

دەزگای ڕۆسا بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب
ژمارەی بڵاوکراوە (٦٥)

* ناوی کتێب: تەواری ئەنفال
* نووسەر: نەژاد ڕەشید پشدەری
* بابەت: ڕۆمان
* پێداچوونەوەی زمانەوانی: حەیدەر عەبدوڵڵە
* دیزاینی ناوەوە: دەزگای ڕۆسا
* بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
* چاپ: دووەم ٢٠١٨
* چاپخانە: هێڤی
* نرخ: ٥٠٠٠ دینار
* لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٠٤)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە.



ناونیشان
هەولێر- شەقامی پەروەردە- پشت قوتابخانەی ئەیوبییە- بەرانبەر دەستەی دەستپاکی هەرێم
Nobile: ٠٧٥٠٧١٢١١٨١
E-mail: dazgairosa@gmail.com
www.facebook.com\DazgaiRosa

ڕۆمان

# تەواری ئەنفال

## نەژاد ڕەشید پشدەری

پێداچوونەوەی زمانەوانی
حەیدەر عەبدوڵڵا

**چاپی دووەم**
**هەولێر ٢٠١٧**

# پێشەکی

هیچ کام لەم ڕووداوانە خەیاڵ دروستی نەکردوون، بەڵکوو ڕووداوەکان خەیاڵیان کێش کردووەتە ناوخۆیان، چونکە ئەو زەمەنەی نەژاد لاوێتی تێدا بەسەر برد، پڕبوو لە بەسەرهاتی ناخۆش، ئەوکاتە تراژیدیاکان لەم خاکەدا چڕببوونەوە، منداڵ لە ترسی بۆمبباران و جەنگە بەردەوامەکان هەمیشە لە لەرزین دابوو، لاویەتی لەخۆیەوە هەڵدەوەری، باوان جەرگیان دەسووتا، نیشتمانیش لەژێر پۆستاڵەکاندا نامۆ دەبوو.

نەژاد هێشتا لە سەرەتای لاویەتیدا بوو، گەمەی سەر شەقامەکان و پیاسەی ئێوارانی، چاوچاوانێی کچەکانی شاری جێ هێشت و ڕووەو چیا بێ ئاوڕدانەوە، پێشمەرگایەتی هەڵبژارد. لەوێ فێرە زۆرشت بوو، تێگەیی ئازادی، بە ئاسانی وەدەست نایە، دەبێ هەڵدێر و هەڵەتەکان ببڕێت، دەبێت لە ڕێچکەکان بوێرانە لەنێو بۆسەکانی دوژمندا دەست بکاتەوە، دەبێت بۆ ئازادی تەنیا نیشتمان هەڵبژێرێ و سڵ لەمەرگ نەکاتەوە. نەژاد، لەهەرەتی لاویەتیدا بوو، هەموو ئەو ڕێگە دژوارانەی بینی، ماندوو نەبوو تا ئەو کاتەی نیشتمانی بەئازادی دیت، لەوێدا نایەکسانییەکان، گەلێك ئازاریدا، هەربۆیە لەم بیرەوەریانەیدا، ئەگەرچی بەکاری فەنتازی و وشەسازی نەوێراوە، بەڵام زۆر ڕاشکاوانە ڕووداوەکانی لەشێوەی چیرۆك پیشانی ئێمە داوە. ئەو دەخوازێ پێمان بڵێ: ڕووداوەکان، یان تەواری ئەنفال منی کێش کردووە تا بیان نووسمەوە. بەواتایەکی تر، (هیچ کام لەم ڕووداوانە، خەیاڵ دروستی نەکردوون، بەڵکوو ڕووداوەکان خەیاڵیان کێش کردووەتە ناوخۆیان) ئاخر تێپەڕینی تەمەنی لاویەتی نەژاد بەناو ئەم ڕووداوە پڕ مەترسیانە چۆن نابێتە کاراکتەر و ڕۆڵبینین لەنێو شانۆگەرییە ڕاستەقینەکاندا بگێڕێ، ئەو لەسەر تەختەی شانۆ، لەنێو مەرگی هاوڕێکانی زۆر سەیر ڕزگاری دەبێ، بۆیە ناتوانێ وێنەکانی ئەوسا نەکێشێ و ڕووداوەکان هەڵنەڕێژێ. (تەواری ئەنفال) ئەزموونێکی تاڵی ئەم کاراکتەرەیە، ڕژاوەتە نێو پانتاییەکانی خەیاڵەوە زۆر بەهێمنی پێمان دەڵێ، ئەم ئازادیە بەهەوەنتە بەرهەم نەهاتووە، تا لەنێو

ململانێ حزبییەکاندا ونی کەین. ئێستا، بەرهەمی تێکۆشانەکانی سەردەمە سەختەکانە، با ئەوەی نوێ تەنها بیری لێ بکەنەوە؛ ئەزموونێکە دوور نییە بەسەریدا بچینەوە، هیچ دوورنییە جارێکی دی تفەنگەکان هەڵگرینەوە، ئەوسا پێویستیمان بەو ڕووداوانە دەبێت، کە هێشتا نەکراونە چیرۆك، بەو توانایانەی تۆزی لەسەر نیشتووە و پەراوێز خراون.

لەبەشی دووەمی تەواری ئەنفالدا. فلاش باگ کاری خۆی دەکات و بە وریاییەوە بە بەشی یەکەمییەوە دەبەستێتەوە. تەواوی دیمەنەکان لەنێو چیا سەرسەختەکاندا دەسووڕێنەوە، پێدەشتەکان لەنێو بۆسەی جاش و خۆفرۆشەکاندا پیس بوون، ئەم چیایانە لەوەتەی هەن پەناگەن و بوونەتە داستان، ئەوەتا نووسەران دەیانکەنە کەرەستەی بەرهەمەکانیان. تێکۆشان لە سەردەمە ترسناکەکاندا زۆر سەخت بوو، بۆیە ئێستا دەنووسرێنەوە و دەبنە کتێب و دەگێڕدرێنەوە، زۆرینەمان بەوێدا تێپەڕیوین یان دیومانە و کاراکتەری سەر ئەم شانۆیە بووین. دەکرێ لە خوێندنەوەی بەشی دووەمدا خوێنەر ساناتر لە کەسایەتییەکان بگات، بەتایبەت شاهۆ، ئەم کەسایەتییە خەباتگێڕە پاسەوانێکی یان پارێزەرێکی سەرسەختی نیشتمان و تەوارە، ئەگەرچی ناوی کتێبەکە تەوارە وەك منداڵێکی بێکەسی بەجێماوی ئەنفال، بەڵام ڕۆڵی سەرەکی شاهۆی پێشمەرگە دەیگێڕێ، ناوی ئەو لە تەواوی ڕۆمانەکەدا بەدی دەکرێت، ئەو توانایەکە دەوروبەر خۆشیان دەوێت و بەهۆی ئەویشەوەیە پێشمەرگەکان لە بەرگریدا بەردەوام دەبن، ئەگەرچی دواجار شاهۆ شەهید دەبێت، بەڵام شاهۆکانی دی، وەکوو ئەو دەبنە پارێزەری نیشتمان و تەوار.

نەژاد لەم بەشەیدا توانیویەتی ڕووداوەکان وەکوو خۆی بەیەکەوە گرێ بدات لە چەند دیمەنێکی سروشت و جەنگدا زنجیرەیەك چالاکی هەمەچەشنی کردووەتە کەرەستەی ئەم کتێبە. پێ دەچێت زۆر جار ڕووداوەکان ڕاستینە بن و هەندێ جارییش لە خەیاڵ دەچن، بەڵام بە هەردوو دیوەکەیدا وەك سەرەتایەکی باش بۆ نووسینی بیرەوەری، یان ڕۆمان هەنگاوی ناوە، دەکرێ لە پرۆژەکانی داینەمیدا جگە لە زمانەوانی باشتر بیر لە ڕووداوە دووبارەکان و ئەم کەموکوڕیانەی درکی پێ نەکردووە بەسەریدا بچێتەوە و بەرهەمێکی نایابمان بداتێ.

**سەلام عومەر**

# تەواری ئەنفال

ئەگەرچی دەمێکە لە ئاسۆوە مژدەی گزنگی داوە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەرەبەیانێکی تەماوییە. ڕەنگی سپی سەرتاپای کێوەکانی داپۆشیوە، لە هیچ شاخێکەوە، نەک چیایەکی دیکە بەدی ناکرێت، بەڵکوو ماوەی نێوان تاشە بەرد و تاوێرەکان هەتا گا بەردە زەبەلاحەکان بەدی ناکرێن. لێرەوە لە دوندی شاخە بەفرینەی، کە ناوی (کۆسرەت)ە، بەسەر خاکی شێلدراو و پاوەنکراو قەدەغەکراوی بە پیتوبەرەکەتی بیتوێندا دەڕوانێت، هیچ لووتکە و بەرزایی لە خۆی زیاتر تەوێلی لە سکی شۆڕبووەوە و داچوڕاوی گەواڵە هەورە سپییە چڕەکان ناخشێت. چیای مژگرتوو لە ئامێزی هەموو کەژەکانی ساڵدا، یەک جۆرە پۆشاک دەپۆشێت، بەو بەرگە سپییەوە بەدیار دەکەوێت، بە شانازییەوە دەڵێت: چۆنتان دیوم، هەروام بەدیدەکەن، بە هەر لایەک لێی دەڕوانی، تەمومژێکی چڕ، لە شێوەی پەڵەهەورێکی یەکپارچەیی سپی، سۆمای چاو دەبات، هەتا چاو هەتەر دەکات شەختە و بەستەڵەکە. بەیانیان لەگەڵ کازیوە ئەنگووت، هێدی هێدی بەداماڵینی مەندیلە سپییەکەی چیای سەر بەتەم جێدەهێڵێت و هەتا هاتنی بولێڵ ڕووەو نزار و پاشان زینوێ شێخی و لەوێشەوە بەسەر کۆنە گۆڕستانی قەڵای شەهیداندا گۆڕ و قەڵا و مەزارگە و سەنگەر و قوڵکەکان و شوێنەوارە فەرامۆشکراوەکان بەسەردەکەنەوە. پاشان بە خێرایی ڕەشەبا سەر بەرەو خواردەبنەوە بۆ ناو قڵشی کۆنە ئەشکەوتە پێچاوپێچەکان. دوای ئەوە دۆڵ و پێدەشت و بەندەری بەرتەسکی کەڵەمێوێ لە چاوەڕوانییان دایە، پێ دەچێت هەتا پێش چەند ڕۆژێک ژیانی تێدا بووبێت، ئەوەتا لەژێر کەڵەمێوە وشکهەڵاتووە قەد ئەستوورە پەرشوبڵاوەکان، لەسەر کانی و کارێزە ڕوونەکان، چەند پەتوویەکی کۆنی بۆنداری کەڕوو لێدراو هەڵچندراون، کۆنە کەرەسەی پاشماوەی سەربازی، قەوان و مەتارەی فافونی قۆپاوی ژەنگاوی و پاڵتۆی ئەستووری خمخانە لێدراو بەپەرشوبڵاوی لێرە و لەوێ لە ژێر بنە گووێنیە باڵا کورتەکان جێماون، چاوەڕوانبن هاکا خانەخوێ پەرتەوازەکان وەکوو باشووکە لە

ڕۆژێکی ڕەشەبا و تۆفان خۆیان بە هێلینداکردەوە. لەوێشەوە بەرەو کانی ئەسپان بە کۆنە ئاخووڕ و تەوێڵە و گەوەرە بۆندارەکانی شوێنی تەراتێنی ئەسپە بزربوو تەریوەکان یاددەکەنەوە، ئەوەتا کۆنە گووریس و لغاو و زینەکانیان بەبێ ناز لەپاش خۆیانەوە جیماون، تاڵە موو گرۆڵە پرچەکانیان درێژی کلکو سەرملە ڕەنگاوڕەنگی جۆراوجۆر لە هەندێك شوێن کلافە و بسکی خەنەیی، سپی، خۆڵەمێشی وەنەوشەیی وەکوو کاکوڵ و بسکی درێژی قەف قەفی هەتا سەر کەمەری باریکی چەند کچە شۆخی چاو مەستی بیتوێنی بەدیدەکرێن، هێشتاکەش پاش ئەو هەموو زەمەنە بۆنی میسک و گوڵاو سەوزەگیایان لێدێت، حیلە و چریکەیان لە نێوان کلۆرەدارەکان دەنگدەدەنەوە، دەڵێن: پێکهاتە و درووست بوونی هەموو شار و شارۆچکە و گوند و ئاوەدانی دنیا هاوشێوەن، مرۆڤ پەلی بۆ هەموو شتێک کووتاوە، سەرچاوەی ئاو و کانی دۆزیوەتەوە، یان داگیریان کردوون. پاش ئەوەی بە پارێزەوە جێگای حەوانەوەی خۆیان دابین کردووە، سەرەتا ئاوەدانی، لەدوور خانووە قووڕەکانیان بنیات ناون، دوور لە سەرچاوەکان، هەتا پەلەوەر و ئاژەلەکان لە ئاو بێبەش نەبن، پاشان دەستەمۆ و کەوییان کردوون بۆئەوەی لەگەڵیان بژین، بۆ بێگار و کولوبار گواستنەوە ڕامییان بکەن، کەچی دەربەندی ئەسپان ئەو ڕچە و باوەیان شکاندووە و سەرەوژێریان کردووە، لەسەر ئەو مێرگ و کانییە شێوێندراوە، ئەوکاتی وانەبوو دیمەنەکەی جۆرێکیتر بوو، چڵرەچڵۆڕی ئاوە سازگارەکەی شەو و ڕۆژ تێکەڵ بە حیلەی ئەسپە خاڵدار و هێلدار و ئەسپەشێ ئەسپی ڕەشی قەترانی کوێتی ئەسڵی لەهەر هەموو ڕەنگەکان، قریشکەی جوان و جریوەی بولبولە سەرمەست و ئاشق و شەیداکان دادەچۆڕا، هەر لێرەوە لەسەر ئەوکانییە و کارێزە مەردوومیان ناچار کرد، بۆ تەنها جارێک ملکەچی داخوازییەکانییان بن، لەدوورەوە بێن و لە ناو کۆنە کەلاوە خاپوورکراوەنە بژین، بەڵام ڕاگواستن و بە زۆر کۆچپێکردن، نە ئەسپەکان و نە خاوەنەکانییان توانیان، تەلبەند و شووورای بەرزی دڕکاوی تەلدڕوەکانی ئۆردووگا زۆرەملێیەکان بپسێنن. ڕێگا دۆزینەوە و گەڕانەوە بۆ مەنزڵگا کارێکی ئەوەندە سەخت نەبوو بۆیان، بەڵام کۆت و زنجیر و پەیوەندی دەست و پێیان بە هیچ ئاسنگەری مەچەك و بازوو دەماردەپەڕیوی پۆڵایین لە هەقی شکاندن و پساندن نەدەهاتن. یادەوەرییە تاڵەکان پێیان دەڵێن، ئەی گەواڵە هەوری سپی مل بنێ ڕووەو دەریاچە، چونکە لێرە هیچ یادگارییەکی وا خۆش

جێنەماون، بەو هیوایەی لەگەڵ نەسیمی شێداری دەریاچەی خوارەوە، ڕاستەوخۆ کەنارە کەفاویەکانی بە بنارەوە نووساوە. ناوێزانی یەکتر ببن و هەتا بتوانن بە نارامی ئاڵوگۆڕێکی بۆنی دوند و دەریاچە بکەن. لێرەوە نەک ڕەنگەکەیان دەگۆڕێن و لە سپی پاتەوە بە ڕەنگی خۆڵەمێشی، بەڵکوو بۆنیشیان قوورستردەبێت. بۆگەن دەبێت، سپیەکان چیدیکە بەو ئاووهەوایەی دەڵێی بەو ماوە کورتە داکشینە جادوویەکی لێکراوە، چ تەلیسمێکە، ڕەنگ و بۆن و ژیان سروشت لە چرکە ساتێکدا، بۆ وا گۆڕان؟ چما بنار و چیا و دەریاچەش تەواوکەری یەکترنین! زێی بچووك لەو ڕۆژمیەوە لەودیو سنوورە دەسکردەکانەوە دێت، ناراستەی دەشتایی حەوزی بیتوێنی گرتووە، لەبن شۆڕەبیە قەد ئەستوورەکانی ئالیقەی بچووک لەگەڵ خەڵکی ئەو دەڤەر و چیایە گفتی کردەوە، سۆزبێت، گفتێکی بێگەردی دەریایی، ئەگەر هاتوو مەردوومی ئەو مەملەکەتە بێخاوەنە نارام بوون، ئەویش ڕەنگی سپی بریسکەداری نەگۆڕێت، لەگەڵ هەر هەڵچوون و داچوونێک و نەگبەتییەک بەرۆکیان بگرێت، ئیدی ئەویش چیدیکە هێمن نامێنێت و بە بێوویست و نارەزووی خۆی ناوچەوانی تێکدەنێت و شەپۆلەکانی سەرشێت دەبن و هەرچی لە چواردەوری و لە ناوییەتی لوولی دەدات و ڕایدەماڵێت.

ئەوڕۆکەش وەکوو تەواوی تەمەنی، چاوی لە تەمومژەکەیە بەهەمان تامەزرۆییەوە، بەئامێزی بناردا بەرەو دەشتایی شووشکەدا دەکشێت. هەنجیرۆک، بۆ کەڵە هەنجیرە وشکبووەکانی ئامێزی کردووەتەوە. لەناو شوێنەوارە کاڵبووەکان، لەخوارئاوا وەک هەموو جارێک لە قەدپاڵی چیا پەرشوبڵاو دەبنەوە، چەند پەڵەیەک بەجێدەهێڵن، بەسەر هەرجێگایەکدا دەڕۆن چەند شێدار بێت، تەڕوو تووشتری دەکەن.

لە دامێنی ئالیقەی بچووك، بۆ ماوەیەکی کورت وچانێک دەدەن، ئەو پشووە کورتە، وەکوو ئەوە وایە لە ڕاوێژ و بیرکردنەوەدا بن، بەکام ڕێچکە و ڕێگادا بەرەو خوار داکشێن، ئەوجا ئەو ڕۆژە ڕۆژی هاوینی وشک و تەمەن کورت بێت، یان زستانی تەمەندرێژی نەپساوەی بەبەفر و ڕەهێڵە و باهۆز بێت.. خۆ بەهاران و پاییزانیش هەمان ئەرکیان هەیە. مەردووم و پەلەوەر و زیندەوەرەکان بەسەر دەکەنەوە و گوێ بۆ خەڵکی بنار ڕادێرن، بزانن ئەوساتانەی نێشکگیری لووتکە بوون چی ڕوویداوە، لەبەر ئەوەی سەر بە هەموو کۆخ و ماڵ و مزگەوت و

تەکیە و خانە خاپوورەکاندا دەکەن سەرگوزەشتەی نەک چیا و بنار، بەڵکوو هەموو دەڤەرەکە دەبیستن. خۆ بە بیستنی چیرۆک و بەسەرهاتە جەرگبڕەکان، ناتوانن هیچ لە هیچ بگۆڕن، لەبەر ئەوەی ڕووداوەکان هەرهەموویان مەرگەساتن و بەبوون و نەبوونی ئەوان هەر ڕوودەدەن، بەڵام کاری ئەوان گوێڕایەڵییە، نەک ڕاوێژ و چارەسەر.. جار هەیە ئەفسانەی وا دەبیستن ناچارن پاش ماڵئاوای و دووبارە هەڵکشانەوە بەرەو لووتکە، ڕۆژی دواتر بۆی بگەڕێنەوە و گوێبیستی بن. زۆر جار ئەوان ڕاستی بەسەرهاتەکان لە هەموو کەس باشتر دەزانن، شایەدحاڵی زیندووی ڕووداوەکانن، لەناو ئەوان بە بەرچاوی ئەوانەوە ڕوودەدەن، بەڵام ناتوانن بەشداری گێڕانەوەی یان گۆڕینیان بن.

بەو پێیەی هەمان تەمومژ ڕووەو لووتکە هەڵدەکشێتەوە، دەبێت دوای نیوەڕۆیەکی درەنگوەخت بێت.. بەو جۆرە ماڵئاوایی لە تەواوی چیا و بنارنشینە ڕەنگ و ڕووخسار تەماوییەکان و(بنە گوێنیە) کورتەباڵاکان بکەن پێیان بڵێن:

وەرزی سەهۆڵبەندان و بەستەڵەك "لەلای نێوەی بنەگوێنی باڵابستە" وەرزێکی بێکۆتاییە، وەکوو مێو و بنێشتە تاڵ، مەردوم و بنار، کێو و نزار، کورد و ئازار و گازی ژاراوی، سەرسەختانە بە بێویست و ئارەزوو هۆگری یەکتری کراون. قەت لەیەکتری جوودا نابنەوە. چەندەها ساڵە، پیر و پێشینان ڕابردوو ڕووداو دەڵێن: مێژووی کەڤناری پتر لە میلۆنان ساڵە، بگرە زیاتریش لەو ڕۆژەیەوە گڕکانی گۆی زەوی تەقیوەتەوە و گورزە ئاگری بێشوومار دامرکاوەتەوە و بەستەڵەک جێگای گرتووەتەوە، زوقم و سەرما وەهای کردووە، هەرچی ڕەگوڕیشەی هەیە بە ناخی زەویدا ڕۆبچن، تەنانەت داربەڕووەکانیش دەستبەرداری کوێستان بوون، ئەو کوێستانانەی تەوژمی سەرماکەی هیچ شتێك خۆی لەبەر ناگرێت. بنەگوێنی، ئاشقی دووەم.. پێشمەرگەی ئەشقییایە، چیا، بەستەڵەك، بنەگوێنی. پێشمەرگەی ڕیشنی ڕووت و ڕەجاڵ. بۆ ناسینی ئەو چوار شتە، هەرکەسێك ئەشقییا و مەرگی پێش خودی خۆی کەوتبێت، ئەوە گیانی لەسەر بەری دەستی بووە و لەهەموو کەس زیاتر گیانبازی کردووە، پێویستی بە پێناساندن نییە. ئەو پێکهاتانەی کە دەبێ یەك یەك بە قووڵایی نهێنی و دیرۆکیاندا بچینە خواریێ!. کەنگێ؟ چۆن چۆنی ئاوێتە و ئاشقی یەکتربوون؟ چۆن لەگەڵ یەکتری هەڵدەکەن و چی وایان لێدەکات لەو چۆڵەوانییە ئاوێزانی یەکتری بن.

بنەگوێنی ئەو درەختە کورتە باڵایەیە، لەکوێستانی لەفەڕاشینە بەرزەکان، لەو جێگایەی سەوزایی کۆتایی دێت، شەختە تەواوی بەندەن دادەپۆشێت، چاوشارکێ و گەمەی خۆحەشاردان لەگەڵ پێشمەرگەدا دەکات. سەرسەختانە پێیدەڵێت: ڕاستە ئێمە نەک تەمەنێکمان بەیەکەوە بەسەر بردووە، بەڵکوو ڕەگوڕیشەمان تێکەڵاوی یەکتربوون، هەمیشە بە سوودبووم بۆتان، لە ڕۆژانی سارد و سەرما، گرم لەخۆم بەرداوە بۆئەوەی لە سەرمان ڕەقهەڵنێیەن. کام ئاشقە ڕووتە ئەوەندەی من وەفاداری دوولبەرەکەیەتی؟ پێم بڵێ کام؟ لە کاتی شەڕ و لێقەومان بوومەتە پشت و پەناتان لە پشت بەژن و باڵا کورتەکەم خۆتان حەشارداوە، بەقەد خیز و خۆڵان سەد ئەوەندەی گەڵای داران فیشەکە سوورە گەرم گەرم، پارچە ئاسن و ساچمەی تیژ تیژ بەر جەستەم کەوتوون کەچی لاشەی زەبەلاحی ئێوە پارێزراو بووە، بۆ سەرخەوێکی شاد و ئارام بوومەتە کەپر و سابات و ڕەشەبام گێڕاوەتەوە و کردوومە بە شنەی شەماڵێکی خۆش. بۆئەوەی کاتێک لە شیرین خەودا ئاوێزانی ئازیزانتان دەبن، بەسەرلێشێوای ڕانەچڵکێن. ئەگەر بێتو بەچاوتاندا بدەمەوە و داوای پاداشتان لێ بکەمەوە، ئارەقی شەرمەزاری بە تەوێڵتاندا دێتە خوارێ. وەرە بزانم! ئەتۆ ئەو بوونەوەرە سەرسەختەی بوویەتە وێردی سەر زمانی دۆست و دوژمن، بەناوهێنانت هەرچی نەیاری جانەوەر هەیە، لەدوورترین سنوور نەک سڵ لەناوەکەت دەکەنەوە، بەڵکوو بە چۆکدادێن. کۆرپەی ڕقگرتووی ناو بێشکە بەناوی تۆ ژێر دەبێتەوە، بێباکانە زۆرانبازی لەگەڵ مەرگ دەگرێ. پێشمەرگی خۆت کەوتووی یان مەرگ پێشت کەوتووە.

وەرە و لەپەنای باڵای بڕکەنۆکم و قەدی ئەستوورم خۆت حەشاردە، ناوبانگی من وا ڕۆیشتووە و بەگوێی هەموو زیندەوەرێکدا چرپاوە، ئێمەی بنەگوێنی چوار وەرزی ساڵ، هەر سەوز و تەڕ و بەرین، قەدی ئەستووری ئاودارمان، بە چقڵەشینکەی درێژی سەوزی نووک تیژی زەرد زەرد دەورەدراوە، پێمدەڵێن: ئەتۆ ڕووەکێکی بێسوودی، بوونت بە پێچەوانەی بێبەرگی بوونەوەرەکانی کوێستانە، لەبەر بێبەرگییان حەزیان لە شتی زوو سووت باوە. وا ئاسراوم هەتا لەپاش بڕینەوەشم سووتانم زۆر ئاستەمە، ئەو گیانی یاخی بوونەم ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر دەبێت، ئەوەتا لەگەڵ تۆپباران و ناڵەناڵی خومپاران، هەموو بستەخاکێکی گرداوە، سەرت هەڵبڕە و چاوبگێڕە بە بەرچاوی هەموومانەوە، ئەمن، ئەتۆ، دار، بەرد، سروشتی کرگرتوو و گەردوونی پاوانکراو،

ئاسمانی شێواو، دۆستی کۆستکەوتوو، دوژمنی شەرمەزار، ژیان مەرگ، گەواهی دەرن. چیا بە هەموو شتێکیەوە ئاگری گرتووە "نێل نێل دەسووتێت، زۆردەمێکە خۆلەمێشەکەی بای زریان ڕاپێچی داون" ئەوە باهۆزی مەرگە و هەموو چرکەیەک هەڵدەکات و دەموسات و کاتی بۆ نییە و گیانی هەزاران کەسی سڤیلی بێگوناح و بێتاوان دەدووڕێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەهریمەن لەو خاکە گڕدراوە باڵادەستە و فەرمان تەنها فەرمانی ئەوە، ئەویش لە کاولکاری ناکەوێت. تەنها من نەبێت (بنە گوێنی) چۆکم دانەداوە و بەپێوە ماوم، ڕەگوڕیشەم وەها بەزەویدا ڕۆچووە، هیچ هێزێک نییە خاشەبڕم بکات، کەچی ئەوەتا پێمدەڵێن:

- دەبسووتێ لەو سەرما کوشندەیە! مەگەر (عەگۆل) وەها ئەگریس بێت، بە ئاگری دۆزەخیش ئاسووتێت. ئێمەی کوێستانی بە ڕووەکێکی نامۆ و بێکەڵکی گیاکەڵەی ئاران و بیابان دەشوبهێنن. هەر بۆیە دەهەری بووم و داوەمەتە دەشت و کێو، ئێمە سروشت و جوانی دەبەشینەوە، ئەو ئەهامەتی و قاتوقڕی، هەرخۆمان قوربانی هەموو ڕۆژێکی ساڵ بەبێکۆتایی هاتن و بە بێدیدەنی جەژنی قوربان، ئەو جەلاد و خوێنخۆر، ژیانی خۆمان لەسەر خاکێکی داگیرکراو بنیات ناوە، ژینی ئەوان لەسەر خەرمانی ئێسکی وردکراوی ژن و منداڵی بەدرێژایی مێژوو ئەنفالکراو هەڵچنیوە، قەت ئێمە و ئەوان نابینە دۆست و هاوزمان و هاوپەیام و برای یەکتر، کەی وا ڕێککەوتووە، دوو سەر بە خوێنی سەری یەکتر تینوو لەسەر یەک سەرین دابندرێن، با ئەو هەر بە خۆڵە سوورەکەیەوە بلوورێنێت و داوای قوربانی زیاتر بکات. ئەمنیش لاوکی ئەڤینداری بۆ هەموو گیانلەبەرێک دەچڕم، حاشا لەو بەیەکەوە لکاندنی دوو جەستەی ئاسمان و ڕێسمان لەیەکتری دوور. هیوام دەخواست، من و عەگولی بیابانی ڕاستە هەردووکمان شەیدای چوڵەوانین، بەڵام هیچ وێکچوونێك لەنێوانمان نییە، هیچ نەبایە وەکوو دوپشکەڕەشە و شەوگەر ئەوە دوای ئەوە وەکوو میراتێك بۆمان بمابایەوە، لێك تێگەیشتن و ڕێکەوتنێك لە نێوانمان هەبوایە، لە بیابان شەوگەڕ بۆ خۆحەشاردان حەشارگەی شەوگەڕی دوور و درێژ بکۆڵێت، بەڵام هێشتا لە سکی برسی دەوارنشینان نە پارێزراوە، بۆیە لەگەڵ دووپشکەڕەشە ڕێکدەکەوێت، داڵدەدانی بەرامبەر بەژەهرە ڕەشەکەی لە کاتی پەیدابوونی دەستی نامۆ بۆ ڕاوکردنیان، دەبوایە ڕوونکردنەوەیەکیش بۆ ئەو دوو ناوە، عەگۆڵ و بنەگوێنی هەبوایە، چۆن دەبێت هاوسۆزییەك لە نێوانیان نەبێت. ئەوەی ڕێگرە یەکێکیان چیانشین و ئەوی

دیکەیان درکێکی بیابانی هاوشێوەی یەکترنین. بۆ ساغکردنەوەی ئەو دوو ڕووەکە بالاّ کوورتیلەیە، کەسێک بە ناوی شاهۆ، سەر گوزەشتەیەکمان بۆدەگێڕێتەوە. وەها لەبیر و ئەندێشەکانی دێت و دەچێت، چەند ڕۆژێک لەمەوبەر، بەتەواوی نازانم چونکە ڕۆژەکەم تۆمار نەکردووە چوومە لای پیری موغان (مام لالۆ ڕەزگەیی) ئاشقی چیا و بەندەن و لێرەوار، سارێژی برین و ئازارو ژان، هەتا هەتوانی چەند برینێکی قوڕس، قوڕس و وەلاّمێکی دروستی لێوەرگرم. لەژووری چاوەڕوانم دەکرد، پێش ئاوابوونی خۆر و هاتنی شەو گەڕایەوە. لێم پرسی ((مام لالۆ.. دەزانی عەگۆلّ چییە؟)) هیچ خۆی شلوێ نەکرد، دیاربوو زۆر جاری دیکە ئەک بیستبووی بەڵکوو جۆری ڕووەکەکەشی دەناسی، چما گژوگیا و ڕووەک و درەخت هەیە مام لالۆ نەیناسێت، هەتوان و گیادەرمانی برینانی لێ دروست نەکردبێت. هەرچی دکتۆر و حەکیم و لوقمان هەن دێنە لای ڕەزگەیی بۆ شارەزابوونی داوودەرمانان. پێداندەڵێت هەر بەوە دکتۆر و حەکیم مەبن کە چۆن دەرمانی تفت و تاڵی بێبرِشت بگرنەوە، چیا و بەندەن و مرۆڤ و پەلەوەر بناسن و لەدەرد و ئازارەکانیان بگەن، دەستان لەسەر شوێنی بیمارێکدا دانێن، لە دڵ و دەروونەوە لەگەڵ ئێشەکانیان بژین، بە گژوگیا و ڕووەک و سروشت ئاشنابن. وامزانی پرسیارەکەی منی لەبیر کردووە یان پشتگوێی خستەوە، بەلاّم بایدایەوە سەری، بۆیە بە نەرمییەکەوە گوتی: ئەو (عەگۆلەی) ئەتۆ وێردی سەر زمانتە، لە بیابان هەیە لە شێوەی بنەگوێنیە، بەلاّم عەگۆلّ وشک و برینگ و ڕەنگ زەردە، کەچی بنەگوێنی بۆ خۆت دەزانی چۆن چۆنییە! ئاو تەڕاتی لە هەموو شوێنێک ببڕێت لەوان نابڕێت ((بۆچی ئەو پرسیارە دەکەی، لەکوێ بەبەر گوێت کەوتووە؟))، چاوەڕوانی ئەو پرسیارەم دەکرد بۆیە گوتم ((ئەوەی ڕاستی بێت لەو خەڵکانەم بیستووە کە لە ئەنفال ڕزگاریان بووە)).

مام لالۆ زۆر بەتەمەن بوو، وەرزی تەمەنی پاییزێکی درەنگوەختی نیشاندەدا، وێستگەی ژیانی زۆربەی گەلاّ زەردە ڕەقهەلاّتووەکانیشی هەڵوەراندبوو، ئەگەرچی لە جووڵان و هاتن و چوون نەکەوتبوو، بەلاّم لەڕۆیشتن دوولا دەهاتەوە، بەدەم دووبارەکردنەوەی دوا ڕستەی من.. لەو کەسانەی بیستووە لەئەنفال ڕزگاریان بووە. دیار بوو ئەو بابەتە زۆر ئازاری دەدا، هەناسەیەکی درێژی پڕ لە بۆنسۆی هەڵمژی، وەکوو ئەوەی حەسرەتێک لەسەر سینگە ڕەقەمووایەکەی گیربووبێت، بەسەر بادانێکەوە پرسی: ((بۆ کەسێک هەیە بتوانێت لە ئەنفال ڕزگاری ببێت؟»،

ڕەنگی ڕوخساری تەواو سوور هەڵگەڕا، بە گەروویەکی ویشکەوە دریژەی پێدا:
((لەو ئەنفالە ڕزگارمان دەبێت، پلانی ئەنفالێکی گەورەترمان بۆ دادەڕێژن، ئەگەر هەموو ژیانمان ئەنفال و قڕکردن نەبوایە، ئێستا گەورەترین نەتەوەی سەر گۆی زەوی دەبووین، لەگەڵ ئەو هەموو ڕەشە کوژییەش هەر ماوین و هەناسە دەدەین. هەرچەندە ئەو ژەهر و کیمیایە، فیشەکی وێڵ نییە بتوانی خۆتی لێ لابدەی، هەر ئەوەندە کەمێکت هەڵمژی، وەکوو مۆرانە لەناوەوە دەتوێنێتەوە، گۆشت و ئێسقانت دەکاتە ئاو، پاشان بە گوتەی کێ ئەنفال کۆتایی هاتووە؟ هەتا کورد ماوە، ئەنفال دەکرێت، مەگەر دۆست و دوژمن و پەیامی ڕاستەقینەی خۆی بناسێت)). چەندی سەرم هێناو سەرم برد، نەمزانی چی وەڵام بدەمەوە، بۆیە بە بێدەنگی گوێم گرت.
((شاهۆی شەهێنەکەم، ڕۆڵەی ئازیزم هەرچەندە لە من زیاتر کونە شاخ و دۆڵ و ئەشکەوتەکان بەسەر دەکەیەوە، وەکوو پێشمەرگەیەکی گەڕۆکی بێجێگا و مەکان، سەر بەهەموو کونجێکدا دەکەی، بەڵام ئەوەی چەند ڕۆژێکە بەو چاوانەی خۆم دیتم، باوەڕناکەم لێرە بووبی و بەرچاوت کەوتبێت، ئەو ڕووداوە شتێکە و زۆر سەروەمێشکی گرتووم، ئارامم لێهەڵگیراوە، ئاگام لە خۆم نییە، ئەتۆش بای لە باتی من هەروات بەسەر دەهات، پێرێ زوو، لە وتەکەی خۆی پەشیمان بووەوە، نە خودایە تۆبە، بەسرپێرێ، بە دەستەزبرەکانی دەستی گوشیم، سەرم سووڕما بەو تەمەنەیەوە ئەو هەموو هێزەی لەکوێ بوو، بەڵام کە تەماشای قامکە ئێسقاناویی و ئەستوور و درێژەکانیت دەکرد، هەستت دەکرد گڕوتینی تێداماوە. کوڕم لێم مەگرە هەمووشتێکم لێ تێکەڵ بووە، ئەو دەستگوشینە وەکوو داوای لێبووردن وابوو، بەردەوام بوو، لەو باسکەی سەرێ، چوومە نزاری لەزینوێ شێخی، بۆ چنینەوەی بڕێک گژوگیا و مازوو، بۆ کردنی بە گیادەرمان. شاهۆ، لەهەموو لایەکی دارچەڵاک و بوخچە و خواردن کەتبوو، بۆگەنێکی کوشندە مێشکی پیاوی کاس دەکرد، ئەوەندەی گەڕام کەسم نەبەزیندوویی نەبەمردوویی لەو ناوە نەدیت، زیروح نەدیارو نە دەنگ و هەتا چرپەیەکیشت نەدەبیست. نازانم چی ڕوویدابوو! بە ئاسپایی لێم پرسی:
- مامە دارچەڵاک چییە؟ بەبێ ئەوەی ئاوڕ بۆ دواوە بداتەوە، دارێکی دوو ئەوەندەی بەژنی کەسێکی کەڵەگەتی لەپشت خۆیەوە ڕاکێشا، دارچەڵاک ئەوەیە! سەرێکی باریک بوو دوولکی چەماوەی کورتی پێوە بوو. هاتەوە بیرم گوندنشینان لە پایزدا لەبندار مازووەکانەوە بەو دارە مازووە میوە لەدارەکان دەکەنەوە،

بەبێ ئەوەی پەلەوان بنو بەدرەختەکاندا هەڵگەڕێن، پرسیم: باشە خاوەنەکانیان لە کوێن؟ دوو دەستی بەرزکردنەوە، نازانم کوڕم ئەوەیە هەناوی خواردووم، جەرگم بەو پیرییەی لەتلەت بووە. دووچاوە تەڕەکانی لەسەر من لابرد و لەکوڕەی پرسی: ئەرێ کوڕم چ بەڵاتە، دەڵێی فەردە تووتنی ئاگرت گرتووە، جگەرە بە جگەرە پێ دەکەیتەوە؟ ئەویش بەدەم لێدانی مژی قووڵتر لە جگەرەکەی ناو پەنجە زەردهەڵگەڕاوەکانی دەستی.. لەبەر خۆیەوە دەیگوت: (بەدوای شتێکدا وێڵم، نازانم، سەرم لێشێواوە. بۆ خۆشم نازانم لە چ گژوگیایەك و ڕووەکێک دروستی بکەم. هەرچی زۆزانی ئەو ناوە هەیە، بن بەرد بەبن بەرد، مێرگ و سەوزایی ژێر بەفری تازە و کۆن، چەنگ و نینۆکم چوون. کەچی دژەهەتوانی ئەو گازە ژەهراویە بەلێشاو بەسەرماندا دەبارێنن دەرمانی نییە، ئەم دۆزییەوە). هیچ دەردێک بێدەرمان نییە، کەچی ئەوە پەتایەکی ئەوەندە کاریگەر و کوشندەیە، ئەوەی دروستی کردووە و ئەوەشی بێبەزەییانە و شێتانە بەکاری دێنێ، بۆ قڕکردنی ئەو خەڵکە ڕەشووڕووتەی، دەست لە هیچ.. هیچ ناپارێزێت، هەر چەکێکی کومەڵکوژی لەو پەڕگەی دنیا دروست بکرێت، لە سەر سەری ئێمە تاقیدەکرێتەوە، بزانن چەند کەس قەلاچۆ دەکات.

دایکی پاش نوێژ بۆ ماوەیەکی باش دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرزکردنەوە، فەقیانە سپییەکانی بەسەر قۆڵ و مەچەکیدا وەکوو ملی بەرامبەر کەسێک، جێگای ئومێد و هیوای بێت، شۆڕبووبوونەوە، وەکوو ئەوەی لەبەرزییەوە کەسێک هەبێت و گوێی بۆ ئاە ونزوولە و پاڕانەوەکەی ڕادێرا بێت. نزاکردنەکەی بەدەنگی بەرز دەکرد، هەر لەسەر بەڕماڵەکەیەوە، بۆ کەمێک هێورکردنەوەی کوڕەکەی بەدەنگێکی لەرزۆکەوە، گوتی:

کوڕم (خودا لە سوڵتان مەحموود گەورەترە)، دەلیلی داماوانە، زۆر دەمێکە پیر و پێشینەکانمان گوتوویانە "ناهەقی بزنی شاخدار، بە سەر بزنی بێ شاخ ناهێڵێت"، قەت زوڵم و ناهەقی هەتا سەر بۆ کەس سەرناگرێت. هەزاران زاڵمی لە هەموو دینان بێبەری هاتن و ڕۆیشتن. خودای گەورە لەناوی بردن تەخت و تاراجی تێکدان، بەڵام بە قوربانی بم زۆر زۆر بە سەبرە. فوویەکی درێژی بە سەر کوڕ و من و مام لالۆ تەواوی ژوورەکەدا کرد. دەنگی لەرزۆکی بوو بە گوڕە و ئەعرەتەیەکی شێرانە (هەڵی ئەگری ئەی خودای بانسەر، ئەتۆ ئاگات لە خشەی مار و مێروولەیە لە شەوەزەنگە ئەنگوست لەچاوەکان، هەرچی ڕوودەدات

به ئاگاداری تۆیە، خشپەی مار و مێروو دەبیەی! نیشانیاندە، تۆفان و ڕەهێڵە و لافاوییان بۆ بنێرە، بمانپارێزە لەو جانەوەر و خوێنمژانە). دەنگی هێدی هێدی غەمبارتر و تێکەڵ بە قوڵپی گریان دەبوو، هۆ خدری زیندەی چۆڵوبەرییان، باڵی پیرۆزت بەسەرماندا ڕابکێشە بێدەرەتان و بێکەس و کەساس و لێقەوماوین. بەرەو لەناوچوون و سڕینەوە دەچین، ڕۆژانە بە بەرچاوی هەموو دنیاوە هەزارانمان لێ سەردەبڕێت، بمانپارێزە، بە گەورەیی خۆت وەکوو عەبدێکی بەلەنگاز، داڵدەمان دە، هیچ حەشارگە و پەناگەمان نەماوە، سەر بۆ هەر کوێیەک هەڵدەگرین لەو ئاسمانەی چاوی بەزەیی تێدەبڕین، کیمیاباران دەکرێین، دینمان چووەتە سەر دینی ئەوان، بەباوەشەگوڵ باوەشمان بۆیان کردەوە، بە دڕک و ژەهر وەڵامیان داینەوە. هەڵی نەگری. خودای گەورە ئەو زوڵمە هەڵنەگری وێڵت کردووین، گوم بووین، بمانبینە خودای تاک و تەنها ئازار و ئێشمان ببیستە، بیان هەنگێوە، چەند دڵ و ڕەنگ و ڕوو ڕەشبن، بیان هەنگێوە، بیانکە بەپەندی زەمانە، مەدەد غەوسی گەیلانی.

کوڕەکەی لەگەڵ هەڵکێشانی هەناسەیەکی درێژی پڕ لەناسۆر، بەدەم بژاردنی کۆمەڵێک گژوگیای بۆنخۆشەوە، بە پێچەوانەی ڕەنگی بزرکاوی، تەواوی ژووره قانگدراوەکەی گرتبووە، سەرگەرمیی و خۆشەویستی بۆ کارەکەی لە تەمەنی خۆی گەورەتر نیشانی دەدا، چونکە دروستکردنی دەرمان لە ڕووەک و گژوگیا، زیاتر کاری حەکیمە بەساڵاچووەکانە، بەڵام ئەو پیشە خۆبەخش و بێدەسکەوتە، پشتاوپشت ئەوە لەدوای ئەوە بەمیرات بۆیان ماوەتەوە، بۆیە مام لالۆش ڕادەستی ئەوەکانی نوێ دەکات و فێریان دەکات. ئەومیان بکوڵێنە، ئەمەیان بپیشێنە، پاشان تێکەڵاویان بکە. دڵۆپ دڵۆپ بە وریایی بیان پاڵێوە. کوڕە چەپکە گیایەکی لەدەست بوو، فڕێی دایە لایەک و بەهەڵچوونێکەوە گوتی:

- دایە گیان! خۆ ئێمە ئاژەڵی دڕندە نین هەتا ئاوامان لێ بکەن! کەسێک پەلەوەرێک، گیاندارێک، ڕادەگرێت بێگاری و کاری و قورس و سووکی پێ دەکات، بەڵام هەر هیچ نەبێت جێگا و ڕێگا و ژیانی مسۆگەر دەکات، کەچی ئێمە بەشمان هەر جەور و ستەم و لەناوچوونە. چمان کردووە؟ ماڵی کەسمان نەخواردووە، خاکی هیچ نەتەوەیەکی دیکەمان داگیرنەکردووە، خۆزگەم ئەو قسانەی ئەتۆ دەیانکەی وابن، دەڵێن "کوێرە چیت گەرەکە، دوو چاوی ساخ"، ئەو هەموو مەردوومەی بەو کیمیایی و گازە کوشندەیە، نابینا بوون و گۆشت و ئێسقانیان

توایەوە. کێ تۆڵەیان دەکاتەوە هەتا فرمێسکێکی تیمساحانەشیان بە درۆ بۆ دەرێژێت؟ پاشان ئەگەر میللەت هەمووی بە کیمیایی لەناو چوو، چی لەسەبر و بەزەیی بکەین. داکی لەو قسەیە دڵگران بوو. پاشگەزبەوە، داوای لێبووردن و بەخشین بکە، خوا گەورەیە کوڕم. شوکرانە بژێربە، ئەوەی بە دوودڵی ناهومێدیەکەوە گوت. هەر وا دەبێت، کورە شیرینەکم. دیارە بەشمان ئەوەندەیە. پاش ئەو دەمەتەقێیەی دایک و کوڕ، پووریێ ڕووی لەمن کرد و گوتی:

ئەتۆ دەڵێی چی ڕۆڵە شاهۆ؟ وەڵامەکەم ئەوە بوو، دڵنیام لەوەی وەک و ڕۆژی ڕۆشەن لێم ڕوونە( دایە ماوزەڕ) ڕۆژێک دادێت تۆڵەی ئەو هەموو خوێنە بەناهەق ڕژاوە دەکرێتەوە، سەرکەوتن هەر بۆ میللەتی ڕەش و ڕووتە. بۆ پشتگیریکردنی بۆچوونەکانم گوێم لەو مەسەلە کوردییە پڕ مانایە بوو (کاریلە هەر لەبن سەوەی نامێنێتەوە، ڕۆژێک هەر پێدەگات.

ڕووم لە مام لالۆ ڕەزگەیی کرد، مامە ئێمەش چەند کەسێکمان هەن بە چەکی کیمیایی بەخەستی بریندارببوون، هاتووم بەڵکوو دەرمانێکت هەبێت. مامەی بەساڵاچوو، دووچاوە بەقووڵاچوە شەکەتەکانی، ماوەیەک لەچاوەکانم بڕی، وەکوو ئەوەی پێش وەخت لە چاوەکانم ڕاستی و دروستی و بڕوابوون بە قسەکانی بێنم بخوێنێتەوە. دیاربوو ناهومێدی، وەکوو حەکیمییەکەی لەویەوە بۆ کوڕەکەی مابووەوە، بۆیە لەڕووخساریدا نەک تەمی شەرمەزاری، بەڵکوو ڕووپۆشێکی ئەستووری تەریق بوونەوە و بەسەرخۆدا شکانەوەم بەدی کرد، بەدەنگێکی گڕی نووساو گوتی:

دەرمان، هەر دوێنێ بەیەک ڕۆژ ئەوەندەی توانیم بیانژمێرم، زیاتر لە هەشتا کەسیان هێنا، منداڵ و گەنج و پیر و پەککەوتە. ژن پیاو کچ کوڕ.. هەر هەموویان تەواوی جەستەیان هەلاهەلا و سووتابوون، کێم و زلزڵەیان لێ دەچۆڕایەوە، بە گوێرەی زامەکانیان تازەبوون، هەر ئەو ڕۆژە پێکرابوون، ئەی خودای گەورە بۆ نامکوژی و لە کۆڵ ببمەوە، بەو تەمەنە بۆ دەبێت ڕۆژانە ئەو هەموو قوربانییە ببینم، ئەو دەست و پەنجە ناسکانەی کۆرپەی ساوایان بەو دوو چاوانەی خۆم دیتم، برینە قووڵەکانی سەر لەشیان هەتا سەرئێسقان ڕۆچووبوون. نوزەیان لەبەربڕابوون، بە دەستەوستانییەکەوە دوو دەستە زبرە دەماراوییەکانی لێکدان، هیچم پێنەکرا. جاران لەبن هەر تاشەبەردێک دارستانێک بە باقە هەموو چەشنە گیایەکی دەرمانت دەست دەکەوت، کەچی ئێستا لە جیاتی پنچکە گیا، پارچەی

مرۆڤت بەرچاو دەکەوێت، وام لێ هاتووە، زۆر کەم لەماڵ دەردەچم. پاش سڕینەوەی فرمێسکەکانی بەدوو دەستە لەرزۆکەکانی شتێکی بۆ ڕاداشتم، ها ئەوەندە دەرمانەم لە گژوگیا دروست کردووە. وەکوو کۆجیلەی بنێشت وابوو. دایە دەستم، ئەوە گیراوەیەکە لە گژوگیا بە شێوەی وازەلینە، لەتەواوی لەشی هەڵسووە، بەڵام نەگاتە چاوەکانی لەبەر ئەوەی زۆر تیژەو ئازاری دەدات. بەڵکوو بێت و خوایە شفا بێت. هەر سەری ڕادەوەشاند لەرزۆک بووبوو، بەڵام ئەو کەسەی باسی دەکەم چاوەکانی سوورهەڵگڕاون، وەکوو دوو گۆمی خوێنیان لێهاتووە. دوو پەنجەی لەسەر پێلوەکانی دانان، چاوەکانی دەبینن؟ بێ بیرکردنەوە وەڵامم دایەوە، بەلێ بەڵام زۆر بە ئازارن، ها ئەوەش قتوولەیەکی باریکی ژەنگاوی بوو بۆ ڕاداشتم. ئەوەش بۆ چاوەکانی، پێش بە کارهێنانیان دەبێت، تەواوی لەشی جێگای برینەکان پاک پاک بە ئاوێکی ساردی سازگار چەند جار بشۆردرێن، ئەگەرنا نەک ئەو دەرمانانە بەڵکوو هەرچی چارەسەر هەیە بێسوود دەمێنێتەوە، بەڵام شاهۆ گیان پێت نەگووتم، کێت بەو چەکەی برینداربووە؟ ویستم وەڵامی بدەمەوە... بێدەنگ بوو ئەو قسانەی بۆ پێشمەرگەیەکی دیکە دەکرد، بەڵام لەنەکاوێک لە گێڕانەوەی سەردانەکەی وەستا، گوێ قوڵاخ بوو، دەنگێکی نامۆ هاتە بەرگوێی. بۆ دووەم جار هەمان پرسیار و بەئاوازێکی تامەزرۆتر و کەمێک غەمبارتر، دووبارە بووەوە.

-مامە شاهۆ عەگۆڵ چییە؟ شاهۆ بەدەم فوولێکردنی ئاگرەکەوە، کە زیاتر چڕەدووکەڵ و قرچەقرچ بوو، گەردەلوولی ئاگرەکە بادەدرا، لوولی دەخوارد، بەرەو سەر هەڵدەکشا، تێکەل بە کزەبا دەبوو، ڕووەو سەر زیاتر هەڵدەستا، بە هورژم ڕووخساری دادپۆشین، بۆ هەر کوێیەک سەریان دەسووڕاند هاوەڵیان بوو.

- ئای دەوروبەر، هۆ هاوڕێیان! ئەو دەنگە کێ بوو؟ تێم بگەیەنن و خاوەنەکەیم پێ ئاشنابکەن، هەست دەکەم ئەو دەنگە خەفەکراوە لە ڕووحی خۆم پێم ئاشناترە.. زۆر جار نەعرەتە و نەڕەنەڕی هەزاران کەس دڵی مێشوولەیەکیش ناخاتە خورپەوە، کەچی نووزە یان ناڵەی منداڵێکی بیمار، سەرجەم جیهان دەگۆڕێت. ماوەیەك بە دووچاوی پروشماوی دووکەڵاوییەوە، بە چواردەوری خۆیدا ڕووانی، هەموو وێنەکانی نەک دەوروبەری، بەڵکوو تەواوی دیمەنی چیا و بنار و درەخت و هەتا بنەگوێنیە بێ شوومار و کەسەکانی بەلێڵی و تارمایی دەهاتنە

بەرچاو. چەند شتێک لەبەرچاوی دەهاتن و دەچوون، بە چووستی دەجولانەوە، قسەشیان دەکرد، بەڵام هەموو دەنگەکان لەناو تاکە پرسیارێکی سادە و ساکاری منداڵانە خەفەبوون. بەشوێن دەنگەکەدا وێڵ بوو، لەچی گەروویەکەوە دەرچوو، پاش ئەوەی بە بنگوێدا بە تیژی باڵی باشووکە یان خێراتر لە تیژڕەوی دەنگ گوزەری کرد. وەکوو نابینایەکی زگماکی پەلی دەکوتان، تەنها یەک دەنگی نووسا و سێ وشەی بە ئاستەم بیستراو، چیان بەسەر هێنا. قەت باوەڕناکەم ئەوەی بە دوو گوێی خۆم گوێم لێبوو ڕاست بێت، چونکە بۆ یەکەم جارە پاش شەش مانگ گوێبیستی ئەو دەنگە دەبێت و بەگوێی ئاشنا دەبێت. چۆن زەوی تینووی ئاو مرۆ عەوداڵی ئازادی و ئاگر ئاشقی پووش و پەڵاشە، ئەویش لەوان زیاتر جەرگ و هەناوی بۆ ئەو دەنگە دەسووتایەوە.. تۆنی گەرووە زامدارەکەی، لەلای، لەهەرچی ژێی ئامێری عود و کەمان هەیە خۆشئاوازترە. بەڵام بۆچی وا بە درەنگی لەرینەوە، ئەو ماوە دوور و درێژە ئەگەر بۆ تەنها جارێک بەبەر گوێی کەوتبا، ئێستا بەبێ بیرلێکردنەوە دەیناسیەوە، بۆ ئەو ماوە دووردرێژە لە بیستنی ئاوازی خۆشترین لاوک و حەیران بێبەشت کردم، ڕاستە گوێیەکانی وەکوو هی برادەرەکانی، بە گرمەگرم و هاژەهاژ و ناڵەناڵی تۆپ و بۆردوومانی بەردەوامی ناوچەکە و سووتانی تەڕ و وشک بەیەکەوە، تەواو تەپ و کاس بوون. زۆر جار لە پێشیەوە بانگ دەکرێت یان قسەی بۆ دەکرێت، هەروا بە جووڵەی دەم و لێو دەزانێت باسی چی دەکەن. بەڵام بۆ دواجار ئەو دەنگەی بە ڕوونی بەرگوێی کەوت. ئەوەی گەرەکم بوو پێی گەیشتم، وامدەزانی ئەو ئاواتەم وەکوو هەموو داخوازییەکانی دیکەم لەگەڵ خۆم دەیبەمە ژێر گڵەوە، بەڵام وانییە و زۆر بە هەڵەدا چووم، ئاوڕێکی بۆ لای هاوڕێ پێشمەرگەکانی دایەوە، بەتایبەتی ئەوانەی لێیەوە نزیک بوون. وەرن لێم خڕببنەوە، دەورەم بگرن، یارمەتیم بدەن. چاوی بە هەموویاندا دەگێڕا بزانێت ئەوانیش گوێیان لەو دەنگە نامۆیە بوو. خۆ ئێوەش وەکوو من نێشکگری ئەو قوڕگە نووساوەن، بە چرپەیەک بتان دوێنێت، یان من دێوانەم و ماوەیەکە لە بیر و ئەندێشەکانی خۆمدا دروستم کردەوە و چاوەڕوانیی ئەوەم گوێبیستی بم و بەڕاست بگەڕێت. هەر لە بیرکردنەوەدا بووم، دەبێت ئەو کیژۆلە دەنگی چونچۆنی بێ، باریك و زیقن، یان تیژ و بەرز، نا وەکوو خورەوشتی ئارام و لەسەرەخویە. چۆن بزانێت و دەنگێك بناسێت کە قەت ئاشنایەتی لە گەڵدا نەبووە، زۆر جار بیر و غایلەی خراپ بە مێشکیدا هاتووە،

ئایە هەر قسە و وتووێژی لە بیرچووتەوە، یان زمانی لە ناو دەمدا نییە، بەڵام وەکوو هەر کەسێك خاوەن زمانە، ئەدی بە چی دەخوات و دەخواتەوە، بەڵام ئەرکی گەڕان و دەربڕینی، بۆ ماوەیەکی کاتی لێ ستاندوەتەوە، ئەوەتا ئێستا، بە کاری دێنێ و پرساری پێ دەکات. هەر چەندەی دەکرد باوەڕی نەدەکرد، بۆیە بە چاو لە هاوڕێیەکانی دەپرسی، گوێتان لێ بوو؟ ئەوانیش وەکوو شاهۆ هەر هەموویان بە حەپەساوی و واقوڕماوی، سەیری یەکتریان دەکرد، ئەو نیگا گۆڕینەوە درێژەی کێشا تاسابوون. کەسیان زمانیان گۆیی نەدەکرد، بۆ تەنها جارێک بپرسن، خاوەنی ئەو دەنگە ئەفسووناوییە کێ بوو؟ پاشان تەماشای کیژۆڵە پارچەڵەکەی لای شاهۆی کرد، کە لەسەر چیچکان دانیشت بوو، بە ڕووخسارێکی ژاکاوەوە، شەرواڵە خاکییە کون کونە چڵکنەکەی لەبن ئەژنۆکانی خڕکردبووەوە، لێواری یاقە تەڕەکەی چۆغەڵەکەی بە ددانە سپی و وردەکانی دەجوین. قۆپچەی کەتافەی سەرشانە باریکەکانی دەکردنەوە گرێ دەدانەوە، بەلچکی پشتێندە ڕەشەکەی زوو زوو ئارەقەی لامل و نێوچەوانی دەسڕینەوە، ئەو دڵۆپە ئارەقە سوێرە خەستانە هی گەرما و شەکەتی نەبوون، زیاتر لە شێواوی دەروونی و هەڵچوونی ڕووحی دەچوون. کچۆڵە وەکوو ئەوەی هەڵە، یان تاوانێکی گەورەی کردبێت، سەری زمانی خۆی دەگەست.. نەدەبوو ئەو دەنگەی لێوە هاتبا و پرسیارێکی وەهای کردبا، بۆچی هەموو شتێکی لەخۆی هورووژاند. بێدەنگی ئەو ماوە دوورودرێژە لەهەموو شتێک پەڕاندبوویەوە، ئەو چاوانەی هەتا کەمێک لەمەو پێش، زۆر بە دەگمەن، زۆر بەمیهرەبانییەوە بۆ ماوەیەکی کورت لەسەری دەگیرسانەوە، ئەوەتا وەکوو تیشکی خۆر لەچاوەکانی دەدەن. بۆخۆدزینەوە لە هەموو چاوە شەکەتانەی تێیەوە ڕاماون. سەری لە ناو ئەژنۆکانی نا و لە ژێرەوەش، بە دووچاوی شینی گەورەی ناتوانین بڵێین ئاسمانی، هیچ شوێنێك لە ئاسمان شینترنییە، لەهەر شوێنێک تنۆکێک شینایی هەبێت، لەمی وەرگرتووە، بەڵام لەو دەڤەرە لاتەریکە شێواوە تەواو نێوچەوانی تێکناوە و وەکوو ئەوەی بەشێک نەبێت لەو گەردوونەی، بۆ ژیانی هەموو بوونەوەرێک نافڕاندراوە، لێرە هیچ ڕەنگێك، هیچ شتێك وەکوو خۆی نەماوە، لەسەر زەوی هەر ڕووحی پاکە و بە کۆمەڵ هەڵدەوەرێندرێن، لە ئاسمانیش زۆر دەمێکە پەرییە باڵ گەورە و سپییەکان پەڕ و باڵیان لەژێر ڕەنگی مەرگهێنەری قاوەیی، زەرد، خۆڵەمێشی، هەرچی ڕەنگ هەیە، بەگازی ژاراوی، هەڵپرووکاون و کڵوکۆیان دامرکاوە، هەڵدێن

و کۆچ دەکەن، یان ڕاستتر بە زۆرملێ کۆچیان پێ دەکەن بەرەو شوێنێک بۆ خۆ حەشاردان، ئاسمان و ئەستێرەی لێ نەبێت، لەبەر ئەوەی ئاسمان لەباتی سۆز و خۆشەویستی میهرەبانی بنوێنێت، گازی ژاراوی پەخش دەکاتەوە. کەوابێت، ئاسمان بە هەموو شتەکانیەوە تۆراوە یان ڕەتێندراوە. لێرە دوورکەونەوە، ئەو خاکە تووشی پەتای ژەهر و کیمیایی و بەر غەزەبی ئەنفال کەوتووە، کەواتە چاوەکانی لە ئاسمان زۆر زویرە، دووچاوەکانی دووچاوی شینی دەریایی، ئەوەتا چەند هەنگاوێک لەخواریانەوە دیارە، بەڵام دەریاچەیەکی ئائارامە، هاژە و شەپۆلە هەڵبزڕکاوەکانی، ڕەنگ و سیمای دەریاچەیان پێوە نییە، زۆر لەنهێنی و تاوانی سەردەمە بەدڕەوشتەکانی بە لرفە لرف و سەرشێت هەڵگرتووە و لەقووڵایی خۆیدا حەشارداون. لەباتی ئەستێرەی دەریاو دووڕ و گەوهەر و مرواری و مەرجان و ماسییە ڕەنگاو ڕەنگەکان، هێسک و پرووسک و تاوان و کارەساتی پاراستووە. دەریاچە بەهەموو گوڕ و تین و شەپۆلەکانی هەوڵدەدات، ڕایانماڵێت و لە خۆیان دووریکاتەوە، بەڵام هەموو چرکەیەک لەزیادبووندان. هەرچەند جارێک شاهۆ تەماشای ئەو چاوانەی سۆمایان داهاتووە، ئەشکیان لێدەبارێت، بە پەشێوی و مەلوولییەکەوە دەکات، نەبەزی و دلێری، تروسکایی مانەوە و بەربەرەکانی لەگەڵ مەرگ و ژیاندا دەکەن، یاخیبوونیان تێدا بەدی دەکران، وەقسەوەرە شازادە خێر لەخۆ نەدیوەکەم، بپەیڤە و چیرۆک و سەرگوزەشتەی پڕ مەینەتیت بۆ هەموو مەردومێک بگێڕەوە، بۆ ئەوەی ویژدانی ڕووشاو و لەکەداری هەرهەموویان بهەژێنیت، بە وەدەنگ هاتنت، میللەتێکی خەواڵوی وەنەوەزدەر بێدار دەکەیەوە. بابزانن نەوەکانیان خودانی چەند داستانی ئەفسانەیین، چیدیکە بەو چاوانە چاودێری هەموو لایەك و یەکە یەکە پێشمەرگەکان مەکە، چۆن دێن چۆن دەچن! باسی چی دەکەن، چۆن گفتوگۆ دەکەن، بەژن و باڵایان چەک و جلوبەرگیان. ڕەنگوڕووخسار و سەر و ڕیشی چڵکن و ئاڵۆزییان. لەوەتای پێشمەرگە هەیە بەو جۆرە بووە بەو شێوەش دەبێت. ئەوانیش، وەکوو خۆم شەو و ڕۆژ هەر لەخەمی ئەوەدان هەر چۆنێک بێت، لەسەرماو برسیەتی و فەوتان ڕزگارت بکەن، بۆ سارێژکردنی زامی جەستە و دەروونی شێواوت، هەرچی زووە هەموو هێزی خۆیان خستووەتە گەڕ، هەر هەموویان بیریان بەلای ئەوەدایە، زامەکانت لە جەستەی تۆ دوورکەوتبانەوە، سەرتاپای ئەوانی بگرتابایەوە، بەڵام دیارە دەرمختی خۆزی لێرە نەڕواوە.

-ئەگەر هاتبا و شەش مانگ لەمەو پێش ئەو دەنگە تەنها جارێك ببیسترایە، زۆر لە گرێ کوێرەکان دەکرانەوە، ئەو ماوە دوور و درێژە پڕ لە ئازارە بەهەموو شەو و ڕۆژ و هەفتە و مانگەکانیەوە بە خەفەیی و چاوەڕوانیکردن ڕانەدەبووردن، ئەو هەموو پرسیارە بێ وەڵامە بەسەریەکدا کەڵەکە نەدەبوون. بەڵام ئەچووە بچێت، ئەوەی ڕوویدا گوزەشت، لەمەودوا، چەرخی فەلەک هەر لە سووڕاندایە و بەرەو دوا ناگەڕێتەوە، تەنها ڕووداوە تراژیدییەکانن دووبارەو سەدبارە دەبنەوە. شاهۆ یەکپێ ڕاست بووەوە، بەدەوری خۆیدا بە دوو باڵی کراوە، خولی دەخوارد، وەکوو ئەوەی نابینایەکی زکماگ بێت و گۆچانەکەی لە جیاتی چاوەکانی کە تاکە ڕێگا نیشاندەر و یارمەتیدەرییەتی لە دەستی کەوتبێتە خوارەوە و بەپەل کوتان بە دوایدا بگەڕێت. چونکە بەبێ گۆپاڵ ژیانی دەکەوێتە مەترسیەوە. خۆی لەدار و بەرد دەدات. ئاو و ئاگر لەپێشیەوە بێت، هەستی پێناکات. هەر ئەوەندەی مەبەست بوو، کیژۆلەکەم. ژیانم، هەناسەم. خۆشیم، ئازاری ویژدانم. هەتا ئەتو لە مەینەتیدا بژیت، دنیا لەبەر چاوم پەردەیەکی ڕەشی تاریکییە، باوەشی بە کیژۆڵە لەڕ و لاوازە نەخۆشەکەدا کرد. لە بۆنکردن و ماچکردنی تێرنەدەبوو، وەها بەسنگی خۆیەوە نووساندبوو، وەختابوو پەراسووە باریکەکانی تێک بشکێنێت، ئەویش تەواو خۆی شل کردبوو، حەزی دەکرد توندتر، بەهێزتر بە ئامێزیەوە بگرێت، چونکە دەمێکە ئەو باوەشە گەرمە دڵسۆزانەی لە دەورە نەماون. کەنیشکی بەستەزمان هەناسە سوار دەبوو، لەبەر بێهێزییان، ماسوولکەکانی ڕووخساری لە جووڵە کەوتبوون. هەستی کرد ئەو جۆرە بەخۆ گوشین و لەئامێزکردنە، ئازاری زیاتری پێگەیاندووە، بۆیە بە سلکردنەوە، دەستە باریکە سپییە لاوازەکانی تەواو شل کردنەوە و بەزەردە خەنەیەکەوە لێی پرسی:

ناوت چییە کچە جوان؟

ئای کە پرسیارێک و داوایەکی سەختە، دەبێ پێش هەموو کەس، یەکەمجار بۆخۆم ناوی خۆم وەبیربێنەوە، خۆم بناسمەوە، ئەوجا بە تۆی بڵێم:

هەردووکیان بۆ چرکەیەکیش چاوەکانیان نەدەترووکاند، وەکوو ئەوەی لەژێر باری شەرمی تازە یەکتر ناسین بن، ئەویش زیاتر خۆی بە سنگی شاهۆوە دەنوساند، وەکوو ئەوەی بیربکاتەوە ناوی خۆی بڵێت، یان نا. بۆچی پێی بڵێم؟ کە ناومی زانی چی دەبێت؟ زیاتر خۆشی دەوێم، یان لێم دووردەکەوێتەوە؟ هەڵەی یەکەمی پرسیارێک بوو کردی، گۆمی مەندی بێدەنگی لێ شڵەقاند، بۆ خۆشی

نازانێت ئەو بە دەنگهاتنە لە ناکاوە، بە بێڕەزامەندی کەس و هاندانی دەوروبەر بوو، یان پەرچە کردارێك بوو بۆ بیستنی وشەیەکی نامۆی نوێ (عەگۆل) قەت لە مەوبەر بەرگوێی نە کەوتووە، ناوێکی عەرەبی نە بیستەی بە کار نەهاتووە، ڕووەکێك بوو نەبوو، نەلێرە هەیە و نەلەو دەڤەرە ساردەش دەڕوێت، کەسیش ناشنایەتی لەدوور و نزیکەوە لەگەڵ نییە، شتێک ئەگەر بوونی نەبێت، ناوهێنانیشی لە زیادەیە، هەر ئەوەندەیە ئارەووزی دەکرد بزانێت چییە. ئەوەتا لە پای عەگۆلی ئەفرەتی و ئەگریس، توخم و تۆی ببڕێتەوە، ناچارە بەناو گوتنی خۆی، بۆی هەیە ئەگبەتییەکی دیکەی لەوە گەورەتری بەسەربێت. وای بە باش دەزانی ناوەکەشی وەکوو کارەسات و ڕووداوەکانی تەمەن کورتە پەروانەییەکەی بە شاراوەیی بمێنێتەوە. ناو و ڕووداو و کارەسات با هەر بۆ خۆم بن، دەستی لە ڕیشە و زەردەکەی شاهۆ گیر کرد، هەموو هێزی خۆی کۆدەکردەوە سەریەک، خۆی ئامادە دەکرد، بۆ وەڵام دانەوە، بەڵام بە هەناسەیەکی پچڕ پچڕی قورسی پڕ لە بۆنسۆ کۆتایی دەهات. بە دووچاوەکانی کە ئەشکیان لێ دەباری داوای پۆشز هێنانەوە و لێبووردنی دەکرد. حەزدەکەم و پێشتریش لەدڵەوە ئارەزووم دەکرد، لەگەڵ یەکەم دیدارمان، ئەو کاتی بە دوو چاوی نیوەکراوە، بە لێڵی نەک ڕووخساری تۆ بەڵکوو هەموو شتێکم وەکوو تارمایی بە ئاستەم بەدی دەکرد. مرۆڤ بە مێردەزمە و تاشە بەرد، بە کەلاک و سێبەر بە شەوەزەنگ تێ دەگەیشتم، ئاخ، لە دەستخۆم بوایە. بەبێ پرسیارکردن ناوی خۆمم پێگوتبان، بەڵام مەخابن بەدەست خۆم نییە و دەنگێک لە هەناو و دەروونمەوە بەردەوام پێمی دەگوت، بێدەنگی هەڵبژێرە، باشترین شت بۆ دیزە بە دەرخۆنەکردنی ڕووداو و ئەهامەتییەکان کەوتنە بن قوڵایی دەریای بێبنە. بە گێڕانەوەی چرکەساتەکانی تەمەنت کە هەمووی کلۆڵییە، زیاتر بەلەنگازتر دەبیت.. بێدەنگی بێدەنگی. ئاخر وەرە تێم بگەیەنە بە ئاشنابوونی ناوی کەسێکی هەتیوی بێسەرپەرشتیکاری ئەخۆشی نابووتی وەکوو من، چیت دەستدەکەوێت؟ ئەوەتا ناوی هەموو هاوڕێیەکانت دەزانی، ئەوانیش ناوت بە جوانی دەزانن، نەك هەر ئەوەندە بەڕێزەوە بە هاوڕێ بانگت دەکەن، لێم گەڕێ چوون لە دنیادا بزر و بێ ناونیشانم، با هەر بەو شێوەیە بمێنمەوە، کەسێک نییە بەدوامدا بگەڕێت، هەتا پێویستی بە ناوم بێت، منیش بەدوای کەسێکدا ناگەڕێم، هەرچی ناوی کۆن هەیە لەبیرم چوونەتەوە، ئەوەی جێگایان گرتوونەتەوە، دووکەڵ، بۆنکڕووز، پێشمەرگە،

برسیەتی، دەرد و بەڵلا، هەڵاتن، خۆ حەشاردان، شریخە و تەقینەوە، دارستان و لێرەواری چڕ، ناوی هەموویان فێربووم. شاهۆ لە دڵی خۆیدا دەیگوت، ئەگەر ناوی تۆم بۆ ئاشکرا بێت، بە هەر بەهایەک بێت، هەرچی بیستوومە دەیزانم، وەکوو تۆ لەبیرم بچێتەوە، دیسانەوە بەختەوەرم. لەبەر ئەوەی زۆر تامەزرۆی بیستنی وەڵامەکەمم، هێشتا دەستم نەکەوتوە، بۆیە بەدەم کەمێک بادانی لووتەباریک و قنجە سپییەکەی، ناوی خۆتم پێ ناڵێی؟ باشە! باوابێت. بەئارەزووی خۆت، ئەوماوە درێژەی چاوەڕوانم کردووە. دەتوانم هەر بەنازە بانگت بکەم. نەک هەرئەو ناوە (نازە) وێردی سەرزاری هەموومان بێت، ناوەکە پڕ بە پێستی خۆتە. دەزانی چەند بە دوای ناوێکدا گەڕاین بۆت! چەند جار لەیەکتری تووڕە و دڵمەند بووین. هەتا بۆ ماوەیەک قسەشمان بەیەکەوە نەدەکرد، بەڵام هەم دیسان دەکەوتینەوە گەڕان بەدوای ناوێکی لایەقی خۆت.. ناردمان لە شار کتێبی ناوی کوردی کچ و کوڕمان بۆ هات، چەندان ناوی تازە و کۆنمان لێنای، کە بە بانگکردن ناوڕت نەدەدایەوە، فەرامۆشمان دەکرد، تاکە ناو کە بە گازکردنی هەڵوێستەیەکی کرد، ناوی نازە بوو، ئەو ڕۆژەی بوو لەسەر زێیە بەسەر کەنارەکانیدا غارتدەدا و سەرگەرمی کۆکردنەوەی سەدەف و گوێچکە ماسی و بە چکە قرژاڵە چاو گەورە و گەشەکان بووی لە لایەك داتدەنان هەتا دەچووی دانەیەکی کە بێنی دوان بەرەو قوڵایی دەریاچە لە کێبرکێ دابوون، بە هێواشی و پارێزەوە دوایان کەوتبووی، بێئاگا لە دوورەوە کۆمەڵە شەپۆلێکی گەورەی سەر شێت لە ناوەڕاستی ئاوەکە بە پرتاو بەرەو تۆ بەڕێوە بوون، سپی سپی دەترووسکانەوە، ئاگات لە خۆت نەبوو، بانگم کردی نازە ئاگاداربە، ئاوڕێکت دایەوە، بەڵام پێلەکان گەیشتنە سەر سەرت و بە خۆیانەوە بەرەو قووڵایی دەریاچە لوولیاندای، هەر ئەوەندەم بۆ مایەوە و پێمکرا، بەجلکوبەرگ و فیشەکدانەوە خۆم فڕێدا ناو ئاوەکە و لە گووره و هاژە و هوژیان ڕزگارم کردی. بۆخۆشی نەیدەزانی چێ دەڵێت و باسی چی دەکات؟ وای هەستدەکرد ئەگەر زوو وەدەنگ نەیەت دەگەڕێنەوە سەردەمی خۆخواردنەوە و بە مەلوولی دامان و دەنگ نەکردن. ئەوەش کێ دەزانێت چەند مانگی دیکە درێژە دەکێشێت؟ دڵم بە بەریەوە ئەماوە پتر چاوەڕی بکەم، هەر ئێستا سەرەتای کۆتایی بزربوونەکەت بێت، بەناو هەموو شوێنێک کەسێک گیاندارێک ئاژەڵێک پەلەوەرێک، تەنانەت مار و مێرووش دەناسرێنەوە.. قسە بکە بدوێ. هەر ئەوەندە گەرمکی بوو، دەنگی

ببیەت و وەقسە بێت، ئەو بێدەنگییەی ئاگرێک بوو، نەک هەناوی شاهۆ، بەڵکوو هەموو پێشمەرگەکانی بەردەوام دەسووتاند. لەوپەڕی شادی و خۆشیدا ئەگەر هەبوویێت، بیریان بەس بەلای ئەوەوە بووە. چیرۆکی ژیانی تەمەن پەپوولەی خۆتمان بۆ باس بکە، خۆ ئەگەرنا ناوی خۆتمان پێ بڵێ، ئەوەتا بۆ یەکەم جار، بەشەرمێکەوە دەڵێت،

ناوم. دەزانی، ناوم چییە؟

ناوی ڕاستەقینەی خۆت نا! بەڵام ناز ناوت نازەیە

نا، ناوم تەوارە!

دووبارەی کەوە، ناوت چییە؟

ناوم تەوارە!

تەوار. ئای لەو ناوە خۆش و دەگمەنەی، چەند ئاسان دێتە سەر زاران، کەس ناوی وای نەبووە. یەکسەر هەڵۆیەکی گەورەی چاو تیژی و چاو زەردی دندووک قولابی هاتەبەرچاو، بە سۆزەوە تەوارە بچووکەکەی بەر سنگی دەخورێنێت و لەبەر جیکەجیکی برسیەتی، واز لەسۆز و لاواندنەوە دێنێت، لە شەقەی باڵدەدات و بە پرتاو هێلانەکەی لە چڵەپۆپەی بەرزترین دارچنار جێ دەهێڵێت بۆ پەیداکردنی نێچیرێك بۆ تەوارە تەنهاکەی، لە ناو هێلانەکەی تەنها لە چاوەڕوانیدایە، نازانێت و بێئاگا لەوەی دایکە هەڵۆ، بووەتە نێچیری کومەڵێك دەعبای شەڕانگێز، زۆر خۆی پاراستووە هەتا بەزووی ئاو و خواردن بگەیەنێتە بەچکە تەوارەکەی، بەڵام هێز و گیانی دڕندەیی دوژمن زۆر لەو بەهێتربوون، پەڕ و باڵ و سەر و مل و سینەیان تێکشکاندووە، بۆخۆی بووەتە نێچیرییان، لەکاتی پارچەپارچە بووندا، بیر و هۆشی هەر بەلای ئەوەدابووە، تەوارە لاوازە زەرنەقووتە بێپەڕوباڵەکەم، چۆنچۆنی بژیت و بەرگەی برسیەتی و هێرشی جانەوەران بگرێت. تەواری تەمەن پەپوولە، پاش نائومێدبوون لەگەڕانەوەی دایکە هەڵۆ، لەبەرزترین تیکەشاخ بە دەم درێژکردنی دەنووکە زەردە نەرمەکەی بۆ خواردن هەڵدەدێرێت و پێش ئەوەی بەکەوێتە سەر بەردەڵانی سەرزەوی یەکەم جار تۆڕی تەنکی چیکڵدانە خالیەکەی دەتەقێت و پاشان ئێسقانە نەرمە وردەکانی وردوخاش دەبن. دەستێکی ماندوو لەرزۆک دەگاتە بەر گەردنە نەرم و شلەکەی و دەربازی دەکات، ئەو دوو دەستەش، شاهۆی پێشمەرگەیە. بۆ خۆدوورخستنەوە لەو خەیاڵانە کە زیاتر ئازاری دەدەن، بە ڕاوێژێکەوە

گوتی: برادەران ئەو کچە شۆخە ناوی تەوارە! نەك نازە. لەمەو دوا قایل نابم کەس بە نازە بانگی بکات، هەتا تەوارمان هەبێت، نازمان بۆچییە! ناوی نازە سڕایەوە و ناوی تەوار جێگای گرتەوە، نازە بە ناز و هەست ناسك و گرینۆکە، بەڵام تەوار خۆڕاگر و جەربەزەیە. لەهەموو لایەکەوە ناوی تەوار دووبارە و چەندبارە دەکرایەوە، زایەڵەی ناوی تەوار لە ناو چیا و ئەشکەوت و دۆڵەکان دەنگی دەدایەوە.. وەکوو ئەوەی پێشمەرگەکان زمانی خۆیان لەسەرناوەکە ڕابێنن، تەوار.. تەوار.. یان حەزیان لە ناوەکەی بوو. زۆریان بەدوای ئەوەدا دەگەڕان بزانن لەمەوپێش لەهیچ کەس بەرگوێیان کەوتووە، یان بەلایەنی کەمەوە ماناکەی بزانن. هەرلەوێ چەند پێشمەرگەیەك گفتیاندا، مەرجە سۆزی پیاوەتی، کچمان ببێت ناوی بنێین. تەوار.. شەش مانگ بوو پێشمەرگەکان لەبەر خۆیانەوە ناویان نابوو نازە، چونکە قسەی نەدەکرد و، ناوی خۆی بەکەس نەدەگوت. هەر پرسیارێکی لێی دەکرا، بە سەرلەقاندن وەڵام دەدرایەوە. ئێستا ئەو سەردەمە بەسەر چوو، هەموو پێشمەرگەکان یەك یەك لە باوەشیان کرد، وەکوو ئەوەی یەکەم جاریان بێت ببیبنن، ئەمن ناوم جووتیارە، ئەوەش بروسکە، ئەوەشیان هیوایە، سەرداریش لەو سەرەوە پاڵکەوتووە، کەمێک نەخۆشە، بۆخۆی دەڵێت چ نییە کەمێک سەرمام بووە، ئەو باپیرە بە ساڵاچووەش دەبینی.. ناوی خاڵە حەمەیە. بەڵام ئاگاداربە خۆی بەمام کۆسرەت ناساندووە. خۆشی پێ گەنجە، پێشمەرگەکان بەگشتی و بەتایبەتی ئەوانەی ژن و منداڵیان بەجێ مابوو، بیری ماڵ و منداڵیان، یادی ئەو ڕۆژانەی لەناو منداڵەکانیان بە گاڵتە و خۆشی بەسەر بردوون، دووبارە بەناوی یەکە بەیەکەی ناوی منداڵەکانیاندا چوونەوە، بزانن کەسیان بیریان بۆ ناوێکی ئاواچووە. هەمووی بە ماڵئاوایی و لێک جوودابوونەوە، بەرەو گەشتێکی قورس و چارەنووسێکی نادیار کۆتایی دەهات، کام دڵ دەتوانێت بەرامبەر پرسیاری سادەی منداڵێک بەدڵێکی پاکژوترسی لەدەستدانی سۆزی باوک، کە لە باوکی دەکات، بابە بۆ کوێ دەچی؟ کەی دەگەڕێیتەوە؟ ئەگەر هاتییەوە چیم بۆ دێنیت؟ ئەوانە و دەیان پرسیاری تر، وەڵامیان نەبوو، کێ دەڵێت جارێکی دیکە لەو گەشتە دوور و درێژە و سەرهەڵگرتنە ناچارییە بەدیداری نازیزانیان شاد دەبنەوە و ڕۆڵە بێنازەکانیان لەباوەش دەگرنەوە، دەڕۆین دیارییەک کە لەهەموو شتێک پیرۆزتر و بەنرخترە، هەتا لە گیانی ئێوە و ئێمە و هەموو کەس، ئەویش ئازادییە، ڕزگاری وڵاتە وەدەست دێنینەوە. بۆیە فرمێسکی

سۆزیان بەسەر تەواردا دەباراند و سۆزی هەموو جگەرگۆشەکانیان دابۆیە. شاهۆ، ئەو پێشمەرگەی هاتەوە یاد نازانێت ماوە، شەهیدبووە، پاڤێل پشدەری کاتێک لێی پرسی ئاستەمترین شت لەلات چی بوو؟ کاتێک لە خانەوەدەکەت دوورکەوتیەوە و ڕووەو شاخ و سەربەرزی بێناوڕدانەوە بەرەو پێشمەرگایەتی هاتی، وەڵامەکەی ئێستاش لە گوێیەکانی دەزرنگێتەوە.. تاقە کچە جگەرگۆشەکەم، تانیە بەدڵێکی ساف و بێگەردی منداڵانەوە لێمی پرسی.. بابە کەنگێ دەگەڕێیەوە؟ ئەو پرسیارە جەرگبڕە ئێستاکەشی لەگەڵدا بێت نەمتوانیوە وەڵامی بدەمەوە. پاش ئەو تاسبردنەوەیە، وەکوو ئەوەی وڕێنە بکات، ئەوە چ ژیر و بەبیریك ئەو ناوەی لێناوە؟ چاوەڕوانی ئەوەیان لە کچە جگەرگۆشەکەیان کردووە، وەکوو تەوارەکان بەهەڵمەت بێت، هەر خۆشی وەڵامی خۆی دایەوە، یان دایکی یان باوکی نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ بیری بەلای ناوێکی شایستەوە سەرقاڵ بووە، بۆیە بەو ناوە ناوزەدیان کردووە. هەستی کرد کیژۆڵە بەو قسەیە دڵگران بوو، ڕەنگی پێستی لە بنچینەدا سپی سپی وەکوو بەفری یەك شەوەی کوێستان، بەڵام لە زۆر شوێن پەڵەپەڵە زەردی پێوە بوو، لە یەك چرکەدا ڕەنگی هێنا و ڕەنگی برد، پاشان سوورهەڵگەڕا.. بەو ڕەنگگۆڕانە شاهۆش سوور هەڵگەڕا و لێوەکانی لەرزین، زمانی خۆی گەست، لەدڵی خۆیدا گوتی، خۆزگە زمانم لاڵ بوایە و ئەو قسەیەم نەکردبایە، هەست و سۆزو خۆشەویستییەکی ئەوەندە کاریگەر بەرامبەری وەهای لێ کردووم، هەرچی دەیڵێم و دەیکەم، بەبێ ویستی خۆمە. بۆ گۆڕینی بابەتەکە و ڕاستکردنەوەی قسەکانی، بەمیهرەبانییەکەوە لێی پرسی. نازیزەکەم، دەزانی تەوار مانای چییە؟ ئەو کەسەی ئەو ناوەی لێتنا، بۆتی ڕوونکردەوە چی دەگەیەنێت، کیژۆڵە وەکوو خووی پێوەگرتبوو بەردەوام ماوەیەك بێدەنگ دەبوو، دیاربوو لە بیرکردنەوەدابوو، بەچاوە شەکەتەکانی وا پێدەچوو پێشتر مانای زانیبێت، بەڵام شتێکی لەوە گەورەتر وای لێکردبێت نەك ناوی خۆی بەڵکوو هەموو شتێکی لەبیر چووبێتەوە، بۆچی ڕێی کەوتووەتە ئەو هەرێمە گڕگرتووە؟ بۆ بەتەنیا ماوەتەوە؟ کوان، کەسوکار و خۆشەویستەکانی؟ ئەو کۆمەڵە ڕیشنە دژوونە کە ناویان پێشمەرگەیە، بۆ داویانەتە ئەو شاخ و کێوە، چی ئەو هەموو میهرەبانییەی پێبەخشیون؟ بۆ وەگیرکەوتنی ئەو هەموو پرسیار و وەڵامە، پێش ئەوە دەبێت، کورترین وشە، سادەترین ناو، وەکوو ڕۆژی یەکەمجار زمان پژانی سەرلەبەر فێرببێتەوە، شەش مانگە بۆ یەك جاریش تاکە وشەیەکی

نەگوتووە. هەتا لەکاتی دەرزی لێدانیش دەمی نەکردەوە ئاخ و ئۆفێك بکات، یان نارەزایی دەربڕێت. هەموو پرسیارەکانی وەکوو ئازاری زامەکانی تەواوی جەستەی خەفەکردەوەو بە پەنهانی ماونەتەوە، چاوەکانی دووردوور دەیانڕوانی، بەو دەشتایی و بنار و چیپای هەزار بەهەزاری کۆسرەتدا دەیگێڕان، لەناو تەمومژو چڕە دووکەڵی ڕەزوباخ وکەلاوە گڕکرتووەکان، نێڵ نێڵ ئاگری دڕووەڵان و چقڵەشینکە و پووش و پەڵاش و جار جارێك چاوی لە کۆپتەر و فڕۆکە جەنگییەکان دەکرد، کە ئاسمانی خۆڵاوی ئەو ناوەیان بەرنەدەدا، بۆ گەشتوگوزار و وێنەگرتن نەدەهاتن، گازی ژاراوی و کیمیایی و مەرگی بەکۆمەڵیان دادەباراند. ئەوانیش ئەوەندە ئەو کارەیان کردبوو، بێزاربووبوون، زۆر جار بۆ خۆشیان نەیاندەزانی لەکوێ، باری قورسی بۆمباکانیان هەڵڕێژن، بەڵام نەك تەوار و پێشمەرگە چاونەترسەکان، بەڵکوو خەڵکی بنار و گوندە چۆڵکراوەکانیش بەدیتنیان دڵە خورپەیان نەدەگرت، ڕانەدەچڵەکین وایاندەزانی چەند کۆلارەیەکی ڕەنگاوڕەنگی منداڵانن، بۆ یاری و سەرگەرمکردن بۆ ساتێک هەڵدراون، پاشان بە داوە دەزوویەکی باریک بەرەو زەوی ڕادەکێشرێنەوە. بەڵکوو بتوانێت لەو هەموو دیمەنانە مانای ناوی خۆی بدۆزێتەوە، چونکە هەست و نەستی پێی دەڵێن لێکدانەوەی ناوەکەت لێرە دەدۆزییەوە. بەڵام لەو ملیۆنان ناوانە کامەیانە، پاش ئەوەی بێ هیوابوو لە مانای ناوی خۆی، سەرێکی بادا، نازانم، لەبیرم چووەتەوە. شاهۆ چاوەڕوانی ئەو وەڵامەی دەکرد...

تەوارگیان. ئەو کەسەی ئەم ناوە جوانەتی لێناوە، زۆر شارەزا بووە، ناوی نێر و مێ و بێگیانی بە باشی ناسیوە و لێکی جوداکردوونەتەوە... ئاخ! خۆزگە بۆ یەکجار بە دیداری شاد دەبووم، من دەزانم تەوار بەچکەی (مێیەی هەڵۆیە). ئەوەش دەزانم، کە تۆ کچێکی ئازای، بێباکی، بەرزەفڕی وەکوو هەڵۆ چوون بەس لەبەرزایی دەژیت، زۆر جار بە ئاسمانی ئەو ناوەدا هەڵۆ لە تاقی ئاسمان دەفڕن، بەڵام لە سەردەمی بە ژاراوی بووندا نا، با تەمومژ بڕەوێتەوە، ئەوجار تەوارەکان بە شاباڵە گەورە ڕەنگاوڕەنگەکانیان دەبینی، چۆن لە ئەشکەوتەکانەوە بەئاسمانی ئەو بیتوێنەدا بەرزەفڕ لەشەقەی باڵدەدەن، تەوار و بیتوێن، یان بیتوێن و تەوار دوو شتی لێک جیا نەکراومن.

هەردووکیان بێدەنگ بوون، وادیار بوو هیچیان حەزییان نەدەکرد خۆیان لەبابەتی تر بدەن، بۆیە چاویان بەدوای پێشمەرگەکاندا دەگێڕان، لەوناوەی

بڵاوبووبوونەوە. لەناو پێشمەرگەکان یەکێکیان لە هەموویان بەتەمەن تربوو، وەکوو چۆن شاهۆ پێی ناساندبوو ناوی خاڵە حەمە بوو، خەڵکی بناری کۆسرەت بوو، لە خۆشەویستی چیاکە ناویان نابوو مام کۆسرەت، مام کۆسرەت درەنگ هەستی بەو شتە نوێیە کردبوو، بەهەنگاوی گەورە گەورە، بەرەو لای هات، هەر لەدوورەوە کەوتە لاواندنەوەی.. تازە بیستم ناوت تەوارە.. بەچکە شێرەکەم، کیژە تاقانە ژیر و مەندوو مەستوورەکەم. لەمن لاوک و حەیران لەتۆش تریقە و خنینەوە. پڕ بەگەرووت پێکەنە، ئەو ناوە پڕکە لە قاقا، بۆساتێکی باش لاواندیەوە ئەو ڕوژەی بە هەموو ئەهامەتیەکانیەوە، بە خوشترین ڕۆژی تەمەنی تێدەگەیشت.، مام و لەناو ئەچووم، هەتا گوێیە کپەکانم بە ناوەکەت زرینگانەوە، ئای چی باپیرەیەکی بە ختەوەرم، بێدەنگ بوو ڕوومەتە خڕو تووکنەکەی لەبەر ئاگرەکە ئەوەندەی کە خرپنتربوون، ئەو چرچولۆچی ڕووخساری لە ماوەیەکی کورت ئەمان و ڕەوینەوە، کۆنە پاڵتۆ بێ ڕەنگەکەی لەبەر کردەوە، لەسەر ئەرمەگیا تەڕ و سەوزە شێلدراوەکەی ڕاخست، بنباڵی تەواری گرت و لەسەر پاڵتۆکە داینیشاند و بە جوانی لایەکی بەسەر پشتیدادا، بخەوە کیژە خۆشەویستەکەم، پشوویەك بدە، دەگەڕێمەوە لات. پاشان بە مەلوولیەکەوە لە پێشمەرگەکان دوور کەتەوە، ماوەیەك بەچواردەوری خۆیدا ڕوانی لەسەر بەردێک دانیشت و مێزەرەکەی سەری داگرت و دەستی بەقژ و ڕیش و سمێڵە پرە سپیەکەیدا هێناو بانگی پێشمەرگەکانی کرد. وەرن لێم خڕببنەوە! هەموویان بەپەلە بەدەم بانگەوازەکەیەوە چوون، لە دەوری کۆبوونەوە. تەنها شاهۆ نەبێت. بە بست لە تەوار دوور نەدەکەوتەوە، هەر چەندە لە هەموویان ڕوونتر گوێی لە مام کۆسرەت بوو، بەڵام وەسەر خوێی نەهێنا، بەشکەم ئەوئەگرێتەوە، بانگی کرد شاهۆ گیان، ئەتۆش هەتا ئێرە وەرە.! گەنجە باڵابەرزە ڕیش و سمێڵ زەردەکە، بە چەند هەنگاوێك هات، پێش ئەوەی بگاتە لایان، هەڵوێستەتەکی کرد، بەگورجیەکەوە گەڕایەوە، دەستی دا چەکەکەی، کە لە تەنیش تەوار بە بەڕدێکی هەڵپەساردبوو، دووبارە تەواری ماچ کرد. دڵ لەدڵ مەدە شازادەکەم، ئەوەندەم پێناچێت، ئێستا دەگەڕێمەوە لات، هەتا ئەو دەمی دەتوانی پشکۆکانی ئاگرەکە بگەشێنیەوە و باش باش خۆت گەرم کەیەوە، بەڵام ئاگادار بە ئەسووتێی. ئەگەر حەزیش دەکەی گوێبیستی قسە خۆشەکانی مام کۆسرەت بیت، دەتوانی لەگەڵمدا بیت، بەڵام بەسەر هەژاندنی تەوار زانی حەز ناکات بەشدارییان بکات، چونکە بە

کۆبوونەوەیەکی پێشمەرگانەی تێدەگەیشت، با بۆ ماوەیەک لەو نیگایان دوورکەوەمەوە و لەگەڵ خۆمدا بژیم، شاهۆ زانی مەیلی نییە و ئارەزووی تەنیایی دەکات، بۆیە بە تەنیا جێیهێڵا، دووبارە گەڕایەوە ناو هاوڕێیەکانی، هەر هەموویانی بە سەر دەکردەوە، لە ڕەنگ و ڕوویان خوشحاڵییەکی بێئەندازەی بەدی دەکرد.

لەبەرامبەر مام کۆسرەت لەسەر بەردێك دانیشت، لەبەر ئەوەی کەس هیچی نەدەگوت، هەستی کرد شتێکی تازەی گرنگ هەیە و ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەوەوە یان بە تەوارەوە هەیە.. بۆیە حەزی دەکرد هەرچی زووە، گوێبیستی هەواڵی نوێ بێت، چاوەڕوانییەکە درێژەی کێشا، ڕووی لە مام کۆسرەت کردو بە ئەدەبێکەوە گوتی، فەرموو مام کۆسرەت، هیچی تازە هەیە؟. ئەو کۆبوونەوە لەناکاو لەو شوێنە بە خۆڕایی نییە، ئەگەر نا خۆتدەگرت هەتا دەگەیشتینەوە بارەگای کەڵە مێوێ، بەهەرحاڵ دڵمان لەلاتە و گوێیەکانمان بۆ بیستنی قسەکانت لە خزمەتدان. کاتێک دیتی بزەیەکی خۆش کەوتە سەر ڕووی هەموو پێشمەرگەکان بە مام کۆسرەتیشەوە، کەمێک خۆشحاڵ بوو. مامەش بەکاوەخۆ، توورەکەیەکی ڕەشی لەبن پشتێندە چڵکنەکەی دەرهێنا زاڵکەکەی کردەوە و دەستی هەتا بنی برد، وەکو ئەوەی لەناو جەواڵێکی قووڵ بە دوای شتێکی بچووکدا بگەڕێت، ماوەیەك دەستی بە ناودا گێڕا هەندێک خڵتە و خۆڵی پاشماوەی توتنی دەرهێنا و لەسەر پەڕە سیغارێکی دانا و کەوتە پێچانەوەی، وەها بەوەستایانە و لێزانانە بڵاوی دەکردەوە، وەکو ئەوەی دانە و گەرد و پاشماوەی گەوهەر و تەلابن و نابێت تۆزەکەشیان بە بابدرێت. سەری زمانی زەردهەڵاتوو و بەڵغگرتووی بەپەڕە سیغارەکەدا هێنا و پێچایەوە، هەموو پێشمەرگەکان بە تامەزرۆییەوە لەوکاتەیدا سەرنجیان تەنها لەسەر قامکە درێژە دەماراویە وشکهەڵاتووەکانی مامەی بەساڵاچوو بوو، بەبیری پەرتەوازەشیان ئەندێشەکانیان خستبووە سەر ئەو بیرۆکانەی لە مێشکی شەکەتی ڕدێن سپییەکەیان دەخولایەوە. داخوا ئەو کۆبوونەوە سادە و ساکارە و لەو شوێنە مەترسیدارە و بەو کاتە درەنگ وەختە، چاوەڕوانی پێشهاتێکی گەورە دەکرێت. ئەگەر نا تەنها یەک کاتژمێری دیکە خۆیدەگرت، کە دەگەیشتنەوە بارەگا، لەوێ پشوویەکی باشیان دەدا و هەموو شتێک ڕوون دەکرایەوە. ئەویش پێش ئەوەی بە شخارتە تەڕەکەی دەستی گڕی بدات، چاوێکی بەهەمووواندا گێڕا، سیغارەکەی بەرەو پێشمەرگەیەک ڕاداشت، کە

له تەنیشتیەوە بە نیمچە ڕاکشانەوە، پەتوویەکی کۆنی کوونکوونی سەوزی سەربازی لەخۆیەوە لوولدابوو، بۆنی شێ و بۆنسۆ و خوێن و مەرگی لێدەهات، بە ڕەنگی بزرکاو و پفکە و سوورەکوانی دەموچاوی هەڵاوساوی، نەیانتوانی بوو گەندەمووەکانی لاڕوومەتی، تیلم تیلم پێستە هەڵوەریوەکەی دابپۆشن، هەتا بچووکترین جووڵەی چاویشی زۆر ئەستەم و لەسەری دەکەوت.. بزە بەردەوامەکانی بۆ ئەوەبوون، هاوڕێیەکانی دڵنیا بکاتەوە هێشتا ماوم و باشم، بەڵام هەناسە قووڕسەکانی تێکەڵ بە سیخەسیخی سینگی ئارەقەیەکی خەست تەواوی دەموچاوی داپوشی بوو، دیار بوو نەخوشیەکی کاریگەری هەبوو، بەڵام وەسەرخۆی نەدەهێنا و وانیشانی دەدا هەروا بە بێتاقەتی ڕاکشاوە و بەهیچ کلۆجێک دەربەست نایەت، سەرما و کڵۆڵی و برینداربوون و نەخۆشی بۆ ئەو، هەر بە ناو هەن و ناتوانن خۆیان لە قەرەی ئەم بدەن. لەبیران ڕاچووبوو بە دەنگی مام کۆسرەت وەئاگاهاتەوە. ها هاوڕێ سەردار ئەتۆ ئەو سیغارە بکێشە، ئەوڕۆ ئەوەندەم کێشاوە ناو سنگم وەکو فەردەخەڵووزی لێهاتووە. سەردار سەرێکی بەرەو هاوڕێکەی بەرزکردەوە، ئەك سمێڵە پرەسپیەکەی بەڵکو برۆ ئەستوورەکانیشی بە دووکەڵ و نیکۆتین زەردبووبوون. ئەویش بەبێ ئەوەی هیچ خۆی تێکبدات، سیغارەکەی لەدەستی وەرگرت و گرپیدا، بە دەم مژلێدان و کۆخەکۆخەوە ویستی شتێک بڵێت، هەر ئەوەندەبوو بەلێشاو دووکەڵ لەدەم و لووتی دەهاتە دەرێ و کۆخەکەی بەهێزتر دەبوو، ڕووخساری سوورتر هەڵدەگەڕا. شاهۆ سێغارەکەی لەدەستی دەرهێنا و سەری مەتارەکەی کردەوە، چەند قومە ئاوێکی بەدەمیەوە کرد، ئارامبە هاوڕێ! بە پشتێندەکەی ئارەقەی ڕووخساری سڕیەوە، دووکەڵ و جگەرەکێشان بۆ تۆ باش نییە. جارجارەش مژێکی لە سیغارە ورگ ئاوساوەکەدا دەدا، ئاە، بەڕاستی ئەو تووتنە کوردکوژی تەواوە. . زۆربەی پێشمەرگەکان حەزییان دەکرد، لەو کوردکوژە چەند ئەفەسێکی بەدڵی خۆیان هەڵکێشن. بەڵام بەشی نەکرد. مامەی بە سالاچوش. توورەکەکەی بە خاڵی لەبەر پشتێندی ڕاکرد و لەسەرخۆ کەوتە قسەکردن، ویستی ڕاستەوخۆ بچێتە ناوبابەتەکە، بۆیە گوتی نازانم ئەوڕۆ بە ڕۆژێکی تایبەت بشوبهێنم، ئەوەندە کەیفسازم هەر مەپرسن، وا دەزانم تازە لە داکی خۆم بووم، هیواو ئەمەلێکم هاتووتەوەبەر، ئەویش سەبارەت بە چاوی ئەو کیژۆڵەیە، بەڵام بۆیەش کۆمکردنەوە سەریەك، لە ڕێگا چارەیەك بگەڕێین، بە چاوی خۆتان دەبینن، ئەو

هەموو بۆردوومان و کیمیایی بارانە، چەند ڕۆژە بێ پسانەوە وا بە خەستی دەکرێت، تەڕ و وشک بەیەکەوە دەسووتێت. نیشانەی ئەوەیە، دوژمن بە تەمای هێرشێکی زۆر گەورەیە، هەروا لە چوار دەورمان هێز کۆدەکەنەوە، بەتەمای هێرشێکی سەرتاسەری یەکجارەکین، وا دیارە هەر بۆ ئێرەش نییە، بارودۆخی هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی پێشمەرگە حاڵیان لە حاڵی ئێمە باشتر نییە. ڕۆژانە لەهەموو لق و بەتالیۆن و بارەگاکانی دیکەوە هەواڵمان بۆ دێت.. دەنگوباسی هەر هەموویان دەزانین. وابێ دەچێت ئەوانیش ئاگاداری بارودۆخی ئێمەبن، زۆر جار داوامان لێدەکەن بۆ یارمەتیی و پشتگیریمان هێز ڕەوانە بکەن، بەڵام ئەو ناوچەیە هەر ئەوەندەی پێویستە، لەلایەك خۆراك و خواردەمەنی کەمە، لە لایەکی دیکەشەوە، هێرشی زۆر دەکرێتە سەری، ئەگەر بێت و ژمارەی پێشمەرگە زیاتر بکرێت، حەوانەوە و شاردنەوە و ئیدارەدانی قورستر دەبێت و قوربانی دانی زیاتر دەبێت، ئەوەندەی لێرە هەین، وەکو پێشمەرگە دەربەست نایەین، خۆمان ئامادەکردووە و شەڕی مان و نەمان و دەستە و یەخەیان لەگەڵ دەکەین. بڕوام زۆر بە هێز و بازوو ووره و خۆڕاگری و قارەمانی هەر هەمووتانە، ڕۆژی لەوەش سەختتر و دژوارترتان دیتوە، کەمێک بێدەنگ بوو، وەکو ئەوەی بزانێت هەتا ئێرە کەسێک بەرپەرچی دەداتەوە، زانی دەنگ نەبوو، بەردەوام بوو. ئەوەی بیر و هۆشی منی کرۆژتووە، وەرن با هەرهەموومان بیرێك لەو کچە بەستەزمانە بکەینەوە. ئەوە چەند مانگە لەگەڵمان هەر ئەو کونە شاخ و دۆڵێەتی، زۆر نارەحەتی و برسیەتی و دەردەسەری چێشتووە، گەر وا بڕوات لەماوەیەکی کەم دەبێت لەو ناوە دوور کەوینەوە و. ئەوەی زۆر هیلاکە یان بریندارە، بەتەمەنە نەخۆشە، دەبێت بەرەو قەندیل پاشەکشێ بکات، سەفەرێکی زۆر دوور و سەخت دەبێت، چەند پێشمەرگەیەکی بە توانای گەنجی وەک خۆم، دەنگی پێکەنین ماوەیەک بێدەنگیان کرد. بە شێوەی دەستەیەکی پارتیزانی دەمێننەوە. ئەوەی نارەزوو نەکات، یان لەخۆی ڕانە بینێت، بە زۆرەملێ نییە، دەتوانێت بڕوات کەسیش سەرکۆنەی ناکات. چونکە بارەگا و شوێنی تایبەت نابێت. باقیکە دەڕوات، هەتا بارودۆخەکە کەمێك ئەهوەن دەبێتەوە. لەساڵی شەست و سێوە لە وەتای بوومەتە پێشمەرگە، زۆر سەرکەتن و تێکشان و نووشستی و هەتا نسکۆشم بە چاوی خۆم دیتوە و لەگەڵی ژیاوم، بەڵام کارەساتی ئەو جارەیان زۆر گەورە دەبێت و هاوشێوەی نابێت.. ئەنفال لەڕەگوڕیشەوە هەڵیکەندین،

لێرەدا چارەنووسی ئەو کیژۆڵە چی بەسەر دێت؟ قەت باوەڕناکەم کچێکی هەشت نۆ ساڵە بەو هەموو دەرد و نەخۆشی و برینە قورسانەوە، لەهەقی ئەو سەفەرە دوورو درێژە بێت، کە بەلایەنی کەمەوە سێ مانگ ڕێگا دەبێت. بەرەبەرە چاوەکانی شلویترو دەنگی کزتر دەبوو. بۆدڵنیاکردنەوەمیان، دەبێ وەکوو چاوی خۆمان بیپارێزین، دەستی بۆ چاوەکانی بردن و تەڕاتیبکەی لابردن و ڕێگای نەدا چیدیکە ڕۆندکی تازە و نوێ جێگایان بگرنەوە و هاوڕێیەکانی هەستی پێبکەن. بەدەنگێکی پڕ بڕوابەخۆبوون، تەواو جیاواز لە چەند چرکەیەک لەمەوپێش. وەکوو ئەوەی ئەو ساتە کەمە هێزێکی دەرەکی پاڵپشتی کردبێ. ئەگەر هەر هەموومان لەناو بچین ئەو کیژۆڵە دەبێ سەلامەت بێت و لە ژیاندا بمێنێت. ژیانی ئێمە گرنگ نییە، مانەوەی ئەو مەبەستە. چونکە بۆ خۆتان دەزانن، زۆر منداڵە و بە مەزەندەی من هەر هەشت نۆ ساڵێك دەبێت، پاشان لە خاو خێزانەکەی هەر ئەویان ماوە شەو و ڕۆژ لەگەڕان و پرسیار کردندا بین هەتا کەسێکی غەمخۆر دەدۆزینەوە و ڕادەستی دەکەین. ئەمن بۆ خۆم ئەوەم بەسەر هاتووە و دەزانم دوور کەوتنەوە و لەدەست دانی خاو و خێزان چەند دژوار و ئەستەمە، با بەسەرهاتێکی کورتی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە، لەوانەیە هەندێکتان ئەوەتان بیستبێت، بەتایبەتی هاوڕێ شاهۆ و جووتیار.. پاش ئەوەی ماوەی سێزدە ساڵ لەماڵ و منداڵ دابڕام، بە هۆی ژیانی سەختی پێشمەرگایەتی هیچ جارێک بۆم نەکرا سەردانی ماڵێ بکەم، ئەوانیش بۆیان نەلوا بێنە لام، جار جار نامە گۆڕینەوە هەبوو، شێوە و تەمەنی منداڵەکانم تەواو لەبیر چووبووەوە. ڕۆژێکیان کوڕێکی لاوی قشت هاتبووە بارگاکەمان وام زانی بۆ پێشمەرگایەتی هاتووە، هەموویان لێیان پرسیم ئەو کەسە دەناسی، هەر چەندی لێی وردبوومەوە، هەستم کرد ئەو گەنجە یەکەمجارمە ڕووبەڕووی دەبمەوە.. هەر پرسیاری ناو و تەمەن و لەکوێوە هاتووە، بەتەمای چییە! دەنگێک بە ئەدەبەوە قسەکانی پێ بڕی و تێکەڵ بە پێکەنینەوە.. باب و کوڕ لە یەکتریان دەپرسی برا ئەتۆ خەڵکی کوێی، هاوڕێ جووتیار گیان، ناهەقمان نەبوو یەکتر نەناسینەوە، ئەو فیلمەش ئەتۆ و ئەوانی کە ڕێکتان خستبوو.. هەتا باوەشی پێدانەکردم و هاواری نەکرد: بابە نامناسیەوە؟ نەمزانی ئالانی کوڕمە، ئەوجار زانیم چەند ساڵە و، ئەو ماوەی لەخێزانەکەم دابڕاوم سێزدە ساڵ بووە. ڕۆژێک دادێت ئەو کچە داماوەش بە کەس و کاری شاد دەبێتەوە، خۆ ئەگەر هاتوو ئەمان توانی بیپارێزین و لەناوچوو، کەواتە ئەو

بنەماڵە ون و بزرە کە هیچی لەسەر نازانین بە یەکجاری مەفح بوونەوە، شەرمەزار و ڕووزەردی بەردەمی هەموو کەس دەبین، چۆن دەتوانین و لەڕوومان دێت، تەماشای ناوچاوی خەڵکی بکەین. لە هەمووی ناستەمتر چۆن دەتوانین ناوی پێشمەرگە و وڵات و میللەتپارێز هەڵگرین. خۆ ئەگەر پێشمەرگایەتی ئەوەندە کارێکی ئاسان و ئەرکێکی ئەوەندە سادەبوایە، هەرکەس چەکێکی لەشاندەکرد و ناوی لەخۆی دەنا پێشمەرگە. ئەوەتا فەرموون چەند هەزار پێشمەرگەیەک بەرامبەری چەند ملیۆنێک جاش و جەیشی شەعبی و سەرباز و مغاویر و فیدای سەدام و چوزانم هەزار جۆر جروجامش. ئەو هەموو ناوە بەکێ لەبەر دەکرێن، دەبنەوە. هەر ئەوەندە دەزانم دوژمنێکی سەرسەخت و خوێنمژ لە پێشمانە، ئەوەندەمان لەسەرە هەتا دوا تنۆک خوێن شەڕ بکەین و بجەنگین. هەر هەمووتان گفتم بدەنێ ژیانی تەوار لەپێش مەرگی خۆتانەوە بێت. ڕووی وەرسووڕاند، بە بێ ئەوەی تەماشای شاهۆ بکات، کە لەبەرامبەریەوە لە بیران ڕاچوو بوو. هەتا دوێنێ پشووم بە ماڵی مامی گەورەمان، مام لالۆ خۆش بوو، بە پەناگە و جێگایەکی باشم دەزانی، هەم چاودێرییان دەکرد و سەرپەرشت و پەروەردەیان دەکرد، هەمیش برینەکانیان سارێژ دەکرد، لەلای مام لالۆ دەرمانی هەموو برینێک سووک و قوڕس و دژوار وەچنگ دەکەوێت، لە دڵەوە حەزمدەکرد ڕادەستی ئەوانی بکەم، کەچی ئەوانیش داخەکەم! سەری خۆیان هەڵگرتوو بە نیوەشەوێ بەبێ هەست و خوست، هەتا مارو مێروکە بەسەر زەویدا دەخشێن، دەنگیان نەبێت خشپە خشپێکیان دێت، کەچی ئەوان ئاوا بێ شوێنەوار لەوناوەی دوورکەوتنەوە. هەتا چاویان بەرایی نەدابن بێن و خوداحافیزیەکی گەرممان لێ بکەن، دەیانزانی دنیا مردن و ژیانە، کێو بە کێو ناکەوێتەوە، بەڵام چاو بە چاو دەکەوێتەوە، بەهەرحاڵ، من دڵمەندنیم لەوان، ئەوە ژیانی خۆیانە و ئازادن، لە کوێ، چۆنچۆنی ژیان دەبەنە سەر؟ بەڵام ئەوەی من لالۆ بناسم هەر وا بەئاسانی دەستبەرداری ژیانی ئێرە نابێت، ئەگەر لە گیانی خۆشی نەترسێت ئەوە بیرێک لە سەلامەتی و داهاتووی ئەوەکانی دەکاتەوە. هەستی بە مەترسیەکی گەورە کردەوە. بار و دۆخێک لالۆی نە بەگەنجی نەبە پیری ناچارنەکردووە سەری خۆی هەڵگرێت. با ئەوەیان بۆ ڕۆژانی داهاتوو لێگەڕێین. لەسەر مەسەلەی ئەو شتانەی کە باسم کردن. ها هاوڕێ شاهۆ ئەتۆ دەڵێی چی؟ شاهۆ بەدەم شێلانی سینگیەوە، وەکوو ئەوەی ئەک خۆی بۆ وەڵامی ئەو شتانەی هورووژان و باس

کران، ئامادە نەکردبوو. بەڵکوو واپێدەچوو هەر قسەیەک دەبێت، چاوەڕوانی وەڵامی ناکرێت. بۆیە بە پچڕ پچڕی گوتی. ڕاستی لەگەڵ گلەیی و گازەندەکەت دانیم دەرهەق بە مام لالۆو خانەوادە شەڕەفمەندەکەی، چونکە بۆ خۆت مامەی بە ساڵاچوو دەناسی، دەبێت شتێک لەوە گەورەتر لە گۆڕێ بێت، هەتا بە خاو و خێزانەوە ئاوا بەپەلە و لەناکاو سەری هەڵگرتووە، سەرکۆنەکردنەکەی تۆش دەرهەق بەوان زیاتر لە وەفاداری و خۆشەویستییەوە هاتووە، ئەوەندەش بەسە دەڵێی چاویان بەرایی نەداوە بێن و ماڵئاوایی لە پێشمەرگە و بنار و چیای کۆسرەت بکەن، پاشان بە مەنزووری من ئەوە ژیانی خۆیانە و بۆ خۆیان لێی سەرپشکن بۆخۆشت گوتت، لە کوێ و چۆنچۆنی بەسەری دەبەن. لە شتێک دڵنیام ئەوەندە تەمەنەی مام لالۆ ماوە، جێگای داخە لەماوەیەکی کورت بە هۆی بەساڵاچوون و پیرییەوە ماوەتی لەهەر شوێنێک بێت، وەکوو جەنگاوەرێک و کوردێکی خاکی و دڵسۆز دەمێنێتەوە. لەسەر مەسەلەکانی کە ئێوە چی بە باش دەزانن وابکەن. جار جارێك ئاوڕی بەلای تەواردا دەدایەوە. نیگاکانی ئاگرێک بوون و دەیانی سووتاند، ئەوەی دەیگوت، بێپەروا و بێ مەبەستێکی ڕوون دەیگوتن. واپێ دەچوو حەز نەکات بە سات و چرکە و بەبست لەتەوار جودابێتەوە و ئێشکگری بێت، هەموو دەمێک لە ئامێزی بێت و هەناسەکانیشیان تێکەڵ بین. ئەویش بە دوو چاوی پڕ گومانە چاودێری دەکردن، بۆ تەفرەدانیان، جار جارە سەرێکی بەلای دەریاچەدا دەسووڕاند، کاتێک مام کۆسرەت دەئاخافت تەماشای دەمی دەکرد، لەگەڵ شێلانی سینگی شاهۆ ئەویش سینگی خۆی دەشێلا. لەبەر دووری ماوەی نێوانیان و هاڕە و گرمەی تۆپ و کۆپتەرە ئەگریسەکان، باش گوێبیستیان نەدەبوو، لەپستە پستەکەیان تێ نەدەگەیشت، بەڵام لێی ڕوون بوو باسی ئەو دەکەن. شاهۆ وەکوو هەموو جارێک هەر ئەوەندەی دووبارە و سەدبارە دەکردەوە، بەڕاستی بەرپرسیارییەکی زۆر گەورەودژوارە، ناتوانین هەروا بەئاسانی دەستبەرداری بین، هەتا ئەو ڕۆژەی کەسێکی دڵسۆزی نزیکی خۆی ئەدۆزمەوە، دڵم ئاوناخواتەوە و لەهەوڵ و گەڕان و پرسیارکردن ناکەوم. ڕادەستی کەسی ناکەم، بەیەکێک لەهەرە ئەرکە پیرۆزەکانی خۆمی دەزانم، هەتا دوا هەناسەم بۆ تەواری تەرخان بکەم، یان پێش ئەو لەسەر چارەنووسی ئەو دەکوژرێم یان بەسەلامەتی دەیگەڕێنمەوە باوەشی کەسێکی دڵسۆزی. نازانم دەتوانم ئەو قسەو گفتانەم بەجێ بگەیەنم، نازانم هەوڵدەدەم، خۆ

تەنیاش نیم، لە دڵسۆزی هەمووتان بەرامبەر تەوار بێگومانم، لەسەر مەسەلەی هێز کۆکردنەوە، ئەوە پەلەقاژەی مەرگیانە، لەدوورەوە کیمیایی و چەکی قورس تاقی دەکەنەوە، ئەگەر ئەوان نەهاتن و هێرشیان نەکرد، ئێمە دەیکەین. بەدرێژایی ژیانیان ئەوان خۆیان پەنا داوە و ئێمە هێرشبەر بووین. ئەوان نێچیرێکی تۆقیوی سەر لێشێواو ئێمە ڕاوچیان بووین. دەنگی هەموو پێشمەرگەکان بەسەرداری پرزەلێبڕاوەوەش بەیەکدەنگ، مەرگمان پێش مەرگی تەوار دەکەوێت. شاهۆ لە خۆشیان و لەپەشێویان لێوە تەنکە پەمەییەکانی دەلەرزین.. مام کۆسرەت گەڕێکی خواردەوە و چەند شتێکی تازەی خستە سەر قسەکانی، بەردەوام بوو. قسەکانی کەمێک لەمەوپێش هەمان بیروبۆچوونی تۆ و ئەو هاوڕێ قارەمانانەبوون، هەریەکەیان بۆخۆیان کێوێکن لە خۆڕاگری. ئەوەی من دەمەوێت بیڵێم دوو ڕێگامان لەپێشە، هاوڕی سەردار بۆ خۆتان دەزانن تەندروستی زۆر خراپە، ئەوەتا بە چاوی خۆتان دەیبینن. سەردار لەژێر پەتوومکەی هاتە دەرێ و وەکوو ئەوان بەچیچکان دانیشت.. تکادەکەم زۆرباشم و کەڵکی شەڕم پێوە ماوە. بەیەکجاری لەهەموو شتێک دوورم مەخەنەوە، لەپەلوپۆ نەکەوتووم. مەسەلەی چوونە ناوشار بۆ ماوەیەکی کورت، بۆ چارەسەربوو، بەڵام دەبینم ئەرکێکی لە تەندروستی من لە پێشتر هاتە پێشێ.. مام کۆسرەت دەستێکی لەسەر شانی دانا، هەر چەندە لەمەو پێش هیچ ئەو شتەم لەگەڵدا باس نەکردەوە. دەتوانێت کاتێك برادەرانی شار هاتن بە شوێنیدا، تەوار لەگەڵ خۆی بەرێت. سەردار لەبەر خۆییەوە سەرێکی قایل بوونی هەژاند. یان دەتوانین بۆنەوەی لەبەر چاوی خۆشمان بێت. لە شووشکەی زرار و ژنەکەی لەوێ دەژین وەجاخکوێرن و منداڵیان نییە، دەتوانن تەواری بکەنە کچی خۆیان، هەرچەندە بۆخۆشم زۆر حەز لە سەر و بیچم و خوڕەوشت و چارەی نەگریسی زرار ناکەم، لەهەمووتان باشتر زراری دەناسم و لە دڵەوە دەیبوغزێنم، بەڵام خانزادی خێزانی بەس بە ناو ئافرەتە، شێرەژنێکی هەلکەوتووە، پێشمەرگەیەکە بۆخۆی، باوەڕم وایە وەك منداڵی خۆی بگرە باشتریش بە خێوی دەکات. بە بڕوای من لەلای ئەوان بێ ژیانی پارێزراو دەبێت. دەڵێن لە سوێی منداڵ، خانزادخان بەردەوام بووکەڵە و مەلۆتکەی لە پەڕوپاتاڵ درووستکراو، لە هامێز و باوەش دەگرێت، بەدەم ڕاژاندنیانەوە لای لایە و سەر دوولکەیان بۆ دەڵێت. شاهۆ هەتا ئەو کاتە بێدەنگ بوو، کەسێك ئاوا تامەزرۆی منداڵ بێت بۆچی منداڵی نابێت، دەهاتە بەرچاوی، کە

تەوار ببێتە کچی خانزاد، چۆن شاگەشکە دەبێت و وەکوو ڕۆڵەی خۆی هەلسوکوتی لە تەکدا دەکات، ڕۆژانە پۆشاکەکانی دەگۆڕێت. دەستێك جلکوبەرگی کچانەی بۆ دەدوورێت، بەردەوام دەیشوات و بسك و کەزییە زێڕینەکانی شانە دەکات، شەوانە لە باوەشی خۆی دەیخەوێنێت، بە ماوەیەکی کورت هەموو زامە جەستەیی و دەروونییەکانی سارێژدەکات، هەرچەندە تەمەنەکەی هی ئەوە نییە، بە یەکجاری هەموو شتێك لە بیر بکات و ئەوەی هەیبوو لە دەستیدا ڕۆیشت، جارێکی دیکە بە خەونی شەوانیش نابێتەوە میوانی، زۆر ناستەمە، بیری منداڵ ئەوەندە تیژە، هەتا سەردەمانی گاگۆڵە و گرووگاڵ بڕ دەکات. ئەوە وایە، بەڵام خانزادەخان ئەوەندە وریا و تامەزرۆی منداڵە وادەکات کەسوکاری لە ناوچووی بە زوویی فەراهەم بکات. ئای خانزاد! چی بیرۆکەیەکی ناگراویت لە ژێر سەردایە. بزە دەیگرت، چاوەکانی لە بەختەوەرییان وەکوو تریفەی مانگ دەترووسکانەوە و شادی و ئارامییەکیان بە خۆوە دەدیت، بەڵام بە ناو هێنان و گوێبیستبوونی ناوی زرار، زۆر پەست دەبوو، کونە لووتە باریکەکانی لەتووڕەبوونیان، ئەوەندەی دیکە باریکتر و تەسکتربوونەوە. دیاربوو زۆری لەدڵدابوو بەرامبەر بە نەتوارە ناشیرنەکانی. مام کۆسرەت، ئەتۆ بەڕاستە زراری چی، هەموو کەس دەزانێت لە پێناوی هەوەسبازی خۆی لە بۆ ژنێك، کابرایەکی بێتاوانی کوشت، خوێنی کەسێکی بە ناهەقڕژاوی دە ئەستودایە، هەرچەندە ئافرەتە گوناحی نییە و لە جیاتی خوێندراوە، کابرای کوژراو بەبێ ئەوەی هیچ خراپەی زراری هەبووبێت. خانزاد ئافرەتێکی بێچارەی دیلی دەستی کۆمەڵگایەکی نێرینە و پیاوسالاری بێبەزەیی و چەوسێنەرە، وەکوو هەر مێینەیەکی دیکەی ئەو وڵاتە. کاڵایەکە و بەبێ پرس پێکردنی سەودا و کڕین و فرۆشتنی پێدەکەن، کەس لێیان ناپرسێت هەتا لە مەسەلەیەکی چارەنووسسازی وەکوو هاوسەرگیری بۆیان نییە بیروبۆچوونی خۆیان بڵێن.. کەسێکی کەللەپووتی وەکوو زرار، ئەگەر نەك پیاو، مرۆڤ بوایە ئەو کارەی نەدەکرد. ئاخ ئەگەر بەدەستی من دەبوو ئەو جانەوەرە لە شوێنی کوژراوەکە بە سزای خۆییم دەگەیاند. حوکمی دادپەروەریم بە جێدەگەیاند، دەمکردە پەندی زەمانە، بۆ ئەوەی بۆ هەموو خەڵکی دیکە بووبا بە دەرس، بەڵام دەڵێی چی؟.. دەست بۆ هەرچی درێژ دەکەی، وەکوو فیشەکە شێتە بە ڕووتدا دەتەقنەوە، برا، ئەتۆ بۆیە دەستت داوەتە چەك و بوویە پێشمەرگە، بۆ ئەوەی سەر و سامان و ئابڕووی خەڵکی

بپارێزی، نەک پە پشتی پەردەی پێشمەرگایەتییەوە زوڵم و زۆری لە بێدەستەڵاتان بکەی، ئەو جۆرە کەسە هەلپەرستە خوێڕیانە، وەفایان بۆ کراسی بەر خۆیان نییە. دەربارەی هاوڕێ سەردار.. دەگەڕێتەوە بۆ شار بۆ چارەسەر، خۆم یەکەمین کەس بووم دەرکم بەوە کرد، زۆر دەمێك بوو دەبوو هاوڕێ بگەڕێتەوە شار و چارەسەری خۆی بکات، بەڵام دەبێت لەو ماڵ و ئەو ماڵ هەر خەریکی خۆ حەشاردان و خۆ شاردنەوە بێت. کێ دەزانێت چارەنووسی چی دەبێت؟ پاشان تەوار و شار زۆر لێک دوورن، تەوار کچی لادێ و بن ڕەشماڵە، تەواوی تەمەنی لەناو کاریلە و بەرخ گەورەبووە، بە ژیانی شار ڕانەهاتووە و بۆی قورس دەبێت. ڕاستە ئێمە لەشاخ دەژین و دوورین لە ژیانی شار، بەڵام خەڵکی لە شارەکانیش ژیانیان نەماوە و ڕۆژانە تووشی قڕکردن دێن. زانییان کەڵکی نییە و قسەکانی شاهۆ، بڕیاری کۆتایین، پێش ئەوەی بڵاوەی لێ بکەن. مام کۆسرەت دووبارە ڕووی لە شاهۆکرد. هاوڕێ شاهۆ ئێستا بەقسە هاتووە، لێی بپرسە، بۆ کارناسانی خۆشمان و زووتر شادبوونەوەی ئەویش بە کەسوکاری، بزانە، کەسی خزمی، ئەو کچکە بە کچی خانەدان و شارستانی دەچێت، کەس نازانێت بۆ ڕێی کەوتووەتە ئەو شاخ و داخە و ئەو ژیانە کوڵەمەرگییە. چەندی سەردێنم و سەردەبەم. سەرم لەو ڕووداو کارەساتەی تەنیا مانەوەی ئەو فریشتەیە دەرناچێت، دەبێ لەتەواوی دنیا شتی لەو جۆرە و هاوشێوەی هەبێت؟ هەر سەری دەهەژاند. باوەڕ ناکەم! شاهۆ بە دەنگێکی تێکەڵ بە پارانەوە. جا مام کۆسرەت تکا دەکەم، بەدوو دەستی تەواو بۆ ماوەیەک دەموچاوی داپۆشی، پاشان بە هێواشی چاوەکانی هەڵگڵۆفین بەچواردەوری خۆیدا ڕوانی، وەکوو کەسێکی بزربوو، لەناو لێڕەوارێک بزانێت لەکوێیە.. ئەتۆو هەموو برادەران. لەهەموو کەس باشتر دەزانن کەسوکاری چییان بەسەرهات. هیچ سەرەداوێک نەماوە بتوانین بەدەستییەوە بگرین و دوای کەوین، هەر ئەوەندە دەزانم، هەتا بەسەلامەتی نەیگەیەنمە دەستێکی ئەمین، ناتوام بیر لەهیچ شتێکی دیکە بکەمەوە، تکایە دوورم خەنەوە لەهەموو کارو ئەرکێکی بەرپرسیاریەتی تر، بەتەنیا بەدیار ئەو کۆست و ئەهامەتییەی تێیکەوتووم بە جێم بهێڵن، ئەگەر بۆم دەکراو شەرمم نەدەکرد، چەکەکەم فڕێ دەدا و سەری خۆم هەڵدەگرت و دۆڵودۆڵ گوند و گوند شار و شار دەگەڕام هەتا کەسێکیم دەدۆزییەوە. بەو قسەیە هەر هەموویان بێدەنگ و غەمبار بڵاوەیانکرد و هەرکەس لەبن بەردێک بەبێزارییەکەوە

پاڵی دایەوە. دووبارە بانگی مام کۆسرەت گوتی، هاوڕێیان خۆتان کۆکەنەوە وەڕێ دەکەوین. هەموویان هەستانەوە سەرپێ و ئامادەی ڕۆیشتن بوون، هەرچی زووە لەو ناوەی دوورکەونەوە، چونکە هەرهەموویان بەمام کۆسرەتیشەوە، بەردەوام چاوەڕوانی دوا قسەی شاهۆ دەکەن، هیچ بڕیارێک بەبێ قسەی ئەو ناکرێت، بۆیە مام کۆسرەت بانگی کرد. ئەدی ئەتۆ هاوڕێ شاهۆ؟ شاهۆ بیستۆکە بێ تەلەکەی دەستی ڕاکێشا و له گوێی خۆی نزیک کردەوە، ئەمن لێرە کەمێک دەمێنمەوە، با شالاو و برووسک لێرەبن، بزانم پەیوەندیەک بە برادەرانی سەرکردایەتیەوە ناکەم، هەر هەواڵێکی تازەم دەست کەوت، ئاگادارت دەکەمەوە. دەستە پێشمەرگەکە دوان دوان و سییان سیان بەڕێکەوتن، لەگەڵ ڕۆیشتنیان شاهۆ هەستی بە تەنیایی و بارسووکییەک لەسەر شانەکانی کرد. ئەگەر هیچ نەبێت بۆ ماوەیەکی هەتا کورتیش بێت لەگەڵ خۆیدا دەبێت بۆ بیرکردنەوە، لە ناو جەنجالی بیرکردنەوە دەوەستێت، بیر و هۆش پەی بە کێشە و چارەسەرەکان نابات.

کاتێك شاهۆ گەڕایەوە لای تەوار، بەدەمیان پرسیار لە چاوە لێڵەکانی دەخوێندرانەوە، هەرچەندە ڕەنگ و ڕووی بە گەڕانەوەی شاهۆ زۆر گەشابۆوە، هەرکاتێک شاهۆ لێی دوورکەوێتەوە وەکوو گوڵە نازناز و لاولاو بە خێرایی سیس دەبێت و دەپووکێتەوە، بەهاتنەوەی لە چرکەیەکدا دەبووژێتەوە. ئەوەتا بە دووچاوە مەلوولەکانی لە شاهۆوە ڕادەمێنێت، وەکوو ئەوەی بپرسێت باسی چیتان کرد؟ بڕیاری چیتاندا؟ بۆچی پرسیارتان لە من نەکرد؟ خۆ باس و خواسەکەتان لەسەر من و ژیانی من بوو، چرپەچرپەکەتان بە نهێنی بوو، بەڵام وا تێگە یشتم، کە تۆ تاکە فریادڕەس و سەر پەرشتیاریی لەگەڵ هاوڕێیەکانت بە تەمان دەستبەردارم بن و بێکەس و تەنیا لەو شاخ و کێوە بمێنمەوە. بڕۆن! هەرهەمووتان بڕۆن بە تەنیا جێم بێڵن، بڕۆ شاهۆ ئەتۆش ئۆغرکە، بۆ کوێ دەڕۆی بڕۆ، من کەسێکم کە کیمیایی مەرگ و تەنیای و دڕندە و تاریکی لە هەقم نەهاتوون، نەیانتوانیوە لەناوم ببەن. دەربەست نایەم، هەموو جانەوەرێکی شەڕخواز لەبەر پێیە باریک و زامدارەکانم بە چۆک دادێن. ئەوەتا ئەمن پێشمەرگەم لەپشتە. ئەوەی زیاتر ئارامی پێدەبەخشی، لەدڵسۆزی پێشمەرگەکان دڵنیابوو، بەتایبەتی مامە شاهۆی، باشە ئەو پێشمەرگانە بۆ ئەوەندە میهرەبانن؟ئەو هەموو سۆز و بە زەییەیان لەکوێوە وەرگرتووە؟ غەمخۆری هەموو

کەسێکن، تێیاندا هەیە تەمەنی چەند ساڵێک لەم گەورەترە، هێشتا سەر لێوەکانیان مووگرەنەبوون، کەچی وەکوو کەسێکی بە ساڵاچوو هەڵسوکەوت دەکەن، بەڵام داخەکەم ژمارەیان زۆر کەمن، زۆر جار لە پەنجەکانی دەست تێناپەڕن. کەچی ناوچەیەکی بەرفراوان لە ئاشتی و ئارامیدا دەپارێزن، لەچاو ئەو حەمکە پیاو خۆر و مرۆڤ خۆرانە، دەڵێی بە مەکینە درووست دەکرێن، دەست لە هیچ ناپارێزن، فەرهوود و دزی و کوشتن و تاڵان و کاولکاری، بەخوێنی سەری پێشمەرگە تینوون ئەوەتا یەکێکیان لەلایەتی.

جار جارێك بە دزە نیگایەك شاهۆی بەسەر دەکردەوە. لەتەنیش یەکتر دانیشت بوون، بەبێ ئەوەی کەسیان زاتی ئەوەبکات، باسی هیچ بکات. دیار بوو هەریەکەیان چاوەڕوانی ئەوەی تری دەکرد. تەوار چیلکەی لە پاشماوەی ئاگر و وردە پەنگرەکان وەردەداو و بیر و ئەندێشە ئاڵۆزەکانی وەکوو خۆڵەمێشەکە بێ ووزەو پەرشوبڵاوبوون، وا بە سانایی شتەکانی بۆ کۆنەدەکرانەوە سەریەک و سەرو دەرووی لەو هەموو ڕووداوە دژوارە یەک لەدوای یەکانە دەرنەدەکرد. شاهۆش خۆی سەرگەرمی دەزگا بێسیمەکەی دەستی دەکرد.، بەڵکوو لەو ئامێرە بچووکەوە، شتێکی گەورە ببیەت، زوو زوو، هەلۆ، هەلۆ! چۆنی ئەبیسی وەڵام، دەزگاکە جارجار ویقە ویقێکی لێ دەهات، دەنگێک زۆر لە دوور چەند قسەیەکی دەگوت و بە هاژەهاژو ورشە ورشێک کپ دەبوو. خوڕەی ئاوو شەپۆلی نزم نزم. شاهۆ لەبەر خۆیەوە، چەند شتێکی دووبارە دەکردەوە. . ئارا، زمناکۆ، دوو، دوو، شەش، فاریزە. هەشت لەسەر حەوت. ببیستە، ببیستە! چۆنی ئەبیسی، وەڵام بە ئالێری بێسیمەکەی ڕیشی خۆی دەخوراند، زۆر لە تەوار ڕادەما، کاتێک دەیدیت سەری بەرداوەتەوە، نازانێت بە چ جۆرێك پرسیای کەسوکاری لێ بکات، هەرچەند جارێک خۆی ئامادە دەکات بۆ ئەو پرسیارە نەکردەیە، ماسوولکە و دەمارەکانی گشت گیانی خاو دەبوونەوە و دەمی دەبوو بەتەڵەی تەقیو. وەرە بزانە لەبەرامبەر کچۆڵەیەکی ئاوا، هێشتا بۆنی شیری خاوی لەدەمە بچووکەکەی دێت، زیاتر وەکوو دەنکووی زەردی زەرنەقووتەیەکی بی پەڕوباڵ دێتە بەرچاو، ئاوا دەسەوستان و بێدەسەڵاتە. پرسیار لەکێ بکەم؟ بۆ خۆی لەهەموو کەس باشتر ئاگاداری چیرۆکی جەرگبڕی تەوارە، شەش مانگە بەدەم ئازاری ئەو ڕووداوەوە دەتلێتەوە خەو و خۆراکی لێ هەگیراوە و شەو ڕۆژ مۆتەکەیەکە و سەرسینگی بەرنادات. چۆن خەو و خەیاڵ و ژیانمت گۆڕی! ئای ئەو ڕۆژەی

تەواری تێدا ناسی، ئەوە ناسین نەبوو، بەڵکوو ڕێکەوتێکی بە هیچ جۆرێک چاوەڕوان نەکراو بوو. زیاتر دۆزینەوە بوو. قەدەر لە باتی ئەوان، بڕیاریدابوو، ئەو دیدارە لەنێوان دوو دنیای لە یەکچوو لە سەردەمانێکی جیاوازدا، ئەوە چی ڕێکهوتێکە چارەکەسەدەیەك دووری نێوان تەمەنیانە، هەمان خاڵی هاوبەشییان هەبێت و سەرگوزەشتەیان کتومت وەکوو یەك وابێت. ئەوە زەمەنە بە ناچاری لە سەر خاکێکی پڕ لە ئەفسانە و داستانی ڕاستەقینە چەقی بەستووەو ناڕوات، یان ڕووداوەکانی ڕۆژانە بەرامبەر بە مەردومە تەمن لێك جیاوەزەکان دووبارە دەبنەوە، هەمووتان ئەوەی یەك کاردو و درێژکراوەی گوتیەکانن، شاهو ئەتۆش یەکێکی لەوانە، دە زانم ئەو ڕۆژە یەکێک لە سەختترین ڕۆژانی ژیانت بوو، وەرچەرخانێکی وای لەژیانتدا دروست کرد، سەدجار مەرگی خۆت بە ئاوات دەخواست نەك ئەوەی بەچاوی خۆت دیتبات، لە کەسوکاری تەوار و خەڵکی دوڵی بالیسان و شێخوەسان بە گشتی، ئەو بالیسانەی هەرچەند جارێک لەگەڵ هاوڕێیەکانی بەوێدا گوزەریان کردبێت، پێش سەردەمی ئەنفال و کیمیاباران وکاولکردن و ڕاگواستن، هەتا لەو ساتە وەختەش، خەڵکێکی سادەو خاکی میوان دۆست و بە خزمەت، هەر ڕێبوارێک پێشمەرگەیەک ڕێی کەوتبا ناویان، وەکوو ماڵی خۆی لێدەهات، نەیاندەزانی لە کوێی دابنێن و چی دەرخوارد بدەن، بەڵام ئاخ! ئەنفال چیت بەو خەڵکە بێدەرمتانەکرد. ئێستاکەش ئەنفال هەر بەردەوامە، بەڵام خەڵکی لەگەڵی ڕاهاتن، ئای بالیسان! بووە بە خاکێکی یەک پارچە قەدەغەکراو ئەو سەردەمانە بەسەرچوون، سیمای ژیان لەوێوە دەستی پێ دەکرد، ئیستاکە چۆڵ و هۆڵ و وێرانەیە، ئەوساتە. لەنێوان کارۆخو ئاراسن، شاهۆو دەستەیەك پێشمەرگە لەپاش چوار ڕۆژ ڕێکردن لەناوزەنگەوە، شەلاڵی ئارەق بووبوون، پێستی ژێر جلوبەرگە خاکیەکەیان تەواو سووتابووەوە هەراسانی کردبوون. بەدرێژایی زنجیرە لووتکە ئەپساوەکانی چیای سەرکەشی قەندیلی لەبن ئەهاتەو و دۆڵ و کێو و دەشت و هەورازییان بڕی بوو، چەند جار تووشی پێکدادان و بۆسە و شەڕی لەناکاوی دەستە و یەخە بووبوون، کێڵگەی مین و هەڵدێرانی بزنە ڕێ و تیکەشاخەکانیش لەوێ بوەستێت، لەو سەفەرە درێژە، بەبرسیەتی بێ هەگبە و توێشەبەرە، لە ڕێگا هەرچییان دەهاتە پێش سکی برسییان پێ تێر دەکرد، بێبەرگ، بەرەو ئاوەگرد بەڕێوە بوون، لە دەشتایی دوو سێ ڕەشماڵیان بەدی کرد. تەواو دڵیان خۆش بوو ئومێدێکیان بەبەر داهاتەوە،

چوار ڕۆژە شتێکی وا نەکەتووەتە سەرزمانیان باس بکرێت، ئەو وردە نانەڕەقەی پێشیان بوو لەناو قەفی پشتێندە تەڕ و ئارەقاویەکەیان چەند چار تلیسابوونەوە و ڕەقهەڵاتبوونەوە و کەڕ و لێیدابوون، بوونی ئیسپرتوو ئەسپەنیك و دەرمانی کێچ و مورییانیان لێدەهات، تامی هەموو شتێکیان لێدەهات، تەنها زەواد نەبێت، دەمێك بوو تەواو بووبوون، گەدە و ڕیخۆڵە وشکەکانیان، داوای ووزە و خۆراکی بەپەلەیان دەکرد. تاکە ڕزگارکەر و ئاواتیان ئەوەندە ڕەشماڵە سەرابییانە بوون، بۆیە هەموو سەرنجیان لە وێداکۆکردبوونەوە، ئەوەی بەردیدەیانی ناڕوونتر دەکرد، پەردەیەکی ئەستووری لە پێش چاویان دروست دەکرد، لەچواردەوری چادرەکان ئاگر و چڕەدووکەڵێك بوو، تۆ بڵێی دانووله و گەنم و ساوار بکوڵێنن، پۆلە پێشمەرگە شازدە کەسیەکە لە برسان چاویان لێڵدەی دیت. دۆڵ و دەشت و شاخ و بەندەنیان وەکوو تراویلکەی بیابان بە هیوای چۆڕێک ئاو دۆزینەوە دەهاتە بەرچاو، خۆ لەوانەیە چەند ڕۆژی دیکەش دوور لەئاوەدانی ڕێگایان کردبا، هەستیان بەقەد ئەو برسیبوونەی ئێستا نەکردبا، بۆیە هەرکەس لەوەی لای خۆی دەپرسی. باشە ئەوە ڕەشماڵ نین؟ دووانن یان سیانن، بەس ئەوجارەش گوویێیان لە قرچەقرچی ڕونی خۆماڵی سافی کوێستانانی هەڵقرچاوی سەر ئاگردان ببوایە، سکی برسیمان بە شلەساوەرێك دوینەیەك، برینج و شلە و گۆشتی مامر نەگەر هەبێت و گەدە و ڕیخۆڵە وشکەوەبووەکانمان تێرکردبا و چەند چایەکی خەستی گەرم و گووڕمان بەسەر داکردبا و ماوەیەك لە ژێر ڕەشماڵ و تاولێ لینگمان لێ درێژکردبا، بەدەم شنەبای تەزیوی پیرە کارۆخەوە سەر خەوێکمان شکاندبا، شەکەتی هەموو ڕێگامان لەش و گیان دەردەچوو، ئەو بیر و ئەندێشە و تەواوی هیواو داخوازییەکانیان بوون، بەستەنانی تیری یان هەورامی تەنك و نەرم نەرم وەکوو پەشمەك و لۆکە، لەکاتی دابەشبوون بەسەرماڵەکاندا، بە بەر چاوی خانەخوێوە لوو دەدرێن و لە ناو قەفەکانی پشتێند دەئاخندرێن، بۆ ڕۆژانی دوور لە ئاوەدانی، خاوەن ماڵ، کاتێك ئەو کردەوەیە دەبینێت، ئەوەندە ڕۆژانە لەبەر چاووی دووبارە دەبێتەوە، بە کەمێك شڵەژانەوە هاوار بەسەر کابانی ماڵدا دەکات، کچێ کەس خواردنی بەبێ نان لە پێش میوان داناوە، ئەو هەموو ڕێگایەیان بڕیوە دەبێت ئاوا بەبێ موبالاتی خزمەت بکرێن، بووك کچ، حورمێ بە پێکەنینەوە سەبەتەنانی تازە دێنن لە پێش میوانی دادەنێن، بە دوو چاوی ئەبلەقەوە لە سەبەتە خاڵیەکە دەڕوانن، تۆ بڵێی هەروا بەو چاوتروکاندنە، فریای

جوینی نانەکە کەوتبن، ناسکەنانە ڕەبی نۆشی گیانتان بێت، گوشتی پێبگرن. ئەوەتا بە دیداری ڕەشماڵ و عێلو سەرنشینەکان شاد نەبوینە، کەچی پێمان دەڵێن، کاکە هەر چەندی هەن بەشی ژەمەنانێکی سەرپێی هەبێت، وەری دەگرین و بەردەوام دەبین لەسەر ڕۆیشتنەکەمان، خەیاڵ پلاوی کەمێك تووشی توڕەبوون و دەمارگیری دەکردن، دەڵێی لە ئاوەگردی نانیان لە سەر سێڵی سووتاوە ئاوا پەلەپەلدەکەن، لەوێش لێناگەڕێن چەهەند ڕوژێك پشوو بدەین کوسرەت خۆت بگەرەو بە پڕتاو هاتین، هەر تاوناتاوێك دووبارە و چەند بارە یەکێك لەوەی کەی دەپرسییەوە، ڕەشماڵن، بەدی بەو دوو چاوانەی خۆم سێ تا چوارم ژماردن، لەبن پەناو پەسێوو گابەردەکانیش برێکی کە هەر هەن، جارێ هەر ئەوەندە دیارن، لەوانەیە زیاتر بن. مەڕوماڵاتن، ئەوەتا لەجووڵە و لەوەڕدان، ماوەی نێوانیا دوور نەبوو، بەڵام بۆڕەی گاو حەپەی سەگ و هەتا زەڕەی گوێ درێژێکیش نایەت، کوا زڕەی زەنگولەی ڕانە مەڕو بزنان لۆقە و غارە غاری گارانێ، هەتا میاوەمیاوی پشیلەش نایەت، دنیایەکی کشوماتە. پێشمەرگە لە بەرزایو ڕەشماڵ لە تەختای، لەگەڵ هەر سووڕانەوەیەك ڕەشماڵەکان لەبەرچاویان بزر دەبوون، پەژارەو نائومێدی دایدەگرتن، ئەو هەموو ڕێگایەمان بڕێوە هەر دەتان گەینێ، سەرکێشی ئەو ڕەشماڵانە سەرسامی کردبوون، هەرچەند وڵات کاول بکەن، بستە خاکێک دەدۆزینەوە تاوڵی سەر بەرزی خۆمانی لێهەڵدەین، خاکی قەدەغەکراو پاوەنکراو بە دیدو بڕیاری کەسانێکە خەون بە و شتەوە دەبینن، ئێمە قەد وا بە سانایی واری خۆمان بەرنادەین، چارەنووس هەرچی دەبێت، بلا ببێت. واهاتین قەدبڕ بە ڕێگا خۆلاویەکاندا سەربەرەو خواردەبوونەوە، هەنگاوەکانیان گورجترکردن تەقەتەقو ڕەقەڕەقی مەتارەی ئاوی خالی و چەك و فیشەکدانیان بەرزتر و ئاشکراتر دەڕۆی، زۆر جار هێشتا سیمای پێشمەرگە بەدیارنەکەوێ بە سەدای چەکەکانیان خەڵکی ئاواییەکان دەیانزانی پێشمەرگە هاتن، چایان دێم دەدا، گەرماویان گەرمدادێنا، دۆشەك و بالیفییان زیاد و ڕێك دەخستن، چاوەڕوانی قسە و باسەکانیان دەبوون. هەوراز بە گرد و هەڵەتیان دەسپێرێت، کەس چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد، ئەو هەورازە نەگریسە هەرتەواو نەبوو، وەکوو ڕێی حەجێی لێهات، دەڵێی دەستێك هەیە درێژی دەکاتەوە. بۆ ماوەیەکی کورت بێدەنگ پشوویان دەدا، زۆربەی جار دەستە پێشمەرگە، کە زۆر پرزە لێبراودەبوون دوو سێ کەسی بە توانایان بە دوای ئاو

و ئاوەدانیدا دەگەڕان و ئەوانیکە لەلایەك لە چاوەڕوانیدا دەبوون، بەڵام جارجار گرمەگرمی باڵە فڕەی جەنگیو کۆپتەر، هاڕەهاڕی تۆپانێش دەهات، هەرچەندە دوور بوون، وازی پێ لەو بیرکردنەوەهێنان، فرۆکەکان هەتا ئەگەر نزیکیش بان کێ گوێی بەو شتانە دەدا! هەرچەند هەنگاوە ماندووەکانیان گورجتر دەکردەوە، هەستیان بە نائارامیەك دەکرد، ئەو ناوە وا کپ و ئارامە دەڵێی خولی مردووی بەسەر داکراوە، ماوەیەکە هەست بە بوونێکی تیژی کوشندە دەکەن، بۆنی سیر و سێو بۆگەن و چڕەدووکەڵ زیادی دەکرد، ئاسمانی گڕدراوی کاروخ بۆن و بەرامەی کوێستانی نەدەما و هەوا قەتیس ماوەکە ڕەنگ و بۆنی تیژتر و کاریگەرتر دەبوو، هەناسەیان تەنگتر دەبوو، ئەو ئاسمانەی وەکوو گەواڵەهەور لەپێشیان بوو، تۆختروتاریک تر دەبوو. حەزیان نەدەکرد بڕوا بە هەر شەش هەستەبکەن، بۆ ئاسای هاتنە بەرچاویان دەیانگوت، هەرهەمووی مەسەلەکە ماندووبوونی ڕێگایە، لەبەر ئەوەی دڵیان ئەوەندە بەڕووداوی مەرگهێنەر پڕبوو، هیچی بەبەرەوە نەمابوو. پێشمەرگە یەکی لاوی بە خۆوە بە نەرمە غار بەپەلە هاتە پێشەوەو خۆی گەیاندە شاهۆ.

هاوڕێ شاهۆ، بە هانکەهانك هەناسە تەنگیەوە، پاش و چانێکی کورتی ناچاری، گوتی: هاوڕێ، هەست ناکەی کارەساتێك، کارەساتێک لەو ناوە ڕووی داوە؟ شاهۆ کەمێک وەستا دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دانان لە شەکەتیان دەلەرزین، لەگەڵ بیستینی ئەو بۆچوونەی چاوەڕوانی دەکرد، ئەوەندەیکە تەواوی لەشی داهێزاو بەچواردەوری خۆیدا ڕوانی، بەدەم چەند هەناسەیەکی قووڵەوە، با بەڵام هەموو کوردستان ئەنفال کراوە و بۆ خۆت دەزانی تەڕو وشك بە یەکەوە سووتاوە، دووربینەکەی سەر سینگی ڕاست کردەوە و ماوەیەک لەپێش پێڵوە تەڕە نارەقاویەکانی ڕاگرت. ئەوە چی ڕوویداوە! چی بە چاوی خوم دەبینم، دە ستەکانی لە ڕزوکتربوون، بەپەلە دووربینەکەی لە ملی کردەوە، بو دڵنیا بوون دایە دەستی هاوڕێکەی، ئەویش چاوی بەو شوێنەی کەمێك لەمەو پێشی شاهوداگێرا، دووربینەکەی لە دەستی کەوتە خوارەوە، دوو چاوەکانی قەپات کردن، حەزی نەدەکرد بۆ هەتا هەتایە ببیان کاتەوە، هەرچەندە پێشمەرگە ویستی شتێکی نوێ بڵێت، بەڵام بەوەندە کۆتایی بە سەرسووڕمانەکەی هێنا، برادەران دەڵێن با هەندێك لەسەر هەست و لە ئامادە باشیدا بێت، ئەوەی ئیستا لەبەرچاومانە، بە ئاشکرا دیارە کیمیایی لێرە لەپێش کەمێک بەخەستی بەکار

هاتووه. . لەو ڕوونکردنەوەی شاهۆ هەڵوێستەیەکی کرد. بەڵام شڵەژاوی خۆی شاردەوە، باشە جیڤۆ گیان بگەڕێوە دواوە و دەستوری ڕۆیشتن تێك مەدە، پاراستنی یەکڕیزی و دابی ڕۆیشتن لەسەر هەرهەموومانە، هەموو چرکەیەك چاوەڕوانی بوسەو شەڕ بکەن، هەتا نەگەینە جێ نازانین چی ڕووی داووە. پێشمەرگە کە ماوەیەک لە شاهۆوە ڕاما بگەڕێینەوە یان بەردەوامبین؟ شاهۆ بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژەی بۆ ڕیزی دواوە کرد، کرد گەڕانەوەی چی! باشە کاکە، پێشمەرگەکە بە ناڕەحەتی و بە بێدەنگی گەڕایەوە دواوە.

زۆر تامەزرۆی ئەوە بوون بزانن، چی شتێك لەو ڕەشماڵانە ڕووی داوە؟ ئەگەر بۆیان بکرایە دوور بەدوور بە تەنیشتیدا تێدەپەڕین، بەڵام چۆن دەتوانن خۆیان لە ڕووداوەکان جیاکەنەوە، بە بێ ویست و ئارەزووی خۆیان، ڕەشماڵەکان بەرەو خۆیان ڕایاندەکێشان. ئەوەتا بەرەبەرە هەوا قووړستر و وشکتر و ئۆکسجین کەمتر دەبێتەوە، کاتێك کەوتنە بەرامبەر ڕەشماڵەکان، چەند دارێکی ڕەشی سووتاو لە هەموو لایەکەوە کوڵو کۆیان دامرکابوو، لەلای چەم و سەر کانی و لەناو چاڵ و لەبن گاشەبردی گەورە، سەرەتا لاشەی هەڵاوساوی چەند ئاژەڵێك، بۆی هەیە لە پەلەوەڕ و باڵندە و ڕەشەوڵاخ زیاتر کەس بەبەر کیمیایی نەکەوتبیت، هەر چەندە ئەوانیش گیانلەبەرن و وەکوو ئادەمیزاد حەز و ئارەزوو بە ژیان دەکەن و هەست بەئازار دەکەن، کاتێک هەوا بۆگەن دەبێت، پێش هەموو کەسێک ئەوان پێشهاتی ڕوودانی کارەساتێک دەکەن، بەڵام کاتێک چەند هەنگاوێک چوونە پێشێ، یان ڕاستتر قوربانی بۆ لای خۆیان پەلکێشیان دەکردن، بە دەرکەوتنی جلوبەرگی خۆڵاوی ژن و منداڵ، چوار لاشەی پیاوانەش لە نزیك یەك بە چەند فیشەکێك پێکرابوون، پێشمەرگەکان بە پشتێندو جەمەدانە تەڕەکانیان دەموچاوی خۆیان بەستبوون زۆر بە پەلە بەناویاندا دەگەڕان، بزانن کەسیان لەژیاندا ماون، لاشەکان، کەفا و زەردا و لە دەمیان دەچۆڕایەوە خوێناوێکی زۆریان لێ ڕۆیشتبوو ئەو دیودیویان پێدەکردن، ڕایان دەوەشاندن. نەهەناسە نەدەنگ، نە جووڵە، دوو منداڵی جمکە وەکوو یەك باوەشیان لەیەك دابوو، یەکیان کوڕ بە جلی کوردی کوڕانەوە ئەوی کەیان کچ، لەناو چاڵێکی تەڕ یەکترییان لە ئامێزێ کردبوو، بۆیە دیاربوو دوانەبوون، نەک ڕەنگ و ڕووخسار و بەژن و باڵایان، هەتا جۆری مەرگەکەشیان وەکوو یەک بوون، بە گوێرەی باوەش بەیەکترداکردنەکەیان وادیاری دەدا، ئەوەندە هەناسە پاکەی لەسییە وردەکانیادا

هەبووە، هەتا دوا هەناسە بەیەکتریان گۆڕیوەتەوە. لەو لاترەوە هەروا چەند هەنگاوێک ژنێکی گەنج کەوتبوو بەگوێرەی ئەوەی دوو دەستی بۆ لای دوو منداڵەکە درێژ کردبوو، بەهیوای ئەوەی بتوانن بەچەند هەنگاوێک بگەنە لای وەکوو ئەو کۆرپە ساوایەی سەری لەناو سنگی خۆی نابوو، بۆ هەتاهەتایە لێی جیانەبێتەوە. ئەوە سێهەمین ئافرەتە بێگیان کەوتوون، پیرێژنێکی بسك و کاکول سپی لەچکەکەی لە ملی ئاڵابوو دوو دەستە چرچەکانی بە گوانی مەڕێکی مردابو ڕەق بووبوو، ئافرەتە گەنجەکان، جلکوبەرگیان شیتاڵ شیتاڵ بوون لەبەریاندا و لە خوار کەمەریانە بە تەواوی ڕووت بوون، بەئاشکرا جێگای لاقەکردن و هەتککردنیان پێوە دیار بوون، پێشمەرگەکان، جەمەدانەکانیان بەسەر جەستەی ڕووتیاندا دەدەن و بە چاوی سوورسوورر هەڵگەڕاویان، وەکوو گۆمی خوێن، کەس نەیدەزانی بۆ ئەو هەموو قوربانیە دەگریان، یان کاریگەری خەستی کیمیایەکە بوو، ئەو دیمەنە سامناکە، ئەو مەرگە پاک و بێدەنگە. وای لێ دەکردن، زیاتر بەناو لاشەکاندا بگەڕێن، بەڵام کاریگەری و تیژی بۆنەکە هێواش هێواش پرزەی لێدەبڕین و بەبێ ویستی خۆیان لەو ناوە دوور دەکەوتنەوە هەناسەیان تەنگ دەبوو، هێڵنجیان دەهاتێ، زەرداوێك لینج لەدەمیان دەهات، کۆخەکۆخیان پڕ بە چیا دەنگی دەدایەوە، لەگردۆڵکەیەک لە سەرویانەوە لەبەرزایی بەپەرش و بڵاوی لەو دیمەنە جەرگ بڕەیان دەڕوانی. نەیاندەزانی لەوناوە دووورکەونەوە، بەخاکیان بسپێرن، نەتوانا و وزەی ئەوەیان هەبوو، نە هیچ شتێکی نوکتیژی وایان بەدەستەوە بوو بۆهەڵکۆڵینی خاک و لێدانی گۆڕ بۆیان، ئەگەر هیچ نەبێت گۆڕێکی بە کۆمەڵ. چونکە هەرهەموویان یەک کارەسات، یەک جۆرە چەکی کووشندە، یەک دەستی چەپەڵی زاڵمی خوێنخۆر یەک هۆ ئەویش بەڕێکەوت کورد بوونیان کۆتایی بە ژیانیان هێنابوو. کام ویژدان، کام مرۆڤایەتی ئەو قەسابخانەیە قبوڵ دەکات! لەو بێدەنگیە خۆڵی مردوو بەسەرداکراوە، دەنگی زەنگۆڵەیەك بە ئاستەم دەبیسترا، وەکوو ئەوەی جاڕ بدات و بڵێت، ژیان کۆتایی نەهاتووە. زۆر جار لە شەوانی ئەنگوستەچاو، هەمان زڕەی زەنگۆڵە. ڕێ نیشاندەربووە و ڕووەو شوان و مێگەل و ئاوەدانی ڕایکێشاون، بەڵام ئەوجارەیان زڕەی زەنگۆڵەیەکی ئاسایی نییە دێتە بەرگوێ، وەکوو دەنگێکی کپکراو لە گەروویەکی تاساوەوە بانگدەکات زیاتر وەکوو ناقووسێک و کەڕەنایی جەنگە، تێکەڵ جار جارێك بەباعەباعی کارێلەیەك دەبێت، بەڵام کەس نەیدەزانی لە کوێوەدێت، ئەوە چ

ئامازمیەکە؟ چ ڕۆحێک توانیویەتی لەو مەرگەساتە خۆی ڕزگار بکات، بۆ کیمیایی ڕێگای هیچ پەرجویەکی هێشتووەتەوە! ئەو موعجیزانەی هەزاران ساڵە مەردوومی ساویلکەی پێ تەفرە دەدەن، بەو گازە ژەهراوییە خاڵی بوونەوە و ناوەڕوو بوون. شاهۆماوەیەک کەوتە گوێڕادان و چاودێری کردن، ئەوە لەو مەرگەساتە بەرخۆڵەیەک مەڕێک، بزنێک هەتا مێگەلێکیش ڕزگاری بووبێت، چی لەو نهێنیە ئاشکرا دەکات، لەلایەکی کەشەوە، لێی بووبوو بە مەراق، هەتا ئاراستەی زەنگۆڵە و باعەباعی کاریلەکە بزانێت. گوێیەکانی وەها دەزرینگانەوە هەموو دنیای لێیبووبووە زایەڵەی کاریلە و دەنگی زەنگۆڵە. وای دەزانی هەرچوار دەوری مێگەلی کاریلەن بە زەنگۆڵەوە. چەند جار تەواوی ڕووخساری دەخستە ناو لەپی دەستی بەڵکوو تەنها دەنگی زەنگۆڵەیەک بێت و دەنگەکانی دیکە کپ ببنەوە. هەستایەوە باریکەڕێیەکی گرت، بەرەو لووتکەی کارۆخ، پاش بڕینی چەند پێچێک. باعەباعەکە بە ڕوونی دەهاتە بەرگوێی، ئەشکەوتێك هاتە پێشی لێرەوە نەک دەنگی کاریلە، بەڵکوو ئەوەتا لەبەرچاوی بەشەلەشەل دەیهەوێت لەو ناوە دوورکەوێتەوە، بەڵام ئەوەی ڕێگربوو لەچەند مەترێک نەیدەتوانی دوورکەوێتەوە، گوریسێکێ باریکی لە مل بوو بە دەوری بەردائێکدا سووڕبووەوە، شاهۆ لەسەر بەردێک بەرامبەری دانیشت، ئەگەر لەگەڵ خۆم بیبەم بەشی تەواوی ڕێگایەی ماوەدەکات. ئاخ برسیەتی ڕەگێکت لە هارییە بزانە ئەو کاریلە لاوازە بچووکە، لەگەڵ هەموو پەلەوەرێکیە قەلاچۆ دەکرێن، کەچی ئەویش بیری لەلای سەربڕین و برژاندنیەتی، چار چییە؟ ئەگەر لێرە بەتەنیا بەجێی بهێڵم کە نەبێتە خواردنی گورگ و دڕەندەی برسی، هەر لە تینوان دەخنکێت، خۆ لەگەڵ خۆم بیبەم بۆخۆم بارم ئەوەندە سووک نییە، کاریلەیەکیش لە ئامێز بگرم، ئەوانی لەگەڵیشیدان وەکوو ئەو نین، لەوانەیە برسیەتی ناچاریان بکات هەر بەپێست و تووکەوە قوتی بدەن. دوەڕۆم وازی لێدێنم بۆخۆی و چارەنووسی نادیاری خۆی، کاریلە لەگەڵ هەر باعەباعێکیشی بە دووچاوی پڕ ئاوو فرمێسکەوە بەلاجانگە سپیەکەیدا دەهاتنە خوارێ، دەیڕوانی. دواجار بڕیاریدا لەو گوریسە و بەردە ئازادی دەکەم، ئەگەر هەڵات و دوورکەوتەوە بابڕوات، خۆ ئەگەر کەوتە دواشم بابێت، هەستایەوە دوو هەنگاو لێی چووە پێشێ، کاریلە خۆی بۆ هەڵدا. بەدوودەستی لەرزۆکەوە لایەکی گوریسەکەی گرت. کاریلەکە بەدەم سووڕخواردن بەدەوری شاهۆدا، گوریسەکەی لە دووپێیەکانی ئالاندبوو، زمانە وشکهەڵات و زەردە

شەقارشەقاربووەکەی لەپێڵاوە لاستیقە کونکونە قوڕاویەکانی هەڵدەسوو. بۆنی بەشەڕواڵەکەیەوە دەکرد لوولەی چەکەشۆڕبووەکەی دەمژی وەکوو ئەوەی بە گووانی دایکی نادیاری تێگەیشتی بێت. بەدەوری بەردەکەدا سوڕایەوە کاریلەی لەباوەشکرد، هەندێك لە خوارتر سەری گوریسەکە لە شتێك ئالابوو، پارچە لبادێکی کۆنی تەڕ لە شتێکەوە پێچرابوو. ئەو پارچە لبادە چییە؟ تۆ بڵێی ئەو لبادە تەڕە نەبێتە هوی کارەساتێکی تر، لەو بەسەرهاتەی بەسەر هاتووە شتێکی لەو بابەتەبێت، دووبارە ئەویشی هێنایەوە بیرخۆی، بەسەر هاتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای شەستەکان، لەسەر زاری سێکەس بیستوویەتی، لەکاتی یەکێك لە هەڵات هەڵاتێک بووە، لەهەموو ئاوەرەبوون و ماڵ وێرانیەك، کارەسات تەنها بەر بینگی منداڵان دەگرێت، شەوێک هەرچەندە سێبەری گەورە و قووڕسی زنجیرە شاخی ئاسۆس، هەتا سەر زێی بچووک لە نزیک گوندی گەرمکان درێژببوونەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی شەوێکی فێنکی مانگەشەوبووە، هەموو شتێک بەڕوونی بەدیکراوە. بەدەم ڕێگاکردنەوە، دوو ئافرەت، بە هەڵەداوان دەڕۆن و بێپسانەوە هاواردەکەن. محەمەد، محەمەد. . دوو دەنگە ترساوەکە دەبنە دەیان دەنگو بە سەدایەک وەڵامیان دەدەنەوە. . محەمەد محەمەد. . . لە هیچ کەسیکەوە وەڵام نییە. . ئەوەی دێتەبەر گوێیان تەنها پرمەپرمێکی وەکوو ولاخە بەرزەیە. لەودیو گردێکی نزم دێت. بە ئەسپایی و ترسەوە بە گردەکە هەڵدەگەڕێن، لەگەڵ داگەڕانیان لەتەختایی لەسەر ڕێگایەکی خۆڵ. ئەسپێک لووتی بەسەر پارچەپەڕۆیەکی سپیدا ژەنیوە و هەڵمێکی درێژ لە کونە لووتەکانیەوە بەرەو پەڕۆ سپیەکە دەڕوات. دوو ئافرەتەکە هەوڵدەدەن ڕێگای خۆیان بگۆڕن و بەلایەکیکەدا درێژە بە ڕۆیشتنەکەیان بدەن، لەگەڵ دووبارە بانگکردنەوەیان. . محەمەد، محەمەد. . ئەسپەکە سەر بەرز دەکاتەوە و دوو گویەکانی بەرەو دوو ئافرەتەکە قووت دەکاتەوە. بەپارێز و ترسەوە لێی نزیک دەبنەوە. یەکێکیان بەوەی کەیان دەڵێت. کچێ خوشکێ ئەوە ئەسپەکەی خۆمان نییە. . لە کۆنە پەتوو جاجمەکان دەیناسنەوە، پاشان تەماشای ڕێگاکە دەکەن، لەژێر دوودەستی ئەسپەکە، پەڕۆیەکی سپی کەوتووە. یەکێکیان پەڕۆ سپیەکە هەڵدەگرێتەوە، لەبانگ و ڕۆڕۆ و سینگ کوتان دەدات، ئەوە کۆرپەکەمە، داخوا محەمەد چی لێهاتووە؟ هەرباشە گورگ و دڕەندەی کێوی نەیخواردووە. مەلۆتکەکەی بە سینگی خۆیەوە دەنووسێنێت، ئەوی کەیان بەهەمان شێوە، دەستدەکات بە بانگ و ڕۆڕۆ. داخوا

حەمەکەم نەماوە، ئەگەرنا قەد ساوایەکی بەو شەوەو لەوشوێنەدا بەتەنیا جێنەدەهێشت. . نەماوە بەخوای لەناو چووە، یان خەڵەفاوە و ئەقڵی لەدەستداوە. یەکێکیان داکی من بووە و ئەوی کەیان پوورم. داکم بۆ من ڕۆڕۆی کردوە و پووریشم بۆ کوڕە لاوە بێسەر و شوێنەکەی، کەمتر لە نیو کاتژمێر لەمەو پێش زیندوو بوو. . . ئەوەندەی پێناچێت محەمەد بە هانکە هانک لە دوورەوە بە خۆ و بە دوو ڕەشەوڵاخی بە بارەوە پەیدادەبێت. بەبێ سڵاوکردن دەپرسێت، کوڕەکەتان دۆزییەوە؟ بە هەردووک ئافرەتەکە دەکەونە سەرکۆنە لۆمەکردن، قسەپێگوتنی. ئەتۆ چۆن دڵتهات کۆرپەیەکی ساوا. لەناو ئەو شاخ و داخ و سەر زنێیەی لەناو ئەو هەموو گیاندارە دڕندانە بەتەنیا لەسەر زەوی فڕێبدەی، هەر ئەوەندەی گوتووە، چارم نەما ئەسپێکیان ڕەویەوە، ناچاربووم، ئەو کارەی بکەم. خۆزگە هەر ئەوشەوە دەبوومە خۆراکی گورگ و پڵنگی کێوی یان ئەسپەکە بەسمە ئاسنە ڕەقەکانی دەیشێلام و ئەو کارەساتانەم بە چاوی خۆم نە دەدی. کۆرپەیەکی سپیپۆش لەژێر مەچەک و نالی ئاسن، لبادێک هەناسە دەدات. لەناو ئەو هەموو بۆنی کیمیبایە نیشانە ژیان بەدیار دەکەوێت، بۆچی هاتن و تووشی چی بوون، دەڕۆم و دڵم بەرگەی ئەو هەموو بەسەرهاتە ناگرێت، دەکۆخم پارچە لباد لەگەڵم دەکۆخێت، هەناسە دەدەم، هەناسە دەدات. . لەبەر خۆیەوە هەر ورێنەی دەکرد و قسەی دەبزڕکاندن، ئەو پێشهاتانە چین؟ ئاسۆس و ئەسپ و مەلۆتکە و تاریکایی. کارۆخ و پارچە لباد و ئەنفال و کیمیایی و مەرگی بە کۆمەڵ. . قەندیل و بەستەڵک و ڕەقبوونەوە، زۆزکو هەڵدێران و هەرەسهێنان، کەنگێ ئەو لووتکانە بۆ ئەوە درووست بوون، ببنە مایەی کارەسات، سەرم بۆ هەر لایەک هەڵگرت، تووشی دەیان ڕووداوی ناوێزە و ناخۆش دێم، ڕۆحی شەکەتم بەرگەی ئەو هەموو بەسەرهاتە جەرگبڕە ناگرێت. . دەڕۆم دوور دەکەومەوە و سەری هۆم هەڵدەگرم، بەبێ ئاوڕدانەوە ئەو مەملکەتی ئەنفالستانە بەجێ دەهێڵم. ملی ڕێگای دەگرت، دەنگێک سۆزێک ویژدانێک بەرەو دواوەی ڕادەکێشایەوە. بەهێواشی کەوتەکردنەوەی لوولەکانی پارچە لباد. لەناو لبادەکە دەعبایەکی خشۆک وەکوو تێسکەی تفەنگ دەرچوو. زۆر گوێی بەو شتە خشۆکە نەدا، چەند تاڵەمووی زەردی خۆڵاوی بەدیار کەوتن. لبادەکەش لە مووی بزنە مەرەز دروستکرابوو، بۆیە تاڵەمووەکان بووبوونە بەشێک لە لبادەکە، لرخەیەکی بەر گوێ کەوت، کۆخینێکی ناسکی منداڵانە، کاریلە و گوریسی فڕێدایە سەر زەوی

چەند هەنگاوێک دوورکەوتەوە. . ویستی بەکام ڕێگای باریکدا هاتبوو دووبارە بگەڕێتەوە، کۆخینەکە زیادی کرد، بەپەلە گەڕایەوە. پاڵێکی بە لبادەکەوە نا، غلۆر بووەوە پێچەکانی کرانەوە کچێکی پارچەڵە بەبێ هۆشی بەڵام، لرخەلرخێکی لە سنگی دەهات، دیار بوو مابوو بەدیارکەوت. شاهۆ باوەشی بە کچە پارچەڵەکەداکرد، هەناسەی بە ئاستەم دەدا، ڕووخساری لە ئارەقە شەڵاڵ بووبوو. سەری بە سینگیەوە نا، بۆ بیستنی ترپەی دڵی. بەلاوازی جوڵەیەکی هەبوو، کەوتە شێلانی سینگە خۆڵاوییەکەی، چەند جار ڕایوەشاند، بۆ چرکەیەک چاوەکانی کردنەوە، بەنووزەیەکەوە داوای ئاوی کرد، بردی لەسەر جۆگەلەیەکی لێخنی لینج دەموچاوی شووشت، ئاوی ناوەتارەکەی چەند قومێکی تێدا مابوو بەسەر دەمیەوە کرد، کچە تواناى قووتدانی قومە ئاوی نەبوو، کاریلە و کچەی لە باوەشکرد، نەیدەزانی چیان لێبکات، هەتا ئێستا غەمی کاریلەیەک بوو، کەچی کیژۆڵەیەکی بووراوەشی هاتە سەرێ. چی ئەو کچە پارچە لەیەی گەیاندووەتە ئێرە؟ بۆچی لەوانی کە دابڕاوە؟ باوەڕناکەم بۆ خۆی بیری بۆ ئەوە چووبێت، یان بتوانێت شتێکی وا لە خۆی لوو بدات، گوێی لە دەنگی تەقە بوو، دەستڕێژ نەبوون، دوو فیشەك، پشویەکی کەم. سێ فیشەك، چەند دەنگێك بانگیان دەکرد. . شاهۆ، شاهۆ . وایدەزانی دە نگەکان بانگ دەکە ن. . شاهۆ. محەمەد، زانی برادەرەکانی لەیەکدابڕاون، پاش چەندجار فیشەك تەقاندن یەکتریان دۆزییەوە. دەنگی بێسیمەکە هەلاو سێ سێ، چاکی دەبیستم وەڵام، شاهۆ ئارارات، گەرمەسێر. . بەدەم ئەو دەنگو تەشویش و شەپوڵانەوە، نەک شاهۆی لەخەوێکی قووڵی بێئامان و پڕکارەسات بێدار کردەوە، بەڵکوو ڕای چڵەکاند، دەنگی کەسە نادیارەکە تێکەڵ بە ڕەشەبا و لوورەلووردەبوو، دیاربوو دەمێک بوو هاتبووە سەر هێڵ و کەس وەڵامی نەدابووەوە. شاهۆ گشت گیانی وەسەر ئارەقە گەڕابوو، هەموو ئەندامەکانی لەشی وەکوو بیی ناو ئاو دەلەرزین، بەرامبەر ڕەنگی سوورهەڵگەڕاوی تەوار و، دەزگاکە، دۆشدامابوو. دەستێکی بە دەموچاویداهێناو فرمێسك بە ناو ڕیشیدا ڕێچکەی بەستبووە ناو گەردنی، هەستی دەکرد هێز لە جەستە و هەناوی نەماوە، چاوی لەهەموو شێک دەکرد، تەنها لە تەوار نەبێت، بە دوورکەوتنەوە لەو یادەوەرییە پڕ ئازارە و دیتنی دیمەنی بریسکەی دەریاچە، کەمێک هاتەوە سەر خۆی. . هەر ئەوەندەی زانی تەوار وەکوو بەچکە ئاسکێکی ترساوی لەدەست ڕاوچی هەڵاتووی، پاش ڕاوەدوونانێکی توونە، ئەویش بۆ

قوتارکردنی گیانی لەدەست نێچیرەوان، سەری بە هەموو کونوقوژبن و ئەشکەوت و جێگایەکدا کردبێت، بە هەناسەبڕکێ و لیچکردن، خۆی بە باوە شیدا کرد، دوو قۆڵە لاوازەکانی وەها لەملی ئالاندبوو، زۆر بەئاستەم هەناسەی بۆ دەدرا، شاهۆش زیاتر بە خۆیەوە ڕادەمووسی و چاوەکانی لە چاوەسووربووەکانی دەبڕین. دەزگاکە زوو زوو ئاماژەیەکی دەکرد، هاوڕێ دەنگم دەبیستی وەڵام! بەبێزاریەکەوە بیستۆکەکەی هەڵگرت. بەڵێ! چاکی دەبیستم وەڵام. کەوتە قسەکردن و نووسینی ژمارە و هێما و ناوەکان، ماوەیەک سەرگەرمی لێکدانەوەی شفەرە و نمرەکان بوو، بەڵام سەری ڕادەوەشاند و بێئاگام بوو، بۆیە بێسیمەکەی قەپات کرد. هێشتا تەواری لە باوەش بوو، پرچە ئاڵۆزکاو و ژاکاوە خۆڵاویەکەی ماچدەکرد، ئەو خەیاڵە لینجاوییە چی بوو ئاوا لەناکاو بەربینگی گرت، بڕیاری دابو بۆ هەتاهەتایە لەبیری کات، بەڵام شەو و ڕۆژ بەبست لێی جیانابێتەوە، واش پێدەچێت هەتا دوا چرکەکانی ژیانی لەگەڵیدا بێت، چۆن دەتوانێت کارەساتێکی وا فەرامۆش بکات، لەمەو پێش بەردەوام بەدەم ئازاری بەسەرهاتێکی ساوایی دەتلایەوە، بەڵام لە چاو ئەوە شتێک بووە وەکوو سەیرانێک شایەنی باسکردن نییە، دواجار بەدەم ڕێککردنی کیژۆڵە گوتی(بۆ بانگت نەکردم، تەوارگیان، چاوەکەم! جارێ وا ڕام وەشێنە، قسەم لەگەڵدا بکە، ئەگەر زانیت ئاگام لە خۆم و لەتۆش نەماوە، گازمکە، حەز دەکەم بەیەکەوە قسە بکەین، ئەوەندە بێدەنگ مەبە، هەرچی لە دڵتدایە بۆمی باس بکە، ئەتۆ هەموو کەسی منی، لە تۆ زیاتر کەسم نییە، ئەتۆش من بە مامی خۆت، برا گەورەی خۆت بزانە و، پێم بڵێ ناوی بابت داکت، خاڵ مام، کەسێکم پێ بڵێ بزانم ناویان چییە، بۆ خۆت دەزانی زۆر پێویستیم پێیانە، بەبێ ناسینی ئەوان هیچم لە دەست نایەت! لەکوێ، بە چ ناوێک بگەڕێم. ماوەیەک چاوەڕوانی وەڵام بووم. تەوار دووبارە دنیای بێدەنگی قسەنەکردنی هەڵبژاردبووە، بۆیە هیچی نەگوت، شاهۆ هەناسەیەکی هەڵکێشا و دووبارە کەوتەوە لێك دانەوەی ئەو شفرە و ناو و ژمارە ئەو شتە نهێنیانەی بە بێسم وەری گرتبوون. مەگەر تەنها بۆ خۆی سەرەدەریان لێ دەربکات. لەنەکاوێك هەستاو چەند جار خۆی تەکاند، لەدوور لەسەرویانەوە لەبەرزایی لەهەمان شوێن لەبناری کۆسرەت، کە ماوەی یەك کاتژمێر لێیەوە دوور بوو، دەنگی دوو تەقینەوەی گەورە هاتن، لەگەڵ دیتنی چڕە دووکەڵ بەرەو ئاسمان لوولی دەخوارد، یەکسەر و بەبێ دوو دڵی زانی لەکەڵەمێوێ بوو، دڵی داخورپا، ئایە

بوردوومانی باڵەفڕەی سەربازی بوون، خۆ هیچ شتێکی ناناسایی بەچاو نابینێت، جگە لە پەلە هەوری غوبار هاتوونەتە سەر تەموومژی نەپساوە، هێرش نەکراوەتە سەر بارەگا، ئەگەر وابوایە، دەبوو لێرەوە تێپەڕیبان، چۆن چۆنی پەیوەندییان پێوە بکەم؟ دەزگاکە لەلای خۆمە، کەسێك نەهاتەوە، تۆ بڵێی هەر هەموویان بەر کەوتبن! پێش هەموو شتێك ئەوەتا تەوار لە باوەشیدا، لەو لایەنە وە دڵی ئارامە.

. هیچ دەنگی تەقە و شتی کە بەدوایدا نەهات، بەڵام لە فڕینی پۆلێك کۆتر و باڵداری سەر لێشێواو زانی شتێك لە بارەگایەکەیان ڕووی داوە. دوو پێشمەرگەکەی کە هەتا ئەو کاتە دوورە پەرێز بوون، دوور و نزیك لە ئێشکگری ئەواندابوون، کەمتر خۆیان نیشان دەدا، کەس هەستی بە بوونیان نەدەکرد، بەپەلە و بە هەڵەداوان هاتن، بەدەم ڕێگاوە ئاماژەیان بۆ بەرزایی دەکرد، هاوڕێ شاهۆ، تەقینەوەکە لە کەڵەمێوێ بوون ئەویش بە پەشۆکاوییەوە.

بە مەزەندەی منیش لە ناو بارەگا بوو. نازانم هیچم لێوە دیار نییە، بەڵام بەگوێرەی دووری زرمبەی تەقینەوەکە وای بۆ دەچم لەناو بارەگا بووبێت، وەکوو ئەوەی هیچی لەبیر نەمابێت یان لەدنیایەکی دیکەوە گەڕابێتەوە، نامۆ بەو شوێنەی لێیەوە وەستاوە. چەند دەبێت هاوڕێیان ڕۆیشتوون؟ هەردووکیان وەڵامیان دایەوە، کەسمان کاتژمێرمان دەدەستدا نییە، هەتا بزانین چەند وەختە، بەڵام تاوێکی باشە. ڕووی لە هەردووکیان کرد. تاو تاو، تاو چەندە، کەمێك زۆر دوور نزیك، وەڵامی ڕاست و دروستم بدەنەوە! دوو پێشمەرگەکان تووڕەبوونەکەیان وەسەرخۆیان نەهێنا، زانیان لە بارێکی دەروونی ناجووردا دەژیت، دەنا ئەوەندەی شارەزای خوو ڕەوشتی شاهۆن، دەزانن چەند کەسێکی لەسەرەخۆ و دڵگیرە، هەتا زۆر جار بە مام سەبروکە بانگ دەکرێت، لە نەکاوێك تۆنی دەنگ و گفت و لفتی گۆڕا، پێداچوونەوەی خۆی کردبوو، گوتی: مادام مام کۆسرەتیان لەگەڵ دایە، غەمم نییە! لێرەوە بۆ کەڵەمێوێ چەند دەبێت؟ هەر دووکیان کەمێك هاتنەوە سەر خۆیان دووکاتژمێرە! کەواتە گەیشتوونەتە بارەگا.

ماوەیەك بوو شاهۆ لەبەر تەوار و لەتاوی نازاری پشت زۆرکەم ڕەخت و فیشەکدانی دەبەستن، وای هەست دەکرد تەوار ئەگەر بەبێ چەك دەیبینێت زیاتر بەلایدادێت، چاری نەما، زۆر بەپەلە بانگی پێشمەرەیەکی گەنجی کرد، برووسک گیان وەرە لەگەڵم، شاڵاو ئەتۆ لەگەڵ تەوار بە هێواشی وەرن بۆ کەڵەمێوێ. هەورازەکە زۆر سەختە و پەلەی لێنەکەی. ئەگەر زانیت ماندووە لەباوەشی بکە،

یان چاوەڕوان بە هەتا دەگەڕێمەوە. پێشمەرگەکە ڕووخساری وای نیشان دەدا لەگەڵ ئەو قسانەی شاهۆدا نییە و زیاتر لە گەنجیەتی خۆی ڕادەبینێت، بۆیە بەبێ ئەوەی تەماشای شاهۆ بکات. هاوڕێ باشترە ئەتۆ لەگەڵ تەوار بیت، ئەمن وەکوو بەرزەکی بانان بۆی دەردەچم بزانم مەسەلە چییە، بەزوویی دەگەڕێمەوە و هەواڵت بۆ دەهێنم. چەکەکەی کردە شانی چاوەڕوانی وەڵامی نەکرد. هەتا ئەتۆ وەخۆ دەکەوی ئەمن گەڕاویشمەتەوە، ئەدی برام، شاڵاو هەر بۆ شاڵاو بردن نییە. دەنگی شاهۆ بە کەمێک تووڕەبوونەوە، قسەکەی پێبڕی، ڕاوەستە! لەخۆتەوە بۆ ملی ڕێگات گرتووە. وەرە لەگەڵ تەوار بە! دنیات بە فشە داوەتە بەرێ. جا ئەمن بڵێم چی دنیای فانی بۆ خۆی لە هیچ و فشە پێکهاتووە. ویستم چاکەیەکت لەگەڵ بکەم، لەگەڵ زانی شتەکە لە گاڵتەکردن تێپەڕی، سڵاوێکی سەربازی کرد، ببوورە، ببوورە، فەرمایشتی جەنابتانە. شاهۆ سەری گرت و ئەولاو ئەولای ماچکرد، بەهەمان شێوە چەند جار تەواری ماچکرد. تەوارگیان ئەتۆ لەگەڵ هاوڕێ شاڵاوی بە باشە! تەوار ماوەیەك تەماشای دەموچاوی منداڵانەی شاڵاوی کرد، زەردەیەکیان بۆ یەکتر سەری قایلبوونی هەژاند، شاهۆ ئاهێکی بەبەردا هاتەوە، تەوار لەگەڵ زانی دەبێ پێهەڵگرێت، شەڕواڵە خاکیەکەی هەتا خوار ئەژنۆیەکانی لەناو زەنگاڵ نابوون، کەمێک لە خۆی ڕاست کردەوە. دارەکەی دەست فڕێدا و، بوخچە گچکەکەی لەپشتی بەستوو. بەهەنگاوی خێرا خێرا بەلاڕێدا کەوتە دوویان، چەند هەنگاوە بچوکەکانی گوورچتر دەکرد، زیاتر لە بەرچاوی لەچاوتروکانێکدا بزردەبوون، بە تۆزی پێشیان نەدەگەیشت. پێشمەرگەکە زۆر لە دڵە ڕاوکێدا بوو، جارجار دوور دەکەوتەوە، بەڵام دەیزانی تەوار بە جێماوە، دڵی ئۆقرەی نەدەگرت و دەگەڕایەوە، دڵنیابوو ئەو چەند هەنگاوەی هاویشتوویەتی بە زۆر لەخۆکردن و ترسی لەدەستدانی مامە شاهۆبووە، ئەگەر ناهێزی ڕێکردنی نییە. پێشمەرگەکە بە پێکەنینەوە پێی دەگوت. جەرگەکەم هیلاك بووی. تەوار جاران بوایەوە

وەڵامی نەدەدایەوە، بەڵام لەگەڵ پێشمەرگەکان هەستی بە دڵ ئارامی دەکرد. خۆ بەدەستخۆشی نەبوو، نەیدەتوانی قسەبکات، ئەوەی ڕوویداو بەسەری هات کارەساتێک بوو بۆخۆی، هیچی لەبیر نەمابوو، چی ڕوویدا، پێشمەرگەکە مەتارەیەکی ئاوی بۆ ڕاگرت. ئەو چەند قومێکی بچووکی لێدا، فێربووبوو وەکوو پێشمەرگەکان هەموو شتێکی بە پێخۆر دەخوارد و دەخواردەوە، پێشمەرگەکە

دەستێکی پڕ سۆزی بەسەریدا هێنا، دووبارە مەتارەکەی بۆ ڕاگرتەوە، تەوار گیان بخۆوە ئاو زۆرە، لەپاش ئەو تەلانەی بەردەممان کانیاوێکی خۆش دێت، لەبەر دڵی من چەند قوومێکی دیکەش بخۆوە. . تەوار دووبارە مەتارەکەی وەرگرتەوە و قومێکی درێژی خواردەوە، پێشمەرگەکە ئاو لەپی دەستی پڕ ئاوکرد و دەموچاوی تەواری شووشت، بە جەمەدانییەکەی زۆر بە هەستیارانە و هێواشی ڕووخساری سڕییەوە. ئەو پێستە ناسکە بۆ وا وەکوو لیمۆ زەردهەڵگەڕاوە و تەنک بووە، بەدزییەوە فرمێسکەکانی دەسڕینەوە. چەکەکەی لەشانی داگرت، تەواری کردە قەڵاندۆشکان، یەک دوو جار شانەکانی بادان بۆ ئەوەی تەواری لەسەر شانی ڕێکخات و تەواو لەنگەر بگرێت و ترسی بەربوونەوەی بەولاو ئەولادا نەبێت، بەڵام تەوار هەستی بە شەرم و دڵەڕاوکێیەک دەکرد، لەوبەرزاییەوە زیاترهەستی بە ساردی کزە بایە کوێستانیەکەدە کرد، بەڵام بەوەی دڵی خۆیدەدایەوە دەتوانێت باشتر بکەوێتە چاودێریکردنی پێش خۆی. بەڵکوو بتوانێت تەنها بۆ جارێکیش بێت شاهۆ و هاوڕێیەکانی بەدی بکات، نابێت ئەوەندە دوور کەوتبنەوە، ماوەیەک بەبێدەنگی ڕێگایان بڕی، پێشمەرگەکە دووربینەکەی لەقەدی کردەوە و بۆ تەواری ڕاداشت، بزانە لەدوور چی بەدی دەکەیت! هەرچی دیتت، ئاگادارم کەوە. تەوار دووربینەکەی لەدەستی وەرگرت، قەت باوەڕی نەدەکرد ئەو پارچە ئاسنە ئەوەندە قورس بێت، خەریک بوو لەدەستی بکەوێتە خوارەوە، بەدەستەکەی دیکەی گرتیەوە. قایشەکەی لە ملی خۆت بئاڵێنە، لەسەر قسەی شاڵاو لە ملی خۆی چەندجار ئاڵاند، چاوی بە دوو کوونەکەیەوە نا، شتەکان ئەوەندەیکە لەبەر چاوی دوورکەوتنەوە، کوا هیچ نزیک ناکاتەوە، دووربینەکەی داگرت، ماوەیەک چاوەکانی هەڵگلۆفین، خانووە داتەپیوی کۆنەئاش هەروا چەند هەنگاوێک لێیانەوە دوورە، کەچی لەنێوان گلاسە تەڵخەکاندا تەواوێک بچووک و دوور دەکەوێتەوە، نهێنییەک لەو کارەدا هەیە، ئەگەر وابێت پێویستی بەو ئاسنە قورسە بێمانایە نییە. . ماوەیەک بیری کردەوە، سووڕاندی ئەو جارەیان ئەک پێش خۆی بەڵکوو تەواوی چیاکە نزیک بوونەوە. ها چی دەبینیت؟ تەمووەژ. بەس ئەوەندە جوان بگەڕێ! دەزانی تەوار بۆ خۆم بەسەرم هاتووە، یەکەم جار کە دووربینم تاقی کردەوە، زۆر لە لام سەیربوو، لەسەر دەریاچەبووم، لەدووری چەند کیلۆمەترێک ئەسپێکم دیت کەوتمە چاودێریکردنی، وەکوو ئەوەی لەبەردەمم بێت، چۆن گیای دەخوارد، کلک ڕاوەشاندنەکەی، کە مێشەکانی لە خۆی دووردەکردنەوە، مێش و مەگەزەکە

لەبەر چاوم دەبوون بە دالی گەورەی زەبەلاح. برکە نۆک و بنەگوێنیەکان لەبەر چاوم وەکوو سوورەچنار و سپێداری سەر لە کەشکەڵەی ئاسمان دەهاتە بەرچاو، تەواوی لاشەی ئەسپەکەم نەدەبینی، لەنەکاوێک لووشکەیەکی هاویشت، بەپەلە دووربینەکەم دوورخستەوە، ئەوەک جووتەکەی بەرم کەوێت، قاقایەکی کێشا، پاشان لەخۆم تەریقبوومەوە، ئەمن لەکوێ و ئەسپ لە کوێ، بەدەم ڕێگاوە هەر پرسیاری لەتەوار دەکرد. چاوەکانی تۆ لە دووربینەکەی من بەهێزترن و باشتر دەبینن. ئەگەر حەز دەکەی با هەر بۆ خۆت بێت. بەڵام ئاگاداری بە! مێروولەیەکی وردت بۆ دەکات بە گامێشێک، هەرچی بەدیت کرد ئاگادارم بکەوە. پێشمەرگەکە لەو شاخ و کێوە بەو کپی و خامۆشییەی تێی هەڵ کردە گۆرانییەکی غەمبار، دەنگی وەکوو چریکەی بولبوولێکی تەنیا لە کونجی قەفەس بۆ هاودەرد و ئازادی بچریکێنێت.

دڵم تەنگە و پەرێشانم دەمێکە خەیاڵم هەردەمەی لانەی خەمێکە ئەوەندە دڵ پڕم پێم خۆشە بگریم کە فرمێسک و هەناسەش مەرهەمێکە دەمێنێ . هەر دەمێنێ . بابمێنێ. . . *

تەوار بە دووربینەکەی ڕووی بۆ هەرلایەک دەسووڕاند هەر هەوریسپی تەمومژ بوو، جار جارێک بۆ چەند چرکەیەک هەورەکە لادەچوو، بەرچاوی ڕووناک دەبووەوە، لەنەکاوێک تارماییەک زۆر سەرنجی ڕاکێشا، هەرچەندە بێجووڵە بوو، ماوەیەک تێیەوە ڕاما، دەستەکانی لەسەر ئەژنۆی دانابوو، دەمی تەواو کردبووەوە، سەری بە چواردەوری خۆیدا دەگێڕا، چەکێکی لەشانی بوو، جلوبەرگی زۆر دەگمەن و جیاوازبوون، بەڵەک بەڵەک، تەپڵەیەکی سەوزی لەسەربووماوەیەک چاودێری کرد. بە دەنگێکی نووساوەوە گوتی، مامە ئەو کەسە جلوبەرگ سەوزە کێیە؟ پێشمەرگەکە لەگەڵ گوێی لەدەنگی تەواربوو یەکسەر لەگۆرانی گوتن کەوت. تەواری بەهێواشی دابەزاند، بە هەناسەبڕکێوە دەستی لەسەر سەری تەوار دانا، بە خەندەیەکەوە گوتی شازادە، چیت دیت؟ تەوار ماوەیەک بێدەنگ بوو، چەند جار بە توندی کۆخی. چاوەکانی تەڕ بوون، لەچاو کەمێک لەمەو پێش سپیایەتی چاوەکانی زۆر کەمتر بووبوونەوە، هەتا بیلبیلەی چاوەکانی سوورهەڵگەڕابوون، دەلەرزی، پێشمەرگەکە کردیە باوەشی. ئەمگوت ئەو دووربینە وەکوو هەلووکی شەیتانی وایە، چەند بەسوودە، ئەوەندەش ئەگریسە، زراوی پیاوی دەبات. دەڵێی بەبەردێکیدا بدەم و هەپڕوون بە هەپڕوونی

بکەم، هەر زوو لە قسەکەی خۆی پەشیمان بووەوە، ئێستا هی من نەماوە و خاوەنەکەی ئەتۆی، چارەنووسی لەژێر دەستی تۆ دایە، بەڵام هەتا شاهۆو هاوڕێیان دەدۆزینەوە پێویستیمان پێی دەبێت، با چەند دەمژێرێکی کەش بەساغی بمێنێتەوە. کەوتە بیرکردنەوە، کەسێکی جلکوبەرگ سەوز، بۆ دڵنیابوون لێی پرسیەوە، بەڵام پێمت نەگوت، چیت بەرچاوکەوت. تەوار بەدەنگێکی لەرزۆکەوە نازانم، بەڵام لەو یاڵەی بەرامبەرمان، دەستەکانی تەواو بەرزکردنەوە و بەرەو ئاسمان پاشان هێواش هێواش دایگرتنەوە، بەرەو ناوەڕاستی تیکەشاخێکی تیژی لاسی دەستی ڕاستیان، ئالەوێ، پیاوێکی بەرگ سەوزم دیت! پێشمەرگەکە کەمێک شڵەژا، کەسێکی جلوبەرگ سەوز. جلکوبەرگی کوردی بوو؟ بەسەرسووڕمانێکەوە لەبەر خۆیەوە گوتی، کوردی نازانم، مەبەستم لەو بەرگانەی من! ئەها لەوەی من. کڵاو جەمەدانەی لەسەر بوو چەکی پێ بوو؟

نا، لەوەی تۆ نا؟ کڵاوێکی سەیری لەسەر بوو. گۆچانی بەدەستەوە بوو؟نا چەند کەس بوون، تەوار تەنها پەنجەیەکی بەرزکردەوە. پێشمەرگەکە بۆ نارامکردنەوەی تەوار. هیچ نییە شوان بووە. .

دەزانی چی، شازادەکەمان! بڕۆ لەسەر ئەو کەڵەکە بەردانە بۆ خۆت تەماشا بکە. ئەگەر بەرچاوت کەوتەوە دووربینەکەم بدەیە. تەوار لەسەر زەویەکە دانیشت و چاوی لەزەوی بڕی، پێشمەرگەکە دووربینەکەی بەهێواشی لەملی کردەوەو ماوەیەک کەوتە چاودێریکردن، زۆر بە وردی لەو شوێنەی تەوار ئاماژەی بۆکردبوو دەڕوانی جارجار شووشەکەی پاک دەکردەوە، بەڵام هیچی وای بەرچاو نەکەوت، لەبەرخۆیەوە دەیگوت، کەسێکی جلکوبەرگ سەوز، دەبێت شێخە پەڕۆ نەبێت، دووربینەکەی داگرت و دووبارە کەوتەوە پرسیارکردن، مامە شاهۆ و هاوڕێیەکانی نەبوون؟ بەڵام تەوار هەر بە جەستە لەوێ مابوو، بیر و ئەندێشەکانی چەند ڕۆژە ڕێ دوورکەوتبوونەوە. لەودیو گردەکەی بەردەمیان دەنگی غەڵبەغەڵبێك دەهات، پێشمەرگەکە ڕاوەستا هەڵوێستەیەکی کرد. ماوەیەک لەجێگای خۆی گوێ قوڵاغ بوو. چاوەکانی وەکوو دووربینەکە بەچواردەوری خۆیدا دەگێڕا. تەواری بەپەلە خستە پشت خۆی لەبن بەردێك دانیشت. ئاوڕێکی دایەوە، نیگایەکی خێرای دایە ئەو ڕچەڕێگایەیەی پێدا هاتبوون، ترسی ئەوەی هەبوو ئەوەک لە دواوە زەفەریان پێبەرن، بەڵام دڵی بە تەمەکە خۆش بوو. دەستی تەواری گرت و هێنایە پێش سینگی خۆی، تەوار کەوتبووە نێوان

سنگی پێشمەرگەکە و بەردەکە. . جار جار دەنگەکە بزر دەبوو دووبارە پەیدا دەبووەوە، وەکوو ئەوەی دەنگی بڵندگۆیەک بێت و لەگەڵ هەڵکردنی ڕەشەبا، لەدوورەوە بێت پێشمەرگەکە میلی ڕەشاش ناڕبیکەکەی هێنایەوە و جەمەدانیەکەی بەسەر سەری تەواردا دا، مەترسە! هیچ ڕوونادات. بە لیچکی جەمەدانەکەشی جار جار نارەقەی سەر برۆیەکانی دەسڕیەوە. بۆ ئەوەی تەواو لە نامادەباشی دا بێت. نە ئەوە بوو غەڵبەغەڵبەکە ببڕێتەوە و نەمێنێت، نە ڕەنگ و ڕووخساری کەسیش بەدیار دەکەوت. چەند جار بیری کردەوە جێگاکەی بگۆڕێت، چەند هەنگاوێک بگەڕێتەوە، چونکە لە ناوەڕاستی ڕێگاکەدابوون، خۆ ئەگەر لاڕێ بوایە دەیتوانی لەبن بەردێک لەگەڵ تەوار خۆی بشارێتەوە. لەچاوەڕوانیدا ما، لەدڵی خۆیدا هەر دەیهێنا و دەیبرد، کەسێکی بەرگ سەوز. دەبێ چ پیاوچاکێک بە و نافات و دنیا کاولبوونە ڕووی لێرەکردبێت! بەرگ سەوز. . ماوەیەک مێشکی خۆی گوشی. هەبێت و نەبێت بەرگ سەوز هەر سەربازە، ئەو تەنها یەکێکیانی دیتووە. خۆ لەوانەیە زۆربن، قەت بە تەنها سەربازێک ڕێی نەکەوتووەتە ئێرە. وەکوو ئەوەیە مەڕێک بچێتە ناو گەلەگورگێکی برسی لە ناو بەفر و چۆڵەوانیدا. ئێستا بەتەنها ماوەتەوە، کەوتە خۆ نامادەکردن، یەکەم شت فیشەکەکانی ژماردن، نزیکەی سێسەد گولە بەشی چەند کاتژمێرێک بەرگری دەکات، ئەدی تەوار؟ لە زرمبەزرمب و شەڕەتەقە هەترەشی دەچێت، هەرچەندە کچێکی زۆر چاونەترسە، بەڵام هەرچی بێت هێشتا منداڵە و ئەوەی بەسەری هاتووە بەسیەتی. ناخ شاهۆ! بۆ هیچ نەبا تەوارت لەگەڵ خۆت بردبا، یان هەموومان بەیەکەوە باین. سەری بردە بنگوێی تەوار، گیانەکەم هەستە، دەستی گرت و زۆر بەپەلە خۆی گەیاندە کەڵەکەبەردێکی پشتیانەوە، چەند هەنگاوێک دوور بوو، تەواری لەوێ دانیشاند، دووبارە جەمەدانیەکەی بەسەریدا دا، گەڕایەوە جێگاکەی خۆی، لەسەر هەست بوو، فیتولێدان دەستی پێکرد، دەنگەدەنگەکە زیادی کرد. هەستی کرد شتێک لە پشتەوە وەستاوە، لوولەی چەکەکەی بۆ دواوە سووڕاند، لەگەڵ ناوڕدانەوە، تەواری دیت، هێشتا جەمەدانیەکەی بەسەر سەرەو بوو، لەباوەشی کرد. وەرە لای خۆم! لەسووڕانەوەی پێشیان سێ تارمایی بەدیار کەوتن، هاواری کرد،

زەلام کێن؟ نەجووڵێن! گوێی لە دەنگی شاهۆ بوو، بەپێکەنینەوە، شێتە ڕاوەستە، خۆمانین. لەگەڵ سێ پێشمەرگەی دیکە پەیدابوو، تەوار و، شاڵاو،

چاوەڕوانیان نەکرد هەتا ئەمان هاتن، بەرەو پیریان چوون، تەواری لە باوەش کرد، هەق نەبوو بەجێتبێڵم، بەڵام ناچاربووم، ها هاوڕێ شاهۆ چی بوو ئەو تەقینەوانە؟ شاهۆ بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی، هیچ ئەوەندەی ئێمە لەوێ نەبووین میوانمان هاتبوون، بەداخەوە، یەکترمان نەدیت، بۆ جارێکیکە بێت، تەقینەوەکانیش هەر جاشەکانی سەرەوە بوون غیرەت گرتبونی، بەڵام زانیبوویان لەوێ نین، دوو نارنجۆکیان لەبن دوو بەتانی دانابووەوە، مام کۆسرەت زۆر لەوان وریاتر بوو، تەقاندبوونیەوە. ئەو شەو بەسەریان دا دەین. دەتوانی بۆ خۆت لە کاتی دەستگیرکردنیان پرسیاری تەواویان لێ بکەیت، ئەتۆ واز لەوانە بێنە، ئەو وردە شتانە هەر ڕوو دەدەن، ئەو جەمەدانەیەت بۆ بەسەر سەری تەواردا داوە؟ پاشان ڕەنگی بۆوا زەرد هەڵگەڕاوە؟ وەرە باب و باپیرم، ترساوی!

پێشمەرگەکە دوو مژی قووڵی لە سیغارەکەی دەستی دا و سەیرێکی ئاسمانی کرد، دوای نیوەڕۆیەکی درەنگوەخت بوو، بەڵام هێشتا ڕۆژ بەبەریەوە مابوو. هەرچەندە لەهیچ لایەکەوە تیشکی خۆر دیار نەبوو، جاوەرە دڵت نەتۆقێت هەتا دنیا تاریك دادێت، باشە بۆ بەس بەشەو، دەبا ئێستا بڕۆین، شاهۆ بە بەسەر زەنشتێکەوە

برام، شۆڕش بەپەلە ناکرێت! ئاوا بڕوات زوو لە ناودەچیت و بەپۆستەرێکی ڕەش و سپی دەچیە ناو کاروانی شەهیدان. گەنجی وەکوو تۆ وەکوو کەوی ناو قەفەس وایە، ئەوەندە سەری لە شووڵەکانی قەفەزەکە دەدات سەری خۆی دەخوات و زیان بەخاوەنەکەشی دەگەیێنێت. بەڵام هاوڕێ شتێکی تر، کەمێک پێش ئێستا تەوار لەسەر قەڵاندۆشکم بوو، بەدووربین تەماشای چیای دەکرد، ترسا پێمی گوت کەسێکی جلکوبەرگ سەوزی بەچەکەوە دیتووە. شاهۆ بە سەرنجدانی تەوارەوە پرسی کەسێکی بەرگ سەوز! لەکوێ؟ لەویاڵەی بەرامبەرمان شاهۆ دووربینەکەی وەرگرت. لەسەر هەمان کەڵەکەبەرد ماوەیەک کەوتە چاودێریکردن، پاشان گەڕایەوە ناو پێشمەرگەکان. لەتەمومژ زیاتر هیچم بەرچاو نەکەوت، لەوانەیە چاوی ڕێشکە و پێشکەی کردبێت، بە هەرحاڵ لەسەر هەست دەبین هەموو شتێک ڕێی تێدەچێت. لەسەر ئەو شەکەتییەی خۆی شاهۆ تەواری لەباوەش کرد و کەوتە گاڵتەکردن لەگەڵی. هەرپێنجیان ڕووە و لووتکەی چیا هەزار بە هەزارەکە بەناو تەمومژدا بەرێچکە شارەوەکاندا ڕووە و مەنزڵگا، دەربەندی کەڵەمێوێ هەڵزنان.

# مامۆستای ڕاکردوو

دەنگێك هاوارێک، لە ناخەوە دەیهەژێنێت، بەخۆشی نازانێت. . زەنگی مەرگ و دواهەناسەی ژیانە، یان زایەڵەی نازاری ویژدانە، بەردەوام ختووکەی گیانی سام لێنیشتووی دەدات. . بۆ چرکەیەک بەرۆکی بەرنادات، وایلێ دەکات بەردەوام لە خۆی بپرسێت ئەتۆ لە کوێو و ئێرە لە کوێ؟ چ بەلایەك تۆی گەیاندە ئەو لێرەوارە ترسناکە، هەرچەندە بە ویست و ئارەزووی خۆی نەهاتووە! بەزۆرەملێ پەلکێش کراوە، وەکوو هەزاران کەسیکە، نەک خودی خۆی، کە ئێستا هەموو سەرەداوەکانی لێئاڵۆسکاون، لەخانەی سەربازی دایە، کار و پیشەی ئەو مامۆستاییە کەچی بەبڕیارێکی نابەجێی دەبەنگانە بوومتە سەربازێکی بێبەزەیی دڕەندە، لە جێگای قات و کەرەفاتی ئوتووکراو گاجلێکی بەڵەك بەڵەکی ناحەزت لەبەر دایە. کار و پیشەی مامۆستا و سەرباز تێکەڵ کراون، هەندێك مێشکت بێنەوە سەرەخۆت، شەڕی خۆ کوژی بۆ کێ و لەدژی کێ دەکەیت؟ دەنگێک بە چپەوە لێی پرسی:

مامۆستا هەڵمەت، بۆ بێدەنگی بیر لەچی دەکەیەوە؟ مامۆستا تەپووتۆزی ئەستووری سەر و لامل و تەواوی لەشی، لەگەڵ ئارەقی تاوەگازبووەکەی کەمێک بە سەرقۆڵی بەرگە سەربازییە ئەستوورەکەی سڕییەوە، چاوە بە قووڵاچووە وردەکانی ئەوەندەی کە بچووککردنەوە و بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو، پاشان وەکوو ئەوەی لەبەر خۆیەوە وڕێنە بکات، ئەوەک وەڵامی پرسیارێک بداتەوە، نازانم مامۆستا، بۆ خۆشم نازانم، سەرم تێداماوە. . بیر لە چی دەکەمەوە، ئایە هەموو سەربازەکان، باواز لە سەربازەکان بێنن باسی کە ساسی و قووڕبەسەری مامۆستاکانی وەکوو خۆمان داما و بکەین، لە کوێی دنیا ڕوویداوە ماموستا لە خوێندنگا و خوێندکار و دەرس و خوێندن دوور خرێتەوە و بۆ بەرەی جەنگی ببەن، منداڵ پێگەیاندن و پەروەردەکردن ئاسمان و ڕێسمان لەبەرەکانی جەنگ و کوشتن و بڕین و کاولکردنەوە دوورە، دەوست و پەنجەکانمان بە گرتنی چەك و ڕومانە و تەڕەماش ڕانە هاتوون، بەردەوام ویژدانم زۆر نازارم دەدات، چارەنووسمان چیدە بێت؟ بەتەمای چین؟. . ئەوەتا بەچاوی خۆت دەبینی.

کاروانی ئەپساوەی زیل و ئیڤاو هینۆیە سەربازیەکان، دوو ڕۆژ بێپسانەوە، لە جادەی قیر لایان دەدا و کۆپتەرەکانی سەر سەرمان وەکوو چەتر و سێبەر بەگرمەگرم و ترەتر لەنزمییەکەوە دەفڕن. ئێمەیش وەکوو جووچک و مریشک، ئەوەڵلا، خەراپتر لە سەگ و بەراز لەو قەفەزە گچکانەیان کردووین، بڕۆ بڕۆ. ئەوە لێ لێیە، هێشتا لۆلۆ ماوە، بابگەینەجێ. ئە وجا دەزانی بۆچی ئێمەیان هێناوەتە ئێرە، دڵم پێم دەڵێت، کارێکی خراپی چاوەڕوان نەکراو ڕوودەدات، ئێمەش دەبینە بەشێک لە شەڕی کاولکاری. تکا دەکەم مامۆستا مەسەلەکە بەو قورسیە وەرمەگرە، هەر چەند ڕۆژێکە و ماوەی ڕاهێنان و مەشقەکەمان تەواو دەبێت، دەگەڕێینەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆمان. ئەوانیش بەتەمای دەست و پەنجەی شووش و باریکی مامۆستا و خوێندکار، نەکەوتوونەتە جەنگەوە!

هەشت ساڵە جەنگە، مامۆستا هەر مامۆستا بووە و، سەرباز سەرباز. کەچی ئەوڕۆ هەرمەهووی تێکەڵ بە یەک بوون، ببینە هەرهەموومان خۆراکی قادسیەین. مامۆستای سەرباز و سەربازی مامۆستا، بەڕواڵەت وانیشان دەدەن چەند ڕۆژێکە، بەڵام ئەوەی ئەمن بزانم لەو سەفەرە زۆرملێیە کەسمان بە زیندوویی ناگەڕێینەوە، ئەوە گریمان گەڕاشینەوە، وەکوو کەسێکی دڕندەی دست و مەچەک خوێناوی بە قەلاچۆکردنی خەڵکی لادێیەکان، ئەو کاتی گەڕانەوە چی خۆشی و لەزەتێکی تێدا دەبێت، پێت وایە لە پاش ئەو بەشداری کردنە وەکوو جاران بتوانین چاو لە چاوی خەڵکی بکەین. یان ئەوەتا سەرشۆڕ و ملکەچ لەناو کۆڕوکۆمەڵدا........ قۆنداغە تفەنگێک لاشانی هەردووکیانی سمی و بە شششتێکی درێژ، بێدەنگیی کردن، بەردەوام ئازار و خۆخواردنەوەوە چاوەڕوانیکردنی دەرئەنجامێکی شەرمەزارکەر کەوتنە درێژەدانی سەفەرەکەیان، شتێکی چارەنووساز و ملکەچانەیە، وەکوو تەواوی سەرنشینانی کاروانی زیل و ماشێنە سەربازییەکان ئەوانیش بەشێک بوون لە لێشاوی سەرباز و جاش گەیشتنە ئەو بنارە. نەک ئارامی ئەو دەڤەرەیان شێواند، بەڵکوو وەك مۆرانە و ڕەوە کوللەی برسی و هار بۆلێدانی سەربازگە و سەنگەر کەوتنە وێزەی دارستانی ئەو ناوە. دەمی هاری بلدۆزەر و دەیان ئامێری گەورەی هەڵکۆڵین، بەمشار و مەکینە گەورەکان هەتا بەسەرە ئێزەش، کەوتنە هەڵدڕینی سنگی خاك و خۆڵی ئەو نیشتیمانە، هەر دارستان و باخچەی سەوز بوون لە چاو تروکاندنێکدا لەگەڵ زەویدا تەخت دەکران. ئەوەی بە دووچاوی خۆیان دەیان دیت

و لەمەو پێش بیستبوویان و خوێندبوویانەوە، لەمێژووی هیچ داگیرکەرێك ئاوها جینۆسایدی نەك بەرامبەر مرۆڤەکان، بەڵکو لە ئاست سروشت و ئاژەڵ و بوونەوەر نەکراوە! ئەو کانیاو و سەرچاوە ئاویانەی بۆ خۆیان ئاویان لێدەخواردنەوە، نەك گاشەبەردیان تێفرێدان بەڵکو هەر هەموویان چیمەنتۆ ڕێژکردن، لێناگەڕێن جارێکی کە لێرەوە هیچ کانیاو کارێزێک و سەرچاوەیەکی ئاو هەڵقووڵێن، وابێ بە زەمینانە کەو تبوونە وێزەی هەموو شتێك، وەکوو ئەوەی نەك لەگەڵ مرۆڤ و گیانلەبەرەکان بەڵکو لەگەڵ هەموو بوونەوەرێک لە جەنگدا بوون. کەس نییە پێشیان پێبگرێت، ئەی خوای گەورە ئەو هەموو زوڵمە لە پای چی؟ هەرچەندە بەناو سەربازگەکەدا دەسووڕایەوە، زیاتر تووشی شۆک دەبوو. ئەو جانەوەرانە چین و لەکوێوەهاتوون؟ لەناو ئەو هەموو قەرەباڵغی و هەراو زەنایی ناو سەربازخانە تازە درووستکراوە هەستی بە تەنیایەکی کوشندە دەکرد، زۆربەیان دەڵێی بۆ سەیران هاتوون، بەدەم دەنگی گۆرانی و مۆسقای ڕادیۆوە ڕیشیان دەتاشی، واتدەزانی بۆ ئاهەنگێکی بووکگواستنەوە خۆیان دەڕازێننەوە، دەنگوباسی هەموو ڕادۆیەکان، تەنها باسی بەرەکانی جەنگ و تێکشان و کوشتن و ڕاوەدونان بوو، لەوەتەی باسی هێرشی دەریاچەی ماسی و کێڵگەی دارخوورمای خوارووی وڵات دەکرێت، چەند جار ئازاد کراوە، کاولکراوە داگیرکراوەتەوە، ئاوەدانکراوەتەوە. . هەلهەلەی خۆشی و سەرفرازی لێدراوە، دەبوو بستەخاکێکی ئەو وڵاتە بە داگیرکراوی نەمابا. ئەوەی دەهاتە بەرچاوی، هەر فەردە و گونیە بوون بۆ قایم کردنی سەنگەر پردەکان مەتەرێزەکان، سەری نەک سووڕما، بەڵکوو تەواو سەرەگێژەی گرت، چۆن بەو خێراییە هەر بە جەمەلۆن و لەوح توانییان ئەو هەموو عەمبار و هۆڵ و خانوو بەندیخانە و سەربازگەیەکی ئاوا گەورەی تۆکمە بنیات بنێن، ئەگەر لە هەمووشتێک دەستوپێ سپی بن. بە لە سەربازییکردنی وڵات و میللەتەکەی کارامە و لێهاتوون. وەکوو هەر مامۆستایەک ماوەی شەش ڕۆژ خزمەتەکەی ماوە، بەڵام ئەوەندەی دیقەت دەدات، ئەو هەموو خۆ تەیار و ئامادەکردنە بۆ جەنگ دەبێت، جەنگێکی درێژخایەنی وڵات کاول کەردنە. بەدەستی خۆمان وڵاتی خۆمان وێران دەکەین، هاوڕەگەزی خۆمان لەناو دەبەین، بۆ ئەوان جیاوازی نییە، پێمان دەڵێن سەگی ڕەش و سەگی سپی. ئەوەی لەگەڵیانە و ئەوەی دژیانە لەسەگ زیاتر ناژمێردرێن، ئەگەر لەناویش بچم نابێت وەکوو دۆستێک و سەربازێکی دڵسۆزی

ئەوان، کۆتایی بەژیانم بێت، وەکوو زەرووپەک بە بینە قاقایانەوە دەنووسێم، بۆ ئەوەی جارێکیکە مامۆستا ڕاپێچ نەکەن و بەئارەزووی خۆیان چەکداری بکەن، بڕوا بە کوردیک نەکەن چەکیان بۆ هەڵگرێت، ئەوەتا هەروا یەک کاتژمێر لەمەوپێش باڵندەیەکی بچووکی دندووکشکاو ئامادە نەبوو خۆی بداتە دەستەوە و کەوی ببێت، بەبەرچاوی خۆیەوە، کۆمەڵێک سەرباز زۆریان مامۆستای فریودراوبوون وەکوو خۆی لەبەردەمی چادرە سەوزە سەربازییەکەیان باڵندەیەکی بچووک مامۆستایەک دیار بوو هی زیندەوەرزانی بوو، لەگەڵ دیتنی ناوی لێنا (شوانە هەڵخەڵەتێنە) بەڕاستی ناوەکەی لەلا نامۆبوو، چۆن ئەو مەلە وردیلەیە دەتوانێت شوانێک بەو هەموو وورپایەی خۆیەوە، بەرپرسی مێگەلێک مەڕ و بزنە و لە سەلامەتی و قەڵەوبوونیان هەڵدەخەڵەتێت، بەڵام کاتێک ئەو جووڵانەوە نائاسییەی لێی دیت، زانی مەلێکی چەند زیرەک و چەند ئازاد و بەرزە دەماخە. لەسەر گۆلەئاوێک چاوە شەکەت و ماندووەکانی لە ئاوەکەوە بڕیبوو لەبەر ئەوەی بەشی دەندووکی ژێرەوەی شکابوو هەتا سەر، مل و گەردەنی خواربوووبووەوە، نەیدەتوانی نەدان و نەئاو بخواتەوە، کۆمەڵێک هەوڵیاندا بیگرن، هەتا هەندێک ئاو و سەموونی بە گەروویدا بکەن، بەڵام لەشەقەی باڵیدا و فڕی و دوورکەوتەوە، دیاربوو بڕیاری دابوو، بەسەربەستی لە تینوان و برسان گیان لەدەست بدات و مرداربێتەوە، باشترە لەوەی دیلێکی تێری دەستی کەسێک، یان قەفەس بێت. وەکوو ئەو مەلە پرزە لێبڕاوەشم پێناکرێت، وەکوو ئەو ناتوانم دارەودار شاخەو شاخ بفرم، بەڵام هەڵاتنێک هەڵدێم، فڕاندێک چەکەکەیان دەفڕێنم هەتا ماون چاویان پێنەکەوێتەوە، هەر بەو چەکەی خۆیان شەڕیان دەکەم، با ئەو شەو بدەمە شاخ و کێو، تەنها ئەوەندە بژیابام هەتا دەگەیشتمە برا پێشمەرگەکانم، ئاخ! ئەو دەنگە پەنهانە، وەکوو مۆرانیەک گشت گیانم دەخوات، مێشکم کاس دەکات و یەکەیەکە خانە و دەمار و گۆشت و جمجمەی کەللە سەرم هەنجن هەنجن دەکات، وژەی ڕەشەبا، هاژەی ئاو، زەرەی کەر، هەتا قاقاپێکەنینی سەربازە وەکوو خۆی تۆقیوەکان هەراسانی دەکەن، هەوڵ دەدات ئاسایی بێتە بەرچاو، وەکوو ئەوانی دیکە بەو هاتنە سەرمەست و خۆشحاڵ بووە، بەڵام هەر ئەوەندە چاوە بزو لچولێوە ئەستوورەکان دەبینێت، کۆشکی شووشەی بەزۆر بنیات ناوی ئەندێشە ئاڵۆزەکانی وردوخاش دەبن، زایەڵەی کەوتنی شیشۆقەکان شادەمار و خوێنهێنە رو خوێنبەری دەبڕن، دنیا لەبەر چاوی وەکوو ئەو ساتەی ئاوابوونی

دوا تیشکی زەردەپەڕە، سوور سوورە. بەو وردی کەوتبووە چاودێریکردنی ئەو ڕێگایانەی لە سەربازگە دەردەچوون و بۆ ناوی دەهاتن، لەهەر بەرزاییەک چەند نێشکگر و پاسەوانی لێیە، ئایە سەربازن، مامۆستان مغاوین، چ جۆرن؟ مامۆستایەکانی بە کاسکێتە سەوز و لەش و لار و خاوخلیچکەکانیان دەناسیەوە، وەکوو هەویری نەشێلدراو بوون، هەتا ڕۆیشتنەکەیان جیاوازبوو، وەکوو ئەوەی پاش پشوویەکی کورت بەرەو پۆلەکان بگەڕێنەوە، تیژ تێدەپەڕین، تەماشای ئەولا ئەم لایان نەدەکرد، هەتا سەیری بەرپێی خۆشیان نەدەکرد، بۆیە هەروات دەکرد دانەیەکیان دەکەوت و بەرەو چۆمی غلۆردەبووەوە، جلکوبەرگەکانیان ئەوەندە شل و شەپرێو بوون، دەتگوت بەزۆری کردوویانەتە بەریان. نیتاقەکنایان وەها تووند بەستبو تووشی تەنگە هەناسەی کردبوون، یان ئەوەندە شل بوون لەڕۆیشتن بە کەمەریانەوە نەدەوەستا. سێ چارەگی ڕۆژ ڕۆیشتبوو، ئەو چارەگەی خۆر بە ئاسمانەوە نووسابوو، دەتگوت بێری ئەفسەرەکانە بۆ خەوتنیش بە تەپڵی سەریانەوە چەسپی بوو. هەر ئەوەندەم ئاستەمە، هەتا دنیا کەمێک تاریک دادێت، ئەگەر بزانم لەدواوە بە فیشەک وەکوو بێژنگم لێدەکەن، بڕیارێکم داوە پەشیمان بوونەوەی بۆ نییە، لەتاریکی شەودا خۆم لەو جانەوەرانە جوودا دەکەمەوە، باشترین و سەلامەترین ڕێگا، دەمە و ڕووبار و ڕووبار بۆی دەرچێت، یان خۆی بە ئاوێدا دات، بەڵام بە شڵپەشڵپەکەی ئاشکرا دەبێت، پاشان کێ ناڵێت ئەو چۆمەش بە سەربازگەیەکی دیکەی ئاسپێرێت و هەر لەناو ئاوەکە ڕەقهەڵنایەت؟ نا ڕووبار و ئاو و زێ و دەریا بەشە و شووم و بە ترسن، هەتا ئێستاکە کەس بە شەو لە پەڕینەوەی ئاو سەری بە سەلامەتی دەرنەکردووە، هەرچی حیکایەت و ئەفسانە و بەسەرهاتی لەمنداڵییەوە هەتا ئەوکاتەی ئەنکی بیر و زەینی بڕی دەکرد و دەیگێڕانەوە، ژیانیان لەناو ئاو کۆتایی هاتووە، ناقەت هەرگیزاو هەرگیز، خۆم نادەمە دەست شەپۆڵ و گێژەنی دەریاچە، هەتا ئێستاکە ناوێکی تەواوم بۆ ئەو زەلکاوەی خوار سەربازەگە نەدۆزیوەتەوە، لەسەرومان باریک و قووڵ دیارە، ئەوەتا لەبەر دەمم پان و بەرین وەکوو زێ دێتەبەرچاو، چەند سەدمەترێک لە خوارتر، دەریاچەیە و کەنارەکانی خانەخانەی وشکهەڵاتوون، لە ڕۆخەکانی لاشەی دەیان ئاژەڵ و ماسی و هەتا ئەهەنگی بۆگەن کەوتوون، ناوی چیت لێبنێم، هەرچی هەی چاوەڕوانی من مەکە، دەزانم هەر ئەوەندەم خۆشە هەتا لە چاوی سەربازەکان بزر دەبم، هێشتا بەتەواوی

سەرم ژێر ئاو نەکەوتووە، ڕامدەکێشیە ناوەندی ئاوەکە و نقوومم دەکەی پاش چەند چرکەیەک لەسەر پشت بێگیان و بێهەناسە دەکەومە سەرئاو، ما مرۆ چییە؟ خۆ مراوی و کیسەڵ نییە لە ناو ئاو بەهەوای تواوە و لە دەرەوەش لە وشکانی بە هەوای ئۆکسجین بژیت، هەر کە چەند چرکەیەک هەناسە نەما، کۆتایی بە هەموو ئاوات و ئامانج و ژیانی دێت، ئەگەر هاتوو هەروا بە ئاسانی لە ناوچووم، کەواتە ئەوان دوژمنی باوەکوشتەم بردیانەوە هەروا بەبێ زیان و سەرهێشە لە کۆڵیان بوومەوە، بە لە ناوچوونی هەر کوردێک شاگەشکەدەبن، زەروویەک لە کۆڵبووەوە، بەڵام بۆ وان باشترە لەگەڵ بەرەنگاربوونەوە و شەڕی دەستە و یەخە بکوژرێین، هەتا پێش لینگلێڕاکێشانی یەکجاری، چەند کەسێکی هاوڕەگەز و نەژادی نەتەوەکەی خۆت لەناوببەی، لەو قەڵاچۆکردنە بەشدار بیت، دەڵێن بەدەستی خۆمان نییە بەدڵمانە. هەتا مقاش هەبێت بۆ دەست و پەنجەی خۆمان بسووتێنین. قەت لەگەڵ من ئەو ڕۆژە بەچاوی خۆتان نابینن، ئەو کاتی یان لەسەر سندووقە ڕەشەکەم دەنووسن، ترسەنۆک یان شەهیدی قادسیەی ناموبارەک. ڕێگایەک دەدۆزمەوە، لەخەویشدا هەر بیرتان بۆی نەچێت، ڕووبار لەبیرکە! نا، باشترە لە کلکەی بەرامبەری ئاودیوبم. گرنگ نییە بەکوێدا؟ ئێشکگر و پاسەوانەکان ئەوەندە زۆرن، وەکوو زیخولمی دەریا لەو ناوەی بڵاوبوونەتەوە، بەڵام کە تاریک داهات هەموویان بڵاوەی لێ دەکەن، بەبێ ئۆقرەییەوە بەناو چادرەکاندا دەگەڕا، زۆربەیان لەبەر شەکەتیان لاکەیان دەهات، هەر یەک لەلایەکەوە، درێژ بووبوو، تەنها ئەو نەبێت، گوێچکەکانی دەرزرنگێنەوە، برۆ خۆت ڕزگارکە هەرچی بەو حاڵەوە ئاوا ڕەنگ بزرکا و شەپرێو دەیان دیت، مامۆستا بەتەواوی خەڵەفاوە، شێت بووە، هێشتا لە ماڵێ بە دێوانەییەکەیان نەزانیوە، نابراله! بۆ حاڵی خۆی زیندووە، بە ئانقەست و زۆڵیەتی خۆی وا نیشان دەدات شێت و شبڕ بووە، بۆ ئەوەی مەرەخەستی بکەن و بە کوتە وەرەقەیەکی دکتۆر، بە ڕستەیەک. مامۆستا هەڵەمەت شێت و شبڕ بووەو بۆ کاری جەنگ و سەربازی دەست نادات، بۆ خۆی بگەڕێتەوە ناو ماڵ و منداڵی، ئەگەر نا چۆن کەسێک بەچەند ڕۆژێک ئاوا تێکدەچێت، زۆرزانی وەکوو مامۆستا هەڵەمەت نییە، چەندجار بەدەمی خۆی گێڕاویەتەوە، چەند ساڵ لەمەو بەرتەنها دوو مانگ سەربازی کردووە، لەکاتی پڕکردنی گونیە گڵ، بۆ داپۆشینی ئامێری سەربازی و سەنگەرەکان خۆی خستووەتە بەر تایەی زیلێک کە خەریکی گواستنەوەی فەردە

پڕ لە خۆڵەکان بووە، پاش چەند ڕۆژ لە خەستەخانە ماوەتەوە، ڕووبەڕووی لێژنەی سەربازی و دکتۆرەکان بووەتەوە، پشکنینی سەرپێی بۆ کراوە، خۆڵی کردووەتە چاوی تەواوی لیژنەکە بە تەواوی ئەفسەر و دکتۆرەکانەوە، گوایە پێیەکی لە پێیەکەی دیکەی کورتر بووەتەوە، خانەنشین کرا، لەسەربازی کەچی ئەواتا وەکوو مامۆستایەک دووبارە ڕاپێچی بەرەکانی جەنگ کراوەتەوە، ئەوەش تێدەپەڕێنێت، هەتا دنیا تەواو تاریک بوو، بە ئاشکرا ئەو قسە و باسانەی لە سەرباز و مامۆستاکانی هاوەڵی گوڵی دەبوو. خۆی لە هەمووان جوودا کردەوە، چی دەڵێن بابیلێن. بە پشتی کۆمەڵێک پەرژیندا بە ماتەماتە بەرەو سەرچوو، دەیزانی لە قووڵە گردەکانەوە چاودێری دەکەن، هەر چەند مەترێکە و بەبێ ئاوڕدانەوە بەناو تاشەبەرد و ڕەوەزێکدا ڕۆیشت، ئەگەر هاتوو لەدواوە تەقەیان لێم کرد، ئەوە هەموو شتێک کۆتایی دێت، ئەگەر نا، بە خێرایی دەردەچم، هەر هەنگاوێکی هەڵدەهێنایەوە بەتەمای هەنگاوی دووەم نەبوو... ماوەیەک بەم شێوەیە بەردەوام بوو، لەکاتی هەنگاونانەوە باڵەکانی تەواو بەرەو سەر بەرزدەکردنەوە، وەکوو ئەوەی بەتامای فڕین بێت، بۆ ئەوەی بەزووترین کات لێرە دوورکەوێتەوە، یان لەگەڵ بیستنی یەکەم هاواری دەنگدانی زەلام کێی؟ دەستەکانی بەبەرزییەوە ئامادەبێت، چەند جار چەند ڕێگایەکی دەهاتە پێشی، لە خۆیەوە ئەوەی ناوەڕاستیانی دەگرت، بیرێکی وەکوو ڕەشەبا بە مێشکیدا هات، پێیەکانت سووک کەو بکەوە غاردان، سووکەئاوڕێکی دایەوە چەنگەتفێکی گەورەی تێگرتن، بڕۆن و ئاو و ئاو چن، جارێکی دیکە چارە و ناوچەوانی نەگریستان نەبینمەوە، خوام دەکرد هەر هەمووتان سەرما و تۆفان و بوومەلەرزە لەناوی دەبردن، هەرچەند زۆر مامۆستای بێتاوانی وەکوو خۆی تێدایە و بە زۆرملێ ڕاپێچیان داون... کەلاشنکۆفەکەی لە شانی کرد. هەلاتنێک هەلات، ئەو هەموو ساڵەی وەکوو مامۆستای وەرزش و زمانی کوردی، بۆ ئەو ڕۆژە، مەشقی کردبوو.. لەدوور لە خوارەوە گوێی لە دەنگی چەند دەستڕێژێک بوو، بەلام دەربەست نەهاتوو بەردەوام بوو لەسەر هەلاتنەکەی، هەتا ئێستاکە دەتوانم بەردەوام بم لەسەر غاردانەکەم، کەواتە پێنەکراوم، ویزەویزی گوللە وەکوو باران و تەرزە بەبن گوێدا دەهاتن، هەر ئەوەندەی دەزانی بەزووی لەو ناوەی دەبێت دوورکەوێتەوە، پاش چەند سووڕانەوە و ناودیوبوون، زانی لە مەترسی دەستگیرکردن دەرچووە. دوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرز کردنەوە و لە دواپێچی

هەورازی بەرامبەر سەربازگەکەدابوو، لێرەوە هەستی بە ئارامیەك کرد. . دنیا چۆنە، ئێستا یاخیەکم و دژی دەوڵەت هەستاومەتەوە، ئەو دەوڵەتەی لەسەر بنچینەی ڕەگەزپەرستی و خوێنڕشتن و داپڵۆسین بنیات نراوە، وڵاتێک بەدەستی چەند لۆتی و سەرسەریەک بەڕێوە بچێت، دەبێت چی وڵاتێک بێت، هەتا چەند کاتژمێرێك لەمەو پێش لەژێر فەرمانی کەسێکی بێگانەی داگیرکەردا بووم، سەر بە کۆماری ڕەق و ترس بووم، هەرچییەکیان دەگوت. بەڵێ گەورەم برۆ ئاوبێنە برۆ داربشکێنە، ئەو ڕەز و باخچەیە تێکدەن، ئەو گوند و کوردستانە تەواو خاپووربکەن، ژن و منداڵ زیندە بەچاڵ بکەن، ئێستاش قسەکانی ئەفسەرە دەرەجەدارەکەی لە گوێ دەزرنگێتەوە، هەتا دوا چرکەکانی ژیانی لەگەڵیدا دەبێت، وە نەبێت لە قسەکانی ژیری و حیکمەتێکی تێدا بووبێت، بە ڕقێکەوە کە تژی بوو لە ترس و نائومێدی، لەو چیایەی بەرامبەرمان چەند ڕێگر و چەتەیەکی سەرلێشێواوی لە یاسا لادەری ترسنۆکی و بێ غیرەتی داردەستی بێگانە، خۆیان مەڵاس داوە، لە چەند ڕۆژێکدا هێرشیان دەکەینە سەر و تەفر و توونایان دەکەین، بەزمییتان بە خۆیان و ماڵ و منداڵیاندا نەیەتەوە، هێرشێکمان بۆیان کرد، تەفروتوونابوون، ئەوەی کوژرا، کوژرا، چەند دانەیەکیان دەستگیرکراون، گوللە باران دەکرێن، چەند ترسنۆکێکیش خۆیان پاراستوە و هەڵاتوون، یان بەزمیەیان پێدا هاتوون، کەڕایان کردووە نەکەوتونەتە دوایان، ئەو جۆرە جرج و شەمشەمە کوێرانە مافی ژیانیان نییە، فەرمانی کرد، بیانهێنن، بزانین چ جۆرە پێشمەرگەیەکیان بە دیل گرتووە. تەواوی سەربازگەکە بێدەنگ لە چاوەڕوانی هێنانی دیلەکاندا بوون، داخوا ڕوخسار و شێوەی پێشمەرگە پاش بە دیلگرتن چۆن بێت؟ ئایە لە چاوەکانیان ترس دەبارێت، دەکەونە سەر ئەژنۆ و داوای لێبووردن و بەخشین دەکەن، یان وەکوو ناسراون بە سینگێکی فراوان و سەربەرزیەکەوە بە هوتافلێدان بەرەو ڕووی مەرگ دەبنەوە، لەبەر چاوی دوژمن سەربەرزمان دەکەن! پێشمەرگە و بەدیلگیران، ئەدی دوا فیشەکی بڕیاردەر بۆچی لە باشترین شوێنی لەشیان دەیشارنەوە ئەویش گیرفانی سەر دڵیانە، هەموو ساتێک بۆ دڵنیابوون بەسەری دەکەنەوە، ئەوە نەریتێکە و لە باو و باپیرانەوە لە کاتی هەموو جەنگەکان بەمیرات بۆ نەوەکانی دوای خۆیان جێهێڵاوە. کەواتە ئەمڕۆ ئەو دابەشکێنداروە و پێش نەمانی فیشەک خۆیان بەدەستەوە دەدەن، بەڵام کاتێک سێ جاش و پێنج سەربازیان بە چاو بەستراوی هێنان، بەبەرچاوی

هەموو سوپاوە، سەرباز و جاشەکانی کەوە، دەستەی مەرگهێنەر هاتن، لە ناوەڕاسی گۆڕەپانی سەربازگەکە. بە فەرمانی ئەفسەر، یەك، دوو، سێ، بتەقێنن، تیرە بارانکران، چاوەکانی خوێگرتن، ئاخ نازییەکانی جیهانی سێهەم چوون خوێناوی ئەو خەڵکەی دەخۆنەوە، جیاوازی لەنێوان بێگوناهو تاوانبار و چ دۆست و دوژمن ناکەن، قسەی بابە بە ساڵاچووە بە ئەزموونەکەی ڕێك وادەرچوو، ئەو ڕژێمە خوێنخۆرە چی کەپری بۆ بکەی چی لێی تێکبدەی، لە لای وەك یەك وایە! دۆست و دوژمنی خۆی بە چاوێك سەیر دەکات، داگیرکەری ئاو و خاك و بیر و هزرە، هەر ئەوەندەی دیت، هەشت لاشەی بێگیانی پێنج سەربازی بێ گووناهو، سێ جاشی خۆفرۆشی چاوشۆڕ، کەوتنە سەر زەوی، هەر کە ئەو کارە قێزەوهنە. خوێناویەی بە چاوی خۆی دیت، چاوی کراوەی لێڵی تیرباران کراوەکان پێیان دەگوت، ئەگەر تۆش وەکوو ئێمە بکەی بێگانەپەرستی، چارەنووست، وەکوو خۆمان دەبێت، یەکسەر کەوتە دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك بۆ هەڵاتن، ئەو کردەوە بەرامبەر هەموو کەس دووبارەی دەکەنەوە، بۆ چاو ترساندنی باقی جاشوسوپاکەیە، بڵێ ئەمن مامۆستایەك چکارم بەو سەریەشەیە بوو، چاکم کرد هەڵاتم، دەستەکانم خۆش بێت، بەڵام بەرەو کوێ بڕۆم؟ بۆ بۆخۆی دەزانێت لە کووێیە؟ هەتا بزانێت بەرەو کوێ بڕوات! هەر ئەوەندە دەزانێت، لەپشتییەوە سەربازگەیە و. لەپێشیەوە چیای هەزار بە هەزارە، کابرای ئەفسەر ڕێگانیشاندەرێکی باش بوو بۆی، یاخیو چەتە، کەواتە پێشمەرگە بەو شاخەوەن، هەموو کەس دۆست و دوژمن دەزانێت، لەوەتەی ئەو کێوانە هەن، پێشمەرگەکەش هەیە، باشە چۆن چۆنی بیان دۆزێتەوە؟ ئەگەر دۆزیمنەوە باوەڕیان پێم نەکرد؟ دەڵێم مامۆستام و بەزۆر هێناویانم. دەستەکانم بە خوێنی کەس سوور نەبووە، هەتا ئەمڕۆکە چۆلەکەیەکم لەئاو نەکردووە، ئەوەندەی مەبەستە، ئەگەر قەل وداڵ بیخوات تازە دەربەست نایەت. خۆزگە دەستەجلێکی کوردیم دەست دەکەوت، چەند لەسەربازی، وەڕسە دە ئەوەندە لەو جلکە بەڵەك بەڵەکانە بێزارە. هەنگاوەکانی سست کردنەوە، ماوەیەك لە بیرانڕاچوو، ئایە کارێکی باشی کردووە یان، کارێکی خۆکوشتنە؟ هەر لەگەڵ سەربازەکان گەیشتە بنار و لێرەوار، گوێی دەزرنگایەوە، شتێك لەناخیەوە، دەیهەژاند، بڕۆ، بڕۆ، ئەتۆ مامۆستایەك چارەڕەش و بەلەنگاز چ کارت بە سەربازی داوە؟ ئەوانیش فێڵیان لێکردین، هەر مامۆستا و خوێندکارێک، پاش ناوەندی دەبێت، سێ مانگی هاوین

مەشقی سەربازی بکات، بەڕۆژ مەشقە و بە شەو دەچنەوە ماڵی خۆتان، کەچی ئەوەتا ملیان پێ لەملی ئەو چیا و چۆڵە ناون، ئەوانەی کە چی خوێندکار چی مامۆستا، هەر لەیەکەم ڕۆژەوە نەهاتنە ژێر بار زۆر زیرەکتربوون، نایکەین، دەرمان دەکەن بابیکەن! سزامان دەدەن با بیدەن. مامۆستای ناکریکاری، کرێکاری نا کۆڵهەڵگر، ئەوە سووکەمەشقی سەربازییە، یان شەڕی پارتیزانیە و وڵات کاولکردنە، بەرامبەر بە کێش؟ بە پێشمەرگە. . باشە ئەو سەربازگەیەی لێهەڵات تۆ بڵێ نەکەونە دوای، بەڵام دڵی بەوەی ئەهوەن دەبووەوە دەیزانی سوپا لەدەرەوەی زۆر بە هێز و تۆکمە دیارە بەڵام لە ناویدابە ئەوجا دەزانی چەند شڕ و شپڕێوە. ئاخر مامۆستا چییە هەتا بۆ شەڕ بیهێنن؟ ئەگەر شەڕتان پێناکرێت وازبێنن، زۆر بە ئارامی ڕێگای دەکرد، ترسی ڕاوەدونانی گرتنەوەی هەر هەبوو، قەت لەو باوەڕەیدا نەبوو وا بەئاسانی بتوانێت ئەك بۆخۆی، بە چەکیشەوە هەڵبێت، هەر کە گەیشتمە پێشمەرگان، بە پێشمەرگە وەریان گرتم باشە. . ئەگەرنا ئەو چەك و فیشەکدانەیان بە دیاری دەدەمێ، چەکێک بۆ ئەوان زۆرە، لە دوژمنیش، هەر موویەک لەبەرازێک بێتەوە. . بۆ خۆم. لەو لادێیانە دەبمە مامۆستای شۆڕش، زۆرم لەسەر مامۆستای شۆڕش بیستووە. پێگەیاندنی منداڵان چ لە شار، چی لەلادێکان، هەریەکە، بەڵام بە گوێرەی ئەو خوێندکارانەی لە لادێیەکانەوە بۆ خوێندن دەهاتنە شار دەیزانی کەس لە لادێکان نەماون و ئەنفال و کۆمەڵکوژی کراون، وزەی چەند تۆپێکوە ئاگای هێنانەوە، دنیا بەرەو ڕووناکبوون دەچوو، دەنگی کۆپتەر و فرۆکەی جەنگی دەهاتە بەر گوێ، گرمەگرمی تۆپ و بۆردوومان هەتادەهات زیادی دەکرد. نزیکتردەبوونەوە هەنگاوەکانی گورجترکردن، لەسەر سەریەوە باڵە گەورەکانی کۆپتەرێك وزەی هاتوو تێیەڕی، خوێیدایە بن گاشە بەردێك، دانەیەکی کە، بەڵام ئەوەیان هەرچەندە بەرزتر بوو زۆر گەورەتربوو زانی ئەوجۆرەیان کۆپتەری حەماڵ و بارهەڵگرە و بۆ گواستنەوەی سەرباز و کەلوپەلی جەنگییە، وا دیارە لە پێشمەوە هێز دادەبەزێنن، دابەزین دابەزین، چەکەکەی لە شانی کردەوە، بە تووڕەبوونێکەوە میلەکەی هێنایەوە، لەبەر خۆیەوە ڕیزێک فیشەکی بە ئاسمان و چواردەوری خۆیدا تەقاند شانەکانی لەرزین، دیتی چۆن بەتیژی گرەی گوللەکان سنگی تاریکیان شەقکرد و بەدووی یەکدا وەکوو دەنکی تەسبێح لە پێشبڕکێدابوون، حەزی دەکرد لەگەڵ گورزەئاگرەکان بەخێرایی ڕەشەبا لەوناوە دوورکەوتبایەوە. ماوەیەک

چاوشەکەتەکانی بە ئاسماندا گێڕا، هەستی بە قورسی سەروشان و ملی کرد، سەری بەردایەوە. کۆمەڵێک قەوانی بۆش لە تەنیشتیەوە کەوتن، دانیەکی هەڵگرتەوە گەرمگەرم دووکەڵ و بۆنی باردووی سووتاوی لێدەهات، لەگەڵ بۆن و دووکەڵی لوولەی چەکەکەی یەک بوون، زۆر سەری سووڕما هەروا بەو خێرایە فیشەکەکان دیار نەمان، بەرەوکوێ چوون، داخوا هێلانەیان ماڵی کێیان کاول کردووە، لەکارە نابەجێیەکەی زۆر پەشیمان بووەوە، ئەو هەموو فیشەکانەم بۆ بەفیڕۆدان، لەوچۆڵەوانییەی هاوەڵ و هاودەمێکی باشی بوون. سوودی تەقاندیان چی بوو، بەڵام ئەگەر دوژمنی بەرامبەر بوایە، گوللەکانی بەفیڕۆ نەدەڕۆیشتن، بزەیەک گرتی ئافەرینی خۆی کرد، بزانە چەند بە خێرایی فیشەکاکانم بە ڕێ کرد، وای کە بە تیژی بە ئاسمان بە پەرش و بڵاوی لەچاو بزربوون، بزربوونی چی بۆ هیچی بەچاوی خۆی دیت، چەند گڕەناگرێکی سەرخڕ لەچاوتروکانێکدا هەڵبوون و بزربوون، چەکەکەی هەڵسوور و داسووڕ پێ کرد، سێ پیت نووسرابوون، ج، م، ش، ژمارەیەک لەسەر قۆنداغەکەی هەڵکەندرابوو، بەڵام سووتابوو بۆی نەخوێندرایەوە، ئای پیرە کلاشینکۆف، خودا دەزانێت، کەللە و سەر و مێشک و دڵ و جگەری چەند کەسی دڵ پڕ لە هیوات دەرزی ئاژن کردووە، چەندان منداڵت هەتیوکردووە، ماڵی چەندین خێزانت بە چەند فیشەکێکی گێل کاولکردووە، یان بە بارێکی کەدا ژیانی چەندین کەست لە مردن ڕزگار کردووە، بەڵام تاوانەکانت لە کارە باشەکانت زۆر زیاترن، یەکێک لەهەرە کارە جەرگبڕەکانت ئەوە بوو، باوکم هەتا دوا هەناسەی ژیانی هاواری کرد، چەک دووژمنە، شەیتانێکی ماڵکاولکەرە، ڕۆڵەکانم لێتان وەسیەت بێت، بۆ ئەوەی پاش خۆشتان باس بکەن، چەک گەورەتین پەتاو نەخۆشی مرۆڤایەتییە، ئامان بەلای چەکدا نەچن، کەچی ژیانیشی هەر بە چەک کۆتایی هات، لەگەڵ کۆمەڵێک کەسی گەڕەکێ، گوللەباران کرا، چەند ڕۆندکێکی گەرمی تازە چاوەکانی شلوێو تەڕ کرد، ناچارم بابەگیان، گەردنم ئازاد بکە، نەمتوانی ئاوات و وەسیەتەکەت ببەمە سەر. ئەوەتا وەکوو کۆرپەیەکی ساوای خۆشەویست چەکەکەم کردووەتە باوەش، فرێیبدەم بەدوامەوەن، لەناوم دەبەن، ناچارم بەرگری پێ لەخۆم بکەم، گفتت دەدەمێ هەر کە گەیشتمە ناو برا پێشمەرگەکانم دەستبەرداری دەبم! پەیمانت دەدەمێ. هەستایەوە بە جەستە و دەروونێکی تێکشاوەوە بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتنەکەی، لەدوورەوە دیاربوو، شارەزای ڕۆیشتنی ناو شاخ و دۆڵ و

بەرد و دار نەبوو، بەخێرایی دەڕۆیشت، هیلاك دەبوو، پشووی دەدا، لەباتی ئەوەی لەسەرەخۆ بە پشوودرێژی بە ڕێگا پێچاوپێچەکاندا سەرکەوێت، ئاسۆیی بۆیەهەڵدەستا، بۆیە زوو هەستی بەشلی قاچەکانی و لەرزینی ئەژنۆیەکانی کرد. چەند تۆپێك لە پێشی بە عەرزی کەوتن، پڵتەیان هات ئەتەقینەوە، دووکەڵی ڕەنگاوڕەنگیان لێ هەڵدەستا، ڕەنگەکان سەرەتا هەریەکە و لە کونێکەوە دەردەچوون، ڕەش، سەوز، خۆڵەمێشی، نارنجی، پەمەیی، پاشان تێکەڵ بەیەک دەبوون، ڕەشڕەش، یەکسەر زانی مەسەلە چییە، لەولاو ئەو لای لە هەموو لایەکەوە، چیا دابێژرا، بۆنی سیر و سێو، بۆگەنی کوشندە بڵاوبووەوە، کاسەی سەری بنیادەمی کاس دەکرد، پێش کەمێك حەزی دەکرد کەسێکی تووش هاتبا، دەردی دڵی خۆی بۆ باس کردبا و ڕێگا نیشاندەری با، بەڵام ئێستا لەدڵەوە حەز دەکات لەوناوەی کەسی لێنەبێت. هەتا کەس بەبەر نەکەوێت. هەناسەی تەنگ بوو، دەمو لووت و قوڕگ و سیەکانی دەستیان سووتانەوەیەکی بەهێز و پاشان بەئازارکرد، ئەو گۆڕانکارییە ترسناکە چی بوو وا بەخێراییی بەسەریدا هات، هەتا چەند چرکەیەک لەمەو بەر چاوەکانی بچووکترین گەردیان لە دوورترین شوێنەوە بەتاریکیش بەدی دەکرد، کەچی ئەوەتا چاوەکانی دەڵێی خۆڵ و لمیان تێکراوە و دەرزی ئاژنکراون، دەستەکانی وەکوو پۆڵا چەکەکەیان دەگرت، کەچی نەک هێزی هەڵگرتنی نەماوە، بەڵکوو بەشانیەوە ناوەستێت، ئەژنۆکانی هەستیارترین شوێنی لەشی بوون، وا شەکەت و ماندوو بێهێزن بەزۆر خۆی بەسەرپێوە دەگرێت، واهەستدەکات خەریکە بە چۆکدا بێت و بکەوێتە سەرزەوی و تەواوی ئێسقانەکانی لەشی نەک تووشی ئێسکە نەرمە و شلبوونەوە بوون، بەڕادەیەک وادەزانێت ورد و خاش بوون، هەموو ئەندامەکانی جەستەی لەیەکڕا هاوار دەکەن، ئەو بۆگەنی و ژەهرەمان لێ دوورخەوە، چی دیکە بەرگەی ناگرین، ئەوە هەر بە بۆنەکەی بەبێ ئەوەی ڕاستەوخۆ بەسەر جەستەی کەوتبێت، ئەدی ئەگەر بکەوێتە ناو مندی گازەکەوە، دۆزەخی نیشاندەدات، چەند بەبێ بیرکردنەوە و بێبەرنامە دانان دەرچووم، خۆ لەوانەیە بیرۆکەی لەلای مامۆستا هاوڕێیەکانی باس کردبا، هەموویان لەگەڵی ڕێک کەوتبان، هەتا سەربازەکانیش زۆریان لەو بارودۆخە هەتا سەر ئێسقان ناڕازی بوون، تەنها جاشەکان نەبێت، واتدەزانی بۆ ماڵی بابەییان یان بۆ مزگەوتێ دەکەن، وەها بە دڵسۆزی ئەوەندە داخ لە دڵ. جاشایەتی و پاشایەتی، نە وەڵڵا جاشایەتی و ڕووڕەشی، ئابڕووچوون. نەدەکرا

ئەو ڕێگایەی ئەمیان هەڵبژاردبایە! بەڵام ئەوەش گاڵتەی منداڵ نییە، چەند دەگەڕێت و چاو و دەگێڕێت، نەکانیاوێك نەچەمورووبارێك، ئای خودای گەورە تووشی چ ڕۆژێکی ڕەش هاتم! لەگەڵ هاتنی هەر گوللە ڕاجیمە و تۆپێك کە باڵندەکان لە شەقەی باڵیان دەدا و ڕووەو بەرزایی هەڵدەکشان، هەتا شەو بوو لە چەند شوێنێك، قووڵکە ئاگر دیار بوون، لەوانەیە هی شوان، یان پێشمەرگە بوبێتن، بەس ئەوجارەش کەسێکم دیتبا، لەو تەنیایە کوشندەیە وەختە دڵم دەردەچێت. لێرە لە تەنیایی و لەسەربازگەکەش لە قەرەباڵخی وەڕەس بووبوو. دنیا تەواو ڕووناك بووبوو، هێشتا هەر تەنیایە و کەسی لێ بەدیار نەکەوتووە، بەدەم ڕێگاوە چاوی دەگێڕا، داری میوەیەك، سەوزەیەك، هیچ شتێك نییە بۆ خواردن، هەتا گژوگیا و ڕەوکێک نییە بە کەڵکی خواردن بێت، باشە بۆشتێکی لەگەڵ خۆی نەهێنا، چەند بە پەلە سەردەکەوت، بۆگەنیو و کەمتردەبووەوە. دەمی وەها وشك بوو، مەتارەی ئاوەکەشی لەبیر چووبوو، هەر هیچ نەبوایە چەند سەموونە ڕەقەیەکی لەگەڵ خۆیدا هێنابا، لەوان سەموونە ڕەقانەی فڕێیان دەدان، باشە ئەگەر پێشی بایە، بەچی نەرمی دەکردنەوە، هەتا باڵدار و قاز و مراوی کە قووتیان دەدان لەبینیان گیردەبوون، هەر سەموونێک بە کەندوویەک ئاو ناخووسێت، ئەوەندە کۆن بوون کەڕەکیفە و کەڕووی لێدابوون، لەباتی ڕەنگی بۆر یان قاوەیی، سەوزهەڵگەڕابوون، ئاخ دانەیەکم لەو سەموونانە بەدەستەوە با، بزانە قەمپاڵی چۆنم لێ دەدا.. وای زانی هەرکە لە سەربازگەکە دەرچێت، بە چەند کاتژمێرێك دەگاتە پێشمەرگە.

کەچی ئەوەتا ئەو ڕۆژەش دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ وەختە، هەر بەرەو سەر بەناو گابەرد و تاوێر و، دڕکو داڵدا ڕێگای دەکرد، وەك باڵندەیەکی سەر لێشێواو بە دوای هێلانەکەیدا بگەڕێت، ڕوو لەهەر لایەك دەکات چەند تۆپێك لەولاو ئەولای بە عەرزی دەکەوتن، زۆر شەکەت و پرزە لێبرا بووبوو. بیری دەکردەوە ئەو بارەگرانە بە شانی خۆم داداوە، سوودی چییە؟ بۆ هەتا هێزم تێدایە تووڕەی نەدەم، بەڵام ئا سەبرکە لەوە بۆیە کەس بیری لە هەڵاتن نەدەکردەوە، بۆ عەرەبەکان ئەوە هیچ، هەر کەسێک بیری لەهەڵاتن کردبایەوە ماڵ و منداڵ و کەس و کاری تێدادەچوو، پاشان زۆریان ئەو جەنگە نەک بە هی خۆیان و ڕەوای دەزانن بەڵکوو بە ئارەزووی خۆیان بوونەتە سووتەمەنی، بە جەنگی ڕزگاری دەزانن، بەڵام ئەدی کوردەکە چی؟ئاخ تینوویەتی. بەس ئەوجارەش پڕ بە ناودەمم

گووپەناکم پڕ ئاوکردبا، مەلاشووی بەگەروویەوە نووساوە، ئاو، ئاو چۆڕێک ئاو چکێک ئاو بەس بەشی ئەوەندەی کردبا، ناودەمی تەڕ کردبا، زمان و ددان و شەویلاکی تەواو لەکار کەوتوون، تالاییەک لەگەدە خالیەکەیەوە بۆناودەمی دەگەڕایەوە، بیری کردەوە، لە زۆر کەسم بیستووە میزی خۆیان خواردووەتەوە، بەلام کە ئاو نەخۆیەوە میز لەکوێ دێت، هەست دەکات نەک لەکەمەریەوە، بەلکوو تەواوی جەستەی وشک بووە و تەڕاتی تێدا نەماوە. لەبەرامبەریەوە سەوزاییەکی بەبەر چاو کەوت، بە هێلێکی باریک بەرەو خوار شۆربووبووەوە، سەوزەلانی لە هیچ شوێنێك بەبێ ئاو نابیت. هەموولایەک سەوزە و ئاو نییە، بەچەنگەچڕێ و بە سینگە خشێ بە هەورازەکەدا خشا، لەو دەمەیدا خۆی وەکو گیانەوەرێکی پرزە لێبڕاوی خشۆك دەهاتە بەرچاوە لێلەکانی، ئەو خشخۆکانە چۆن دەتوانن بە درێژایی ژیانیان بەسەر زەوی بەستەلەك، داخکراو و سووتاو لەسەر سك بخشێن، چەند بۆی دەخزێ سەوزەلانییەکە لەبەر چاوی گەرمتر و کەسکتر دەبوو، ڕوومەتی لێدەخشاند شێیەکە فێنکایەتیەکی پێ دەدا، زمانی بە نەرمە گیایەکدا دینا، گازی لێدەگرت، کوزەلەی پەلک نەستووری تەڕی بەبەر ددانی دەکەوت، چەند لەسەر سک دەخشا بەرەو سەر کوزەلەکان تەڕتر و ئاودارتر دەبوون، لەو کاتەیدا ئەو تەڕاتییە پێی لە ڕووبارەکەی بەردەمی سەربازگە گەورەتر بوو، جۆگە ئاوێکی دۆزیەوە ئاوێکی لێلی پێدادەهات، بینی بە ئاوەکەوە نا، ئەوەندەی تینو بوو، بە هیچ دەمی لە جۆگەلە نەدەکردەوە، لەگەل قوتدانی ئاوە لێخنەکە قەوزە و گیا و مێش و مەگەز قورتقورت بە گەروویدا دەچوونە خوارێ، تووشی سەر سووڕان بوو. هێلنجی دەدا، گەدە و ڕیخۆلە وشکهەلاتووەکانی بە یەکدادەچوون، قورس دەبوون، لەبەر چاوی بنار دەچووە سەر چیا و چیا بەرەو خوار دەچوو، دار و دەشت و سەوزایی، لەگەل هەموو داروبەردی وەکوو چەرخ و فەلەك بە دەوریدا دەسووڕانەوە. وای هەست دەکرد ئەوە کۆتاییە، باز و قەل و دال بەسەرسەریدا لەبەرزایی بە چوار دەوریدا دێن و دەچن، بالەکانیان شل دەکرد، هێواش، هێواش، بۆی دادەبەزین، تاوێك دەنووکە درێژەکانیان بە بەردە نووکتیژەکان زیاتر تیژ دەکردەوە، پاشان هەلقووت هەلقووت بە دوو بالی گەورەی شورەوە بە پارێز لێیدەهاتنە پێش، بۆ ئەوەی لەگەل چەند دەنووکێك ونجرونجری بکەن، سەرەتا لە دوور تەنها ملەنەستوورەکەیان درێژدەکەن دەنووکێکی وەکوو نوقرچێك لە ناسکترین شوێنی

دەدەن، چەند هەنگاوێك دەگەڕێنە دواوە، بزانن هەست بە ئازار دەكات و هیچ كاردانەوەیەكی بەرامبەریان نابێت، دەهاتە بەر چاوی سەرەتا لەگەڵ هەر دەنووكێك وەكوو ئەوەی سووژنێكی پێدابكەن، ئەو شوێنە داخ دەبێت، پاشان خوێنێكی سوورسوور لە كونە زۆرەكانەوە دەر دەچێت، لە ماوەیەكی كورتی كەمتر لە چركە كێشانێك كونەكان دەبن بە دە، بە سەد بە هەزاران، خوێنە سوورەكەی بە دەنووكە زەردەكەیانەوە دەبێتە قاوەی، جۆگەلەیەكی بارێكی لیخن وەكوو ئەو زەرداوە، بەرەو خوار ڕێچكە دەبەستێت، مێش و مەگەزی هەموو بنار تێیدەئاڵێن، ئەوەی لە پاشی دەمێنێتەوە، پەیكەرە هێسكێكی سپی بێ گوشت و دەمار و پێست و مووە، بێ هەست و ئەست هەڵدەستێتەوە لەشی سووك بووە بە سەر تاشەبەرد و دڕك و داڵدا وەكوو ئاسكێكی لەش سووك هەڵدەبەزێتەوە، چی دیكە پێویستی بە ئاو و خواردەمەنی و ڤیتامینات نییە، شەڕی ژیان كوتایی دێت، بە ناو تاوێرەكاندا بازە و بازیەتی، ئەگەر بێت و وەكوو جاران لە چالاكی قوتابخانەكان بە شداری كێبركێی خوێندكارەكان بكات لە پێش هەموویانەوە دەبێت، چونكە ترسی بەربوونەوە و پێست ڕووشان و بریندابوونی نییە، بەشێوەیەك غاردەدا كە س نەیگاتێ، ئێستا دەتوانێت بە ئاسانی بە دوای پێشمەرگەكاندا بگەڕێت و بیاندۆزێتەوە، بەڵام بە و حاڵەوە ببینن چەند چلە ئێسقانێكی سپی چەكێكی بە شانی داداوە، سل دەكەنەوە بە بەر فیشەكی دەدەن، چەند كون لە سەر لاشە و گوشتە نەرمەكەی پێش چەند سائێك هەبوون سەد ئەوەندە لە ئێسقانەكانی، كە متیارەكان بە مشەمش دێن، لە گەرمەی غاردان پێیەكانی دەكرۆژن، پەیكەرەكە دەگەڕێننەوە بۆ پیرەدای، بە دوو چاوی تەڕەوە دەڵێت، ڕۆڵە ڕۆ لە لاوێكی ئاواجوان نیو توورەكە ئێسقانی هاڕاو ماوەتەوە، چی نیشانی منداڵ و ژن و كەسوكار و دەرو دراوسێ بدەم، ڕۆڵە ڕۆ، بۆ ماموستا جوانەكەم ڕۆ!.. هەر باشە ئەوەندەشی گەڕایەوە و گۆڕ غەریب نەبوو، لەو ترسە هەرچی هێزی هەیەتی كۆی دەكاتەوە سەر یەك بەڵكو بتوانێت جووڵەیەك بكات، بۆ ئەوەی بوونی خۆی بسەلمێنێت و بۆگەكان لە خۆی دوورخاتەوە، بەڵام ئەوان چاوەڕوانی ئەوەیان دەكرد، لاشەكەی بۆگەن ببێت، لەبەر ئەوەی داڵی كەرخۆر وەكوو بەعس و جاش وایە، حەزی لە نێچر و كەلاكی بۆگەنە، چاوەكانی قەپات كرد، گەدە و ڕێخۆڵەكانی قۆڕە قۆڕەكەیان درێژتر و بەرزتردەبوون وەكوو چەند بەچكە پشیلە یان تووتكەسەگی برسی دەیان

قرووسكاند و دەيان لووراند. ترشەڵۆكێك دەڕژايە ناو دەمی لەگەڵ هەر هەناسەیەكی بەرز و نزمی دەكرد، مێش و مەگەز و مێرووی زەرد ڕەش لە كونی چاوەكانی دەئاڵێن، پارچەی ئەوەندە گەورەیان لە ناوچەوان و لاڕوومەتەكانی دەكردەوە. دە ئەوەندە لە كێش و قەبارەی خۆیان گەورەتر، بەدەم ئازارەوە دەیناڵاند، زیرەی منداڵێك وەڵامی ناڵەناڵەكەی دایەوە لەزیرەی منداڵێك وەخەبەرهات، بەڵام تاكە دەنگێك نەبوو، بە دەیان دەنگی زیقن پڕ بە گەرووبان وەكوو زەنگی پشوو یان كاتی لە مەكتەب بەربوون، هاوارییان دەكرد. ماموستا، ڕابە سەرخۆ.. كاتی دەرس خوێندنە، پێڵوەكانی جووڵان، تارماییەك بەبەرچاویدا وەكوو ئاسك تێپەڕی، ئەی خودایە ئەوە چی بوو؟ توانای سەربەرزكردنەوەی نەمابوو، دنیا لەبەر چاوی بووبووبە تەڕاویلكەی دوور، دوور بوو، دووبارە چاوەكانی لێك نانەوە، منداڵ لەو شوێنە دوور لە ئاوەدانییە چیدەكات؟ ئەوجارەیان كەسێك بانگی كرد هەستە! هیچ وەڵامی نەبوو، بە ئاستەم دەستێكی جووڵاند بۆ ئەوەی نیشانیان بدات زیندووە. كاتێك چاوی كردەوە چەكەكەی پێنەمابوو، چوار چەكداری ڕیشنی چڵكن بەسەر سەرییەوە وەستاون، ئەتۆ كێی؟ هێشتا وەڵامی نەدابووەوە، چكارەی؟ توانای وەڵامدانەوەی نەمابوو. لەبرسان و لە بۆنی گازی ژاراوی پرزەی لێبڕابوو. سەری بەسەر ملیدا لاربووەوە، هەموو هێزی خۆی كۆكردەوە، بە دەنگێكی نووساوەوە بەكزی تینی دایەخۆی، مامۆستام. چەكدارەكان دایانە قاقای پێكەنین، لە ژیانیاندا مامۆستای لەو جۆرەیان نە دیتبوو بەو جلوبەرگانەوە، وا پڕ چەكە، وادیارە مامۆستای مۆدێرن، جیاوازن لەگەڵ كۆنەكان. لەجیاتی خامە چەك و لەجێی شارلستۆن پانتۆڵی سەربازی لەبەر دەكەن، دوژمنان كەم بوو مامۆستاشی هاتە سەرێ، ڕاستیان كردەوە، ڕەخت و فیشەكدانیان لێكردەوە، دووبارە لەسەر سەوزەگیا درێژیان كردەوە.. دەنگێك بە تووڕەییەوە، كاك شاهۆ دەستی ببەستین؟ دەنگێكی میهرەبان وەڵامی دایەوە، نە بابە گوناهەچی كردووە، بزانین چی بەسەر هاتووە. بردیانە سەر كانی دەموچاویان شوشت، هەندێك هاتەوە سەرخۆی، چەند پارچە نانیان بەناو بۆ تەڕكرد و بە خووساوی خواردی. وەكوو جوجكە مریشك ملی لار بووەوە، هێڵنجی دەهاتێ، چاوەكانی سوورسوور، بە نووزەییەكەوە پرسی (ئێوە كێن؟) هەمان دەنگی كە داوای دەستوپی شەتەكدانی دەكرد، لەسەر ناوازی كەمێك لەمەوپێش دیاربوو ڕقەكەی نەنیشتبووەوە، شیڕاندی بەسەریدا،

ئەتۆ هەقی پرسیارکردنت نییە! دەنگە ئاشنا میهرەبانەکە وەڵامی دایەوە، ئێمە پێشمەرگەین.

کەمێك سەری بەرز کردەوە، ئەوە ئەو ئاوە بوو لە کەنگێوە وەکوو دەرمانی چاوهێشە بە دوایدا وێڵ بوو، دواجار بە دەمی خۆیان بەدەنگی ئەوان گوێی ئەک لەو ئاوە پیرۆزە بوو، بەڵکوو بەدیدارییان شاد بوو. هەناسەیەکی شادمانی هەڵکێشا بە ئاوات و ئامانجی خۆی گەیشت، بە قوربانتان بم، زۆر بە دواتاندا گەڕام، فرمێسک لە چاوەکانی هاتن، دەستی بۆ بەرز کردنەوە. باوەشی پێداکردن، هەریەکی چەند جارێك ماچی کردن. براینە ناهەقتان ناگرم، لەگەڵ قووتدانی دوو سێ پارچە نانی خوساو.. لە کەنگێوە بە دواتاندا دەگەڕێم.

ئەتۆ سەربازی؟ کاکە من بۆ خۆم مامۆستام، بەڵام سێ مانگەی هاوینێ مەشقی سەربازیمان پێدەکەن، لە دوێنێ شەوێوە هەڵاتووم، شاهۆ بانگی تەواری کرد. تەوار.. تەوار لەپشت دارێك خۆی شاردبووەوە، کاتێك تەوار کاکی سەربازی دیت بەو جلکانەوە ترسا. وەرە، وەرە مەترسە مامەیە! مامۆستا سەرباز. تەوار هات، بەڵام لێی نزیك نەدەبووەوە، دووروونزیك چاودێری دەکرد، ڕووی لە شاهۆ کرد: ئەوە کچتە؟

شاهۆ تەماشایەکی تەواری کرد، ئەوجا برادەرەکانی، تەواری لەباوەشگرت: لەداری دنیا بەس ئەوکچە شیرینەم ماوە!

ڕووی لە برادەرەکەی کرد، شاڵاو چەکەکەی مامۆستا سەرباز بکەڕێنەوە. شاڵاو چەندجار چەکە قوڕاویەکەی ئەودیو و ئەودیو پێکرد، بە بە لچکی پشتێندەکەی پاکی کردەوە، چەکێکی جوانە! ئاخر کاك شاهۆ کێ ناڵێت ناپاك نییە؟ لە سەرتاپای مامۆستای دەڕوانی، پاشان ئەو قوڕبەسەرە توانای چەکهەڵگرتنی نەماوە. مامۆستا و شاهۆ زۆریان پێناخۆش بوو، کاکە کێ تاقەتی هەڵگرتنی چەکی ئەمی هەیە. پێشمەرگەکە ڕەشاشێکی ئاربیکەی قۆنداغ داری پێبوو، لەگەڵ کەلانشیکوفە سیخۆیەکەی کاکی سەرباز گۆڕیەوە، ڕەخت و فیشەکدانەکەی خۆی دا بەکاکی سەرباز و هی ئەمی لەبەرکرد، قایشی ڕەختەکەی بۆی گەورەبوو تەسکی کردەوە، شاهۆ بە پێشمەرگەکەی گوت، چەکەکەی خۆی بدەوە، مامۆستا بە شاهۆی گوت، نا گەنجە دڵی پێ خۆش دەبێت، پێشکەشی خۆت بێ، پێشمەرگە لاوەکە چەکەکەی هەر بەدەستیەوە بوو، خێرا خێرا، یاخوا بەخێر بێیت، سەر چاوی شاڵاو، لەسەربازەکە نزیك بووەوە

تۆپەڵێك بنێشتی لە باخەڵێکی فیشەکدانەکەی دەرهێنا بەوەیانەوە گۆڕینەوەکە زۆرم زەرەرە.. بۆ خۆت دەزانی ساقی بێ باقیەکەمان بێبەرامبەرە، تۆپەڵێك بنێشتە تاڵی لەدەمی خۆی ناو کەمێکیشی ئاخنیە دەمی تەوار. تەوار هەرچەندی دەکرد دەمی قەپات نەدەبوو، شاهۆ بنێشتی دەمی تەواری کردە دوو بەش و بە پێشمەرگە لاوەکەی گوت، خەریك بوو شازادەکەمان بخنکێنی، پێشمەرگەکانی دیکە هەریەك لەبەرخۆیەوە کەوتە سەر زەنشتکردنی، قەد ئاقڵ نابێ. هەرچەندە مامۆستا تەواوی جەسەتەی داهێزا بوو، بە تامەزرۆییەوە تەواری کردە باوەشی، کاسکێتەکەی خۆی کردەسەری، تەوار پرچەزەردەکانی چڵکن درێژ لەژێر کاسکێتەکەوە لوول بەسەرشانەکانیدا شۆڕبووبوونەوە وەکوو شازادەیەکی نازدار دەهاتە بەر چاو. مامۆستا بەدەم ماچکردنی تەوار، ئەمنیش دوو کچم هەیە، شەش ساڵی و دوازدە ساڵانن، شەش ساڵییەکەیان تازە چووتە بەر خوێندن، واتە پۆلی یەکە، ناوی شکۆفەیە ئەوی کەیان دوازدەیەکە وەنەوشەیە لە پۆلی شەشە..

لەڕێگا بەدەم گێڕانەوەی بەسەرهاتی هاتنی جاش و سوپا، زوو زوو ئاگاداری دەکردنەوە، بە تەمای شالاوێکی گەورەن بەهێزێکی بێشومار لە هەموو بەرەکانی جەنگەوە بەچەك و جبەخانەیەکی زۆر پەلاماری چیا و بنار و پێشمەرگە دەدەن، ئامان خۆتان بشارنەوە دەرهەقەتیان نایەن، چاویان سووربووە، دڵییان تژی لە ڕق و کینەیە. چەندبوون، چۆن بوون، چیان لەبەردابوو، هەرهەمووی بۆگێڕانەوە. شاهۆ زۆر پرسیاری لێ کرد، ژمارەیان چەندە؟ بەتەمای چین؟ لەکوێوە دەیان هەوێت هێرش بکەن؟ مامۆستا لەو هەموو چەک و جبەخانە و سوپا بێشومارە سەرت سووڕ ئەمێنێت، ئەوە کاری ئەمڕۆ و دوێنێیان نییە، زیاتر بۆ خۆدەرخستن و شاردنەوەی شکست و ورەی داتەپیویانە، پەلەپرووزەی مەرگیانە، وانەزانی ئێمەش هەروا دەسەوستان دادەنیشین، لە هەموو لایەنێکەوە شەن و کەومان کردووە و لێکدانەوەی وردمان بۆ کردووە، وەک هەموو جارێک پەلاماری شاخ و گوندەکان دەدەن، تۆپبارانێکی خەست، بۆمبارانێکی چڕ، پاشان هێرشێکی بەپانی، کاولکارییەک دەمێننەوە، خەڵکی بێتاوان و بێوەی لەناو دەبەن، هەرچی گازی کیمیایی هەیە دەڕژێنن بەسەر سەری خەڵکیدا، پاشان بە سەرلێشێواوی هەڵدێن. تەوار دەستی لەناو دەستی شاهۆ بوو ئەو پشووە کورتەی بەهەلزانی، کەوتە پرسیار کردن.

مامه شاهۆ. ئەدی گدی چی لێهات؟

شاهۆ ڕەنگی بزڕکا، ماوەیەك تەمەشای هاوڕێیەکانی کرد. ئای چ پرسیارێکی قورسە، خوادەزانێت، گدی ناوی کام قوربانی خوشك یان برایەتی بە تەواوی بۆی نایەت، هەر چەندی کردی لەگەڵ مامۆستا بەردەوامبێت لە سەر وتووێژەکەی و کەمێك پەرێشانی و شێواوی ڕووخساری بشارێتەوە، بێدەنگ بوو، ئەوە ئەو پرسیارەیە ماوەیەکی دوورو درێژە لە بیر و زەینی خۆی دادەهێنێت و دەیبات، وەڵامێکی سادەی وەکوو پەرەی دڵی ناسکی منداڵ بێت، کەچی ئەوەتا هیچ وەڵامی پێ نییە، خۆی لەپرسیارەکەی گێل کرد، پێشمەرگەکان واڕاهاتبوون، ئەگەر لە گیانەڵا بووندابان دەبوو داواکاری یان ئازاری تەوار تەواو بووبا، ئەوجا باوەشیان بە مەرگدا کردبا، هیچ فەرمانێك پێش ئارامکردنەوەی دڵی گوشراو و توراوی تەوار بەرامبەر هەموو شتێك نەدەکرا. شاهۆ بە دووچاوی پڕ لەپاڕانەوە، کەوا بە ئاشکرا نە ك کوتەکوتیان دەکرد، بەڵکوو هەڵدەپەرین، یارمەتیم بدەن چی وەڵام بدەمەوە، وەکوو خوێندکارێک بەرامبەر پرسیارێکی کۆتای دۆش دامابێت و چارەنووسی بەو تاقیکردنەوە گرێ درابێت و نەیزانێت، ئەگەر وەڵامێکی ڕاست نەداتەوە، دەکەوێت و ڕەنجبەخەسار دەچێت، هاتوچۆی یەک ساڵی بە فیڕۆدەڕوات، کەسیش نییە لە یارمەتیدانی بۆ حەلکردنی، ئەی پەڕ و پرسیارە دڵڕەقەکە، هەی مامۆستا و چاودێرە بێبەزەییەکان، فریام کەون. هۆ هاوڕێ و هاوسەنگەرە لەمێژینەکان، خۆ ئێوە هەتا ئەو چرکەیە مامۆستا و هاوسەنگەرم بوون، بۆ دڵڕەق و بێبە زەیین، قسەیەک بکەن نقەیەک. بۆ وا بێدەنگ قڕوقەپتان کردووە، بابەت بگۆڕن. بگریەن پێبکەنن هەرچی دەیکەن بیکەن، لەوپرسیارە گورچکبرە ڕزگارم کەن، گاڵتەم پێبکەن سەرزەنشتم بکەن، کوڕە لۆمەم بکەن و هەتا جنێوم پێبدەن، پێمڕابوێرن، تووڕەنابم، دڵشاد دەبم، لەوساتەوەختە دەگمەنە ئەو شاهۆیەی بەرێ نەماوم. بۆ هەموو گرفتێک چارەسەرێکم پێبێت، بۆ هەر پرسیارێک وەڵامێکی بەجێ بدەمەوە. وەڵامم پێ نییە وا بە خێرای ئارەقەی شەرمەزاری نەک تەوێڵم بەڵکوو مووڕەغەی پشتم تەڕدەکات. ناودەم و گەرووم وشکهەڵاتوون، زمانم نایەتە گۆ، کام زمان هەتا وەکوو شمشێرێ دووسەر و تیژ و کاریگەر و خۆشبڕ بێت، دەتوانێت سەر لە کالان دەربێنێت، پێش ئەو پرسیارە سادەیە کەسێک بووم و ئێستا کەسێکی کە، نازانم چ گۆڕانکارییەکی باش یان خراپ بەسەرمادا هاتووە، هەر ئەوەندە دەزانم لە چاو ترووکاندنێکدا هێزی

لاویەتی و جوانیم لەدەستدا، لەپڕدا پیریم هەست پێکرد، تێگەیشتم زۆر لەوە گەردەل ترم و کوولّترم بتوانم دڵی ڕەنجاو و ناسکی تۆم پێڕابگیرێت، من ئاوام ئەدی هاوڕێیەکانم بۆ وا مۆمیاکراون، وەکوو ئەوەی چەند هەزار ساڵ بێت، لەناو گۆڕدا تاقەت کرابن، ئەدی مامۆستا، دەمی وێکنەدەکەوتەوە، باسی هەمووشتێکی دەکرد چاوەڕوانی پرسیار و وەڵامی نەدەکرد، سکی پڕ قسە بوو، کەچی ئەویش وەکوو ئەوانی کە هەر هەموویان خۆیان لە نیگاکانی هەر دووکمان دەدزنەوە.. ئەتۆش دەڵێی پرسیارەکە ئاراستەی تۆ کراوە، هەر خۆدی خۆت دەتوانی وەڵامێك بدەیەوە، بۆ خۆت سەرپشکبە و چاوەڕوانی یارمەتی ئێمە مەکە. تەوار زانی وەڵامی دەستنەکەوت، بە دەم هەناسەیەکی درێژی پچڕپچڕەوە. گوتی، دەزانی گدی کێیە؟ ئەگەر بمزانیبایە بەبێ پێچوپەنا و بەسادەیی وەڵامم دەدایەوە. هەرخۆی وەڵامی خۆی دایەوە. کاریلەیەکم هەبوو ناوی گدی بوو. شاهۆ ئاهێکی بەبەردا هاتەوە، کەواتە تەوار هێواش، هێواش، هۆشی دێتەوە سەرخۆی. کردیە باوەشی. تەوار گیان. گدی.. گدی کارەکەم، من دێم لەدەستم ڕامەکە! گدی، گدی، کارە سپی، تو من ناناسیت؟ گیات دەدەمێ، گیا، نەترسیت. بەخوای هەر ئەوەندەشم لەبیر ماوە، ئەوەشم بەخۆشی تۆ بەبیردا هاتەوە، کاریلە سپیە تووکنەرمەکەت، دوو گوێیەکانی قاوەیی بوون، لەبەرچاومە.. لە بناری کارۆخ لەلای ماڵێك بەجێمان هێشت، دۆست و ئاسیاوی خۆمانن هەتا بۆمان بە خێوکەن پێش شەش مانگ بوو، ئێستا بووە، بە کاوڕ، پاشان دەبێت بە بەرخ. کە زۆر گەورە بوو دووگی نەرمی تەواو شۆڕبووەوە دەبێت بە مەڕ، شیردار دەبێت و ئەو کاتە دەچین دەیهێنینەوە، بەڵام باوەڕناکەم بیناسیەوە. تەوار بێدەنگ بوو، بیروهۆشی هەر لای کاریلەکەی بوو، ئێستا گەورە بووە گوێیەکانی پانتر و شۆڕتربوونەتەوە، لە غاردان و کێبرکێ ناتوانێت پێشی کەوێتەوە، بەو ئاواتەی بە زووترین کات بە دیداری شاد بێتەوە بە شێك لە یادەوەرییە زۆر و زەبەند و بە ئازارەکانی زیندوو دەبنەوە، هەر لە ڕێگای کاریلەکەشیەوە دەتوانێت سەرجەم شتە بزربوو خوشەویستەکانی بدۆزێتەوە.. کە لە ناکاوێک بەبێ هۆ لەدەستی چوون.. بەرخ و ڕەشماڵ و زۆرشتی کەش ماون بەدوایاندا بگەڕێت، بەڵام ئەو کارۆخە دەبێت زۆر دوور بێت. ئەوەندە ڕێگابڕین و ددان بەخۆداگرتنی دەوێت.

پێش ئاوابوونی خۆر گەیشتنە کەڵەمێوێ، لەسەر تاشەبەردێکی گەورەی لووس ئێشکگرێک چاودێری دەکردن، کە کاکی سەربازی بەو جلەسەوزانەوە دەدیت،

چەکەکەی ئاراستە دەکردن، بەڵام کە ئاوا بە ئارامی لەتەنیشت شاهۆوە دەڕۆیشت و تەواری لەسەر شانی بوو، دەستی خاودەبووەوە، بەتەمای زووگەیشتیان لەچاوەڕوانیدا بوو، کاتێکی پێشمەرگەکان لەدەوری ئاگرێکی گەورە کۆببوونەوە، لەنەکاوێک کاکی سەربازیان دیت، زۆر جلکەکانیا لە لا سەیربوو. شاهۆ بەیەکی ناساندن. ئەوە مامۆستا سەربازە، ئەوەش مام کۆسرەتە، یەك یەك یەکتریان ناسی. مامۆستا سەرباز هەر چاوی بە ناو بارەگاکەدا دەگێڕا. ژیانێکی زۆر سەرەتایی، لەچەند لاوە چەکو فیشەکدان هەڵواسرابوون، بەچەند کەلەمێوێکی ئەستوور تەواوی دەربەندە کە وەکوو سابات و کە پرێکی لێهات بوو، چەند بەتانییەکی ونجڕونجڕ کراو لەسەریەك کۆکرابوونەوە، شاڵاو غاریدا سەر پارچە بەتانیەکان. پارچە بە تانیە سەوزە کۆنەکانی خۆی کۆکردنەوە سەریەك، باشە ئەو شەو بەچی  بخەوم؟ مام کۆسرەت وەرە باوانەکەم جێگا زۆرە، لەتەنیشت مامی خۆت بخەوە. پێشمەرگەکان لە دەوری کاکی سەرباز کۆبوونەوە. لەجلکوبەرگ و دەموچاوی ڕادەمان. باشە ئەدی ئەوە تاقمی شاڵاو نییە پێیەوەتی؟ شاڵاو بۆ کاکە بۆ، سەودامان کرد بۆخۆی ڕازی بوو. مامۆستا کەوتە ژماردنی پێشمەرگەکان بێجگە لەو چوار پێشمەرگەیەی لەڕێگا ناسیبوونی، حەوت دانەی کەشی لێبوون، واتە یازدە پێشمەرگە، دانەیەکیشیان لەپێش بارەگا ئێشکگر بوو، ئێشکچی ناوی چالاك بوو، ئەوەی لە دەمی شاهۆ زانی. باشە هەر ئەوەندەن؟ یان ژمارەیان زۆر لەوە زیاترن! بە دڵ حەزیدەکرد ئەو پرسیارە بکات، بەڵام لە ڕووی نەدەهات، هەلی دەگەرم بو کاتێکی گونجاو. مام کۆسرەت پاش خۆشهاتنێکی گەرم، کەوتە پرسیارکردن لە کاکی سەرباز، ئەمیش هەر هەمووی لە نووکەوە بۆ گێڕانەوە، لە ڕۆژانی ماموستایەتییەوە هەتا گوللە بارانکردنی سەرباز و جاشەکان هەتا هەڵاتن و لەهۆش خۆچوونی و دۆزینەوەی لەلایەن تەوارەوە. شاهۆ گوتی، ئەمن و برادەران لەسەر کانی دوورکەوتینەوە، تەوار کەمێك بزر بوو لەپشت جۆگە ئاوێك بە زیرەیەك ئاگاداری کردینەوە. مام کۆسرەت هەستایەوە، بە دوای تەوار دەگەڕا، کوا دادیلوکە! کیژە لێهاتووەکەی بابە گەورەی، بەڵام کاتێك دیتی لەسەر کەپرەکەی شاهۆ خەوی لێ کەوتووە، پەتوویەکی پێ دادا و چەند جار ماچیکرد، بخەوە کچە تاقانەکەم خەوی خێرت بێت. خەونی خۆشخوش! تەوار لە هیلاکیان پرخەپرخی دەهات. جاشەکان هەرچی لەناو بارەگا هەبوو بردبوویان، مام کۆسرەت نیوفەردە ناردی لەدوور

لەناو کۆلکەدارێك شاردبووەوە، لەگەڵ هەندێك ساوەر و شەکر دەرمانچا، مامەی بە ئەزموون چاوەڕوانی هەموو شتێکی کردبوو، زۆر ڕۆژی وەهای بە چاوی خۆی بینیوە، دیتی سێڵ و قۆری و مەنجەڵ نەمابوون. تەنەکەیەکی ژەنگاوی لێ بوو، هەویرەکەیان لەسەر پانکردەوە و نانیان دروست کرد، پاشان بۆ دروستکردنی ساوەر بەکاریان هێنا، پێشمەرگەکان بە فێڵی سەرما و خۆ گەرمکردنەوە، لەبەرامبەر نانە ژەنگاویەکان، دانیشتبوون، بۆنی هەویری خاو و چرە دوکەڵ تەواو سەرمەستی کردبوون. کاتێك دروستبوو، مام کۆسرەت دوو نانی جیاکردنەوە لەگەڵ هەندێك ساوەر، ئەوەش بۆ کیژۆڵەکەی خۆمە، کەنگێ بەخەبەر هات دەیخوات. مامۆستا سەرباز بە ئەدەبێکەوە لە مام کۆسرەتی پرسی، ئەرێ مامە ئەو کچە، کچی کامتانە؟

بۆمامۆستا؟

هەرکەس بە هی خۆی دەزانێت و هەر یەکێک لە ئێوە، وەکوو جگەرگۆشەیەکی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات، بڕوا بکەن لەوەتەی بە خزمەتی ئێوە و ئەو پێشمەرگە بەرێزانە گەیشتووم، ئەو کیژۆڵە زۆر بیر و هۆشمی، دەتوانم بڵێم بە تەواوی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە، بە شێوەیەک دووری منداڵەکانی خۆمم فەرامۆش کردەوە، هەرچەندە شت لەسەر ژیانی دەبیستم زۆر تر تامەزرۆی ناشنابوونی ڕابردووی دەبم. چاوێکی خێرای بە هەمواندا گێڕا، هیچ نافرەتێکیش بەدی ناکەم، کەواتە دایکی لێرە نییە؟ مامەی بە ساڵاچوو، مامۆستا ئەو کچۆڵە جەرگی هەموومانە و کچی کەسیشمان نییە. ئەو شاهۆی حازری خۆی بە باوکی دەزانێت، بەڵام بە قەد من هۆگری نەبووە، ئاوڕێکی بەلای تەوار دایەوە بزانێت خەوتووە. کاتێك گوێی لە پرخەی بوو بە هێواشیەکەوە بەچرپە گوتی، مامۆستا ئەو کیژۆڵە بەستەزمانە بەسەرهاتێکی زۆر جەرگبڕی هەیە، لە خێزانێك بەتەنها لە ئەنفالی دۆڵی بالیسان دەرچووە و تاقانە ماوەتەوە، هەرچەندی دەگەڕێین و دەسووڕێین پرسیاردەکەین شەش مانگە کەسمان وەچنگ نەکەوتووە بیناسێت یان وەخۆی بگرێت. کۆڵنادەین لە شاخ لە لادێ، لە شار لە هەموو کەس پرسیار دەکەین. هەرکە تۆم دیت، یەکەمجار وام زانی لەلایەن هاورێیانەوە بە دیلگیراوی، بەڵام کە دیتم چەکت لە دەستە، بۆچوونم گۆڕا و بیرم بۆ ئەوە چوو لەلایەن هاورێیانی شارەوە ڕێنمایی کراوی بۆ ناو مە، بەڵام وادیارە بۆ خۆت ویژدانت بەرامبەر ئەو ڕژێمە خوێن خۆرە لە عەزابدا بووە و بڕیارت داوە نەك بە قسە و

فەرمانی ئەوان نە جوڵییەوە بەڵکوو دژیان بوەستیەوە، بە هاتنت زۆر خۆشحاڵین، یەکەم پرسیار حەزمدەکرد، بزانم داخوا هیچ دەربارەی ئەو کیژۆڵە نامرادەی دەزانی، یان کەسێکی دەناسی؟ بەڵام دوایی بیرم کردەوە، خۆ هەریەك شار نییە، هەتا ئێستاشی لە گەڵدا بێت، بۆمان ڕوون نەبووتەوە خەڵکی کوێیە! ئەمن بۆ خۆم ئاوها هۆگر و متووی ئەو کیژە بووم، ئەگەر بستێك لێم دوورکەوێتەوە، دەبمە دێوانە و وەزگ دەدەم، مام کۆسرەت دڵی پڕ بوو، وەکوو کەسێکی باوك مردوو لە ناخەوە بۆی دەکوڵا، چاوی لەسەر تەوار هەڵنەدەگرت، پیرەمێرد ئەوەندە گریا، وەکوو منداڵی ساوای بێدایك بەکەس ژیرنەدەبووەوە، هەر پێشمەرگە و لە گۆشەیەك بە غەمبارییی دانیشتن، بەتایبەتی ئەوانەی لە ڕۆژی دۆزینەوەی لەگەڵ دابوون، کاکی سەرباز، لەبەردەم ئاگرەکە لەبیران ڕاچوو، لە دڵی خویدا دەیگووت، ئەگەرچی جگەرگۆشەکانی من لە سۆزی باوکایەتی بێبەشن، هەر هیچ نەبێت دایکیان لەلایانە، لەمەودوا هەم ڕۆڵی باوك دەبینێت، هەم دایکێکی دڵسۆز. ئەنك و مام و خاڵ و ئامۆزا و پووزا و کەسوکار و غەمخۆرییان هەیە، ئەدی ئەو کچۆڵە کڵۆڵە بێکەسە، کێ نازی هەڵدەگرێت؟ هەست و خوشەویستی کچەکانی خۆم هەمووی دەدەمە ئەو پەپولە تەنیایە، زۆر سەری لەو هەستەی خۆی سووڕما، باشە ئەو پێشمەرگانە چەند ئەرکییان بەسەر شانەوەیە، لە لایەك شەڕی درەندەترین ڕژێم دەکەن، بەو ژمارە کەمەی بە بەرچاوەوەن، لەم لاشەوە بوون بە باوك و دایك و منداڵی سێوی و بێکەس، باشە بۆچی دەڵێن پێشمەرگە دڵی یەك پارچەیە لە ئاسن و لەبەرد ڕەقترە، هەست و سۆزی بەرامبەر کەس نییە، ئەوەتا هەتا دوژمنی سەر سەختی خۆیان، بە هەڵخەڵەتێندراو دەزانن و چاوەڕوانن ڕۆژێك بیروهۆشیان بێتەوە سەرەخۆیان و دەست لە خوێنڕشتن هەڵگرن. ئەوەی بە چاوی خۆم دەیبینم، زۆر پێچەوانەی ئەو هەستەیە، باشە ئەدی چۆن شەڕی ئەو ڕژێمە زاڵم و بە دەیان هەزار جاش و چڵپاوخۆر و سوپا جانەوەروانەتان پێدەکرێت؟ ئەوەی بە دەنگێکی بەرز گوت بە بێویستی خۆی. شاهۆ هەتا ئەو کاتە بێدەنگ بوو، مامۆستا مەسەلەی شەڕی دوژمن شتێکی کەیە، بە زۆر بەر بینگی گرتووین چارمان ناچارە، بەسەر زەویدا و بە ویشکانیدا نایەن، لە ئاسمانەوە هەراسانیان کردووین، بە کیمیایی قڕیان کردووین، ژن و منداڵ و پیر و پەکەوتە جینۆساید کران، لەژێر هەورەوە مەرگ دەبارێنن، بەچاوی خۆت ئەگەر ماین دەیبینی، ئەو سوپا زەبەلاحەی باست کرد،

دره‌نگ و زوو به‌ره‌نگاری یه‌کتر ده‌بینه‌وه، ئه‌وجار به چاوی خۆت ده‌بینی، چۆن ته‌فروتوونا ده‌بن، هه‌ڵاتنێك هه‌ڵدێن هه‌رکه‌س زوو فریای خۆی که‌وێت، هه‌ر چه‌نده زۆریان بێ تاوانن، که‌سانی وه‌کوو جه‌نابتن، ماموستان، خوێندنکارن، کاسبکارن، به زۆره‌ملێ هێناویانن بۆشه‌ڕ، که‌س به‌ڕه‌زامه‌ندی خۆیی نه‌هاتووه، وه‌کوو ئێمه نین، بزانه که‌سێکی وه‌کوو جه‌نابت، نه شاره‌زاو ته‌نها به ناو ئاگر و ئاسن و دڕکوداڵدا هاتووی، به دوای پێشمه‌رگه‌دا گه‌ڕاوی... له‌و قسانه‌دا بوون، نێشکگر لاوێکی ڕه‌شتاڵه‌ی له چه‌ك و فیشه‌کدان ڕه‌شداگه‌ڕابوو هات بۆلای مام کۆسره‌ت و شاهۆ. شاهۆ پێگوت، چالاك گیان ببووره برسیته، نه ئه‌وه‌بوو نانه‌که‌ت بۆ بێنین یان بتگۆڕین. لاوه‌که گوێی له‌بن سه‌ری مام کۆسره‌ت پاشان شاهۆ نا، ته‌ماشایه‌کی مامۆستای کرد، مامۆستا ڕه‌نگێکی هێنا و ڕه‌نگێکی برد، سوور هه‌ڵگه‌ڕا، چرکه چرکی سووتانی دڕك و پووش و په‌لاشه‌که وای ده‌زانی له‌ناو دڵ و هه‌ناو و جگه‌ریدا ده‌سووتێن، ئه‌وه ئه‌و چرکه‌ساته بوو نه‌ك به درێژایی دوێنێ شه‌و و ئه‌وڕۆ، به‌ڵکوو سێ مانگه چاوه‌ڕوانی ده‌کرد. ئه‌گه‌ر هات و پێشمه‌رگه‌کان باوه‌ڕیان پێم نه‌کرد و به ناپاك و سیخوڕیان له قه‌له‌م دام. ئه‌و قسه خۆشانه‌ی چه‌ند وه‌خته بۆیان ده‌کردم، بۆ سه‌رگرمکردن و خافڵاندن بوو، هه‌تا بزانن بۆ خۆم به ئاره‌زووی خۆم ددان به‌هه‌موو شتێکدا ده‌هێنم، ئای چه‌ند ساویلکه و گه‌مژه بووم، چه‌ند جار له ناچاوانی خۆی دا، دوو ده‌ستی به‌رز کرده‌وه، گوێ بگرن هاوڕێیان به هه‌رچی باوه‌ڕتانه، وه گیانی هه‌ردووك کیژه‌که‌م، قه‌سه‌م به پاکی و به له‌نگازی ئه‌و ته‌واره نازداره، به‌وپه‌ڕی نیازپاکی و به دڵێکی سافه‌وه، پاکتر له ناوی کانی دوور له هه‌رچی غه‌لوغه‌ش، هانام بۆتان هێناوه، ئه‌گه‌ر باوه‌ڕ ناکه‌ن ئه‌وه چه‌که‌که‌م و بۆخۆتان بێت، هه‌تا ماوم بێ چه‌ك له‌گه‌ڵتان ده‌بم. شاهۆ داوای لێبووردنی له مامۆستا کرد، ببوره ماموستا گیان میوانمان هاتووه، ئێستا ده‌گه‌ڕێینه‌وه خزمه‌تت. پشوویه‌ك بده و ئه‌گه‌ر ویستت ده‌توانی له‌سه‌ر که‌پره‌که‌ی ته‌وار سه‌رخه‌وێك بشکێنه، زۆر شه‌که‌ت و ماندووی، فێری ژیانی پێشمه‌رگایه‌تی نه‌بووی، دوایی هه‌رچی هه‌ته به کاوه‌خۆ باسی ده‌که‌ین. ماموستا هێشتا نه‌هاتبووه سه‌رخۆی وه‌کوو وڕێنه بکات، مانای وایه ده‌توانم بڵێم، باوه‌ڕتان به قسه‌کانم کردووه. مام کۆسره‌ت و شاهۆ و هه‌موو پێشمه‌رگه‌کان باوه‌شیان پێداکرد، شاهۆ پێش ئه‌وه‌ی بڕوات، ماموستا تۆ هاوڕێ و برای ئازیزی، ئه‌گه‌ر هیچ غایه‌له و گومانێکمان به‌رامبه‌رت هه‌بوایه، هه‌روا به ئاسانی چه‌که‌که‌تمان

نەدەدایەوە دەستت. لەگەڵ مام کوسرەت کەمێك لە بارەگا دوورکەوتنەوە، کەسێك لە خوار تاشە بەردەکان، ئەسپەکەی لە دارێک بەست بووەوە و چاوەڕوانی دەکردن، هەردووکیان باوەشیان بەمیواندا کرد، چەندجار یەکتریان ماچ کرد، بانگی چالاکیشیان کرد بهشداربیان بکات.. پاش کەمێك پشوودان، مام کوسرەت ڕووی لە میوانکرد. ها حوسێن چت لەدڵ دایە، هەروا لە هیچ و خۆڕایی بەو ناوەختە و ئافاتە وا بە هەڵەداوان بە خۆڕایی نەهاتووی. حسێن کەسێکی تێکسمراوی کورتە بالاّی سیسەڵە، چەند جار تفی قووتدا. مامە، کاك شاهۆ، هێزێکی زۆر گەورە بێ شومار لە جاش و سوپا بەپانای دەشت و بنار بەڕێوەیە بۆ ئێرە دێن، زوو فریای خۆتان کەون، ئەگەر فریایی خۆتان نەکەون کار لە کار دەترازێت. مام کۆسرەت دەستی لە شانیدا، کاکە حسێن براله! هێهور بەوە! وەرەوە سەرخۆت، پێت نە گووتین بەچەندی کە دەگەنە ئێرە؟

لە قەسرۆکان ئاوابوون بە ئارەزووی خۆیان ڕێدەکەن، تەڕاتێن و چلیتبازیانە، بەدەم ڕێگاوە سەرگەرمی تالاّن و فەرهوود و کوشتن و بڕینن، داخەکەم هیچ هێزێك نییە ڕێگایان پێ گرێت و سنوورێك بۆ ئەو هەموو تاوانانە دابنێت. جاری جاران بوایە، هەر خەڵکی ڕەش و پاڵە و ڕەنجدەر تەفروتوونایان دەکردن، بەلاّم کێ ماوە؟ شاهۆ بە دەنگێکی پڕ بڕوابەخۆبوون گوتی، بەشی ئەوەندە ماون براله، هەرهەمووشمان تەپیو و ڕوخاونین، بەلاّم لە شکستێکی گەورە و ترسناك داین.. ئەگەر هاتبا و کوێخایەك ڕابەرمان بوایە، لەوانەی ئێستای باشتر دەکرد و دڵسوزتر دەبوو، بەرامبەر بە گەل ونیشتیمانەکەی. کاروانێك سەر قافلە و ڕێبەر و چاوساخی بەگزادەی شێخ و خوێندەواری هەلپەرست وبوودەڵە بن لەوەی زیاتر چاوەڕوانی چی لێدەکەی؟ دلنیام ئەو کاروانە قەت بە مەنزڵگا و هەوار ناگات، یا ئەو قوناخە مەرگەساتەی ئەنفال تێپەڕێنین، حسابێکی وردیش بە ئەو ڕێبەرە جەلەب برانە دەکەین.. بەلاّم پێمت نەگوت کەی دەگەن؟ حوسێن ماوەیەك تاس بردیەوە، ئەوە چۆن کەسێکی لاوی قالبووی ناو شۆڕش و پێشمەرگایەتی ئاوا بە ئاشکراو ڕاشکاوانە بێزاری بەرامبەر بە سەرە زللەکان دەردەبڕێت. بەلاّم بەسەرخۆی نەهێنا، ڕاستی دیار نیە، کەس نازانێت بەرنامەیان چییە، ئایە ڕاستەوخۆ بۆ ئێرە دێن یان زۆر شوێنی کەشیان مەبەستە، بەلاّم ئەگەر بەو خێراییە برۆن، پێش نوێژی خەوتنان دەگەنە ئێرە. شاهۆ پێیگوت، کاکە زۆر سوپاست دەکەین، ئەوەتا ماموستایەکی داماوی قوڕبەسەریان بە زۆر کردووە بە

سەربان، کوردە هەڵاتووە، بووە بەپێشمەرگە، هەمان قسەی تۆ دەکات، خەمت نەبێت، لێی پاڕایەوە، کاك حوسێن برادەران شەش پێشمەرگەمان لە شارن ئەو شەو دەگەڕێنەوە ئێرە، زوو ئاگادریان کەوە، پێیان بڵێ مام کۆسرەت و شاهۆ و برادەرانتان لە جێگای ژوانن، باشە. خۆ لەبیر ناکەی؟ حسێن لەگەڵ قسەکانی شاهر هەستی بە دڵئارامیەك کرد، دەستی لە سینگی خۆیدا، ئانا بۆ خۆشم دەزانم جێگای ژوان لە کوێیە؟ ئەگەر پێویستی کرد بۆ خۆم لەگەڵیان دێم. مام کۆسرەت ڕووی لە شاهۆ کرد، ماوەیەك چاوەکانی بڕیە چاوە شەکەتەکانی.. چەند جار ویستی شتێك بڵێت، بەڵام سەرئەنجام ڕووی جارێک بەرەو سەر و جارێک بەرەو خوار دەسوڕاند. شاهۆ بە سەرنجەوە چاودێری جوڵانەوەکانی مامەی بە سالآچووی دەکرد، هەرچەندی هەولی دەدا و دەکرد و دەکۆشا بە بێ پرسیار شتێك لە ڕووخساری پەڕیوی بخوێنێتەوە، بەڵام هۆی دڵەڕاوکێی هاوڕێیەکەی دەرك پێ نەدەکرد، ئەو هەموو ساڵەی ژیانیان بە یەکەوە نەك یارمەتی نەدا بوو خوێندنەوەی ناخی، بەڵکوو شوێنە بزری کردبوو، بەڵام بە ئاشکرا ئەو مچوورکەی سەرتاپای جەستە و بەتایبەتی ڕووخساری چرچولۆچی زەرد هەڵگەڕاوی داگرتبوو و هەستی پێکرد، بۆیە بۆنەوەی زیاتر کات بە فیڕۆنەدات، چونکە دەیزانی ڕووداو و پێشهاتەکان زۆر لە وەی خێراترن، کەسێکی وا بە سالآچوو فریایان کەوێت، زۆردەمێکە هەستی بەوە کردووە، تەمەن و حەوسەڵەی هەڤاڵەکەی زۆر لەوە تێپەڕیوە نەك پێش بەسەرهاتەکان بکەوێت، بەڵکوو قەرمیان لە قەرەی بدات، بۆیە بە شلەژاوییەکەوە پرسی، مامە بیر لە چی دەکەیەوە، زۆر بە دڵمە هەستت بە تەمەن و توانا و تاقەتی من کرد، هەر چەندە درەنگ  کەوت بەڵام هەرباشە، ئەوەتا بە دەمی خۆت دەڵێی مامە، مامەی بە سالآچوو و مامەی پرزە لێبڕاو کات بەسەر چوو، مامەی بابردە. مامەی ژەهرەمار. شاهۆ زیاتر شلەژا، تکایە هاوڕێ بۆ یەکەم جارە لە ژیانمدا لێت حاڵی نابم مەبەستت چییە؟ دووبارە تکات لێدەکەم بە جوانی تێمگەیەنە، لە بەردەم ساتەوەختێکی زۆر بڕیاردەر داین، سەرەداوەکانم هەموو لێ تێکەڵ بوون. مام کوسرەت وەکوو ئەوەی دەمێك بێت چاوەڕوانی ئەو ڕووکردنەوەی کردبێت، بەمەرجێك پرسیاری لێ بکرێت، ئەوەتا سات و کاتی خۆی هاتووە، هەرچەندە جێگاکەی ئەوە نییە، بۆیە بە خێرایی کەوتە ڕوونکردنەوە، هاوڕێ شاهۆ بە گوێرەی هێز و باز و توانای لە بن نەهاتووی خۆت بۆ شتەکان دەچیت! شاهۆ

هەرچەندە لەو قسانە ئەوەندەی کە سەری سووڕما بەڵام، حەزی نەکرد بپرژێتە ناو قسەکانی و بابەتەکەی لە بیربباتەوەو گفتوگۆیەکەیان بە ئاقارێکی کە دا بڕوات. بەڵام خۆی بۆ نەگیرا هەر ئەوەندە بە هێواشی گوتی، مەبەستت چییە هاورێ؟ بۆ وا دەزانی سەرەتای دەستدانە چەك و یاخیبوونمە، وا دێمە بەرچاو لە سەردەمی شلوشەنگی لاویەتیدا بم، دەربەست نێیەم و لە ناو هێزی سەیار و گەڕۆکدابم، واز لەمن بێنە، چاوێک بەدەوروبەری خۆتدا بخشێنە، بە دوو بریندار و مامۆستایەکی میوان و کیژۆڵەیەکی نەخۆش، بەو کاتە درەنگە و لە سەر ئەو هیلاکییە، سەری خۆمان بەرەو جێگای ژوان هەڵگرین، مەگین گۆڕستانی قەڵای شەهیدان هەوەنتەیە، ئاوا بە سانایی دەستمان پێی بگات. کەسێک شارەزای ئەو ناوە نەبێت، وا دەزانێت ڕێگای سەر کانییە، بە چەند هەنگاوێک بگەیە سەری، نا مامە شاهۆ ئەو بیرۆکە و فکرانە لە سەری خۆت دەرکە! ڕووی لە تەتەری هەواڵهێن کرد. کاکە حسێن، براکەم، بە کاوەخۆ خۆت بگەیەنە هاوڕێیانی شار و پێیان بڵێ، لە کەڵەمێوێ برادەران چاوەڕوانتانن، باشە! نەجێگای ژوان و نە سەر هێشەی ڕێگای قەڵای شەهیدان. شاهۆ بە دەنگ هات. مام کۆسرەت تکایە هەندێکیش حیساب بۆ لایەنە سەربازییەکەش بکرێت، خۆ تۆ خۆت هەموو ژیانت لە پێشمەرگایەتی بەسەر بردووە، یەکێك لە هەڵە گەورەکانی پێشمەرگایەتی و پارتیزانی، بە کەمزانینی دوژمنە، بۆ خۆت دەزانی جاری جاران نەماوە، لە یەکەم دەستپێژ هێزی پشتگیری و پێشمەرگە بگەنە سەرسەری دوژمن، هەیە و نییە، شەش پێشمەرگەی کەمان هەن، کێ دەزانێت، ئەوانیش لە شار گیر نەبوون، دەگەن بەهاورمانەوە یان ناگەن، کورد واتەنی تێگوشینیش بە تەمای دراوسێیان وشکە. نازانم چۆن، بەڵام دەزانم دەبێ بە هەر نرخێك بێت هەر ئەو شەو بە زووترین کات خۆمان بگەیەنینە مەنزڵگای قەڵای شەهیدان، تاکە پەناگە بۆ بەرەنگاربوونەوە و مانەوە ئەوێیە، مام کۆسرەت بە خۆ بەدەستەوەدانەوە، نازانم بۆ خۆت هاوڕێیان قایل بکە! قایلکردن چییە، بەهەر کەسێکیان بڵێی بەو شەکەتیە، لەنێوان مەرگ و ڕۆیشتن بۆ قەڵای شەهیدان، بە دڵنییایەوە وەکوو تۆ لەو کەڵەمێومیە بەرەنگاربوونەوە و مەرگ هەڵدەبژێرن، بەڵام بێنە بەرچاوی خۆت، بۆ ئێمە تەنها چەند کاتژێرێکە بۆ گەیشتن، جگە لەوەی ئێمە ڕێگاکانی بەرەو ئەوێ وەکوو بەری دەستی خۆمان شارەزایین، چاومان ببەستن ڕچەڕێیەکان بەرەو ئەوێ ڕامان دەکێشن و دەبنە چاوساخ و ڕێناسمان، ئەدی سووپایەکی

عەرەبی چۆڵ و بیابان، ئاستەمە بگەنە ئەوێ، براله ئەوە نەما، هەر بە جاش و کوردە خۆفرۆشەکە هێرش دەکەن، هەموویان کوڕی ئەو ناوچەیەن و لە من و تۆ شارەزاترن، ئەوەی بۆ بێگانە و داگیرکەر دەمێنێتەوە تەنها کۆکردنەوەی فەرهوود و غەنیمەیە.. شاهۆ لە بابەتەکە لایدا. هاوڕێیان هەر پێشیان ناڵێم بەرەو کوێ دەچین. مام کۆسرەت زانی ئەوەی بە قسەناکات، ڕێکەوتێکی باشە بە قسەی من دەکەی تەواری لەگەڵ حوسێنی بنێرە، ئەگەر هیچ نەبێت برادەرانی شار زیاتر ئاگایان لێ دەبێت، شاهۆ هەندێك بێدەنگ بوو نەیزانی چی بڵێت، بڕوای تەواوی بە حسێن بوو، بەڵام ڕادەستکردنی تەوار بە کەسێکی بێگانە کارێکی نەکردەیە، لە لایەکیکە شەوە، دەیزانی چارەنووسێکی نادیار و شەڕێکی گەورە چاوەڕوانیانە، پاش کەمێك بێدەنگ بوون، نا مام کۆسرەت تەوار لەگەڵی ناڕوات، بەس لەگەڵ من دەژیت.. ئارەزووی خۆتە، بەڵام نەک کاڵەك بە ئەژنۆی خۆت دەشکێنیت، خۆڵەمێشیش بەسەر تەپڵی سەرخۆمان داکەین پاشان دادت نادات، ئەمن دەزانم چی ڕوودەدات، هەرچەند بۆ خۆشت هەست بەو مەترسییە گەورەیە دەکەی! شەڕی مانونەمان دەبێت، شاهۆ جارێک لەقسەم دەرمەچۆ، سەد جار لە ژێر فەرمانی تۆدا دەبم، براله مێشکت بێنەوە سەرخۆت، تکای خوێنم لێت کردووە، لەسەر ئەو کچە داماوە پارچەڵەیەی، ئەگەر سووری لەسەر کەللە شەقیەکەت، ئارەزووی خۆتە. ئەو هەموو ساڵەی بەیەکەوە پێشمەرگەین هەر بە کاک و برا و هاوڕێ بانگم کردووی، دڵی تۆم بە هیچ شتێک نەگۆڕیوەتەوە، کەچی ئەوەتا تووڕە و دەهری بووم و بە کەللەڕەق و نەفامت دادەنێم. شاهۆ بە زەردەخەنەوە، بۆ خۆت گەورەی هەموو لایەکی، بە گەمژە و نەزان و ساویلکە و بوودەڵە و هەرچی ئەتۆ دەیفەرمووی سەرم لەڕێتدایە، بەڵام لە مەسەلەی تەوار، ئەوە بەرپرسیارییەتی منە، یان ئەوەتا بەساخ و سەلامتی ڕادەستی کەسوکاری دەکەم، یان ژیانی خۆمی لەسەردا دەنێم. کەسوکاری چی براله کوان؟ لە کوێن؟ پێمبڵێ، کێ ماوە؟ نازانم بە چ زمانێک تێت گەیەنم! نازانم! ئەوەی هەتا ئێرە توانیومانە ئەو کیژۆڵە بپارێزین، سەربەرزییە بۆمان، بەڵام کە ئەو شەو تێداچوو، لەبەرامبەر دۆست و دوژمن سەرشۆڕ دەبین. باشە مادام دڵت ئاوناخواتەوە و ڕادەستی کەسی ناکەی بیرێکی کەم بۆ هاتووە! شاهۆ بە تێڕامانەوە، بزانم ئەو بیروکەیان چییە؟ بەڵکوو بە درووستی بزانم، دەتوانی لەگەڵ تەوار بۆ خۆت بڕۆی. بۆ کوێ بڕۆم؟ بەرەو شار، پاشان لەگەڵ هاوڕێیانی ناوشار بگەڕێوە،

تەوار لە شار بە جێ بهێڵە، چەند پێشمەرگەشت گەرەکە لەگەڵ خۆتدا بیانبە. دەنگی دەستڕێژ و تەقینەوە هەڵوێستەیەکی پێ کردن. پەیکەکە هاتە ناو قسەکانیان، وابزانم مەسەلە ئەو کیژە پارچەڵەیە، ئەگەر گرفتەکەتان ئەوە دەستی دەگرم و لەگەڵ خۆم دەیبەم، حەوت منداڵم هەیە بابین بەهەشت، نۆش، بێتە سەردەی، هاوڕێیان بڕوام پێبکەن، منداڵ نان و ڕزقی خۆی لەگەڵ خۆی دایە، بزانە ئەو کارەی ئەمن دەیکەم، کاروانچی گەرمێن و کوێستانێم، ئەوکاتی سەڵت بووم، هەر ئەوە پیشەم بوو، بەشی ژیانمی دەکرد، هەتا ئەو ئەسپەی کاروانچیەتیم پێ دەکرد، خاوەنی هەبوو، واتە مافی منی بەسەرەوە نەبوو، کەچی ئێستا خاوەنی زۆرشتم، ژنم هێنا و بوومە خاوەنی منداڵێک هەر بەو کارە ژیانمان بەباشی بەڕێوە دەچوو، ئێستاکە بوومەتە خاوەنی هەشت سەرخێزان، کاروکاسبی هەر کاروانچییەتییە، ئەوەی زۆر نارەحەتم دەکات، کاتێک کەسێک پێم دەڵێت قاچاغچی، ڕاستە ئەو بارەی دوور لەڕووتان بە وڵاخ دەیگوازمەوە، لە ئێراقێ بۆ ئێرانێ، لە تورکیای بۆ سوریای. هەر هەمووی کەلوپەلی قاچاخە بەڵام زۆربەی جار چەک و تەقەمەنی پێشمەرگەیە. ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکور و باشووری کوردستان، چاویان لەدەست و بازوو یارمەتی منە، دەیان جار بڕیارم داوە واز لەو کارە بێنم و ئیشێکی کەمتر سەرهێشە بکەم، یان براینە ئەوەتا زوو زوو لەناوتانم ناگەڕێمەوە دەبمە پێشمەرگە، بەڵام پاش ئەوەی تەواری دەگەیەنمە ناو ماڵ و منداڵی خۆم، گفتان دەدەمێ، قسەی پیاوی بەشەڕەف، ئەگەر منداڵەکانی خۆم برسی بن لێناگەڕێم، تەوار لەهیچی کەمبێت. مام کۆسرەت هەتا ئەوکاتە زیاتر گوێگربوو، کاکە ئەگەر هاتوو هەمووومان بوینە پێشمەرگە و بەدەردی بۆ خۆت دەڵێی قاچاخ بووین، کێ هاتنوچوونی ناوشار بکات، هەر کەس بە کار و پیشەی خۆی، خۆ پێشمەرگە هەر ئەو کەسە نییە، چەکێکی بە شانیدا دادابێت و گەزنێک ڕێش و بڕایەوە، هەرکەسێک دڵی بە میللەت و خاکەکەی بسووتێت، پێشمەرگەیە. حسێن کەمێک سەری ڕاوەشاند، فەرمایشتەکان هەمووی سەرسەر و سەرچاو، قسەکانت لە زێڕ بەنرخترن، بەڵام لێتان ناشارمەوە، بەڕاستی لە دوێنێوە چەند بەهاتنی ئەو لەشکرە داپۆلسێنەرە کەوتمە دڵەڕاوکێ، سەد ئەوەندە لەو لێک تێکنەگەیشتنەی ئەنگۆ نائومێد بووم، ئەوەتا لەسەر بچووکترین شت، لە کاتێکی ناسایی ڕێکناکەون، ئەدی ئەوکاتی دەکەونە شەڕ و بۆسە و کوشتار، سوپای دوژمن بە هەزاران، ئێوەش چەند کەسێکی پەرش و

بلاو. ئەگەر وایە، ڕێگا چارەیەکی ئاسانتر هەیە، لە کەناری دەریاچە، دوو بەلەمم شاردوونەتەوە، هەر هەمووتان بە تەواریشەوە، ئەو شەو دەپەڕێنمەوە شارۆچکەی، چەند ڕۆژێک لەوێ خۆتان حەشاردەن هەتا دنیا ئارام دەبێتەوە، پاشان بۆ خۆتان بگەڕێنەوە، هاوڕێیان قسەکەم خراپە. مام کۆسرەت بێدەنگ بوو. شاهۆ دەستی لەسەرشانی میوانەکە دانا و چەندجار ئەولا و ئەولای مام کۆسرەتی ماچ کرد. مام کۆسرەت گەورە و سەروەر و بەرپرسی هەموومانە، مەسەلەی تەوار شتێکە بۆ خۆمی لێ بگەڕێن. بەڕاستی کەسێکی بە بەدەردی بۆ خۆت دەڵێی گەرمێن و کوێستان کردووە، فێری زۆرشت بووی، بۆ خۆم زۆر سەرسام بووم بە پەند و ئامۆژگارییەکانت، ئەوەی ئەتۆ گوتت بۆ ئەوەی باشن لەکۆڕ و کۆمەڵ و دیوەخان و زانکۆکان بخوێندرێن. تەتەر، هەستی بە ئاسوودەیەک کرد، چاوەکانی لەژێر دووکەڵ و سوورایی ئاگرۆکەی سووتانی جگەرەکەیەوە، لە خۆشیان دەبریسکانەوە و هەستکردن بە خۆشیەکیان نیشاندەدا. مام کۆسرەت وەکوو ئەوەی لە ئەکاوێک شتێکی گرنگی بەبیر هاتبێتەوە، وەرە بزانە هاتنی چەند جاشوولەکەیەک زۆر شتیان لەبیر بردمەوە، کاک حسێن، لەشار هیچ هەواڵی کەس و کاری تەوارت نەپرسی، هیچت هەڵنەکڕاند؟ با زۆر گەڕام و پرسیارم کرد، بەڵام وەکوو ئەوە وایە لە دەریایەکی بێ بن لە ماسییەکی ورد بگەڕێی، پاشان تەنها ناوی تەوار بەس نییە بۆ دۆزینەوەی کەسێکی، ناوی باوکی باپیری ئازناوی بنەماڵەکەیان، کەس نایزانێت و شاراوەیە، بەڵام ئەوەندە دەزانم لە هەموو لایەک ناوی تەوار لەکچان دەنرێت، پێش ئەو ماوەیە کەم کەس هەبوو مانایەکەی بزانێت، بۆ خۆشم ئەگەر داکی منداڵان دەستەوکەری پێدەکرا، پاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژێکە، کیژۆڵەیەکی جوانم بە ناوی تەوارە لەباوەش دەکرد، بەڵام داخەکەم ئەو ئاواتەم تەنها بەوەی دێتە دی تەوارم ڕادەست بکەن، شاهۆ و مام کۆسرەت ماوەیەک تەماشای یەکتریان کرد. ماوەیەك لەگەڵیان دانیشت، پاشان ماڵئاوایی کرد و چۆن هاتبوو ئاوهاش لە ناو تاریکایی بزر بوو. هەر لەگەڵ ڕۆیشتنی میوانەکە، گەڕانەوە ناو هاوڕێیەکانیان. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشان جۆری دانیشتن و خۆگرمۆڵەکردنی مامۆستا سەرباز بوو، لەبەردەم ئاگرەکە، وەها لەبیران ڕاچو بوو، هۆشی بە چواردەوری خۆیەوە نەمابوو. شاهۆ داوای لە هاوڕێکانی کرد بە زووترین کات خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕۆیشتن. شاهۆ چەکەکەی خۆی دایە دەستی یەکێکیان و تەواری لە

باوەش کرد. بەبێ ئەوەی کەس پرسیار بکات، پێش ئەوەی ملی ڕێگابگرن، شاهۆ ڕووی لە هەموویان کرد، هەرچی هەتانە لەگەڵ خۆتان بیهێنن وا زوو ناگەڕێینەوە. هەموویان کەوتنە خۆ و ئامادەی ڕۆیشتن بوون، یەک یەک کەوتە ژماردن و بەڕێکردنیان، تەنها مامۆستا هێشتا بەرامبەر کوانووەکە خۆی دەهەژاند، شاهۆ ویستی بەبێ پرسیارکردن مامۆستا تێبگەیەنێت هەستێتە پێ و بەڕێکەوێت، بۆیە بە دەنگێکی بەرز کە زاڵ بوو بەسەر هاژەهاژ و گفەگفی ڕەشەبایەکە و بەدەنگێکی زوڵاڵ گوتی، کەس ماوە ئامادە نەبێت؟ جوڵە لەبەردەوە بێت لە مامۆستا نەهات. شاهۆ گەڕایەوە لای مامۆستا و دەستی لەسەر شانی دانا، هاوڕێ برادەران هەموو ئامادەن تەنها جەنابت ماوی. مامۆستا سەرێکی بەرزکردەوە، بەبێ ئەوەی چاوی لەسەر ئاگرەکە هەڵگرێت، هاوڕێ ئەتۆ و هاوڕێکانت من بە ناپاک تێدەگەن؟ شاهۆ دەستی لەناودەستی نا، بەدەم ڕاسکردنەوەی، ئەو قسەیە چییە مامۆستا، لەهەموو پێشمەرگەکان پتر باوەڕم بەتۆیە، کەسێکی چەند میهرەبان و پاکی، مامۆستا بەدەم هەڵسانەوە، بزەیەکی خۆش تەواوی ڕووخساری گرتبووەوە، کەواتە باوەڕتان بەمن کردووە. هەستە مامۆستا، هەڵستە کەسی وەکوو تۆ دڵسۆزیت لێدەبارێت، ئەگەر وانە بوایە بەپێی خۆت نەدەهاتی. پاش ئەو دەمەتەقێیە کورتە، لەپشت بارەگا گەلییەکی زۆر سەخت و تەنگەبەر و بەپێچ و پەنابوو. سێزدە پێشمەرگە و سەربازی هەڵهاتوو لەگەڵ تەوار بە خەوتوویی بەناو گەلیدا لە چاو بزر بوون.

# گۆڕستانی قەڵای شەهیدان

کتومت، وەکوو هەموو شەوانی چەند مانگی ڕابردوو، پاش ئاوابوونی بولێل، کە شەو دادەهات و دنیا تاریک دەبوو، چ شەوی مانگەشەو یان شەوانی بە هەورو تەم، ئەو کاتانەی تاریکی هەموو شتێکی بە خۆیەوە لوول دەدا، لە ژێر باڵی ڕەشی شەوە زەنگەکە، بزنەڕێ و کوێرەڕێیە کاڵبووەوە لەبن نەهاتووەکان، وەکوو زەردەمار دەهاتنە بەرچاو، درێژ دەبوونەوە، پێچیان دەخوارد، هەرپێچێك بە پێچێکی دژوارتری دەسپاردن، چەند بەرەو سەر هەڵدەکشان ڕێچکەکان زرافتر و مەترسدارتر دەبن، شێو و دۆڵەکان قووڵتر و دوورتر دەکەوتنەوە، ترووسکایی شەپۆلە سپییەکانی دەریاچە، کاڵتر دەبوونەوە، لەم کاتانادا ترسی خلیسکانی تەوار و ترازانی هاوڕێیان دەستی پێدەکرد. ڕستەی پێشمەرگەکان بێئاگا وەکوو یەک جەستە لە یەکتری نزیک دەبوونەوە، ماوەی نێوانیان ئەوەندە کەم دەبووەوە، تا ئەو نزیکیەی هەناسەکانی یەکتریان دەبیست. ئا لەوێدا هەستیان بە ماندووبوونی تەوار دەکرد و جیاوازییە زەقەکان ئازاریان دەدان، ئێرە دنیایەکی خەیاڵی ئەفسووناوی تژی ئاواتە وەدی نەهاتووەکانن، ئاخر ئەویش وەکوو هەموو منداڵانی سەرگۆی زەویی، دڵ و سینەی پڕی داخوازییە، شایستەی ژینێکی لەوە بەختەوەرترە، وەک ڕۆژی ڕوون ئاشکرایە، دەبوو ئێستا لەباوەشی دایکی و لەنێو نوێن و پێخەفێکی گەرموگوڕ و بۆنخۆشدا لەیزتۆک و بووکەڵە و ورچە پەمۆی نەرمی لەباوەش بایە و بەئارامی و بێترس بنوێت و خەونی ڕەنگاوڕەنگی ئەرخەوانی بە گوڵستان و پەپولەی باڵنەخشین ببینێت و بەدەم ژیانەوە قاقا پێبکەنیبا. کە برسی با، خواردنی گەرم و کولێرە چەورەی نوێی خواردبا، لەگەڵ هاوتەمەنەکانی لە قوتابخانە فێرە ژیان و زانست ببا و بەرەو ئایندەیەکی ڕووناک چووبا، بەڵام ئەوەتا ئێستا و بەو تاریکەشەوە لەنێو چیا و پێچە ئەدیوەکان لەگەلیەکی تەڕ و تووشی بە هاژەهاژ، لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگە بەرەو ئایندەیەکی نادیار، گوێت تەنها لە هەناسە گەرم گەرم، بەڵام ساردەکانیەتی، شەوانی ژیانی لە ئەشکەوتە تەڕ و تووش و ساردوسڕەکان دەگوزەرێنێت و بە شریخە و تەقینەوە لەخەو ڕادەچەنێت. هەر ئەوەندە دەزانن سینگی چیا کون دەکەن و چەند هەنگاوێک دەچنە سەر بەردەڵان و زیخەڵان بە

چەند ساتمەیەک دمیان گەڕێنێتەوە دواوە، لە کوێوە پێهەڵگەڕابوون، لەوێوە دستپێبکەنەوە، ئەوە ژیانی تەوار و پێشمەرگەکان بوو، یەکەم هەنگاوی بە ناچارییان ئەودەمی بوو کاتێك ماوەیەك لە گەلی سەرووی کەڵەمێویّ، سێزدە پێشمەرگە و، دوانیان بریندار و لەگەڵ تەوار و مامۆستا سەربازی هەڵاتوو، بەبیّ ئەوەی کەسێك دستێك جلوبەرگی کوردی هەبێت بیداتیّ. هەر هیچ نەبێت، خۆی وەکوو کوردێك بێتە بەرچاو، ئێستا پێشمەرگەم، یاخیم، کوردم، بێباکم، چیدی کە واهەست نهکات ملکهچی فەرمانی بێگانەیە و ئێستا یاخییەکی ئازادە و بە نارەزوومەندانە بەناو ئاو و گاشەبەرد و دڕ و تەلان بەرەو سەر سەر دەکەوێت.
پاش چەند هەنگاوێك تەوار بە خەبەر هات، لە باوەشی شاهۆ دابەزی وەکوو پێشمەرگەکان دەستی بە ڕۆیشتن کرد، دوو بریندارەکە زوو زوو داوای ئاویان دەکرد، ڕێگاکە زۆر خلیسك بوو، سەرکەوتنی زۆرئاستەم بوو. دوو پێشمەرگە بریندارەکە لەلایەك دەیانزانی ڕێگاکە چەند دژوارە و گەیشتن بە مەنزڵگای (قەڵای شەهیدان) هەروا ئاسان نییە، لەلایەکی کەوە لەبەر ئازار لە ژیانی خۆیان وەڕەس بووبوون. لەبەر خۆیانەوە هەر بۆڵەبۆڵیان بوو. بەبیّ ئەوەی کەس بەرپەرچیانداتەوە (تێناگەم کە بەکەڵکی پێشمەرگایەتی نەهاتوون بۆ بوون بە پێشمەرگە، دوو جاشی ترسنۆکی بیّ غیرەت چییە دەستەیەك پێشمەرگە لەبەریان هەڵێن، ئەو دوانەمان بریندار بووین دەمانتوانی لەبن بەردێك سەرڕێیان لیّ بگرین چەند کەلاکیان لیّ بخەین، چیان لە دەست دێت). شاهۆ لێیان نزیك بووەوە، چۆ بن باڵیان، سەردار گیان برادەران، ناهەقتان ناگرم بەو برینە سەختانەوە، لەسەر ئەو هیلاکییە، بۆ خۆشتان گۆڕستانی قەڵای شەهیدان شارەزان، دەزانن مەگەر بزن و گیانلەبەری کێوی تەنگەتاو بکرێت لەترسی گیانی خۆی پەنا بۆ ئەو هەموو شیو و دۆڵ و تاوێر و هەڵبەز و دابەزەی ببات، تکاتان لیّ دەکەم ددان بە خۆتاندابگرن، هەر ئەو شەو و ئەو دوو سیّ کاتژمێرەی بەگیان هەموومان ببەخشن، لەدڵەوە هەست بە ژان و ئازارەکانتان دەکەم، مافی تەواوی خۆتانە، ئاواتی من ئەوە بوو، هەتا بەتەواوی برینەکانتان سارێژ دەبوون، لەسەر جیّ کەوتبان و چارەسەرکرابان، بەڵام چار ناچارە، ئەگەر لەبەر هیچ نەبێت لەبەر پاراستنی گیانی تەوار و ئەو خەڵکەیکە. ناوچاوانی هەردووکیانی ماچ کرد.
دەڵێن هیچیان لەدەست نایە! براله چۆن هیچیان لەدەست نایەت، ئەوان داشیان سوارە و زۆر شتیان لەدەست دێت، ئەوەتا هێرشی هەموو شوێنێك دەکەن، ئەوان

بالآدەستن، ئێمە بەرەو تێشکانێکی گەورە دەچین، دووبارە و سەدبارە ددان بە خۆتاندابگرن. هەر چەند سەرتردەکەوتن، دەریاچەی دەربەند لەگەڵ گلۆپ و چراخانی شارۆچکەی چوار قوورنە لە دەستی چەپ، ڕانیە و کێوەڕەش لەدەستی ڕاست زۆر لەدووری دیاربوون، گلۆپەکانیان وەکوو کومەڵێك ئەستێرە لە لایەك دەکوژانەوە لە لایەکیکە ڕۆشن دەبوونەوە. ماوەیەك پشوویاندا، تەوار یەکەم جاری بوو شتی وەها ببینێت، چاوی لەسەر ئەو هەموو ڕووناکایە هەڵنەدەگرت.

مامە شاهۆ ئەو هەموو چرایە چین؟

تەوار گیان ئەوانە چرانین، گلۆپی کارەبان!

گلۆپی کارەبا چییە؟

گلۆپ وەکوو فتیلەیەکی بچووك وایە، دوو دانە لەو بچووکانە ماڵێکی گەورە ڕووناك دەکاتەوە. تەوار هەر لەبیری ئەوەدابوو، بۆچی بەرەو ئەو ڕووناکاییە ناچن، ملیان لەو تاریکی و دارو بەردە ناوە...

لەپاش پشوویەکی کورت. دەنگی چەند تەقینەوەی گەورەگەورە بە دوای یەکرتدا بیستران، دەستڕێژی دوور و درێژ. پسانەوەی بۆ نەبوو، لەخوار خۆیانەوە بوو، زانییان هێرش کراوەتەوە سەر بارەگایە سووتاوەکەیان. هەنگاوەکانیان گورجتر کردن گەیشتنە شوێنێك هەمووی گاشەبەرد و تیکەچیا بوون، لووس لووس، سەرکەوتنیان زۆر سەخت بوو، هەستیان کرد تەقەکان بەرەبەرە بەرەو ئەوان هەڵدەکشێن، هەتادەهات دەنگەکان نزیکتردەبوونەوە. پاش کەمێك لەلووتکەش تەقە و تۆپ وهاوەن دەستی پێ کرد، لە هەموو لایەکەوە گرمەگرم و زرمەبە زرمب تێکەڵاو دەبوون. شاهۆ بە هیلاکیەکەوە بە پێشمەرگەکانی گوت، کاکە وادیارە لەهەموو لایەکەوە هاتوون، خوارەوەمان دەریاچەیە. سەرەوەمان سەربازگەی گەورەیە، دەستی ڕاستمان جادەی قیرە، دەبێت بەرەو گۆڕستانەکە بچین جێگایەکی زۆر عاسێیە. دەنگی سەردار بوو، بە نارەزاییەکەوە، وابڕوات ناگەینە قەڵای شەهیدان، هاوڕێ شاهۆ ئەتۆ و تەوار و ئەو هاوڕێیانەی دەتوانن خێراتر سەرکەون بڕۆن و زوو بکەونە خۆتان، مامۆستاش لەگەڵ خۆتان بەرن، بەتەمای ئێمە مەبن ئەو شەو ناگەینە گۆڕستان بەزیندووی، سوێندی ئەوەی ناخۆم، بە بێگیان، لاشەمان بە دووی خوماندا ڕاکێشین، مامۆستا هەرچەندی دەکرد سەرودەروی لەو هەموو پەلەپەل و سەرکەوتن و دابەزینە دەرنەدەکرد، دەربەندی کەلەمێوێ بە هەموو پەنا و پێچ و

حەشارگە و سەنگەر و تاوێر و گاشەبەردانەی بەشی ئەوەی نەدەکرد لەوێ بمێننەوە و بەرگری بکەن، دەبێت شوێنێك هەبێت لەوێش عاسێ تر، پاشان بە خەیاڵی خۆی وایدەزانی هەر بگاتە پێشمەرگان، وەکوو ئەوەی وایە پشتی بە قەڵاتی هەولێرێوە یان قەڵای دمدمەوە بێت، خانی لەپڕێزین مشووری دەخوات، کە چی ئەوەی بەبەر چاویەوەتی، کابرایەکی بە ساڵاچوو و منداڵێکی نەخۆشی بێکەس و بێدەر، چەند بریندارێك هێشتا نەکەوتوونەتە شەڕ خوێناو لەبرینەکانیان دەچورێت، ئەو هەموو دنیا لێك جیاوازە، چۆنچۆنی یەکیان گرتووە و چۆنچۆنی بەیەکەوە هەڵدەکەن، پاش بیرکردنەوە و هێنان و بردن دەرکی بەوە کرد، زۆر شت بەیەکەوەیان گرێ دەدات، یەك ڕێباز و یەك دوژمن و برسیەتی و بڕوابوون هەتاسەر ئێسقان بەڕەوایی کێشە یان، هێشتا لە سەرەتای گەشتەکەیدایە و باش شارەزای هیچ نەبووە، کەچی هەستێکی وەهای هەیە، ئەو شتانە ئەویش بە وانەوە گرێ دەدات. کێ دەزانێت کەنگێ بە گۆڕستان دەگەن، ئەو شوێنە کوێیە ئاوا بووتە جێگای ئومێد و متمانەی پێشمەرگە، مامۆستا هەنگاوەکانی گورجتر کردن چووە لای شاهۆ، دەیزانی شاهۆ پێش هەر هەموویان دەیزانی گەیشتن بە گۆڕستان کارێکی هەروا ئاسان نییە، بۆیە بەنەرمییەکەوە لێی پرسی، هاوڕێ شاهۆ زۆرمان ماوە بگەینە قەڵای شەهیدان؟ دەنگی تێکەڵ بە خورەی ئاو و دەستڕێژ و ناڵەی بریندااران بووبوو، وای زانی دەنگی نەبیستووە، بەڵام کە دەنگی شاهۆی بیست لێی پرسی، جارێ ماویەتی بۆ مامۆستا هیلاك بووی، بێنە چەکەکەت بدە برای خۆت، شەرمەزارین مامۆستا، یەکەم شەوە لەلامان تووشی ئەو چەرمە سەرییەی بووی، لەبەر سەلامەتی گیانی هاوڕێیان پێویستە، ئەوە شەڕی پارتیزانی و پێشمەرگایەتییە، ڕۆژێك دوژمن لەبەرت هەڵدێت ڕۆژێك ئێمە، ئەگەر هاتبا و لە دەربەندی کەلەمێوێ چاوەڕوانمان کردبان، هەتا دەهاتن و بە سەریاندا دەدابن کارێکی نەکەردە و گەمژانە دەبوو، بۆیە وا بەپەلە کەوتینەخۆ، هاتنی سوپایەکەمان بەهەندوەرنەگرت. باشە خەڵکی ئەوناوە بۆچی گۆڕەکانیان لەدەشتایە لێنەداون، ئەوە دووەم پرسیاری مامۆستا بوو بۆ شاهۆ. لە باتی ئەم مام کۆسرەت وەڵامی دایەوە و گوتی، کاکە ئەو گۆڕستانە بە قەڵای شەهیدان ناسراوە. هەر گۆڕێکی سەد و پەنجا ساڵ کۆنە، وا دیارە گۆڕی تازەشی تێدان، هەر چە ند مانگ لەمەوپێش کۆمەڵێك لە قوربانیانی ئەنفالیان لەوێ ناشتن، دیارە لە ئەنفالەکانی کەش، ئاوا ڕەشەکوژی و پاکتاوی نەژادی کوردکراوە، حسابی

ئەو ڕۆژەی ئەمرۆیان کردووە، بۆیە لەناو هەوران گۆڕستانیان لێداوە، چووە بنباڵی سەرکەوت قورسایی لەشت تەواو بدە سەر شانی من، ناتوانین کەس لێرە بە تەنیا جێ بێڵین.. شەو دوو بتڵی ڕاشکاوە و هەر هەموویان لە ژێرباری قورسی چەك و تفاقی شەڕ لەشیان شەلاّلی ئارەق بووە، کەچی واز ناهێنن، ئەو خاڵەی مەبەست و ئامانجیانە، چاویان تەنها ئەو باریکە ڕێگایانە دەبینێت، هەنگاوەکانیان بەرەو ئەوێ ڕاپێچیان دەکات. ماموستا لە لایەن خۆیەوە هەتا خوڕەی جۆگەلە و کارێزی بێتە بەرگوێ، ترسی لە تینوان خنکانی نەبێت، کێشەی لەگەڵ ڕێکردن و شەکەتیدا نییە، باوەشی بە قۆڵی تەواردا کرد لە شانی شاهۆوە بە بێدەنگی گواستیەوە سەرشانی خۆی، چەند هەنگاوێك سەرکەوت خێزەلانەکە ورد و لووستر بوون، ساتمەیەکی برد، تەواوری توند بە سینگی خۆیەوە نووساند، چەکەکەی لەسەر وردە بەردەکان، وەکوو دەنگی دەستڕێژ خرمە خرمی دەهات، پێشمەرگەیەك لە نیوەی ڕێگا گرتیەوە، ڕاستی کردەوە، مامۆستا تەوار بە من بسپێرە، هەر چەند ناو بیشەلانێکی چڕ و تاریك بوو، دەنگی شالاّوی ناسیەوە، نا، کاکە شالاّو گیان، با لە لای من بێت، تەواریش هەردووك دەستی لە ملی مامۆستا ئالاند و بە هیوای کۆتایی هاتنی ڕێگای لەبن نەهاتوو، کارێزێکی تاریکی بەرتەسک هاتە پێشیان، شاهۆ هاواری کرد، ئێرە تونێل و کارێزی پێشمەرگەیە، ئێستا سەختترین بەشی ڕۆیشتنەکەمان دێت، تکایە دەستی یەکتر بگرن، مام کۆسرەت ئەتۆ لە پێشەوە برۆ، بۆخۆشم قفڵی دواکەس دەبم. شڵپەشڵپ بەناو بەفراوەکەدا بە کوێری ڕێگایان دەکرد، لە سەرووشیانەوە، وەکوو کوندەی سەربەرەوخوار ئاو دەڕژایە سەر سەریان، لەدوور لە بەرزای ترووسکاییەك، وەکوو کلاّوڕۆژنە بەدی دەکرا، بە قەدەر سینیەکی بچووك ڕووناکایی دەدرەوشایەوە، هەموویان بە هیوای کوتایی هاتنی تاریکی هەنگاویان دەنا، چەند دەچوونە پێش گەورەتر و ڕۆشەنتر دەبووەوە، بەرەو ئاسۆ و دووبارە بەرچاوڕوونی، بەلاّم مامۆستا هەرچەندی چاوەکانی تیژدەکردنەوە هیچی بەدی نەدەکرد، پێم وابێت، لە بیر و زهنی خۆیان ئەو هیواو پەنجەرەیان درووست کردووە، لەو زیندانە تاریك و ماهیی و گلینجانە قەتیس و ترسناکە، بەردوام مەترسیدارمان و بەسەر یەکدا تەپینی لێ دەکرێت، باشە ئەگەر ڕووخا زیندەبەچاڵ دە بن و کەسێك لاشە و ئێسك و پرووسك و ئاسەواریان نادۆزێتەوە. ساتمەی دە برد، وەك نابینیایەك یان دروستر وەکوو ئەو ڕەوە

شەمشەمەکوێرانەی فرە فری باڵەکانیان دەهات و بەردەوام خۆیان بەدەموچاو و لەشیاندا دەکێشا، لە ناوەڕاست دەنگی شاڵاو دەهات، بە لای خوام لێ تاندا، لەو کونە تاریکە بێ چاو و گوێ چی بە دیدەکەن؟ چەرمە چەقاڵتەی نەگریسینە، ئەگەر بەڕیزە گوللەی کردار هەموویان وەك دەندووکی کەو سووردەکەمەوە. دەڵێن فیشەك بە فیڕۆ بە تاریکییەوە دەنێت. دەستی بە دیوارەکان دەگرت، چنگی پڕی قوڕ و لیتە و لێنجاوێك دەبوو، بە هەموو لایەکدا چەنگە قوڕی داویشت، بەس ئەو جارەی بێمەوە سەر دنیایە و پێم لە وشکانی بنێمەوە، ئەو کارێزە بە سەریەکدا دەتەپێنم، وەی بابە وەی. بەڵام جارێ لە کوێمانە، دەنگێك لە دواوە بانگی کرد، دەنگی شاهۆ بوو، هاوڕێ ددان بە خۆتدا بگرە، ئەوەندەمان نەماوە، چەند هەنگاوێکیکە سووڕانەوەیەك دێت و بەرەو سەر سەردەکەوین. هەر پشووی دەخواردەوە بە بێ ئەوەی کەسێك گرژی ڕووی ببینێت، کوا کە نگێ؟ هەزار ڕێگای ئاسانتر و نزیکتر هەن، ئێستاکەش گەڕانەوە و پەشیمانبوونەوە باشترە لەو کونە گورگەی گیرمان تێداخواردووە، دەچینەوە کەلەمێوێ، سەنگەر و بن بەردیان لێدەگرین، با غیرەت بکەن هەنگاوێك بێنە پێشێ، هەر بۆخۆشی وەڵامی خۆی دەدایەوە، جا ڕێگای گەڕانەوە هەیە، هەر ئەوەندە پێت لەو گۆڕە تاریکە نا، قەت ناتوانێ بەرەو دوا بگەڕێیەوە. دەنگی سەردار و برینداەکەیکەش تێکەڵ بە ناڵە و بێدادکردن، تێکەڵ بە شڵپەشڵپ و ناڕەزاییەکانی شاڵاو بوون، مامۆستا هیچی نەدەگوت، چاوی لەسەر شەوقی کزی دەستی لایتی مام کوسرەت بوو، جار جارێك بەرەو دواوە و بنەچی تەڕی کارێزەکە دەگەڕا. عەودالی ئەوە بوو داخوا ئەو کڵاوڕۆژنەیەی باسی دەکەن بوونی هەیە، بگەڕێنەوە هاوڕێیان هەناسە نەما، کەسێك لە دواوە هاواری کرد، بەردەوامبن لە سەر ڕۆیشتن، کەس شەقاوێك بەرەو دوا ناوێت، ئەوەندەمان نەماوە، ئەوەیان دەنگی شاهۆ بوو، بۆ خۆشی لە کۆتایی هاتن و تەواوبوونی ئەو تونێلە ناهومێد بووبوو، ئەوەندەی بیرەدا دەیان جار هاوین و زستان تێپەریوە، قەد بە قەدەر ئەو شەو درێژەی نە کێشاوە، لە خۆی دەپرسی، ئایە داڕمان و هەرەس و سێلاو درێژییان نە کردووەتەوە. دەبێت هەر ئەو کارێزەی جاران نەبێت؟ دووبارە نەڕەی شاڵاو هاتەوە تەواو نا.. قسەکەی تەواو نەکرد.. دیتم مانگم دیت! ئەی مانگ وەرە و لە دڵ دەرهاوێژە خەمان، قەڵەمبازێکی دا، گەیشتین ئەو جارەش پەڕینەوە. هەموویان هەنگاوەکانییان گورجتر کردنەوە، هەرکەسێك لە زالکی کارێز

دەردەچوو، لە لایەکەوە پێڵاوەکانی دادەکەند و قوڕاو و لیتەی لێ دەردەکرد و لە لایەك درێژدەبوو، بەڵام شاهۆ هەر بەپێوە دەنگی دەدان، برادەران هەستن بەردەوامبن، کاتمان زۆر کەممان لە پێش ماوە، پاش خۆهەڵواسین و دابەزینێکی زۆر، کۆتاییان بە سەفەری سەختی کارێزی پێشمەرگە هێنا. لە بەرامبەرییانەوە لەبن تیکە شاخێك بە پەرشوبڵاوی کۆمەڵێك گۆڕی کۆن کۆن بەدیار کەوتن، لەگەڵ بەدیارکەوتنی گۆڕستان، مامۆستا ترسێك لە هەناوی گەڕا دووبارە ناودەمی وشك بووەوە، کاریز بە بیرێکی قووڵ دەچوو، بەڵام گۆڕ و کێل و گڵکۆی لێنەبوون، باشە شەو و ڕێژێك بە تەنیا و بێ هاوەڵ و هاودەم ڕۆیشت نە ترسا، کەچی ئێستا لە گۆڕستانیکی لاتەریکی چۆڵ دەترسێت. چەند قومێکی ئاوی بەپەلە خواردەوە، وای بیردەکردەوە بە سامترین و سامناکترین شوێن بە شەو سەر ئاوە، کەچی سامی گۆڕستان زۆر لەوە گەورەترە. ڕاستە بۆن و بەرامەی ساردی ماسی و گیانداری ئاوی و کەفوکوولی نییە، بەڵام شەوانە هەرچی گیاندار و دڕەندەی سەرئاو و بن ئاو هەیە، بەدێودرنجەوە خەریکی ئاونۆشین و سەمای شێتانەن. لێرە ترسەکە جیاوازە، ڕاستەوخۆ بە ناو کێلەکاندا تارماییە سپیە خام پۆشەکان بە تیژی بۆت دێن و بە ناو جەستە و دەمارەکانتدا تێدەپەڕن و لە ناو دڵت جێگیر دەبن، ئارەزوو دەکەی قەفەزەی سینگت بتەقێت و بە دوو دەستی پۆلاینی خۆت دەستت وەکوو مەنگەنە لە ئەوکیان گیرکەی و قیڕمبڕیان بکەی. نەیدەزانی بە چ جۆرێك بەشداری دڵخۆشی پێشمەرگەکان بکات، بە دۆزینەوەی چەند گۆڕێکی نیوە کراوە ئاوا شاگەشکە بوون، وەکوو ئەوەی وایە هەلهەلە بۆ ئاهەنگی لاشەی ساردبووەوەی خۆت لێدەی.. ئەوەیە جیاوازیەکە.. ئەو زەندەقی چووە لە گۆڕستانێکی کپی ئارام. ئەوانیش گۆڕەکان بە ئارامگا نەك جێگای داڵدەدان بەڵکوو بە پەرستگای خۆیان دەزانن، چی نهێنیەکی شاراوە و هەستێکی نامۆ و بێشروڤەیە، گەنجێکی شاری هەتا پێش بوونە پێشمەرگە و ئاشقی چیا و چۆڵ ببێت، لەگەڵ تاریك داهات هەتا سەری کۆلان بە تەنیا ناتوانێت بچێت و سڵ لە سێبەری خۆی دەکاتەوە، هەتا بۆ میزکردن و دەست بە ئاوگەیاندن ناچێت، هەتا بەیانی لە تاوی سووتانەوەی مووسڵدانی ئەودیو ئەودیو دەکات، کەچی کە دەست دەداتە چەکی بەرگری، دەبنە یەکپارچە ئاگر و سڵ نە لە تاریکی و نە برسیەتی و هەتا مەرگی خۆشیان ناکەنەوە، پێشمەرگی خۆیان دەکەون، ئەوەتا بە بەرچاوییەوە چەکەکانیان بەرەو گۆڕستان بەرز دەکەنەوە و گۆڕەکان خۆتان

بگرن و واهاتین، دەنەدەی خۆی دەدا و غیرەتی وەبەر خۆی دەنا، غیرەت سەگ بتخوات، بزانە هەتا ئەو تەوارە نەخۆش و بچووکە بە دیتنی گۆڕستانەکە گەشاوەتەوە و بەرامبەریان پێدەکەنێت و پێیان دەڵێت، ئەوە هاتم، بۆ لاتان هەتا لە سەر پووش وپەلاش و خۆڵی سەرسینگتان لەنێوان دوو کێلدا بە هێمنی بخەوم و ڕۆژبکەمەوە، دەبێت چ خەوێکی قورسی بە مۆتەکە و پچڕپچڕ بێت، بە چاوێك خەوتوو بە چاوێك بێدار، لەنێوان ترس و خەو بێداریدا چرکە ساتەکان وەها درێژ دەبنەوە نەك دەمژمێر دەوەستێت، بەڵکوو ترپەی نارێکی بەرزی ترسنۆك لە لێدان دەخەن. دڵی خۆی بەوەی دەدایەوە، هەروا خیزمالك بە تەنیشت گۆڕستانەکە تێدەپەڕین، ئەوان لە سەر زاری مام کۆسرەت و شاهۆ و گشتیان سەد جار دووپاتیان کردەوە، مەنزڵگای قەڵای شەهیدان، خۆ ئەگەر بۆ دیداری چەند گۆڕێکی کۆن ئەو هەموو کوێرەوریەیان کێشا هەر لە کەلەمێوێ گۆڕێکی بە کۆمەڵیان بۆ خۆیان لێدەدا، ئەویش وەکوو سەرجەم پێشمەرگەکان. ئاهێکیان بەبەرداهاتەوە، چونکە جێگایەکی ئەوەندە سەخت بوو بە دوو پێشمەرگەوە مەگەر لەبرسان و تینوان بمردبان، دەنا گیرانی زۆر ئاستەمە، دەیان جار هانایان بۆ هێناوە، پارێزراو بوون ئێرە، تەنها گۆڕستانێکی ئاسایی نەبوو بەڵکوو قەڵایەکی سەختی بەرگریکردن بوو، هەرچەندە شەو بوو بەڵام لەهەر چوار لای گۆڕستان جێگای بەرزی ئێشکگرتن و بەرەنگاربوونەوە دیاربوون، لەسەر زۆربەی گۆڕەکان شیر و تیر و قەڵغانی گەورە گەورە دانرابوون، کەسێك زۆر بە هێز نەبوایە بۆی لەزەوی جیانەدەکرانەوە. خەڵکی ئەو بنارە زۆر دەگمەن ڕێگایان دەکەوتە ئێرە، بەڵام کە دەهاتن کێل و گۆڕ و هەتا خاك و خۆڵ و دار و بەردەکەشیان ماچ دەکرد، لەلایەن خۆیانەوە بە دەرمان و چارەسەری زۆر نەخۆشی و هەتا چاکبوونەوەی شێتەکانیان دەزانیین، ئەو شێتانەی جەور و ستەمی ڕۆژگاری بێ وەفا هاریبوونی. لەبەر سنگی گۆڕستان لارێیەك هەبوو، شاهۆ و تەوار و دوو برینداری بردنە ناو ئەشکەوتێکی قووڵ، ئەشکەوتەکە بە گاشەبەردێکی لووسی زۆر گەورە کە بووبوو بە بەشێك لە ئەشکەوتەکە، زالکی ئەشکەوت وەها سووڕابووەوە بەلای دۆڵێکی قووڵی بێکۆتایی بە هیچ شێوەیەك ڕێگایەك نەبوو بۆ چوونە ژوورەوەی، تەنها ئەو ڕێگایەی بەبەردەم پێشمەرگەکاندا تێدەپەڕی. مام کۆسرەت لەگەڵ دوو بریندارەکە و تەوار هەندێک بەپێوە وەستا، پاڵتۆکەی دانا و تەواری لەسەر درێژکرد. بەکاوەخۆ بەرەو دەرەوەی ئەشکەوت چوو، بۆخۆتان

لێره بن ئێستا دهگهڕێمهوه، چهکهکهی لهشانی داگرت، شاهۆ بهرهو لای هات، هاوڕێ بۆکوێ؟ دهچمهوه ناو هاوڕێیان بۆ ناو گۆڕستان، باشه دوایی، بهڵام جارێ لێره لهلای تهوار و هاوڕێیان بمێنهوه! خۆ منداڵ نین، کهسیان بۆ چییه، ئهمنیش دهمهوێت کهلاکی تۆپیوی جاش ببینم. دهی بینی بهخوا، بهڵام ئهوهندهم بهقسه بکه لهبهر تهوار ئهو دوو برینداره. دوو بریندارهکهش تووڕه بوون، کاکه کوا چهکهکانمان زۆر باشین، خۆ ئێمه به کهلهکه و ڕان تهقه ناکهین، ههر دهست و پهنجهیه ئهوانیش بهڵایان نییه. پاش پاڕانهوه و تکایهکی زۆر، ڕازیکردن له ناو ئهشکهوت بمێننهوه، دوو کهڵاشینکۆفیشیان لهلایان دانان. شا هۆ چووه ناو هاوڕێیهکانی. کاکه سوپا و جاشێکی بێشوومار بۆ ئێره دێن، تکایه ههرکهس بریندار بوو، خۆی بگهیهنێته ناو ئهشکهوت، دهست زۆر به فیشهکهوه بگرن، نازانین شهڕهکه چهند بهردهوام دهبێت، نهێنی شهو یان کهسێك بریندار بوو بۆ زانین بڵێت.. تهوار. دیار بوو چهند وشهیهکی کۆتایی بۆ مامۆستا پێ بوو، مامۆستا سهرباز، کاکی خۆم ئێستاش درهنگ نهبووه و ئهتۆ دهتوانی بڕۆی بۆ پاراستنی گیانی خۆت بڕۆ بگهڕێوه ناو سهربازهکان، تکایه جۆری چهك و ژمارهی پێشمهرگه و هیچ زانیارییهك مهده به دوژمن، ئهو چهند کاتژمێرهی شارهزای تۆ بووین دهزانین چهند کوردێکی پاکی. کهس گلهییت لێ ناکات، ههر براکهی جارانی خۆمان دهبیت، بهڕاستی پێشمهرگه کهسێك تازه پهیوهندی دهکات دهبێت به لایهنی کهمهوه شهش مانگ دووربهدوور بهشداری شهڕ بکات، بهڵام بارودۆخهکه وای لێهاتووه ئهوهیه به چاوی خۆتان دهیبینن. مامۆستا ههتا ئهو کاته بێدهنگ بوو، کاك شاهۆ، برادهران، گیانی من له گیانی ئێوه زیاتر نییه، ئهگهر باوهڕتان به من ههیه، ئامادهم ههتا دوا ههناسه شهڕ بکهم، ئهگهرنا، دهبێ لێره دوورکهومهوه و بهتهنیا شهڕ بکهم، ئهوهش کارێکی خۆکوژییه، ئهگهر ڕێگام بدهن ژیان چهند ڕۆژێکی یان کێ دهزانێت، چهند ساڵێکی تێدا مابێت بۆ پاراستنی گیانی تهوار لهگهڵ ئهو هاوڕێیه خۆشهویستانه بهسهر ببهم. شاڵاو پێشمهرگه گهنجهکه باوهشی به مامۆستادا کرد و ماچی کرد، مامۆستا له کاتی گۆڕینی چهکهکهت به هی خۆم ئهو چهکهی تۆ دهرزیلهکهم دهرهێنابوو، لهبهر پشتێندهکهی دهری هێنا و بۆی خستهوه سهر چهکهکهی.. ئێستا دهتوانی به ئارهزووی خۆت تهقه بکهی، ههتا ئێستا فیشهکهکانت موختارکوژبوون. یازده پێشمهرگه بهسهر چوار دهسته لهچوار لای گۆڕستان دابهش بوون. شاهۆ زۆر

بەپەلە خۆی گەیاندە ناو ئەشکەوت، دووبارە تەوار لەسەر پاڵتۆی پێشمەرگەیەك خەوی لێکەوتبوو، دوو پشتێندیان پێدا دابوو، شاهۆ لەبەر تیشکی مانگە شەوەکە تەماشایەکی دەموچاوی بێگوناهی منداڵانەی تەواری کرد، گریان لە ئەوکی گیربوو، پڕ بەدڵ حەزی دەکرد ماچێکی بکات، بەڵام دڵی نەهات نەوەك بەخەبەر بێت. لە ئەشکەوت هاتەدەر، مانگە شەوێکی ئەوەندە ڕووناك بوو، هەرچی تەمومژ هەبوو ڕەویبووەوە، یەك بەیەکی کێلەکان، پێشمەرگەکان و هەتا جوڵانەوەی ماریشی بە چاوی خۆی دەدیت، (دەڵێن چرای ماڵی هەژاران، مانگەشەوە) سەد خۆزگە ئەو شەویش وەکوو زۆربەی شەوان تەماوی و باراناوی بووایە، ئەگەر بەدەستی دەبوو، نەک فوو بەڵکوو بەڕەشەبایەکی بەهێز ئەو چرا گەورە ڕۆشنەی ئاسمانی خامۆش دەکرد. پەڵەهەورێک دیار نییە، هەتا هیچ نەبێت جارجارە بزری بکات، خەڵکی لە خۆڕایی ناڵێن ئەو شەو، شەوی پێشمەرگەیە، کاتێک بەفر و تۆفانە هەر چەند ساڵێك مانگگیران ڕوو دەدات، چی دەبوو کەوتبایە ئەو شەو، چاوچاوی نەدیتبایە. بەشە تاریکەکەی بۆ ئێمە بەپەلکوتان وەکوو ناو کارێزی پێشمەرگە یەکترمان دەدۆزییەوە، بە شە ڕووناکەشی بۆ شەمشەمەکوێرەکانی دوژمن. شاهۆ هەرچەندی تەماشای دەکرد لەو شوێنە و بەو مانگە شەوە منداڵێك و دوو بریندار بێ خواردن و کەم فیشەك، کەمی ئاو. شەڕ ڕووی نەدابا، بە ئەزموونی چەند ساڵە بۆی دەرکەوتبوو، لەشەڕی پارتیزانی هەڵبژاردنی شوێنی، هەرچەند عاسێ و سەخت بێت لەبەرژەوەندیاندا دەبێت. شەڕ کاتی بەرەنگاربوونەوە زۆر گرنگە جێگاکە بۆ خۆیان هەڵیان بژاردووە و زۆر لەبارە بۆ بەرگریکردن کاتەکە ئەگەر دوژمن بێت ئەوان هەڵیان بژاردووە، لەو بیرکردنەوانە دابوو، لەخوار گۆڕستان بە دووری یەك فرسەخ لەکاتی چاودێریکردنی بە دووربین، زەوی ڕەش دەچۆوە، بەپەلە خۆی گایاندە لای دەستەی یەکەمی پێشمەرگەکان، لەئامادەباشی دابوون، کوڕینە جاشەکان نزیك بوونەتەوە، مامۆستا لەگەڵ بیستنی هاتن بە بێویستی خۆی ئەژنۆکانی کەوتنە لەرزین، لەدڵدا هەست بە هیچ جۆرە ترس و سڵەمینەوە ناکات، بۆ خۆشی سەری لەو چۆك لەرزینە سووڕمابوو، لەسەر لێواری گۆڕێکی سەر کراوە، دانیشت، دەستی بە ئەژنۆکانییەوە گرت، شاهۆ هەستی بە شڵەژان و جەستە لەرزینی مامۆستا کرد، دەزانی تەواو بچۆوە ناو گۆڕەکەوە، بۆ خۆشی بازێکی دایە ناوی، مامۆستاش بە دەستووری ئەو خۆی فڕێدا. شاهۆ قاچێکی لە پێشەوە و قاچەکەی تری لە دواوە

گیر کردبوو، مامۆستا وەکوو من بکە، بەڵام پێ لە ناوەڕاست مەنێ! چونکە ناوەڕاستی گۆڕ وردە ئێسقانی مرۆڤی تێدایە، با وردوخاش نەبن، مامۆستا هەستی دەکرد، تەزوویەك لە گلەکە وە هەڵدەستێت و بە ناو دەمارەکانیدا ڕووە و دڵ و سەری هەڵدەکشێت. چی هەست و گەرمابیەکە تەواوی جەستەی گرتوومەتەوە، لێوە لەرزە و چۆک لەرزینی نەماوە، پاش ئەوەی دڵنیا بوو لەوەی مامۆستا گەڕاوەتەوە دۆخی جارانی، دەیزانی هەموو کەسێك پێش یەکەم شەڕ ئەو لینگ لەرزینەی تووش دەبێت. ئەو پێشمەرگانەی لەسەر جێ نزرگەی شێخ بوون بڵند تربوون، باشتر هەموو لایەکیان لێوە دیاربوون. بۆیە لەوێوە چاودێری دەکرد، شاهۆ بە ماتەماتە و لەسەرسینگ خۆی گەیاندە لای هەر سێ دەستەکەیکە، کوڕینە زۆریان نەماوە بگەن، هەتا نەیەنە بەردەستان تەقەنەکەن بەڵکوو بڕۆن و شەڕ ڕوونەدات. دەست بە فیشەکەوە بگرن، نهێنی شەو تەوار، ئاگاداربن چاوەڕوانی یەکەم تەقەی من بن، بە هیچ شێوەیەک سەرباز مەکوژن. هەر کەسێك وازی لەشەڕ هێنا و خۆی ڕادەست کرد نابێ تەقەی لێ بکرێت، خەمت نەبێت. گەڕایەوە لای جووتیار، دوو پێشمەرگەکەی لەگەڵدابوو، سیرەیان لە جاشەکان گرتبوو. وەرنە پێش باش بۆخۆتان هاتن، وس هاوڕێ، بێدەنگ بوون. جاشەکان ئەوەندە زۆربوون لە ژماردن نەدەهاتن. لەدوورییەکی کەم ڕاوەستان، لە ڕاوێژ و تەگبیر دابوون، ویستان بگەڕێنەوە دەرکیان بەشتێك کردبوو، هەستیان ڕادەگرت، پاش کەمێك بە فەرمانێك بە پەرشوبڵاوی بەرەو گۆڕستان هاتن. لە کێل و گۆڕەکان تەواو نزیك بوونەوە. دەنگی جاشان دەهاتە بەرگوێیان، بە عەرەبییەکی شەقوشڕ دڵخۆشی سەربازەکانیان دەدایەوە، مەترسن بەدەست بیان گرن پارەیان پێ وەردەگرین، بۆخۆشیان گیانیان لە ناو دەستیان بوو، شارەزای زەبری کوشندەی پێشمەرگە بووبوون. بەڵام چاریان نەبوو، یەکەم کۆمەڵە جاش پێیان بەتەواوی نەنابووە ناو گۆڕستان، لەگۆڕەکان دەسڵەمینەوە، زیاتر پاڵییان وەیەکتری دەدا.. جارجار دەوەستان هەستیان ڕادەگرت، گوێ قوڵاخ دەبوون، کە دەیان زانی هیچ جووڵەیەکی نائاسایی نییە بەردەوام دەبوون لە سەر ڕۆیشتن. کەمێک لەوە دڵنیا بووبوون هیچ لە گۆڕی نییە.. سنووری خۆیان بەزاند، خرمەی یەکەم دەستڕێژ بەدوایدا سێ ئاربیجی. بێدەنگی گۆمی شەویان شڵەقاند، لەهەر چوارلایەوە درانە بەر دەستڕێژی گوللە. لە لای سەرەوەش لەبەر ئەشکەوتەکەش وەکوو باران دەستڕێژ بەناو جاش و سەرباز و مغاویر دەکەوت، دەستە دەستە

دەکەوتنە سەر زەوی و هاوار هاوار و ناڵە ناڵیيان ، لە ناو شریقە و گیڤەگیڤ و ویزە ویزی گوللە کپ دەبوونەوە. جاشەکان زۆر شپرزەبوون چەند کەلاك و بریندارییان جێ هێشت و دووركەوتنەوە. شەڕی هاوان و ناربیجی ئەو ناوەی باش دەکوتایەوە. بۆ ماوەیەك تەقە کزبوو، دووبارە هێرش کرایەوە. بە هاوەن و ناربیجی ڕوومانە شەڕ و پێکدادان لەگەڵ هەرتەقینی هاوەنێك. چەند گۆڕی سەدساڵەی بە ئاسماندا دەبرد. لە ڕچەڕێی بەرامبەریان کۆمەڵێك جاش هێرشیان دەکردە سەر ئەشکەوتەکە، بەڵام هەر زوو سەربەرەو خوار هەڵدەهاتن، پاش سێ هێرش، دەنگی تەقە لەناو ئەشکەوت و دەوروبەری کزبوو، دیار بوو فیشەکیان نەمابوو، شاهۆ لەگەڵ پێشمەرگەیەك چوو بەهاوارییانەوە، نەگەیشتبایە، ئەشکەوت دەگیرا. لە کاتی ئاگربارینیدا، شاهۆ گوێی لەدەنگی زیڕەیەك بوو، ڕاچەنی، دەنگی تەوارە لەناو هەزار دەنگی کچاندا دەیناسیێتەوە، دەبێ فیشەکی بەر کەوتبێت، لە زالکی ئەشکەوتەکەوە، بەباوەش دووکەڵ دەهاتە دەرێ، لەتاوان ئاگای لە خۆی نەما، بەناو ئاگر و فیشەك باراندا خۆی گەیاندە زالکی ئەشکەوت، بانگی کرد، مام کۆسرەت، تەوار، بەپەلە خۆی کرد بەناو ئەشکەوتدا، لە سووچێکی ئەشکەوت مام کۆسرەتی دیت لە بەردەم ئاگر ڕانی تەواری لەسەرئەژنۆی خۆی دانابوو، بە جەمەدانییەکەی لەخوار ئەژنۆیەوە دەیبەست، مام کۆسرەت چی بووە؟ مام کۆسرەت بە هەناسە سوارییەکەوە وابزانم دووپشك بە خوار ڕانییەوە دا، ئەدی ئێستا، کەوتە ماچکردنی تەوار، بەڵام کیژۆڵە بورابووەوە و هۆشی لەخۆی نەبوو. مام کۆسرەت قەڵەمبڕێکی لە باخەڵی دەرهێنا و بە شاهۆی گوت، دووپشکەی ئێرە ڕەش ڕەش و زۆر پیسن، دەبێ ژەهرەکەی دەرکەم. شاهۆ هاتەدەرەوە. لە لایەك نەیدەتوانی، تەماشای تەوار بکات، لە لایەکیکەوە دڵی لای هاوڕێیەکانی بوو، ترسی گیرانی ئەشکەوتی هەبوو، گیرانی مانای نەمان و لەناوچوونی تەوار و دوو بریندارەکە و مام کۆسرەت، هەر لەبەر دەروازەی ئەشکەوت لەگەڵ بریندارێك هێرشیان کردە سەر جاشەکان، بە هەر چواردەوری خۆیاندا دەیان ڕشاند. دوو دەستڕێژی گڕدار بەناوی شاهۆ و هاوڕێکەیدا کران، برادەرەکەی بە هێواشییەکەوە گوتی تەوار، لەگەڵ ئەو وشەیەش شاهۆش هەستی بە تەڕاتییەك لەبەر سکی و سەر ڕانی کرد. نەپڕژایە سەر خۆی. ڕوومانەیەکی فڕێدا ناویان دەنگیان نەما. باوەشی بە برادەرەکەیدا کرد، ڕایوەشاند. چاوی کردەوە، بەهەناسە سوارییەکەوە گوتی ئەمن باشم، بەڵام

هەناسەی بەلاکەلەکەی دەدا. خوێنی دەموچاوی دەسرییەوە، دەنگێك هاواری کرد شاهۆ ئاگادار بە، دەستڕێژێکی بەسەر شاهۆدا کرد. دوو جاش لەپشتیەوە بەربوونەوە، بریندارەکەی بە هاوڕێکەیدا نارد، دووەم جار بوو بریندار دەبوو، هاواری کرد مام کۆسرەت منم هاتم تەقە مەکە. گەیشتنە لای ئەشکەوت، مام کۆسرەت هات بریندارەکەی لێ وەرگرت، شاهۆ گەڕایەوە لای دەستەی یەکەمی، هێواش هێواش، لەلایەن دوژمنەوە تەقە زیادی دەکرد و هێرشەکان چڕتر دەبوونەوە، لەلایەنی هاوڕێکانی کزتر دەبوو، ئەوەش نیشانەی خراپ بوو، هەرچەندە شەڕەکە بۆخۆیان هەڵیان نەبژارد، بەملیان داهات، بەڵام جێگای کوشتارگە لە بەرژەوەندیانە، ئەگەر لە سەر دەریاچە، یان لە کەڵەمێوێ بوایە، بە چارەگی ئێستا خۆیان پێ ڕانەدەگیراو، دەمێك بوو لە ناو چووبوون، بەڵام ئەو گۆڕستانە ئەوەندە عاسێ و بەتیکەشاخەکون و کەلەبەر و ئەشکەوتە، گرتنی هەروا ئاسان نییە، ماوەی شەش مانگە شاهۆ لەگەڵ هاوڕێیەکانی، لەبەر تەوار خۆیان لەشەڕ دەپاراست، لەسەرووی ئەشکەوت و، دەورو بەری بەتایبەتی لە گاشەبەردەکەی، سەرووی ئەشکەوت، بەیەك جار دەیان ئاربی جی و هاوەن دەتەقینەوە، زۆریان لە تیکەشاخەکان هەڵدەقۆستنەوە زەرەدی وەهایان نەبوو، شاهۆ برادەرەکانی بەسەر دەکردنەوە، ناڵەناڵی بریندارێك تازەپێکرابوو هۆشی لە خۆی نەبوو، جار جار لرخەلرخێکی لێ دەهات، وات دەزانی تەواو بووە، شاهۆ بەڕاکێش ڕاکێش گەیاندیە نزیك ئەشکەوت، پێشمەرگە بریندارەکە دەنگی نەما، زانی گیانی سپارد، شاهۆ بە سنگی خۆیەوەنا. جووتیار گیان بۆ بەجێت هێشتم، مام کۆسرەت هاتە بەردەرگای ئەشکەوت و شەهیدەکەی لێ وەرگرت، لەبەر ڕووناکایی گوللە ڕووناککەرەوەکان. مام کۆسرەت دەموچاوی هەمووی خوێن بوو، جارجار بەکلکی جەمەدانەکەی خوێنی دەوروبەری چاوی پاك دەکردەوە، خەریکی پێچانی قۆڵی پێشمەرگەیەکی بریندار بوو، گوێ بگرە هاوڕێ، ئەتۆش پێکراوی، نا سەرم لە تیکە بەردێك داو هەندێك شکاوە، دەڵێم تەقە لە لای برادەران کزبووە. دەزانم ئێستا ئەو برینەی بپێچم دەچمە دەرەوە، فیشەکمان زۆر کەم ماوە، ئەگەر دەزانی کار لە کار ترازاوە و بەرەو ڕۆژهەڵاتن دەچین، بەس ڕۆژ هەڵێت چی دیکە خۆمان پێناگیرێ. بۆ لەگەڵ تەوار خۆت ڕادەستیان ناکەی، مام کۆسرەت دوو چاوی لە شاهۆ زەق کردنەوە و دەستی داچەکەکەی بەرەو زالکی ئەشکەوت ڕۆیشت، دەنگێك لەدەرەوە هات، شاهۆ، تەوار، تەوار، زانی برادەرانن نهێنی شەو

دەڵێن، دوو پێشمەرگە بوون یەکیان بریندارو ئەوی دیکەیان دوو ڕەختی فیشەکدانی پڕی هێنابوو، ئاهێکیان بەبەرداهاتەوە، ڕەختەکان بە هی مغاویر دەچوون لەگەڵ دوو مەتارە ناوی نیوە، دەزانی شاهۆ ئەوەی مامۆستا سەرباز دەیکات، کەس بۆی ناکرێت، لەبەر ئەوەی جلکوبەرگی ئەوانی لەبەر دایە، هەست ناکەن دەچێتە ناویان و فیشەک و مەتارە کۆ دەکاتەوە. پێشمەرگەکە لەگەڵ شاهۆ بەپەلە لە ئەشکەوت دەرچوو، هاوانێك دای لەبەردەرگای ئەشکەوت، شاهۆی فڕێ دا. چەند مەترێك لەولا تر، کەوتە سەرزەوی.

فیشەك وەکوو لێزمەی باران دەبارین، بەڵام هێشتا زاتی ئەوەیان نەکرد بوو، بێنە سەر ئەشکەوتەکە، ماوەیەك لەجێگای خۆی تاسا، دنیا بەبەر چاویەوە دەسووڕا، دوو جار تەکانی داخۆی دەکەوتەوە، پێشمەرگەکە هاتە بنباڵی ها، شاهۆ پێکرای؟ نا هیچ نییە، بۆ خۆشی نەیدەزانی، چی بەسەر هاتووە، پێکرانی دوێنێ شەوی هەر لەبیر چووبووەوە، هەستایەوە، چەکەکەی دۆزیەوە، بە هاوڕێیەکەی گوت، تەقەی هاوڕێیان کزبووە، ئەتۆ بچۆوە لای هاوڕێیانی لای چەپ، ئاگات لە خۆت بێت، بەبێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە، ڕۆیشت، بە دەم ڕێگاوە، فیشەك وژە وژ بەولا و ئەولایدا تێدەپەڕین، شاهۆ ئەمن بەرەو برادەرانی لای شەخسەکە دەچم ئەتۆش، بڕۆ لای برادەرانی دی، داوایان لێ بکە بگەڕێنەوە ناو ئەشکەوت، کێ لەدەرەوە ماوە. لەلایەك دوو پێشمەرگە لەسەر شەخسەکە و لەو لای دیکەش یەك کەس تەقەدەکات، ئەگەر بە خۆڕاگری ئەو سێ پێشمەرگەیە نەبوایە، دەمێك بوو جاش و سوپا گەیشتبوونە ناو ئەشکەوت، ئەوەی شوێنی دیاریکراوی نەبوو ماموستا سەرباز بوو، بە ناویاندا دەگەڕا، چەك و فیشەك و مەتارە و خواردنی کۆ دەکردەوە، کاتێك دەیان دیت کەسێك بە جلکوبەرگی سەربازییەوە لە دووری چەند هەنگاوێك تەقەیان لێدەکات، بێباوەڕی و سڵەمینەوە لەناو تەواوی جاش و سوپاکە سەری هەڵدابوو، سەریان لەو نهێنییە دەرنەدەچوو، ئایە پێشمەرگەکان وەکوو سەرباز خۆیان گۆڕیوە یان لە ناو خۆیان سەربازی یاخی و سەر بەپێشمەرگە هەیە، بۆیە ماوەیەك دوورکەوتنەوە، کەوتنە ژماردن و بە سەرکردنەوەی تەواوی سوپاکە، ئەو ماوەیەش پێشمەرگەکان کەوتنە خۆکۆکردنەوە و سەنگەر قایمکردن و فیشەک بەیەکتری دان، بەردەوام مامۆستا دوو سێ ڕەختی پڕ خەشابەی لە دەورە بوو. پاش کەمێک بێدەنگی

وایانزانی جاش و سوپا گەڕاونەتەوە، بەڵام هەر لە ئامادەباشیدا بوون، دووبارە لەهەموو لایەکەوە هێرش دەستپێکردەوە..

کاتێك، شاهۆ بەنهێنی شەو دڵنیایکردنەوە، تەقەیان زیاتر کرد، هەتا دەگاتە لایان بەناو کێلەشکاوەکاندا خۆی گەیاندە برادەرەکانی، ها چۆنن، زۆر باشین، بەڵام فیشەك لە تەواو بوون دایە، هەندێك فیشەکی بۆ بەجێ هێشتن، ڕۆیشت، بۆ لای برادەرەکەی، مامۆستا بە حەماسەوە شەڕی دەکرد، هەر بەپێوە خەشابەکانی دەگۆڕی، بەڵام بێ ئەزموونی پێوە دیاربوو، شاهۆ چووەلایەوە، مامۆستا بگەڕێوە. مەترسی لەسەر ژیانت هەیە، ئەوەندە دەچیە ناویان ئاشکرا دەبیت و زەفەرت پێدەبەن. مامۆستا گەڕایەوە، دوو تاقم فیشەکی لە لای خۆی دانابوو دایە دەستی شاهۆ، خەمی منت نەبێت، باشە بەڵام لەو گۆڕەی بە پێوە تەقە مەکە، قەناس بەدەستەکانیان لەناوت دەبەن.. دەنگی تەقە زیادی دەکرد، کزدەبوو، لە هیچ لایەکەوە نەدەما، دەهاتنەوە، شاهۆ چەند دەسترێژێکی بە ناو کۆمەڵێك جاشدا کرد، زۆر هاتبوونە پێشەوە زانیبوویان کەس لەوێ نەماوە تەقە بکات، جاشەکان سەربەرەو خوار هەڵاتنەوە، دوو کەلاکیان لێ بەجێما. بەدەم تەقەوە، خۆی گەیاندە لای برادەرەکانی. برادەران هەڵکشێن بەرەو ئەشکەوت، لە تواناداا نەماوە.. یەکێك تەقەی دەکرد دووان دەڕۆیشتن، هەتا خۆیان گەیاندە بەردەمی ئەشکەوت، شاهۆ هاواری کرد، تەوار، تەوار، زانیان ئەوانن، تەقەیان نەکرد. هەر چووە ژوور بۆ لای تەوار، سەلامەتە، کوا مام کۆسرەت ڕۆیشت، نەهاتووەتەوە، مانای چی نەهاتووە. لە دەرەوە بەیەکجاری دەنگی تەقە لەلایەن پێشمەرگەوە نەما. لەبیری ئەوەدا بوون چۆن چۆنی لە دەوروبەری ئەشکەوت بەرگری بکەن، پێشمەرگەیەك پاش تەقەکردنێك زۆر هاتەژوورەوە، پێشمەرگەێکیکەشی لەگەڵ خۆی هێنابوو، شالاو کوا مام کۆسرەت؟ وەڵام نەبوو، شاهۆ شالاوی ڕاوەشاند، کوا چی لێهات؟ بەبرینداری کەوتەدەست دوژمن. پاش کەمێك تەقینەوەیەکی گەورەهات، وابزانم ڕومانەی بە خۆیدا تەقاندەوە. لە دەوروبەری لاشەی چەند جاش و مغاویر کەوتن. لەگەڵ زانییان بەرگری لە دەرەوە نەما، لەدەوروبەری ئەشکەوت، هێرش زیادی کرد، ئاگربارانێك دەستی پێکرد، ئەشکەوتەکە وا هەڵکەوتبوو، لەسەرەوە، بەکەرتەچیایەکی گەورە لووس، وەکوو شووشە گیرابوو، لەو لایەنەوە کەس نەیدەتوانی زەفەریان پێ ببات، لەبەردەمی چەند گاشەبردێك گەورە زالکی ئەشکەوتەکەیان دەپاراست، هەتا

دەگەیشتیە ناو ئەشکەوت دەبوو بە سێ قۆناغ سووڕابایەوە، توولەڕێیەکی باریك بە پێش گاشەبردەکان دادەهات، یەك یەك ئەبا دوو دوو زۆر ئاستەم بوو بەو توولەڕێگا باریکەدا تێپەڕیبان، بۆ هەر کەسێك هاتبایە دەبوو شەڕی دەستەویەخەی کردبایە، لە دوو لاو لەسەرەوەی گاشەبەردەکان شاهۆ دوو پێشمەرگەکە پاسەوانیان دەکرد، هەرزوو زوو هێرشیان دەکرد، سەرەتا بەس جاش بوون پاشان مغاویر بە پێلاقە لاشەی جاشەکانیان فڕێدەدا و دەکەوتەنە تەقە، بەدەم تەقەکردینشەوە هاواریان دەکرد، خۆتان تەسلیم بکەن، لەسەر شەڕەفی سەرۆك ناتان کوژین، دەتۆ وەرە پێشێ بزانە چۆن خۆم ڕادەستان دەدەم.

پێشمەرگەی سەر تاشەبەردەکەش، بە هاوەن پێکرا، پارچەڕەشاش ئاربیکە و، کلاو جەمەدانییەکەی پارچەگۆشتی سووتاوی بەر بووەوە ئەولاو ئەولای شاهۆ و برادەرەکەی. لەگەڵ چەند هاوەنێ کە بۆنی سیر و سێو بڵاوبووەوە، زانییان کیمیایە، هەستیان بەزوورانەوەی قووڕگ ودەم و لووتیان کرد و بە کۆکەکۆك کەوتن، هەر لە جێگای خۆیان هێڵنجیان هاتێ، ڕشانەوە، بەڵام دیار بوو، تەقەکەیان کەم و دوور کەوتنەوە، بەپەلە خۆیان بە ناو ئەشکەوتدا کرد، جەمەدانە و پشتێندی تەڕ. ئاگرێکیان کردبووەوە، چوونە بەر ئاگرەکە، لەناو ئەشکەوتەکەش بۆنی بۆگەنیوی سیر دەهات بەڵام کەمتر، تەوار هەتا ئەوکاتە بێ هۆش بوو، جار جارێك ناڵەناڵێکی دەکرد. بریندارێك بە شەلەشل چووە بەر قاپی ئەشکەوتەکە خۆی بە تفەنگەکەیەوە گرتبوو، پاسەوان بوو. شاهۆ لەبەر تیشکی ئاگرەکە لە دەموچاوی تەوار ورد بووەوە دەموچاوی هیچ نیشانەیەکی ژیانی لێ بەدی نەدەکرا، شاهۆ لە باوەشی کرد، لە دڵی خۆیدا دەیگوت، ئای تەواری بەدبەخت چەند کەر و ساویلکە بووم بەقسەی کەسم نەکرد، هەرچەندی مام کۆسرەت دەیزانی کۆتایی هەموومانە دوا هەوڵی پاراستنی گیانی تۆ بوو، هەزارو یەک ڕێگای بۆ دانام، دەستم داوێنت شاهۆ بەقسەی مام و هاوڕێی خۆت بکە، ئەگەر دەزانی ژیانت لەشار مەیسەردەبێت و ژیانت ناکەوێتە مەترسییەوە، دەستی تەوار بگرە و بڕۆ بیبە بۆ شار، کەنگێ ژیانی ئەوت مسۆگەر کرد، یان کەسێکی دڵسۆزیت دۆزیەوە ڕادەستی بکە و بگەڕێوە. ئاخ لە کەللەڕەقی و بێ مێشکی من، چەند دەبەنگ و غەمسارد بووم لەژیاندا، خۆ ژیانی ئەو کیژۆڵە ژیانی خۆم ئەبوو هەتا ئاوا سەرەڕۆیی پێوەبکەم. ئەگەر ئەتۆ لەگەڵ حوسێن بای

غەمی من چی دەبوو، بۆخۆم بەرەو پیری مەرگ دەچووم، پاش کەمێکیکە دەست لەملانی باب وداك وخوشکو برانەنفالکراوەکانت دەبی، هەمان چارەنووس چاوەڕوانت دەبێت! ئەتۆ تاقە منداڵ بووی لە خێزانە بەکیمیای لەناو چووەکەت. ئێمە باشین، ئەگەر دەمرین. ناومان پێشمەرگەیە، ناوەکەمان بەخۆمانەوەیە، باب وداك خوشکو برا سەلامەتن، با لەهەر خێزانێك دانەیەك بڕوات، نووزەیەک ئەوەندەی کە بەندی دڵ و جگەری پساند، تەواربوو وەهۆش خۆی هاتبۆوەو بە پاڕانەوە داوای شیری دەکرد، مامە شاهۆ حەزم لە شیرە، تخوا چۆڕێک شیر، زمانی بە دوو لێوەکانیدا دەهێناو وەکوو بەرخۆڵەیەکی برسی بەدوای گوانی دایکیدا دەیگێڕان.. کاتێک شاهۆ لێوی مەتارەکەی بەدەمیەوە نا، کەوتە مژینی لەباتی ئەوەی ئەو قومە ئاوەی تێیدامابوو بیخواتەوە. ئەوە شیر نییە، تاڵە تاڵ.. دەنگی خرمە دەستڕێژ لە ناو زالکی ئەشکەوت، وەئاگای هێنانەوە، پێشمەرگە بریندارەکە بوو بە بای دەستڕێژ بۆخۆشی بەسەریەکدا کەوت، شاهۆ دەستی دایە چەکەکەی، لەبەر دەرگا دیتی چەند دەمامك کراوێك بەجلکی سپی لەبەردەم ئەشکەوت بەسەریەکدا کەوتوون، لەو جۆرانە زۆر بوون، لە ترسی کیمیای خۆیان ماسکە و دژە کیمیاییاندا پۆشیبوون، جاشەکان کڵاو جەمەدانەیان لە دەموچاوی خۆیان. ئالآند بوو، شاهۆ لەگەڵ پێشمەرگەی بریندار، فیشەکیان بە خۆڕایی نەدەتەقاند. مامۆستا سەرباز هەتا ئەو کاتە لەدەرەوە بوو تەقەی دەکرد، خۆی بە ژووردا کرد، کاك شاهۆ زۆر نزیك بوونەتەوە.

لەگەڵ زیاتر نزیك بوونەوەیان، دەنگی هاوار هاوار بەرزتردەبووەوە. سەرەتا بە بڵندگۆ پاشان بە ئەڕەنەڕ. چەکەکانتان دانێن و وەرنە خوارێ، لەکاتی ڕومانە فڕێدان پێشمەرگە بریندارەکەش کەوتە سەر زەوی. شاهۆ لە تەوژمی تەقە بەرەو ژووری ئەشکەت چوو. براداران گەیشتن هەر کەس دەڕوات بابڕاوت، هەتا بەیەك جاری کار لە کار نەترازاوە، کەس وەڵامی نەدایەوە. هەرکەس لە گۆشەیەك خەریکی دەرهێنانی دوا فیشەکیماڵئاوای بوو، بەزەردە خەنەوە فیشەکەکەیان دەخستە سەر چەکە خاڵییەکەیان. مامۆستا گوێی لەدەنگی هەمان ئەفسەر بوو، تووشی هاری و هێستریا بووبوو، پڕبە گەرووی دەینەڕاند، وەکوو ئەو ڕۆژەی ناو سەربازگەکە.. تەواوی سەربازخانە کە دەنگی دەدایەوە بە فەرمانی ئەم، پاش ژماردنی یەك، دوو، سێ، ئەو سێ ژمارەیەی ئەوەندە بە ڕق و کینە و خێرا گوتن، وەکوو ئەوەی ئاوێک بێت و بەسەر گڕی هەڵچووی جەستە و دەروونی ئەخۆشدا

کرابێت و چارەسەری بێت. خەڵکی گوللە باران دەکران بەهەمان هەڵچوونەوە، مامۆستا سەربازی یاخی، پاش چەند جار جێگۆڕکێی ئەو تیکەشاخ و بن بەرد بەهێواشی لە دووری چەند سەد مەترێکەوە کەوتە بەرامبەریەوە لەبەرزایی، ئەفسەرەکە جگەرەی دەکێشا و خاڵێکی سووری گڕی جگەرەکە لەنێوان دوو لێوە ئەستوورەکانی دیاربوون.. هەر ئەوەندەی دووبارە دەکردەوە، وەرنە دەرەوە چواردەورەتان گیراوە گەمارۆدراون، ڕێگای دەربازبوونتان بۆ نەماوەتەوە.. ئەی سەربازی هەڵاتوو دەزانم گوێت لێمە، ئەتۆ هیچت لەسەر نییە و تووش بووی.. وەرە بگەڕێوە! مامۆستا سێرەی لێ گرت ماوەیەك چاوی خۆی سڕیەوە. بە چەند فیشەکێك لە خۆڵی وەردا، سەرباز و جاشەکان ترسان، دووبارە دوورکەوتنەوە، پاش کەمێك هێرش زۆر بە قورسی دەستی پێکردەوە. بەڵام ئەوجارەیان بەجلوبەرگی سەرتاپاسپی دەمامك کراو. شاهۆ و برادەکانی لەناو ئەشکەوت، بە بێ ئارامییەوە چاوەڕوانیان بوون. دەنگی تەقە زۆر زیادبوو، وەکوو بەرەی جەنگی لێهات، هەتابەرەبەیان بەردەوام بوو. هەر یەك لە گۆشەیەکی تاریك چاوەڕوانی دوژمنییان دەکرد، بەڵام لە ئەکاوێك دەنگی جاش نەما، داوای خۆ تەسلیم بوونیان لێ بکات هێواش هێواش تەقە دووردەکەوتەوە. ئەیان زانی مەسەلە چییە، داخوا ئەوەش چی پلان و فێڵبازییەکی کەیە. شاهۆ بەرەو زالکی ئەشکەوت چوو، زانی خەڵکانێك لە پشتی ئە شکەوتەکەوە هەن، بڕیاریدا بوو بە دوا فیشەك کۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێت. کەسێك بانگی کرد، کاك شاهۆ شاهۆ، دەنگەکەی ناسیەوە، شەپۆل بوو خۆی بە ژووردا کرد باوەشیان بەیەکدا کرد، شەش پێشمەرگەی لقی خۆیان لەگەڵ پەنجا پێشمەرگەی گەرمیان باوەشیان تێکوەرینا، چۆنتان زانی وامان بەسەر هاتووە، حوسێنی شوان وەڵامی بۆ هێنایین بۆ ئالیقە، زانیمان بەرەو قەڵای شەهیدان هەڵکشاون. پاشان هەرلەڕێگای جاشێکەوە. لەگەڵیاندا بوو زانیمان لەناو ئەو ئەشکەوتە گیرتان خواردووە، ئەوەش دکتۆر هۆشەنگە. نان و دەرمانیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، دکتۆر لەوێ کەوتە تیمارکردنی تەوار، هیچ نییە باشتان کردووە ژەهرەکەتان لە لەشی دەرکردووە، مەترسی لەسەر ژیانی نییە.

# زاوای بەرگ خوێناوی

لە ناو ئەشکەوتی (گۆرستانی قەڵای شەهیدان) لەبناری کۆسرەت، لەبەرزایی سەر لەهەور و لەدامێنی لووتکەی سەر بەتەم، کاتێك چەند هاوڕێی لێکدابڕاوی تامەزرۆی دیدار باوەشی خۆشەویستیان بەیەکدا کرد، بۆ شەپۆل و هاوڕێکانی ئەو بە یەککگەیشتنەوە، دیتنەوە و ڕزگارکردنی هاوڕێکانیان ئارامییەکی وای پێبەخشین، فرمێسکی خۆشیی و غەمباریی تێکەڵ بە یەك بوون.. قەد لەو باوەڕەدانەبوون بتوانن لەدەست ئەو هەموو جاش و سوپا گەورەیە ڕزگاریان بکەن، هەستیان بە سەرکەوتنێکی گەورە دەکرد، بەڵام ئەگەر خۆڕاگری خۆشیان نەبوایە دەمێك بوو بەدەست گیرابوون، هەر بۆیەش توانیان بەشێك لە برادەرەکانیان لەبن چنگی دوژمن دەربێنن، شاهۆ مام کۆسرەت و بەشێك لە هاوڕێیەکانیان یەکەم جاریان نەبوو وەها لەلایەن دوژمنەوە گەمارۆ بدرێن، چەند جار شەڕی سەختتریان دیتبوو، شەڕی دەستەویەخە، فیشەك نەمان بە قەمە و خەنجەر و سەرەنێزە، چەند جاش و سەربازیان کەلوپارچە کردبوون، شەڕی قەمە و سەرەنێزە لە زانستی سەربازی بە جهنگی چەکی سپی ناسراوە، دەگەڕێتەوە پێش دروستبوونی چەکی کۆمەڵکوژ، شەڕی سپی بە چەکی سپی، زۆر سەختترە لە شەڕی فیشەك، فیشەك لەدوورەوە دەیتەقێنی، پیاوی بە جەرگ و بێغیرەت دەتوانێت پەنجەی پێوەنێت، بەڵام شەڕی سەرەنێزە پیاوی خۆی دەوێت. مغاویری لەندەهۆری دەمولیچ بە قەد یەك لێواری بەرمیەك ئەستوور. چەندەها ساڵ لەسەر پشیلە و سەگ و هەتا گوشتی بە نیادەم خواردن بەزیندوویی پارچەپارچەکردن بە کەڵبەوددان شفرەکانیان، مەشقیان پێ کراوە، کوڕی بێ داك و بابن، لەو بیابانانە لە سەد جۆرە پیاو پیتاون، هەرچی سۆز و مرۆڤایەتی هەیە لە دڵیاندا نییە، یان ئەوەتا وەکوو نێچیرێکی دەستەوستان دەچیە بەردەستیان کەلوپارچەت بکەن، بەڵام ئەگەر لێیان ڕاسای، دەبن بە یەك پارچە ترسنۆکی.

بۆ شاهۆ و تەوار و سێ پێشمەرگەی بریندارى دیکە و مامۆستا سەرباز و چالاکی ڕەشتاڵەی خوێن شیرین، مانای مانەوە، مانای یاخیبوونێکیکەی گەورەتر، بۆخۆیان باوەڕیان بە خۆیان نەدەکرد لەو شەڕە خوێناویە ڕزگاریان بووبێت،

شاهۆ لەگەڵ ئەو هەموو دەردەسەری و ئازارەی ئەو چەند ڕۆژە، یان ڕاستتر چەند مانگەی ڕابردوو، خۆ ئەگەرحەوت ساڵی پێشمەرگایەتی هەتا ئێستا بە چیرۆك و ڕۆمان بگێڕیەوە و بنووسییەوە بە چەندان بەسەرهاتی (هەزار و یەك شەو) یان حەمەدۆك بەدرێژایی ژیان دەبێت. شاهۆ پاش شەش مانگ پێشمەرگایەتی بۆ یەکەم جار بریندار بوو، دوو فیشەکە بەسەر شلکەی ڕانی کەوتن. تاسا، کەمێکیش ترسا خۆی زۆر بە بێهێز دەهاتە بەر چاو، بەڵام لەگەڵ دووەم، سێیەم جار پێکانی بوو بەشتێکی ئاسایی و وەکوو ڕیش تاشین و خۆ شوشتنی لێهات، بۆ لەشی خۆی و برینداربوون زۆر بە تەنگەوە نەدەهات، لەدەستدانی هەتا ئەو کاتەی بە چوار دەوری خۆیدا دەگێڕا، هەشت لە هاوڕێیەکانی دیار نەبوون، جەرگی لەت لەت بووبوو، بەڵام لەبەر زامی دووپشکی نەفرەتی کە دوێنێ شەو بە تەواریەوە دابوو.. زۆر نەدەپرژایە سەر زامی قووڵی دەروونی خۆی، پاش چارەسەرێکی خێرای تەوار. دکتۆر بە هەناسە تەنگیەکەوە بە خێرایەکەوە دەرزی دژە کیمیای ئەترۆپین لە تەوارو هەموو بریندار و پێشمەرگەکانیکەیدا، داوای لێ کردن بە زووترین کات ئەو ناوە جێ بهێڵن، لەبەر ئەوەی گازی ژاراوی بەو ناوەدا بڵاو بووەتەوە. کاتێك شاهۆ تەواری بە باوەشەوە بوو بریندارەکانیش بەیارمەتی پێشمەرگەکانی کە لە ئەشکەوتە سارد و تەڕو تووشەکە هاتنەدەرەوە، هەموو لەشیان هەر لە تۆقی سەریان تا نووکی پێیان لە خوێنی خۆیان و بریندارەکان شەڵاڵ ببوون، تەمومژ سەرتاپای چیاو دۆڵ و بنار و، تەواوی گۆڕستان و قەڵای بە هەموو سەنگەر و گۆڕ و کێلەکان گرتبووەوە، بۆن سووتا و کیمیایی و بەدەمیان لاشەی کوژراوی جاش و سەرباز لەسەر کەڵەکە بەرد و، ناو گۆڕە پوشوپەڵاش سووتاوەکان بۆنی بارِودی سووتاو و چڕەدووکەڵ، بە پانایی گۆڕستانە پەرشو بڵاوەکە بڵاوبووبوونەوە، لەخوار ئەشکەوت بەبەر گردێکی نزیکەوە، یازدە گۆڕی تازەی کێل بەرزی شێداری پێشمەرگەی قارەمانی شەڕی مانونەمانی دوێنێ شەو پێشمەرگەی گەرمێنێ، کە لەگەڵ پێشمەرگەکانی بتوێن یەکیان گرتبووە بۆ ڕزگارکردنی هاوڕێیەکانیان هەشتیان هی بتوێن، سێ پێشمەرگەی گەرمێن، لەتەنیشت یەکترەوە بە بەرگوجلی کوردی خوێناویەوە بەخاك سپێردران، لە جەسەتەی پیرۆزی مام کۆسرەت، هیچ نەدۆزرایەوە، گۆڕی دیار نەبوو، لەدڵی گەرمی هاوڕێیەکانی و خەڵکی ئەنفالکراو، ڕاگوێزراوی (بناری کۆسرەت) و دڵی گەرمی هەموو کوردا نێژرا، وەکوو

سەربازێکی ون مایەوە، کەسی وەکوو مام کۆسرەت پێویستی بە جێگا نزرگە و گڵکۆ و گۆڕ نییە، لەهەر شوێنێکی بستەخاکی کوردستان تاجە گوڵینە لەسەر گۆڕی سەربازی ون دابندرێت بەدوای مام کۆسرەتدادەگەڕێت. دەزانێت شۆڕەسواری کێیە؟ کێ شایستەی گوڵبارانە! شاهۆ وێنەی هاوڕێ شەهیدەکانی یەك یەك دەهاتە بەر چاو، سێ ساڵ لەمەو بەر بوو، شالاو هات بۆ پێشمەرگایەتی، هێنایان بۆلای شاهۆ دەیەوێت ببێت بە پێشمەرگە. شاهۆ هەرچەندە تەماشای شالاوی دەکرد، منداڵ بوو، هێشتا خەتی سمێڵی نەدابوو، بەلام زۆر دڵگەرم بوو. بەهەزار ئەولاو ئەولا توانی ڕازی بکات بڕواتەوە خوێندنەکەی تەواو بکات و بێتەوە. شازدە ساڵ بوو، پاش یەك ساڵ و چەند مانگێك هاتەوە ئێستا هەژدە ساڵم، بەلام وەکوو لێکیان دایەوە حەڤدە و نیو بوو، بە مەرجێك وەریان گرت شەش مانگ هەتا ساڵێك بەشداری هیچ شەڕێك نەکات. مام کۆسرەت لەتەمەنی لاوییەوە لە سەرەتای شەستەکانەوە پێشمەرگە بوو بەشداری ئەیلوولی کردبوو، ناکار و خووەکانی پێش گێڕانەوە و پاش گێڕانەوەی هەر شتێك بەدەم خەندە و پێکەنینەوە چاوەکانی پڕدەبوون لە فرمێسك، لە مەودوا بە نەمانی هاوڕێ بە ئەزموونەکەی پرسوڕای بە کێ بکات؟ کێ بێت پێشبینی ڕووداوەکان بکات و چارەسەرییان بۆ دابنێت. لەناو تەمومژو، دووکەڵ لە ئاسمان دەنگی، بۆردوومانی فڕۆکە جەنگییەکان دەهات، بەلام بۆ خۆشیان نەیاندەزانی ناپالم و کیمیایی لە کوێ و لە کێدەدەن؟ شاهۆ کاتێك تەوار بە کۆڵیەوە، بە دڵێکی پڕ لە هیوا و ڕقێکی ئەستوورتر لەجاران، بە ناو تەمومژدا، دوورکەوتەوە، چەند جارێك تەماشای ناو قەدی خۆی کرد، بزانێت دوێنێ شەو لە خوار کەمەرییەوە لە کوێ پێ کراوە، بەلام دیار بوو فیشەك بەبەر مەتارەی ئاوەکەی کەوتبوو، بەسەر ناوقەد و سەرڕانی هەتا ناو گۆرەویەکانی هاتبوو خوێنی وشك بوو سەرتاپای گرتبوو لەگەڵ دیتنی هەر دڵۆپە خوێنێك، چرکەساتەکانی گەمارۆکەی وەبیردەهاتەوە، کار لە دڵۆپەخوێنێك نەمان و شەلالی خوێن بوو، لەسەر جۆگەئاوێك دەموچاوی تەواری شوشت، بەجەمەدانەکەی ویستی دەموچاوی تەوار بسڕێتەوە لە خوێن وەردراوبوو، بەلایەکی پشتێندەکەی دەموچاوی سڕیەوە، ئەو هێزەی لەپێشەوە دەڕۆیشتن بە جاش و سەرباز و دەرەجەدار دیل خۆی لە سەدو و پەنجا کەس دەدا، لەگەڵ هێزی گەرمیان ڕۆیشتن گەڕانەوە ناوچەی خۆیان، ئەوەی بۆ شاهۆ زۆر مەبەست بوو،

بەزیندوویی مانەوەی تەوار و هاوڕێیەکانی بوون، بەڵام دەربارەی پێشمەرگە کاتێك دووشەهید دەبوون چوار جێگایان دەگرتنەوە، لەگەڵ گەڕانەوەی شەپۆل لە شار چوار پێشمەرگە بوون، بووبوون بە دوانزە کەس. چەند تەمومژەکە چڕتر دەبوو، دیمەنی خاپوورکراوی قەڵاو گۆرستانی شەهیدان، زیاتر بزر دەبوو. ئایە ئەو کاولکارییە تەنها بە شەڕێکی یەك شەوەی چەند کاتژمێرییە، هیچی بەسەر هیچەوە نەماوە.

چەند سەربەرەو خوار دەبوونەوە لەپێشیان بە دۆڵێکی تەنگەبەردا سەختر دەبوو، شەپۆل شانبەشانی شاهۆ دەڕۆیشت، باسی شەڕەکەی گۆڕستانی قەڵای شەهیدانی لێدەپرسی، ئەویش بە وردی بۆی دەگێڕایەوە. پاشان بە شاهۆی گووت:

کاکە، دەزانی بیرێکی زۆر باش و لەجێ دابووە، خۆتان گەیاندووەتە ئێرە. ئەو هێزە بێشومارە وا نەبا بە چەند کاتژمێرێک بەدەست دەیان گرتن. لەمەو دوا، ئەگەر هیچ نەبێت بۆ ماوەیەك باشترە لە بارەگای کەڵەمێوێ دوور کەوینەوە، لەبەر ئەوەی چەند جار هێرشی کراوەتە سەر، زانیمان لە زۆر لاوە مین ڕێژکراوە، ئێستاش ئەو چەند گوندەی دەورو بەر چۆڵکراون، لەسەر دەریاچەی دەربەند لەسەرووی ئالیقەی خوار لەبەر ئەوەی کوێرە گوند بەرلە ڕاگواستنی هەموو گوندەکانی ئەو بنارە لەگەڵ هەستانی دەریاچە و زیادکردنی ناو ژێرئاوکەتووە، جێگایەکمان دابین کردووە. دەستمان زوو دەگاتە بردەرانی ناو شار، تەماشایەکی تەواریشی کرد، ڕەنگی بزڕکابوو، لەرزوتایەکی بەهێزی لێ بوو، ئەگەرچی ڕۆژبوو، هەتاو هەڵاتبوو، وشکە سەرمایەکی کوێستان دەهات، بەڵام لە نەخۆشی و ئازاری دووپشك ددانەچۆقەی پێ کەوتبو، کاتێك گەیشتنە ناو دارستانێکی چڕی بە ئاو، چەند کۆنە کەلاوەیەکی لێ بوو بنەوبارگەیان لەوێ خست. لەدوور، جارجار دەسترێژی نەپساوە دەبیستران، کەس ماوە لە پاشماوەی سوپا تەقە بکات. پێشمەرگەکان بە سەرسووڕمانەوە لە لەیەکتریان دەپرسی، دەنگی دەستریژ کپ دەبێت، دووبارە خرمەخرمی دێت، هەواڵیان بۆ شاهۆ هێنا، کاك شاهۆ کەسێك دەڵێت، چەند چەکدارێك هاتوونەتە سەر زرار و بەسەریان داداوە، گوایە کوژراوە، لەگەڵ بیستنی کوژرانی زرار، شاهۆ هەستی بە ئارامییەك کرد، بۆ دواجار بە سزای خۆی گەیشت، کەسێکی چەپەلی بەدخوی وەك زرار قەت لەسەر کاری باشە بەسەریدا نادرێت، بەڵام کێ ئەوەندە

بەرامبەری داخ لە دڵ بووە، بەو دەمەی هەڵیکوتاوەتە سەری هەتا تاریك داهاتن ددانی بە خۆ دانەگرتووە و گیانی تۆڵەکردنەوە ئەو سەرەڕۆییەی پێ کردووە، یان پێ کردوون. زۆر تامەزۆری بیستنی هەواڵی زیاتر بوو، ئەدی چارەنووسی خانزاد، بەڵام کە گوێی لە ناوی خانزاد، خێزانی زرار بوو، خورپەیەك بە دڵیدا هات، هەتا ئێستاکە لەبەرگری دایە و شەڕەکە کۆتایی پێنەهاتووە، بانگی کابرای کرد، فەقێ خدر بوو، وەرە کاکە چۆن زانیت؟ پێش ئێستا لەو یاڵەی ئەو دیوە بووم، کابرایەك بۆی باس کردم، چی دەربارەی خانزاد دەزانی؟ ڕاستی خۆی بەدەستەوە نەداوە و تەقەی کردووە، لە بەرەنگارییەکی پیاوانە دایە. شاهۆ دووجار تەواری ماچ کرد... تەوار بە نووزەیەکەوە داوای شیری کرد، پێش ئەوەی شاهۆ بڕوات، داوای لە چالاك کرد، هەوڵ بدە هەندێك شیر بۆ تەوار پەیدا بکە. لەگەڵ دوو پێشمەرگە بە هانای خانزادەوە چوو، شوانەش دوو پێشمەرگەی لەگەڵ خۆی برد، بۆ ئەوەی شیریان بداتێ، چالاك دەمێك بوو فەقێی دەناسی، بەڵام سەری لەوە سووڕمابوو لەو چیا و بەندەنەوە بە ڕێکەوتیش، تیشکی خۆر دەرناچێت. ڕەنگ و ڕووی فەقێ بەچی ڕەش داگەڕاوە و تاوەگازبووە، وەکوو ئەوەی کەسێک بێت و بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ لە خواروو بیابانە شوان بووبێت، کاکۆڵە درێژ و قیتەکانی لە ژێر تەپلەی لباد تەواو هەستابوونەوە، هاوڕێ هەڵکەوت ئەمەیش کاك فەقێیە دۆستێکی دێرینی خۆمانە. هەڵکەوتیش بە شوانەی گوت، بە خێربێی باوانەکەم. بۆ دواجار کەسێکمان دیت، ڕەنگ و ڕووی جیاواز لە خۆمان. فەقێ کەمێک بە تێڕامانەوە، کاکە هەڵکەوت ڕەنگ و ڕوو دوور لەهی خۆمان، مەبەستت چیە؟ هەڵکەوت مەتارەکەی قەدی دەرهێنا، بۆ فەقێی ڕاداشت، فەرموو چۆڕێک ئاو بخۆوە! فەقێ مەتارەکەی بە سەر دەمیەوە نا، دیاربوو زۆری تینوو بوو. ئەدی کاکی برا، ئێمە پێشمەرگە لەو ئەشکەوت و بارەگا و چۆڵەوانییە، زۆر بەدەگمەن نەبێت دەموچاوێک جگە لەو کۆمەڵە کەسەی بەردەوام بەیەکەوەین نابینین، ناهەقمان نییە ئەگەر کەسیکی دیکە دەبینین لەلامان سەیرە. قەفێ ماوەیەک بیری لە قسەکانی هەڵکەوت کردەوە، پاشان ڕووی لە چالاک کرد، کاکە چالاک، دەڵێی ئەم برادەرە خەڵکی ئەو ناوچەیە نییە. چالاک سەرنجێکی خێرای هەڵکەوتی دا، نەخێر، کاک هەڵکەوت، هەڵکەوتەیەکی گەرمێنیە. فەقێ بۆ مەرایی کردن. بەڕاستی گەرمێنی کوڕی نازای ڕۆژی تەنگانەن، لەو دەشتەی گەرمەسێرێ لەتەختایی وەکوو لەپی دەست، نە شاخێکی وا عاسێ نە

ئەشکەوتێکی وا سەخت و بە پێچ و پەنا. بزانە چۆن چۆنی دوژمنیان تۆقاندوە؟ بۆگۆڕینی بابەتەکە، هاوڕێ چالاك دوێنێ هاتم دیار نەبووی؟ چونکە پێرێ داوای نان و شیر و تووتن و دەرمانت کرد بوو. شمەکەکانم هەمووی بۆتان پەیداکردوون، بەڵام دەستم وەشاری ڕانەگەیشتووە، داودەرمان وەگیر نەکەوتووە. وام زانی ئەوڕۆش دیار نابن. چالاک بە تەنگە نەفەسیەکەوە، کاکە دوێنێ شەو لەشەڕێکی دژواردا بووین، کەسمان بەتەمای خۆمان نەبووین، لە نیوەشەوەوە لە شەڕێکی دەستەویەخەدا بووین، ئەگەر هاوڕێیانی خۆمانی بیتووێن کە لە شار بوون و یەکگرتنەوەیان لەگەڵ شێرەکانی گەرمێنێ وەکوو خۆت باست کردن نەبوایەن و بە فریامان نەهاتبان، ئێستاکە هەرمووەمان لە ژێر خاکدا بووین، بۆ مەسەلەی دەرمان، ئێستا دکتۆرمان لەگەڵدایە وداودەرمانی باشی پێیە. فەقێ دەستێکی لەسەر شانی چالاک دانا، باشە تۆخۆت ساخ و سەلامەتی، دەزانی کاك چالاك ئەمن ئەوە دواجارە دێمە ئەو بنارە، واز لەکاری شوانی دەهێنم، ژیان لەو چۆڵ و بەندەنە ڕۆژبەڕۆژ قورستر دەبێت. چالاک هێشتا تەمی تووڕەی شەڕی دوێنێ شەوی لەسەر ڕووخساری ماندوو و شەکەتی نەڕەوی بووەوە، بەڵام زۆر بەهێمنیەوە گووتی:

ڕاستە برام، دەزانین ئەوە چەندها ساڵە شوانکاری پیشەتانە، پاشان بۆ پێشمەرگەش باش بوون، بەڵام نەتگوت بە تەمای چیت؟

فەقێ کەمێک شڵەژا و شەرمێک بەڕوویەوە دیاربوو، بڵێم چی، کاکە ئەمن دەبم بە پیاو. خۆم تووش کرد.

چالاك: کاکە ئەمن تێناگەم دەبمە پیاو، خۆم تووش کرد، دووشتی زۆر لەیەك دوورن. ئەگەر وابێت هەر کەسێک هەتا خۆی تووش نەکات، نابێتە پیاو، کەواتە ئەمن هاوڕێ هەڵکەوت فت، فەقێ بە پێکەنینەوە، کاکە بەکوردیەکەی ژنم مارەکردووە. ئاها، ئاوا ئەگەر وابێت بیوەژن دێنیت. ناکاکە نا. گەورە بە گچکەم کردووە. خوشکی گەورەم داوە، کچێکی هەژدەساڵیان دامێ، بە بنپشک. کاك هەڵکەوت هەتا ئەو کاتە بێدەنگ بوو، کاك فەقێ، گوایە دەبێت خراپی هاوسەرگیری لە چی دابێت، پاشان ئەو جەنگە درێژخایەنە، زۆر لەوەی زیاتر دەوام دەکات لەوەی چاوەڕوان دەکرێت، پێویستی بە گیانی زیاتر و سووتەمەنییە بۆ بەردەوامبوونی، ئەگەر نەوەی نوێ و هێزی تازە جێگای ئەو هەموو قوربانییە نەگرێتەوە، چۆنچۆنی ژیان بەردەوام دەبێت، هەرچەندە پێش وەخت پیرۆزبایت

لێدەکەم، هیوادارم ژیانێکی خۆش و دوارۆژێکی بەختەوەر، بەڵام وابزانم سەردەمی ژن بەژنە نەماوە، جاران ئەو شتانە لە ناچاری و دەستکورتیان دەکران، دەرکەوت سەرناگرێت. بەسەرهاتێکی کورتت لەسەر ئەو مەسەلەی ژن بە ژنییەت بۆ باس بکەم، نەک بیستوومە بەڵکوو بەسەر خانەوادە و نزیکترین کەسمان هاتووە، ئامۆزایەکی من زوو ژن بە ژنی کرد، پاش چوار منداڵ بە ناچاری کۆتاییان بە ژیانی هاوسەرگیری هێنا. فەقێ پرسی بۆ کاکە، مەسەلە چی بوو؟ وادیارە لەیەکتری تێنە گەیشتوون!

کاکە پاش چوار منداڵ و ئەو هەموو ساڵە بەیەکەوە ژیان لەیەکتر تێنەگەیشتنی چی؟ پاش ئەو هەموو تەمەنە تاڵ و ترشی خۆشی و ناخۆشی ژیانیان بەڕێ کردبوو، تازە لەوە دەرچوو بوو، یەک بڵێت سیرو ئەوی دیکەیان بڵێت پیاز.. تەواوی بەسەرهاتەکە ئەوە بوو، ئەوەی ئێمە زانیمان و بیستمان کەلێنێکی بچووک لە ژیانی خێزانیان کەتبوو، ئامۆزایەکەمان، خوشکەکەی لەگەڵ زاوایەکەیان لەسەر ئەوەی زاوایەکەیان ژنی دووەمی هێنا ئامۆزایەکەی ئێمەی تەڵاقدا، وا ڕێککەوت بۆ تۆڵەکردنەوە دەبوو براکەشی دەستبەرداری تەواوی خێزانەکەی بێت، ئەو دوو بنەماڵەیە هەتا ئێستاش دوژمنی یەکترن. ئامۆزاکەم ئێستاشی لەگەڵدا بێت کە باسی ژن بەژنە دەکرێت، دەڵێت هەتا لەژیاندا ماوم نەک ژن بە ژن ناکەم ئەوەی بە خوێی چێشت بگاتە من ڕێگای نادەم ئەو کارە قێزەونە دووبارە بکاتەوە، ببوورە کاکە فەقێ، خەجاڵەتم کەسێکی وەکوو من ڕێبازێکم گرتووە تژی ڕێز و خۆشەویستییە بەرامبەر بە ئافرەت، قەت ئەو بوونەوەرەوە سەرەکییەی ناو کۆمەڵگا نابێت بە چاوێکی کەمەوە تەماشا بکرێت، بەڵکوو هەموومان ئەو ڕاستییە دەزانین ژیان بەبێ ئەوان نەک ناچێتەسەر، بەڵکوو تووشی لەنگی دەبێت، بگرە هەر مموکین نیە، بەڵام تووشی کارێک و چارەنووسێکی نادیاریان دەکەن، کچ بە شوو دەدرێت بەبێ ئەوەی بتوانێت بەڕەزامەندی خۆی بێت، بێوەژن دەکرێت، هەم دیسان بەبێ ویست و ئارەزووی خۆی. نازانم بڵێم چی! چالاك ڕووی لە فەقێ کرد، کاک چالاک دوور بۆ شتەکان دەڕوانێت. ئەوەی بە چاوی خۆی دیویەتی ئەوەت بۆ باس دەکات، برا ئەمنیش بوخچەی نەکراوەم، تەمەنم لە سی لایداوە، هەر ڕەبەنم و بێ ژنم. هەر ڕۆژەی لە کونە شاخێکم. ژیانی تەنیایی زۆر سەختە، بەڵام ئەگەر هەتا کۆتایی ژیان بەو جۆرە بگوزەرێنم و بمێنمەوە ڕێگا بە خۆم نادەم هاوسەرگیری بکەم و وەکوو

کالایەک مامەڵەی لەگەڵدا بکەم و بەچاوێکی کەم سەیری بکەم. فەقێ وا پێدەچوو لەو بۆچوونە تیۆرییە وشکانەی شار و ناو کتێبان حاڵی نەبووبێت بۆیە زۆر بە سادەو ساکاری پرسی، باشە کاک چالاك بۆ ژن ناهێنیت؟ چالاک بۆخۆی ڕەشتاڵە بوو، لەنارەقە و گەرما و بابەتەکەش هەڵچوو بوو، تەواو پشووی سوار ببوو، بۆیە زانی ئەو جۆرە وتووێژە هیچی لێ شین نابێتەوە، بەباری گاڵتەکردن شکاندیەوە، کاکە ئەمن خوشکم نییە، بەچی ژن بە ژن بکەم، مەگەر کلاشینکۆفەکەم لەباتی بدەم، حیزب لە سێدارەم دەدات. داکم هەتا مابوو ئاواتی ئەوە بوو بۆ یەکجار ئەوەی خۆی لە باوەش کردبا، داخی گرانم ئاواتەکەی نەهاتەدی.. فەقێ ڕووی لە چالاك کرد، کاك چالاك، بەش بە حاڵی خۆم، چوار خوشکم هەیە، لەماڵمان ئەمن بە تاقانە دادەنرێم. وەرە وەکوو برایەك خوشکێکێ خۆمت بۆ بەژن دەدەم. چالاك گوتی، کاکە ئێوە لە شاردەژین، ئەمن شەش ساڵە لە دەرەوە دەژیم.. ناتوانم بێمە شار. پاشان لە بەیانییەکەوە ئەمن و هاوڕێ هەڵکەوت بەیت و بالۆرە و خورشید و خاوەری چیت بۆ دەگێڕینەوە! فەقێ گوتی، کاك چالاك بەسەری خۆم بەسەری تۆ و بەسەری ئەو کاك هەڵکەوتە، بابم نەک لە شار، بەڵکوو ئەوکاتیش لە دەشتیش بوو زۆر ڕقی لەو جۆرە شتانە دەبووەوە، تاکەکەسە کە بە ژن بەژن قایل نییە ئەوە، بەڵام لەدەستی ئەودا نییە، کاروپیشەی گریانە بۆ بناری کۆسرەت، شووشکە و ئالیقە و چناران، بۆ ناو پێشمەرگە و ڕاوەکەو، گاڵتەوگەپ و قسەکانی پێشمەرگە زۆر زۆر پەرێشانە، بۆ خۆشت دەزانی ئێرە قەدەغەیە و خاکەکەی پاوانکراوە ناتوانێت بێتە سەردان. چالاك گوتی، دواجار یەك مانگ لەمەوپێش لەلامان بوو، جلوبەرگ و، پارە و خواردن و داودەرمان و زۆر شتی بۆمان هێنا، نەدەڕۆیشتەوە، بەو تەمەنەیەوە دەیویست دوبارە دەستبداتەوە چەک و ببێت بە پێشمەرگە، نیشان بەو نیشانەی هەتا چەکێکی کۆنی ڕاویشی لەگەڵ خۆی هێنابوو، بە زۆر ناردمانەوە. چالاك زۆر دوودڵ بوو دەبێ هاوڕێ شاهۆ چی بەسەر هات بێت. ئەوانەی لەگەڵیدان هەر هەموویان تازە هاتوون، لە شەڕ و پێکدادان زۆر نازانن، لەلایەکی دیکەشەوە، ڕێگای فەقێ بۆ وا دوور بووەتەوە. زیاتر لە کاتژمێرێکە بە ڕێگاوەن.... هیچ دیار نییە. ئەو هەڵسوکەوت و درێژ دادڕی فەقێ لە تەواوی ڕێگا، زۆر جار بۆخۆشی نازانێت باسی چی دەکات، پاشان نیگا و ئەتواری باش نەدەهاتە بەرچاوی، لەو لایەی دوێنێ شەو هێرشیان کردە سەریان، لەلای جادەی قیر نزیك دەبوونەوە.

شەرمی دەکرد بپرسێت کاکە مەسەلە چییە هەرنەگەیشتین. لە لایەکی دیکەش زۆر باوەڕی بە فەقێ بوو، چەندەها جار شەو لە شەڕ یان گەڕانی شوێنان گەڕاونەتەوە، چەند پێشمەرگە بێترس و غەم لەلای خەوتوون و ئەو بەخۆ و سەگەکەیەوە هەتا بەیانی ئێشکگریان بووە. باش بوو هەڵکەوت دەتگوت لەناو دڵی چالاکدایە، یان هەستی بە دوودڵی و شڵەژاوی چالاک کردبوو، لە فەقێی پرسی. برام کوامێگەلەکەت دیار نین. فەقێ بە بێنەوەی ڕوو لە هەڵکەوت بکات گوتی، برام ئەها ئەو یاڵەی سەرەوە دەبینی، لە ناو دارستان، لە دەوروبەری ئەو مێرگەی ئەو دیو مەڕوماڵاتم لە وێن، لەترسی تۆپباران و لەناوچوونیان لەوێ مۆڵم داون، خۆ وایلێهاتووە مێشوولە بجوڵێتەوە کاسەی سەری هەڵدەگرن. لەگەڵ گەیشتنە ناو دارستانە سووتاوەکە، چەند کوڵکەدارێکی سووتاو شێوەی چەند چەکدارێکی ڕەشییان وەرگرتبوو، هەڵکەوت ئەوەی وەکوو مەبەستێ قۆستەوە، ببینن، ئەو دارە سووتاوانە چۆن شکل وشێوەی چەکدارییان گرتووە، وادەزانی چەکداری ڕاستین، لەو مەملەکەتەی ئەوەندە جەنگ و شەڕوشۆڕ دەکرێت هەتا دارودرەخت و مەڕوبزنیش چەکیان هەڵگرتووە، چەند پێشمەرگە و دڵسۆز هەن، هەزار ئەوەندە جاش و ناپاك و سیخوڕی دوژمن هەن، بەلاچاوێك سەیری ڕووخساری ڕەش داگەڕاوی فەقێی دەکرد، بزانێت هیچ شلەژان و شێواویەك لە ئاکار و بیچمی ناخوێنێتەوە، ئەویش تەپلەکەی بە لارووەتی خویەوە نابوو، ئارەقەیەکی خەستی شەرمەزاری لە ڕووی دەسریەوە، بە شڵەژاوییەکەوە دەیگوت، ئەوەندەی من لەو کێو و بەندەنەی ژیاوم، لە مەڕوماڵاتم زیاتر نەدیتوە، چەند سەری بزن و مەڕ و کاریلە بەدیار کەوتن. کاکی شوان داوای لە چالاك و هەڵکەوت کرد، برا پشوویەك بدەن، دەچم نان و شیر و ماستان بۆ دێنم. هەرکە ڕۆیشتو یەکسەر هەڵکەوت لەچالاکی پرسی، هاوڕێ ئەتۆ باوەڕت بەو کوڕە هەیە، چالاك زۆر بە دڵنیایەوە گوتی:

کاکە ئەتۆ دەڵێی چی، میرزای باوکی هەموو جارێك دێت، هەتا پێش ئەوەی بەرەو شار بڕوات، یان ڕاستتر ڕاگوێزران، دەیگوت، فەقێی کوڕم بۆ شوانی دێتە لاتان هەرچی بەمن دەکرێت فەقێم فێرکردووە بۆتان بکات. هەڵکەوت بە دەم هەناسەیەکی درێژەوە، کە پڕ بوو لە ناسۆر و بێباوەڕی، بڵێم چی چالاک گیان، ئەوەندەی ئەمن لە شاخ و کێو و بەندەنەی ژیاوم، زۆرم ناپاکی هەتا چەند جار لەنزیکترین هاوڕێی خۆمانەوە دیتوە، دەستیان لەگەڵ دامودەزگاکانی سیخوڕی

تێکەڵاو کردووە، بەبێ ئەوەی کەس هەست بکات، هەتا لە کاتێکی لەبار گوررزی ناپاکی خۆیان وەشاندوە. ئەوە نەخۆشییەکی کوشندەیە لەناو کورد بەگشتی و ناو خەباتی چەکداری هەتا ئەورۆ نەک بنەبڕ نەکراوە، بەڵکوو هەربیریشی لێنەکراوەتەوە. نەخوازە فەقێیەکی نەخوێندەواری ساویلکەی خۆشباوەڕ، لەو سەردەمە دژوارەش، هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی ڕژێم ئەوەیە ئەو چەند پێشمەرگەی ماویشن بە هەر نرخێک بێت لەناویان ببات، کڕینی کەسێکی وەکوو فەقێ کارێکی زۆر سانایە. بەچەند سەر مەڕ و بزنێک قایلی دەکەن. ئەتۆ ئەو ماوەیەی سەرنجی شتێکتداوە، لێی ووردبببەوە، لەهەر شووێنێکین لەهەر کەلاوەیەک تیکەشاخێک کۆمەڵێك سەگی بەڕەڵا لەدەورەمان کۆدەبنەوە و دەست بە قرووسکە قرووسک و حەپە و لوورە دەکەن، بۆ ئاشکراکردنمان، ئەو سەگانە چەندەها ساڵ لەسەر ئەو کارە ڕاهێندراون. لەڕێگای هەستی شەشەمەوە، بۆنی بوونی بێگانەو هەست بە بوونی بۆسە و ڕوودانی کارێکی نەخشە بۆ کێشراو دەکەم. ئاخ فەقێ! خۆزگە دەمزانی چیت لەبن سەردایە.. چالاک مەچەکی هەڵکەوتی گرت... هەڵکەوت گیان باوەڕت بەمن نییە؟ چۆن باوەڕم پێت نییە، بەڵام ئەتۆ کەسێکی فەقێش کەسێکی دیکە، دڵم تەواو لێی کرمێ بووە. لەو قسانەدا بوون فەقێ پاش کە مێك هاتەوە. بوخچەیەك و مەشکەیەکی کچکە و بۆشکەیەکی سپی لەدەست بوو. کاکە ئەوەش شتەکانتانە، وەرن دانیشن نان و شیرێژێک بە یەکەوە بخۆین، ئەگەر بۆتان دەکرێت شەو لەلای من بخەون. هەڵکەوت بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەکانی بە چواردەوری خۆیدا دەگێڕا، چالاك، فەقێ گیان لەبەر تەوار داوای شیردەکات، پاشان نازانم شاهۆ و برادەران چییان بەسەرهات، هەر دەنگی تەقەیە دێت و هیچی لێحاڵی نابین و هیچ هەواڵێکمان بۆ نایەت. فەقێ بە پێکەنینکی ژاراوییەوە، کاکە لە شاهۆ مەترسە ناوی خۆی بە خۆیەوە، لە هەزار ناوی داوە قولە پێی تەڕنەبووە. هەڵۆی بەرزەفڕی ئەو شاخە بەرزانەیە.

کاتێك ماڵئاواییان لە فەقێ کرد، هێشتا چەند هەنگاوێك دوور نەکەوتبوونەوە، بانگی چالاکی کردەوە چەند فیشەکێکی گڕدارت پێە؟چالاك لە باخەڵێکی ڕەختەکەی چەند فیشەکێکی دەرهێنا و دایە دەستی فەقێ.. باوەشی بە چالاکدا کرد، لە چاوەکانی زۆر شت دەخوێندرایەوە. چالاك باوەشی پێدا کرد، کاکە جارجار وەرە سەردانمان، بەڵام پاش ئەوەی هەنگوینەکەت تەواو کرد. دووبارە لەیەك جیابوونەوە. فەقێ هاواری دەکرد.. سەر چاوەکانم.. خواحافیزتان بێت.

چەند دووردەکەوتنەوە هاواری زیادی دەکرد. لە ناو کەڵەبەردەکانی ئەولا و ئەولا. لە ناو بەردەکانی پشتیان چەند سەرێك بە دیار کەوتن، سەرەتا وایانزانی سەری مەڕومالاْتن. هەڵکەوت گوتی هیچ بە ئاسایی نازانم.. زۆر لە نزیکەوە چەند دەستڕێژێکیان لێ کرا.. بە ناو چالاك و هەڵکەوتدا.. هەڵکەوت بەلایەکدا کەوت، چالاك دەنگی نەما.. هەڵکەوت بەدەم تەقەکردنەوە خۆی گەیاندە لای چالاك، لەسەر دەم کەوتبوو، کلاْشینکۆفەکەی کەوتبوە ژێری، چەند جار ڕای وەشاند، دەنگ نەبوو، دەموچاوی لە خوێن وەردرا بوو. ڕێچکەی خوێنێکی سوور بە ناوچەوان و سەر سینگیدا دەهاتە خوارێ، چوار چاش نزیك بوونەوە، هەڵکەوت نارنجۆکێکی فڕێدا ناویان، دەنگیان نەما.. لە پشت کەڵەکە بەردەکانەوە دەنگی فەقێ دەهات، کاکە بیکوژن با نەمێنێت. چالاك دیارە کوژراوە.. هەڵکەوت دەستڕێژێکی بە ناو فەقێ و دوو جاشی دیکەدا کرد. لە بەرامبەریەوە دوو جاشەکە کەوتنە سەر زەوی. بەلاْم فەقێ تەقەی لە هەڵکەوت کرد، قۆڵێکی بریندار کرد، هاواری کرد قۆڵێکیم پەرچ کرد.. لە چەند لایەکەوە هێرشی بۆ کرا. جەستەی لەوخوێن شەلاْل بووی چالاکی کردبووە سەنگەر و بەدەم تەقەکردنەوە دەستی لەسەر سینگ و سکی دەکوتا، ناو چنگی پڕ دەبوو لەخوێن، پێتم گوت هاوڕێی ئازیزم، فەقێ ناپاکە! دەمزانی سەری تۆی مەبەستە. کوڕە ڕەشتاڵەکەی گەرمیانەکەم. خوودەیگرت، هەڵدەستایەوە هاواری دەکرد. لەکوێی فەقێی ناپاك، حەوت ڕووحت هەبێت ڕووحێکت پێ ناهێڵم. چواردەوری خۆی دەبێژایەوە، خوێنی سەرشان و قۆڵ و باسکی خۆشی چێوا لەخوێنی ڕژاوی چالاک کەمتر نەبوو، هێواش هێواش لای ڕاستی سڕدەبوو، هەتا ئەو ڕادەیەی نەیدەتوانی قۆڵی بەرزکاتەوە، کرتەکرتێک لە سەر دەفەی شانی دەهات، لەخوار دارستانەکەیەوە دۆڵێکی بەرفراوانی بە دار و سەوزای بوو، لە خوارەوەش گوێی لە چەند دەستڕێژێک بوو، لەلایەک بیری بۆ بە هاناهاتنی هاوڕێیەکانیەوە دەچوو، لە لایەکیشەوە بەگەوەرەی حەڵقەی گەمارۆکەی تێ دەگەیشت، بڕیاری دابوو هەتا دوافیشەک لەسەر چالاک شەڕ بکات. جارجارێک بۆ ماوەیەکی کورت بەرچاوی تاریک دەبوو، پاشان بەلێڵی تارمایی دەهاتنە بەرچاوی.. بەدەم تەقەکردنەوە بن بەرد و بن بەرد بەرەو دەریاچە کەوتە ڕێ، سەرشانی سڕ دەبوو خوێنی لێدە چۆڕایەوە. بەدوایەوە بوون، لەبن بەردێك دانیشت، جەمەدانیەکەی لە شان و قۆڵی ئالاْند. ماوەیەك بە چواردەوری خۆیدا ڕوانی، سێ جاش بە هێواشی بۆی

هاتن.. دەستڕێژێکی بەناودا کردن، یەکیان بەربووەوە و دوانیان هەڵاتن، سەربەرەو خوار بووەوە. لەدواوە تەقەی لێ دەکرا، بەڵام لەگەڵ سووڕانەوە و دوورکەوتنەوەی دەنگی تەقەکان دوورتر دەبیستران، لەدوور کۆنەئاشێکی بەدی کرد، لەنزیك ئەو ئاشە، لەناو بیشەڵان بارەگایەکەیانە. هێواش هێواش شان و لەشی سڕتر دەبوو، ددانی لە فەقێ لە جیڕەوە دەبرد. بەس ئەو جارەی بۆت بمێنم بزانە چۆن پارچەپارچەت دەکەم.. جارجار هەڵدەستایەوە و چەند هەنگاوێك بەرەو کۆنەئاش و بیشەڵان دەڕۆیشت. هێز لە لەشیدا نەما بوو و تەواوی لەشی لە خوێن وەردرابوو. دەریاچە، لەبەر چاوی بووبوو بە ئۆقیانووس و دەریالووشێکی ئەوەندە گەورە، قەت کۆتایی نەدەهات. تینوێتی ئەوەندەی دیکە پرزەی لێ بڕیبوو. ئەگەر دەستی بگەیشتبایە ئاو، ئەوەندەی دەخواردەوە هەرچی خوێنی لەشی هەیە ببێت بە ئاو، زۆر بە زەحمەت چەکەکەی بەرزکردەوە.. چەند فیشەکێکی پێ مابوو بە دوو جار بەسەر بارەگادا تەقاندی ،زۆر لێیەوە دوور نەبوو، چەکەکەی لەدەستی بەر بووەوە، سەر بەرەو خوار خلۆربووەوە، سەری بەر بەردێکی گەورە کەوت، کەوتە خەوێکی قووڵ و هۆشی بەسەر دنیاوە نەما. بۆ خۆشی نەیزانی چەند خەوی لێکەوت، یان لەهۆشخۆی چوو و بوورایەوە.

هەڵکەوت لە دەنگی شاهۆ وەخەبەر هاتەوە، شەو بوو، هەموویان دەوریان لە شاهۆ دابوو، باسی شەڕی کوژرانی زراری بۆ دەکردن. کاتێك گەیشتینە سەر دەریاچە و دەنگی تەقە دەهات. لە کەلاوەیەکی دەم ئاو چوار چەکدار دیاربوون، خانزادیان گەمارۆ دابوو و پەل بەستکردبوو پاش ئەوەی فیشەکی پێ نەمابوو، بەدەست گرتبوویان. ڕایان دەکێشا بەرەو بەلەمێك بۆ ئەوەی بە بەلەم بەرەو شار بیفڕێنن. چەند دەستڕێژێکمان بەسەرسەریاندا تەقاند، شڵەژان و خانزادیان بەڕەڵاکرد، هەڵاتنە ناو بەلەمێك و بەبێ تەقەکردن دوورکەوتنەوە. چەند جار پێشمەرگەکان لە خانزادیان پرسی. باشە کێ بوون؟

- نەمناسین، بەڵام دیار بوون دوژمنی زرار بوون

- باشە باسی زرارمان بۆ بکە.. چۆنچۆنی مێردت پێکرد؟.. بەسەرهاتێکی دوورودرێژە، برایەکمان بەدەستی کەسێك کوژرا بەناوی وەهاب، پیاوی ماڵی ئاغایەك بوو، ئاغا ئێستا لە شار دەژیت، لەسەر کچێك لەکاتی هەرەومزکردن لەگەڵ برایەکەم حەز لەیەکتری دەکەن، وەهابیش چاوی لەسەر ئەو کچەیە، لەو نزارەی پشتەوە برایەکەمی کوشت، برای دیکەمان نەبوو تۆڵەی بکاتەوە، تەنها

ئەمن و بابم و پیرەداکم بووین. بابم لە زرار زیاتر کەسی زاڵمتر شك نەدەبرد. لەگەڵی ڕێککەوت لەبەرامبەر کوشتنی وەهاب ئەمنی بداتێ. ئەوە بوو زرار لەسەر چۆمی لە کاتی ڕاوەماسی بە خەنجەر وەهابی کوشت بوو فرێی دابووەوە ناو چۆمی.. لە تۆڵەی براکەم مێردم بە زرار کرد.

لێرەوە شاهۆ هیچی نەدەبیست، ئەوکاتی گەیشیتە سەر زنیەکە، چوار چەکدار بە قژ خانزادیان ڕادەکێشا. هەڵکەوت ماوەیەك بوو بە خەبەر هاتبووەوە. بانگی شاهۆی کرد، هاوڕێ شاهۆ. شاهۆ بە غەمباری لەبن بەردێك لە پریسکی ئاگرەکە ڕامابوو، چاوە قاوەییە گەورەکانی بەدوا شتێکدا دەگەڕان.. لەگەڵ گوێی لەدەنگی هەڵکەوت بوو بە پەلە هات بۆلای. سەری لەناو ئامێزی خۆی نا.. بە هێواشییەکەوە لێی پرسی.. هەڵکەوت گیان ئێستا چۆنی؟ هەڵکەوت داوای ئاوی کرد، ئازارێکی کوشندە لە سەرشان و لاملی و تەواوی لەشی هەبوو. شاهۆ یەك دوو قومی ئاوی دایە. کاکە ئەتۆ برینداری نابێ زۆر ئاو بخۆیەوە.. دوو قوومی دیکەم بدەیە. دوو قوومی دیکەی خواردەوە، کوا چالاك؟ کەس وەڵامی نەدایەوە.. فەقێ ناپاکی کرد.. ئەك جاشی هێنا سەرمان بەدەستی خۆی دەستڕێژی لێکردین.. چەندم بە چالاك گوت هاوڕێ باوەڕم بەو فەقێ سەگبابەی نیە.. کوا چالاك لەکوێیە؟

بە چاوی خۆم دیتم بەربووەوە.. سەر سینگ و دەموچاوی شەلاڵی خوێن هەناسەی نەمابوو. کوا چالاك؟ بۆ وەڵامم نادەیەوە؟ دکتۆر هات بەلایەوە دەرزیەکی لێدا و خەوتەوە. شاهۆ هاوڕێیەکانی کاتێك گەیشتبوونە شوێنی بۆسە و شەڕەکە چالاك گیانی سپاردبوو، نە فەقێ و نە جاش و نە مێگەل نەمابوون، بەڵام دڵنیابوون فەقێ ناپاکی کردبوو. لە سەر تەلانێك چالاك بەرامبەر بە دەریاچە و لە باوەشی چیای کۆسرەت بە خاك سپێردرا. چەند ڕۆژێك شاهۆ بۆ چالاك زۆر غەمباربوو، دووردەکەوتەوە خۆی دوورە پەرێز دەگرت. هەستی بە ئازاری ویژدان دەکرد، ئەگەر بۆخۆم لەگەڵی بام وای بەسەر نەدەهات. ئای ناپاکی، کورد لەوەتەی هەیە بەدەست ناپاکییەوە دەناڵێ، دەنگی خانزاد وەئاگای هێنایەوە، کاك شاهۆ مام میرزا هاتووە داوات دەکات. شاهۆ بەسەرسامییەکەوە پرسی؟

مام میرزا کێیە؟ لەو قسانەدابوون.. مام میرزا بە شەدەیەکی گەورە و سەبیلە و گۆچانی بەدەستەوە. بۆلای شاهۆ هات. دەست و لێوی دەلەرزین.

پیرەمێرد دوو چاوەکانی وەکوو گۆمی خوێنیان لێ هاتبوو. لچکێکی جەمەدانیەکەی بە چاوی خۆیەوە گرت، چەند جار لە چاوە قاوەیە گەورەکانی شاهۆ ڕاما، مام میرزا کەوتە قسە. ئەو کاتی ڕایانگواستین لەو بنارە دوور خراینەوە، مردنی خۆم پێ خۆشتر بوو، لەگەڵ پێشمەرگان بژیم. فەقێ کە کوڕی من نەماوە، لە جێگای خۆم دانا، کەچی ئەو ناپاکییەی بەرابەر بە پێشمەرگان کرد، شاهۆ بە غەمبارییەکەوە گوتی: ئێمەش چاوەڕوانی ئەو ناپاکیەمان لە بنەماڵەی میرزا نەدەکرد. میرزا.. تازە بۆ خۆم قسەم لە گەڵ کاکە هەڵکەوت کرد، ئەوەی بۆی گێڕامەوە تەواو ئەوە بوو. فەقێ بۆمی باس کرد. شاهۆ کەمێك لە میرزا هاتەپێش، مام میرزا، شۆڕش دەستی درێژە. کامەی خۆی بە دوژمنی سەرسەختی شۆڕش دەزانێت، نەك لەژووری خەوتنی خۆی، بەڵکوو لەکام سەربازگەی گەورە هەیە دەستمان دەیگاتێ. هەرکەسێک ناوی چووە ناو لیستەی ناپاکان و بڕیاری لەناو بردنی درا، ئەمڕۆ نا سبەی کۆتای بەژیانی دێت، کوڕەکەی تۆش یەکێکە لەوانەی ناوی لە لیستەی سوور دایە، لەبەر تۆ دەستمان شکاوە. دوو جار لە دەریاچە بۆی پەڕینەوە، بەڵام لەناو ماڵی تۆدا دەستی لێ نادەین، دوو بست لەماڵی تۆ جیا بووهوە خوێنڕشتنی بۆ ئێمە لە ئاو خواردنەوە ئاسانترە.. مام میرزا گوتی، گوێ بگرە کاك شاهۆ.. ئەمن وەکوو باوکێك هەستاوم بە ئەرکی سەر شانی خۆم.. لە شەوی پەردەی بووك و زاوای لەلام ڕوون بوو، کوڕی من ناپاکی لە پێشمەرگە کردووە. هەروەکوو گوتم، لەناو پەردەی زاوایی لە خۆشترین ساتەکانی ژیانی.. چەند وەخت بوو چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەمان دەکرد. چونکە فەقێ تاقە کوڕی ماڵێ بوو. وەکوو تاقانەی ماڵ بوو. خۆزگە بە خۆزگە کوڕم نەبوایە و وەجاخکوێر بوومایە و بەو داخەیەوە سەرم نابایەوە. لە ژووری خەوتن لەبن پەردەی بووك و زاوای دەمانچەم لەسەرسەری دانا و لێم پرسی. ئەتۆ ناپاکیت بەرامبەر بە پێشمەرگە کردووە؟ هەر ئەوەندەی گوت بابە پێیان کردم. ئەوەندەم بەس بوو. بە دەمانچەی خۆی لە تەنیشت بووکی تارا و جل سپی بە چەند فیشەکێك مێشکم پژاند.

## تووڕەیی دەریاچە

لەژێر تریفەی مانگە شەوە تەمومژاوییەکە، جارجارێک مانگ لە ناو دەریاچە بەدەم شەپۆلەوە سەمای دەکرد، دەریاچە ناوچاوانی تێك نابوو، بە کەفوکوڵ و شەپۆلە گەورە سەرشێتەکانی تووڕەی خۆی نیشاندەدا، ڕەشەبا بەبارانەوە وژەوژی زۆر ترسێنەربوو، دڵۆپە بارانە گەورەکان تێکەڵ بە تەرزەیەك هەر دەنکەی بە قەدەر بەڕوویەك دەبوون دەکەوتنە دەریاچەوە، لرفەلرفی ئاوازێك بوو بەسەرهاتێکی دەگێڕایەوە، وەکوو دوو بێشکەی کۆرپەی لەناو خەوتبێ. لەگەڵ ڕەشەبای ساردی بنار دوو کۆنە بەلەمە کونیاویەکانیان نەك ڕادەژاند، بەڵکو زۆر بەهێز ڕایان دەتەکاندن. خوناو دڵۆپە ئاو وشکە سەرما، لەلایەك لەترسی مار و دووپشك، لەلایەکی دیکە بۆنی تۆڕ و ساردی ماسی. لەگەڵ هاتنی شەپۆلە سپی سپی کەفاویەکان. لەدوور، دوور بە لێشاو ماسی گەورە بچووك. زۆر جار مارماسی و کیسەڵ و قرژاڵ و هەتا کەلاکی ئاژەڵی کێوی وماڵی بەرەو کەنارەکان دەهێنان، دەریاچە یەك پارچە سپی دەچووەوە. باشە ماسی بۆنساردێکی لێ دێت، بەڵام ئەوە بۆن سارد و بۆگەنیوی ماسی نییە! مامۆستا بە دزیەکەوە لە شاهۆی پرسی:

- باشە کاك شاهۆ ئەو هەموو ماسییە بەچی وایان لێهاتوە؟ ئەو شەو شەوی ڕاوە ماسییە. ڕاوچییەکان پێویست ناکات، بە هیچ شێوەیەك خۆیان ماندوو بکەن.

شاهۆ بە هێواشییەکەوە بە مامۆستای گوت:

- دەزانی ئەو ماسی و هەموو ئەوانەی دەیبینی ژاراوین! چۆن شاخ و دۆڵ، دارستان، گیانلەبەرکان ژاراوی بوون.. یەك پارچە سێو، هەنار، هەرمێ هەرچی میوە هەیە تەنها خواردنی بەسە بۆ ئەوەی لەناوبچی. یەك ماسی چەندان کەس لە ناودەبات. جا باشە ئەدی چی ماوەتەوە بۆ ڕاوکردن؟

کاك شاهۆ تەوار زۆر سەرمایەتی، تایەکی بە هێزی لێهاتووە. هەناسەی زۆر تەنگ بووە. با لەگەڵ خۆمان نەی بەین بۆ شار؟ ئەوەتا دکتۆرمان لەگەڵە. کاکە دکتۆر بەبێدەرمان وەکوو من وتۆ وایە. چارەسەری کیمیایی هەروا ئاسان نییە. دەبو زۆر دەمێک با مشووری تەوارمان خواردبا، ڕەوانەی شارمان کردبا و لە ژێر چاودێری دکتۆرەکان بوایە. با لە بەلەمەکان کەمێك دوور کەوینەوە ئاگرێك بکەینەوە؟

- کاکە ئەگەر برادەرانی ناو شار بێن. بزانن لێرەنین دەگەڕێنەوە، بەڵام ئەتۆ و شەپۆل. کەمێك لەولاتر لەپشت ئەو دیو یاڵەوە دەتوانن ئاگرێکی بچووك بکەنەوە، کەس لە ناو دەریاچەوە نەتان بینێت. شاهۆ لەناو بەلەمێکیان مایەوە، لەئاسمان ڕادەما. مانگ و ئەستێرەکان جارجار لەژێر هەورە ڕەشەکان بەدیار دەکەوتن.. چی دەبوو ئەگەر خەڵکی سەر ئەستێرەیەکی دیکە باین؟ ناڵێن ئەستێرە هەیە ژیانی لەسەرە. وەرە بزانە مرۆڤی چەند دڕندە هەیە لەو ژیانە.

شڵپەشڵپی سەوڵی بەلەمێك کەمێك لەسەرووتر هات. شەپۆلە سپییەکان گەورەتر بوون. لرفەلرفیان دەهات، بەلێشاو ماسی سپی هەڵگەڕاوەی سەر پشت دەهاتن. شاهۆ دەمێك بوو ئاگادار بوو بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕوانی دەکردن. دەنگی باڵندەیەکی وەکوو کوکوختی هات. دووبارە بووەوە.. شاهۆ لەبەر خۆیەوە وەڵامی دایەوە. بەلەمێکی گەورەی ڕەش ڕەش هاتە پێشەوە. یەکێکیان خۆی فڕیدایە ناو بەلەمەکەی شاهۆ. باوەشی بە شاهۆدا کرد شەلاڵی ئاوبووبوو، لەبەرخۆیەوە بەدەم ماچ کردنی شاهۆ، خوا بەزیادی خێرم نەکرد، دەڵێی بە کوندە ئاو فڕێ دەدەنە خوارەوە شاهۆ بە پێکەنینەوە، ئەوە چییە کاکە دەڵێی دۆت لێ ڕژاوە؟ ئەوەی دیکەیان بەلەمەکەی خۆی لە کەناری دەریاچە ڕاگرت. بەدەم ماچکردنی شاهۆ. زووزوو داوای عوزرخوای دەکرد. کاك شاهۆ، خەتای ئێمە نەبوو، ڕەشەبا و بۆسە و بۆڵەبۆڵی کاکم سەری لێ شێواندین، دوو جار ڕێگامان هەڵەکرد. دووبارە دەپەڕینەوە و لەسەر سەرەوە خۆمان بە ئاودا دەدا.

- کاك شاهۆ ناو شار شڵەژاوە! دوێنێ شەو هەتا بەیانی شەڕەتەقە نەبڕایەوە. دڵمان هەر لە لاتان بوو، بەڵام دیار بوو دەستەیەکی دیکەی پێشمەرگە بوون، بەسەر چەند مۆڵگەیەکیان دادابوو.

شاهۆ کەمێك تێکچوو. خۆ کار لە کارەکەی ئێمە ناکات. نا نا باوەڕناکەم هەردووکیان بەیەك دەنگ وەڵامیان دایەوە.

- دەتوانن چەند شەوێك لە شار بن. پاشان کارەکانی خۆمان دەکەین.. شاهۆ چوو بانگی هاوڕێیەکانی کرد.. تەواری بە بەتانیەوە لە باوەش کرد و هاتە ناوبەلەمە ڕەشەکە.. تەوار لەژێر جەمەدانیەکەی دەموچاوی داپۆشت و لە دەموچاوی دوو کەسەکە ورد دەبووەوە. قژدرێژ سەرو سمێڵ تاشراو دەمو چاویان لە گەڵ پێشمەرگە جودابوو تەوار ماوەیەك بە چواردەوری خۆیدا ڕوانی، ئەوە دووەم جارە ڕێی دەکەوێتە ناو ئەو دەریاچەیە، جاری یەکەم لەوبەر کەناری

دەریاچە بوو بەرەو ئێرە دەهاتن.. پێش ئەو هاتنە بۆ کەنار هیچی دیکەی لەبیر نییە.

دوو بەلەمەوانەکە. جانتایەکی گەورمیان پێ بوو.. چەند بابۆڵەیەك کەباب و گۆشتی برژاوی بۆن خۆش لەگەڵ خەیار و تەماتە و ترش و خوێیان پێ بوو. یەکێکیان جاجمێکی بەسەر سەری خۆی و تەواردا دابوو. بابۆڵەکانی پارچەپارچە دەکرد و بەدەمی تەوارییەوە دەکرد. جارجارێکیش قتوویەکی هەڵدەپچڕی. ها تەوار گیان کۆلا بخۆوە. هەتا ئەو کاتە تەوار ماسات و دۆی خواردبووەوە، بەڵام ئەو جۆرە ماستاوە زۆر تیژ بوو.. دوو بەلەمەوانە لاوەکە چەند سەوڵیان لێدەدان، زیاتر بەرەو قووڵایی ئاوەکە بە هەستەوە دەچوون. تەوار شتی وەهای نە دیتبوو، بەڵام لەبەر ئازاری سینگ و سەری کەمتر دەپرژایە سەر پرسیارکردن. نەیدەزانی بەرەو کوێ دەچن، بەڵام دڵی بەوە ئارام بوو، مامە شاهۆی لەگەڵدا بوو. دەربەستی هیچ شتێك نەبوو.

لە ئاسمان چەند گلۆپێکی سووری گەورە هەڵدەبوون و دەکوژانەوە گرمەگرمیان دەهات بەرەو سەر هەڵکشان و ڕوەو لووتکەی چیا ڕۆیشتن. چاویان لەسەر گلۆپە سوورەکان بوو. بەپەلە گەڕانەوە، لە دوورەوە چەند بەلەمێکی گەورە بە دیار کەوتن. زۆر تیژڕەو بوون، بلاجکتۆری سەریان بەجارێك نەك دەریاچەکە، بەڵکوو کەنار و دارستانەکانی دەوری شار و بناری کۆسرەتیشی ڕووناك دەکردوە.. دوو تیشکی گەورەی خێرا کەوتە سەریان.. شاهۆ پرسی ئەوانە چین؟ بەلەم و زەورقی جەنگین.. بە دۆشکە گەورەکانیان بە هەر چوار دەوری خۆیان دەسترێژیان دەکرد.. کاتیک دەکەوتنە ناو دەریاچە چرمچزییان دەهات، چەند فیشەکێك بەبەر بەلەمەکەیان کەوت لەگەڵ بلاجکتۆرەکان دەکەوتنە سەریان کۆپتەرەکان لەئاسمانەوە دەسترێژ و ساروخیان داویشت هەرچەند جارێك دەکەوتنە ناو ئاو و ئافورەیەکی گەرمیان دروست دەکرد، ئەگەر شارەزایی بەلەمەوانە بە ئەزموونەکان نەبوایە زۆردەمێك بوو سەراونگوم بووبوون.. بەپەلە ماتۆڕیان هەڵکرد.. بە هەموو خێراییەکەوە بەرەو کەناری شار تێپەڕین.. دۆشکە بە دەستەکان کەوتنە دوایان. گیڤەگیڤ.. زۆر جار لە بەلەمەکەشی دەدا. هەر هەموویان خۆیان مات کردبوو، تەنها بەلەمەوەوان بەردەوام بوو لەسەر کاری خۆی.. وەکوو ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت.. کاکە وەڵامیان مەدەنەوە. کاکە وەڵامی چی، کلاشینکۆف ناگاتە نیوەی ڕێگا. بەلەمە کونەکە نیوەی زیاتر ئاوبوو لاسەنگ

بووبوو، هەرجارێك بە لایەکدا خواردەبووەوە. وای لێهاتبوو زۆر زەحمەت بەسەر ئاوەوە مابوو.. پێش ئەوەی لێیان نزیك ببنەوە گەیشتنە کەناری دەریاچە و خۆیان دایە بن گابردێك و بەپەلە لە بەلەم دابەزین و خۆیان بە ئاو دادا و پەڕینەوە. هەتا ئاو قەدیان لەناو ئاو دابوو. شاهۆ تەوار و چەکەکەی بەرز کردبووەوە و بەپەلە پەڕیەوە. دوو کەسی دیکە لەوبەر چاوەڕوانیان دەکرد.. کاتێك شاهۆ پەڕیەوە تەواری لە وشکانی دانا. میلی کلاشینکۆفەکەی هێنایەوە، بانگیان کرد کاك شاهۆ تەقە مەکە نازانن لە کوێن؟

قرەقڕی دەستڕێژ و گڕدار دنیایان ڕووناك کردبوو، هەر شەش پێشمەرگە و چوار کەسی دیکە و تەوار بە ناو دارستانە چڕوپڕەکەی قەراغی شار ڕۆیشتن، شەلاڵی ئاو بووبوون، جار جار پێلاویان لەپێ دادەکەندرا.. لەبەرزایی دیتیان بەلەمەکەیان بە چەند ئاربیجیەك فڕیە ئاسمان و هەر پارچەی کەوتە لایەك. بە شێوێکی تەنگەبەر شاهۆ لە پێشەوە و مامۆستا بە تەوار لەباوەش چوار پێشمەرگەی دیکەش بە دواییەکدا، بەڵام ماوە بە بێدەنگی ڕێگایان دەکرد. لە چوار کەسەکە دووانیان خوداحافیزییان کرد و ڕۆیشتن. ماوەیەك بە جۆگەلە ئاوێکی تەنکدا پەڕینەوە، لەبەر گۆڕستانێك هەستیان کرد، تەلوسیم لەبەر پێیانە، بە تەنیشت کوشتارگەو کۆمەڵێك کۆگاو دووکان و بازاڕدا هاتنە خوار. تەوار زۆری لەلا سەیربوو هەتا ئەو کاتە شتی وەهای نەدیتبوو، ئەو هەموو چراخان و دەرابە و دەرگا ڕەنگاوڕەنگانە. مامۆستا سەرباز زۆر جار بە جەمەدانی دەموچاوی تەواری دادەپۆشت، خۆیان بە کۆڵانێکی تاریکی باریکدا کرد. کۆمەڵێك خانووی قوڕی بە دەستووری لادێ بوون، دەرگایەك کرایەوە، کچێکی لاو لەگەڵ پیرێژنێك لە لاتەنیشتەوە بوخچەیەکی پێچراویان بۆ مامۆستا ڕاداشت، وەری نەگرت، ئەوە چییە؟ شاهۆ بانگی کرد، مامۆستا وەری گرە. دوایی دەزانی چییە؟خەڵك دەهاتنە دەوەرەوە پێشمەرگەکانیان ماچ دەکرد.. داکت بمرێت پێشمەرگەن.. بە چەند ژن و پیاو دەیان گرتن لە بۆنکردن و ماچکردنیان تێرنەدەبوون. پیرێژنێکی جەرگ سووتاو، دەستی پێشمەرگەکانی ماچ دەکرد.. لەئاستخۆیەوە هەتا لە چاو بزربوون لەسەر ئەرز دانیشتنوو. خۆڵیان بەسەری خۆیاندا دەکرد و بەبێدەنگی خۆیان ڕادەژاند و پێشمەرگەیان دەلاواندنەوە. بۆ شاهۆ و شەپۆل، یەکەم جاریان نەبوو. مامۆستا و برادەکانی لەگەڵ گریانی هەر پیرەژن و پیرەمێردێك دڵیان پڕدەبوو.. تەوار هەستی بە سۆزی دایکایەتییان

دەکرد.. لەژێر جەمەدانەکەیەوە فرمێسکی دەڕشتن، چەند تامەزرۆی باوەشی پیرێژن و پیرەمێردە. شاهۆ و هاوڕێکانی بۆ تەوار زۆر بە وەفابوون، بەڵام ناگاتە سۆزی داك و باب. هەرچەند دەرگا دەکرانەوە، بوخچە و پرێسکە زۆرتر دەبوون. هەر هەمووی جلوخواردن و پارە و کڵاو جەمەدانی.. بۆنی مریشکی برژاو و کەباب بەدوایانەوە دەهات.. پیرێژنێك لەسەر سووچی کۆڵان چاوەڕوانی دەکردن.. کاتێك شاهۆ گەیشتە لای باوەشی پێداکرد. دوو کوڕم پێشمەرگەبوون هەردووکیان پێکەوە شەهیدبوون، چەند گڵ لەسەر گۆڕەکانیانە ئەوەندە تەمەنی ئێوە درێژ بێت.. شاهۆ باوەشی پێدا کرد. دایە گیان ئێمەش هەر کوڕی تۆین.. پیرێژن بوخچەیەکی دایە دەستی شاهۆ ها کوڕەشیرینەکەم خوا دەست بە باڵاتانەوە بگرێت. چاوم کوێر بێت داخوا ئێستا دایکت چەند بۆت بە پەرۆشە؟ دوو گوارەی دایە دەستی شاهۆ کوڕم ئەوانە بۆخۆت.. پورێ گیان لەو شاخ و کێوە چی لە ناڵتوون بکەم.. شاهۆی لە باوەش کرد. پاڕایەوە تخوا دڵم مەشکێنە.. ئاگات لە خۆت بێت لە کۆڵانی ئەودیو چەند جاشێکی لێیە زۆر بێناموسن. زەفەرتان پێ نەبەن. پێشمەرگەکان بە هەزار ئەولاو ئەولا خۆیان لەدەستیان ڕزگارکرد. دووکۆڵان لەو لاتر کارەبا نەبوو لەکەلاوەیەکەوە خۆیان بە ماڵێکداکرد. وادیار بوو خەڵکی لێ دەدەژیا، بەڵام لەبەر ئەوان چۆڵیان کردبوو. هەرکە خۆیان بە ژووورداکرد. ڕەختو فیشەکدانیان کردەوە، خاوەنماڵ هات، دووبارە هەر هەموویانی ماچ کرد و نان و جلوبەرگی خاوێنی بۆ هێنان. یەك یەك برۆن خۆتان بشۆن. ئەوەندەیان خواردن و جلوبەرگ و پارە وەگرتبوو لەسەر و زیاد بوو. هەر بوخچەیەکی دەیان کردەوە، چەند سەفتە پارە و جلی ئوتوکراویان تێدابوو. ئەو شەو هەتابەیانی دەنگی تەقە و دەسترێژ. چی لەناو شارۆچکە، چی لە چیای بەرامبەریان نەبڕایەوە، خاوەنماڵ پێش ئەوەی ماڵئاواییان لێ بکات دڵنیایی کردنەوە، ئەو جۆرە شەوە پڕهەرا و بەزمە هەر هەبووە و خەڵکی شار لەگەڵی ڕاهاتوون. شەش پێشمەرگەکە هەتا ڕۆژبووەوە بە نۆرە هەر لە ژووری خەوتنەوە یەك کاتژمێر ئێشکگربوون. بەیانی زوو خاوەن ماڵ کابرایەکی ڕەقی لاوازی سمێڵ گەورەی چاو بە قووڵاچوی لەگەڵ خۆی هێنا، لەگەڵ شاهۆ باوەشیان بەیەکدا کرد. بۆ شاهۆ هەرهەموویان وەکوو برا وابوون بەرچای لەگەڵ کردن. دوو خوی دژبەیەکی هەبوون. لەکاتی نانخواردن دەتگوت ڕاوی دەنێن فڕکان، فڕکان زۆر بە پەلە نانی دەخوار، کەس هەتا پێشمەرگەی زۆر برسی..

چەند ڕۆژ بوو نانی نە خواردبوو لەگەڵی دەرنەدەچوو. خووی دووەمی ئاگری شقارتەی هەڵدەکرد، ماوەیەك تێیەوە ڕادەما، وەکوو ئەوەی بیر لەشتێکی زۆر گرنگ بکاتەوە، جگەرەکە داگیرسێنێت یان وازی لێ بهێنێت. دووبارە دەنکە شقارتەیەکی هەڵکرد ماوەیەکی باش تێیڕاما هەتا سەرنووکەکەی هاتبوو، خەریك بوو پەنجەی بسووتێت وەکوو ئەوەی لەو ئاگرە کزەوە زۆر شت بخوێنێتەوە، جگەرەکەی هەڵکردوو ڕووی لە پێشمەرگەکان کرد، برادەران گوێ بگرن.. ئەو کەسەی بەشی زۆری جاشەکانی ناردە سەرتان بۆ(گۆڕستانی قەڵای شەهیدان) ئەوکەسەی جاشی نارد. چالاکی، جوانە مەرگی بە ناپاکی بە فەقێ شەهید کرد. فەقێ بە سزای خۆی گەیشت.. مام میرزا گیراوە باوەڕناکەم بە سەلامەتی دەرچێت، بۆخۆشی تاقەتی دەرەوەو ناوخەڵکی نەماوەو هەتا لە ژیان بێزارە.. با بێینەوە سەر دوژمنەکەمان. سەرۆك جاشێکە و ناوی (وەیسە چۆلە) ناوی خۆی بە خۆیەوەتی هەموو ژیانی لە چۆلی و تەنیای ژیاوە، تەواوی ژیانی خەریکی ناپاکی و خۆفرۆشی بووە، بە دەیان شوان، سەربازی ڕای کردوو، خەڵکی لادێ و شاری گرتووە و چەکی پێوە هەڵواسیوە و بەپێشمەرگە ڕادەستی ڕژێمی کردووە و پارەی پێ وەرگرتون. خەڵکی هەراسانکردووە، ڕۆژ بە ڕۆژ هارتر دەبێت. بێناموسی داوێنپیسی گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی، خوێنداکاران ڕێگای چوون و گەڕانەوەیان بۆ قوتابخانە گۆڕیوە، هەموو ڕۆژێك لەبەردەرگا لەگەڵ بەربوونی کچان چاوەڕوان دەکات، ئەگەر بێت و لە ناوی ببەن دەبێت بە دەرسێکی باش بۆ ئەوانەی دووای ئەم دێن. کاك شاهۆ ئەتۆ دەڵێی چی؟

شاهۆ بەدەنگ هات، کاکە ئێمە ئەو ڕێگە درێژەمان بڕیوە، بە ناو ئاو ئاگردا هاتووین، بۆ لە ناوبردنی ئێستاکەش، لەمڕۆ زووتر نییە دەبێت کارەکەمان ئەنجام بکەین.. کاك فەرەج کەنگێ بڕۆین؟ فەرەج تەماشایەکی دەرگای حەوشەی کرد، لەهەر وەختێك برادەرێکی شۆفێر پەیدابوو کارمان تەواوە. لەو قسانەدا بوون. دەرگای حەوشە کرایەوە. قەمەرەیەکی ڕەنگ خۆڵەمێشی خۆی بە ژووردا کرد. شاهۆ تەواری لە گۆشەیەکی ژوورەکە درێژکردبوو، چەند جار ماچی کرد تەوارگیان ئەمن دەڕۆم.. مامۆستا سەرباز و برادەران لێرەن هەرچیەکیان گوت بە قسەیان بکە. کاك فەرەج دەتبات بۆ خەستەخانە، پاشان بە دواتدا دێم تەوار خۆی بە باوەشی داکرد، وەکوو ئەوەی بیەوێت لەگەڵی بڕوات. کاك فەرەج خۆی بە ژووردا کرد.. کاك شاهۆ درەنگە ماوەکە زۆر کەمە.. شاهۆ لەگەڵ شەپۆل

هاتنه دەرەوە لە حەوشە تۆقەیەکیان لەگەڵ شۆفێرکرد. کوڕێکی گەنجی چوست و چالاك. کڵاو جەمەدانیەکی سووری بەستبوو. تۆقەی لەگەڵیان کرد ناوی خۆی نەگوت. شاهۆ بۆ یەکەم جارنەبوو بەدیداری بگات.. کابرا بە بێهیچ پێشەکیەك. کاك شاهۆ.. کاك شەپۆل. لە سندووق خۆتان دەشارنەوە هەر کاتێك بەلای ڕاستی سەکن سووڕامەوە دووجار لە دەرگای ماشێنەکەم دا. دەست بەکاردەبن، لە پاش ئەنجامدانی کارەکە بە هیچ شێوەیەك سندووق ناکەنەوە. شاهۆ پێی گووت باشە کاکە، کاك فەرەج برادەران هەموو شتێکیان بۆ باس کردووین. دەکەواتە سندووقی کردەوە و شاهۆ و شەپۆل بە زۆر جێگای خۆیان کردەوە. ماشێنە خۆڵە مێشیەکە زۆر بە هێواشی لە حەوشە دەرچووە ناو سندووق، شاهۆ و شەپۆل دەموچاوی یەکتریان نەدەدیت.. پاش چەند سووڕان و پێچاوپێچ جار جار هەستیان دەکرد دەکەوێتە سەر جادەی خۆڵ. بۆ ماوەیەك ڕاوەستا، دەنگە دەنگ دەهات.. بە عەرەبی و بە کوردی غەڵبەغەڵبوو دەنگە دەنگ زیادی کرد.. چەند دەستڕێژێك کران هەردووکیان خۆیان ئامەدەکرد بۆ تەقەکردن. پاش کەمێك. ماشێنەکە بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتن.. هەم دیسان تەماشای سەرەوە و خوارەوە و ئەولا و ئەولای کرد.. لەنەکاوێك دوو جار کێشرا بە قاپی ماشێنەکە تەواو هێواش بووەوە. شاهۆ سندووقی قەمەرەی هەڵدایەوە، یەکڕاست کەسێك لە ناو دەرگایماڵێك بەرامبەری بە کۆمەڵە جاشێك دەورە درابوو. ورگنێکی کورتەباڵای کڵاو جەمەدانە لەسەر.. شەپۆل و شاهۆی ئەیان پرسی کێیە بە دوو مەخزەنی حەفتاوپێنجی بەردەمی خۆیان و چواردەوری خۆیان ڕشاند. سەرۆك جاش و پاسەوان و ئێشگری سەربان و بەردەرگا. لە چاوترووکانێکدا کەوتنە سەرزەوی. بە بێ ئەوەی کەسیان بپرژێنە سەر تەقەکردن. سندووقەکە قەپاتکرایەوە و، بە خێرایی تێپەڕین، لە دوور گوێیان لە چەند دەستڕێژێك بوو، بەڵام زیاتر تەقەی پچڕپچڕ بوون. پاش نیوکاتژمێرێك قەمەرەکە وەستاو سندووق کرایەوە. شاهۆ و شەپۆل تەنگە نەفەس بووبوون. جێگایەکەیان ئەوەندە تاریك بوو چاویان ماوەیەکی ویست هەتا لەگەڵ ڕووناکی تیشکی خۆرەتاوەکە ڕاهات. شوفێرەکە باوەشی بە هەردووکیاندا کرد. ئەولا و ئەولای ماچ کردن. بەڕاستی ئێوە پێشمەرگەی گیانفیدان. (وەیسەچۆل) و چڵپاو خۆرەکانتان لە کۆڵ دنیایەکردەوە. لەمەودوا، شار بە ئارامی هەناسە دەدات. شاهۆ باوەشی بە شوفێرەکەدا کرد. کاکە ئەتۆ و کاك فەرەج و برادەرانی ناوشار پێشمەرگەی

تەواون. ئەو هەموو شتە بە ئێوە نەبێت لەکوێ بە پێشمەرگە دەکرێت؟ کاکە ئێمە پێشمەرگەی ناو شارین نەك هی چیاوچۆل حەزدەکەم شتێکتان پێ بڵێم دەزانم لەناوسندووقەکە ئاگادارنەبوون، بەڵام هەستان کرد، گوێتان لەدەنگی دەستڕێژێك بوو. خەریك بوو هەرسێکمان بە تەپکە بگرن، بازگەیەکی کاتی پشکنین بوو پێشی یەك کاتژمێر لەوێ نەبوو کەسێك ڕای کردوو کەوتنە دوای. ئەو شەو هاوڕێیەکانی دیکەشتان دەگەنە ئێرە، دەتوانن بگەڕێنەوە کۆسرەت.. بەڵام کاك شاهۆ ئاگاداربە دوێنێ شەو برادەرانی بارەگا لە بنار و لەسەر دەریاچە، تووشی شەڕ هاتوون.. هەتا بۆخۆمان ئاگادارتان نەکەینەوە، نابێت ئێرە بەجێ بهێڵن..

کاتێك چاوێکیان بە چواردەوری خۆیاندا گێرا، لە ناو شینایی و باخ و باخاتێکدا بوون لەدەرەوەی شار.. دەریاچە و بنار و چیای کۆسرەت بەرامبەریان بوو.. دوور بەدوور لەچەند لاوە کۆپتەر و فڕۆکەی جەنگیان دەدەیت، بە سەر دەریاچەو پاشان بەرەو لووتکەی چیا هەڵدەفڕین گرمەگرم و ناڵەناڵی تۆپان چیایان دا دەبێژا. لە ناو باخچە دوو ژووری گەورەی لە قوڕ درووستکراو، بەڵام هەتابڵێ پاکو خاوێن. ئەو ڕۆژە هەتا شەو داهات. لە ناو باخوباخات چاویان لە لووتکە سەر بەتەمی گرگرتوو و دەریاچەی سپی، سپی دەبڕی. شەو داهات ئاگر لە هەموو لایەکی چیا بەربووبوو. شاهۆ و شەپۆل بە بێئارامییەکەوە چاوەڕوانی برادەرەکانیان دەکرد.. لە نیوە شەودا گڕەی جێبێك هات. خۆی بە ناو باخچەدا کرد. چوار پێشمەرگەی هاوەڵیان دابەزین.. باوەشیان بە یەکتری داکرد، دەستخۆشی لە شاهۆ و شەپۆل کرا. کاك فەرەج گوتی:

لەگەڵ سەرۆك جاش وەیسە چل و یازدە جاش کوژراون ژمارەیەکیش بریندارن.

دەستانخۆش شار خرۆشاوە، خەڵکی زۆر دڵخۆشن ستایش بۆ پێشمەرگە دەنێرن. بەڵام ئەگەر دەکرێت ئەو شەو مەپەڕنەوە.. دەریاچە بە جاش و سەرباز گیراوە.. شاهۆ هەواڵی برادەران چییە؟ ئەوان سەلامەتن بەرەو ناوەڕاستی چیا هەڵکشاون.. ئەمڕۆ ڕزگار لەوێ هاتووەتەوە، ئەگەر حەز بکەن لەگەڵتان دێت.. ئەدی تەوار. کاکە غەمی تەوارت نەبێت. سبەی دەیبەن بۆ خەستەخانە.

شەش پێشمەرگەکە و شوفێر و، ڕزگار بەرەو دەریاچە کەوتنەڕێ.. لەڕێگا تووشی چەند بەلەمەوانێك بوون. پرسیاری ڕێگایان کرد، وەڵام هەر ئەوە بوو، هیچ لەگۆڕێ نییە.. کاتێك گەیشتنە کەناری دەریاچە، ناو تەواو هەستابوو. ئەو

باران و تۆفانەی لە دوێنێوە هەڵی کردبوو زیادی کردبوو. بەلەمێکیان بە ماتۆڕەوە ڕاگرتبوو، کاك شاهۆ حەز دەکەم لەگەڵتان بێم، ئەوەك بارمگا نوێیەکە ئەدۆزنەوە.. کاکە خەمی ئەومیانت نەبێت. بۆ خۆم دەزانم لە کوێ دەیاندۆزمەوە؟ باشە ناکرێت سبەی شەو بپەڕنەوە؟ شاهۆ بەدەم پاڵ پێوەنانی بەلەمەکە بەرەو ناو ئاو، برادەران، مامۆستا سەرباز، هەمووتان هاتوون؟ بەڵێ تەواوین. کاکە ئەمن نازانم لە برادەرانی دیکە چی باسە؟ ناتوانم لەوە زیاتر چاوەڕوان بم.ماڵئاوایی لە دوو پێشمەرگەی شار کردوو، سەرەتا بە سەوڵ لێدان پاشان ماتۆڕی بەلەمەکەی هەڵکرد. زۆر بە تیژی بەرەو قوڵایی دەریاچە تێپەڕی.

هەرچەندە لرفەلرف و هاژەهاژی شەپۆلەکان زۆر گەورەبوون. قوڕاو هەستابوو، شەپۆل لە شاهۆ نزیك بووەوە. لەوبەر کەنار لە ئاستی بارمگا، بریسکە و ڕووناکی بەدی دەکەم.. کاك شاهۆ هێواش بە. کاکە بە خۆڕای دڵی خۆتان سەغڵەت کردووە، هیچ لە گۆڕێ نییە. پاشان غەم و ترسی تەوارم نەما جێگای باشە پارێزراوە، تازە باکم بە شەڕ و کوشتار نەماوە. زیاتر لە شەش مانگە، وەکوو کەروێشکی ترساو خۆمان دەشارینەوە. بزانە ئەوەی لەمێشکم دایە چۆن چۆنی بنار و چیا و ئەو ناوە لە مۆڵگاو، سەربازگە بە یارمەتی ئێوەو برادەرانی شار پاك دەکەمەوە. دەشتی کاکی بە کاکی هەر جاشێك ویستی بە ئارەزووی خۆی بە ڕۆژی ڕووناك هێرش دەکاتە سەرمان بەکەیفی خۆیان تەراتێنە و پیاسەی پێدا دەکەن، بۆسەمان بۆدەنێنەوە. لەمەودوا کلکیان پێ شۆڕدەکەمەوە ناو گەڵیان. بابرادەران کۆکەمەوە سەرێەك. پێش گەیشتن بە کەنار دوو تاشە بەردی گەورەو چەن بەلەمێکی سووتاو بەدیکران هەموو جارێك پێش ئەوەی بەیەك جاری بپەڕنەوە بۆ بنار پێش ئەو تاشە بەردانە ڕوویان وەردە سووڕاند بگەڕێنەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر بۆسە هەبێت وا هەست بکەن بەدییان کردوون. لە پشتەوە تەقەیان لێ دەکرا، چونکە بکەوتبانە ئەو دیو تاشەبەردەکان ڕێگای گەڕانەوەیان نەدەما. هەروا دووسەدمەترێك لە کەنار دوور بوو. لە نەکاوێك بلاجکتۆر هەڵبوون دنیا لەژێر ڕەحمەتی ڕەشەباو باران بلاجکتۆر وەك ڕۆژی ڕووناکی لێهات.. دەنگی بڵندگۆ بەعەرەبی پاشان بە کوردی بەرز بووەوە.. چواردەورتان گیراوە گەمارۆدراون.. بە خێرایی خۆتان بەدەستەوە دەن.. دوو بەلەمی گەورەی جەنگی بەپەلە بەناو ئاودا هاتن.. کەوتنە بێژانی چواردوەری خۆیان، شاهۆ لەگەڵ پێنج پێشمەرگەی کە بەسەر دوو گاشەبەردی کوناوکون و

تیکەشاخی سەرتیژ لە ناو ناو لە کەناری دەریاچە بڵاوبوونەوە.. لەگەڵ یەکەم هێرش بە دۆشکە و لە قەراغ ئاو بە ئاربیجی. زۆر بە قورسی لێیان درا.. شاهۆ سێرەی لە یەکەم زەوڕەق گرت.. بە ئاربیجیەك پارچەپارچەی کرد بوڕکانێك ئاگر لە ناو ئاو بە بەرزی گردۆڵکەیەك ئاگر بەرز بووەوە.. بەلەمی دووەم گەڕایەوە. لەوبەر وەکوو باران گولله بۆیان دەهات.. شەپۆل بانگی لە شاهۆ کرد. بگەڕێینەوە ئەوبەر.. بە لێواری دەریاچە لەو بەرەوە. گرمەگرمی چەند کۆپتەر و فرۆکەی جەنگی دەهاتە بەر گوێ. زۆری پێنەچوو کەوتنە باراندنی ساروخ و خۆمپارە قورسەکان، زۆر جار لەبەر نزیکی لە جاش و سوپا دەکەوتنە ناو سوپاکەی خۆیان لەوبەر لەکەنار دەریاچە دەبابە و ناقیلە و زرێپۆش حەشریان دەکرد. بە هاوانێك لە تەنیشیانەوە بەلەم سووتا.. کۆپتەرێکیان زۆر نزم بوو سینگی لە ناوەکە دەخشاند، بە دووشکە چوار دەوری خۆی دە بێژایەوە، شەپۆل بۆی هەستایەوە بە گوولە ئاربیجیەك دەریاچەی پێ ڕووناك کردەوە بە دوایدا بیکەیسی خستیە خوارەوە و کۆپتەر و فرۆکەکانی کە دوورکەوتنەوە. شەپۆل بە دیار ئاگری سووتاوی کۆپتەرەکە ڕامابوو دەستڕێژێکی گڕدار بەبەر سنگ و سەری کەوت بەر بووەوە ناوئاو. شەپۆل لەگەڵ شەپۆلەکان بەبێ بەرگری ئاو بەرەو خوار بردی.. شاهۆ کاتێك بە وەی زانی شەپۆل ژێر ئاو کەوتبوو. نەتدەزانی باران بە خووڕترە یان فیشەك.. لەبەرزایی لە لووتکەی چیاشەوە. دەریاچە ئاگردەدرا، شاهۆ چەند جار هاواری کرد شەپۆل.. شەپۆل. وەڵام نەبوو، لێی بێهیوا بوو.. ئەوەی سەری لێ دەرنەدەچوو، بۆچی کۆپتەرەکان لەوبەر بناری کۆسرەت تەقە دەکەن و تەقەیان لێ دەکرێت.. بەشێکی کەمی جاش و سەرباز تەقەیان لەوان دەکرد.. وەکوو ئەوەی گەماڕۆ درابن.. هەندێکیان لە ترسی ئاگری سەرووی خۆیان، خۆیان بە ئاودا دەدا.. لەلایەن شاهۆ و هاوڕێیەکانیەوە وەکوو نێچیر دەکەوتنە بەر ئاگری چەکەکانیان دووجاش لە تاریکایی نزیك بووبوونەوە لاشانی پێشمەرگەیەکیان گرت ڕایان کێشایە ناو ئاو. مامۆستا سەرباز هەردووکیانی بە چەند فیشەکێك نقووم کرد هاواری کرد هیوا دەستم بدەیە ڕایکێشایەوە ناو تاشەبەردەکان تاسابوو لە چەند لاوە سەری شکابوو.. جاشێك چەکەکەی بەرز کردەوە و خۆی بە ئاوێ دادا.. شاهۆ هاواری کرد کەس تەقەی لێ نەکات، کەمێك هەستایەوە بانگی کرد، چەکەکت فڕێ بدەو وەرە.. کابرا بەرەو لای هات.. لەوبەرەوە هەروا سەد مەترێك دەبوو.. دەستڕێژێك لە شاهۆ کراو

بەبەر کەلەکە و زگی کەوت بەرەو پاش کەوت. مامۆستا خۆی فڕیدا بۆلای شاهۆ.. بەرت کەوت بریندار بووی؟ بەپەلە کەوتە داماڵینی ڕەختەکەی پشتێندوو شەڕواڵو چۆغەکەی شەلاڵی خوێن ببو.. هەناسەی تەنگ ببو، بەڵام خێرا خێرا دەیگوت.. مامۆستا باشم. ئاگات لەو بەر بێت.. دەنگی تەقە کەم ببۆوە.. سەرباز و جاشەکانیان دەدیتن بەرەو خوارو سەرەوە سەریان لێ شیوابوو هەڵدەهاتن.. کاك شاهۆ برادەرانن. لەوبەری ئاوەکەوە دەنگێکی ناسکی ژنانە بانگیانی دەکرد.. هاوڕێیان.. شاهۆ.. مامۆستا.. شەپۆل.. واهاتین.. خۆیان بە ئاوێ دادا. شاهۆ و، مامۆستا و. هیوا.. لاشەی لەخوێن شەلاڵی سەنگەریان برد. لە شەپۆل هیچ شوێنەوار دیار نەبوو، لەکەنار و لەبنار لاشە بەسەر یەکتردا کەوتبوون، هەرچی لاشەی کوژراوەکانی ناو دەریاچە بەرەو خوار لەگەڵ پوشوپەلاش و ماسی سینگ سپی بەرەوو خوار ڕایدەماڵین، لاشەکان دەبوونە نێچیری ماسی، ئەوانیش دەبوونە نێچری گازی ژاراویی.. دیار بوو کۆمەڵێك پێشمەرگەی خۆیان و بەرەی کوردستانی بە هەموو لایەنەکانیەوە بە فریایان کەوتبوون. لەوبەر بنار دەیان خودە و بێری و کاسکێتی ڕەنگاوڕەنگ، لەتەنیشت دوو دەبابە و سێ ناقیلەی سووتاو لاشە وەکوو بارەداری قەلاشکراو بەو ناوەدا بڵاو ببوونە. کاتێك شاهۆ بەبرینداری گەیشتە بارەگای بیشەڵێن، یان ڕاستتر چواردەستەکی هەڵیان گرتبوو، لەسەر پارچە بەتانی و لێفەشڕەی پارچەپارچە بۆنی باڕودی سووتاو، بە چواردەوریدا پەڵە پەڵە خوێن لە تەنیشتیەوە جۆگەلەی خوێناوی تازە و کۆن تێکەڵ بەیەك بووبوون ڕەنگ و بۆنی سەوزە گیایەکەیان گۆڕی بوو بە قاوەییەکی تۆخ.

- ئێره شاره، ژیانی شار وەکوو لادێ نییه! دوو دنیای لێک جیاوازن، لەشار هەموو شتێك لەژێر چاودێرییەکی تووند دایه، شار وەکوو سەلکه پیازێك وایه هەتا دەگەیه توێژەکانی ناوەوەی، دەبێت سەد جار فرمێسکی چاوەکانت بسڕیەوە. له شار نابێت بەئارەزووی خۆت قسه بکەی، باسی پێشمەرگه و چەك و شەڕ ناکرێت. ناوی ئەنفال و هیچ شتێکی لەوبابەتانه ناهێنی. خەڵکی به دوای بژێوی ژیاندا غار دەدەن! زۆر ناپرژێنه سەرئەوەی چی له دەوروبەریان ڕوودەدات. ڕووداو و بەسەرهات بچووك بچووکن.. زوو زوو ڕودەدەن. ژیان له لادێ وەکوو هێلکەیەکی پاکراوە. به بەرچاوەوەیه. کارەساتەکانی زۆر دەگمەن و جەرگبڕن. زۆر جار به کاولکردن یان به لەناوچوونی هەموو خەڵکەکەی کۆتایی دێت. لەشار هەرکەس بۆخۆی دەژیت، سۆز و خۆشەویستی کەمتره.

تەوار به دووچاوی پڕگومانەوه له بەختیار ووردەبووەوه، بۆی بووبوو به شاهۆ، بەڵام کەس جێگای مامەشاهۆی بۆ ناگرێتەوە. نەیدەزانی باسی چی دەکات. لەبەر ئازاری سینگ و سییەکانی، به زۆر زەحمەت هەناسەی بۆ دەدرا.. قسەکانی مام بەختیار بۆنی خۆشەویستیان لێدێت، بەڵام زیاتر به قسەی ئەو ژنو پیاوانه یان منداڵ هەتا زۆر جار، جوجکه و مراوی و مشکی دەدیت. له سندووقه ئاوێنەدارەکەی بەرامبەری لەسەر بۆفیەیەك دانرابوو دەچوون. جامێکی گەوره دوو لای پشتی تەخته بوون، دەنگێکی زۆر سەیری لێ هەڵدەستا.

گۆرانییان دەگوت. قسەیان دەکرد. شەڕیان دەکرد دەستیان لەیەخەی یەکتری گیردەکرد. به مەترەق و دار حەیزەران هەموو سەر و گوێلاکی یەکتریان دەشکاند.. گاشەبەرد و تاوێری وەها گەورەیان بەیەکتری دادەدا هەزار ئەوەندەی خۆیان دەبوون. کەچی ڕاست دەبوونەوە گۆرانی و حەیران و هۆرەیان دەگوت. ئای که ئازا و بێچاوڕوون. سەیری ئەو سندووقه لەوەدابوو هەرکه پارچەپەڕۆیەکیان بەسەر دادەدا یەکسەر بێدەنگ دەبوو. سەگەلی لادێ کاتێك کەسێکی غەریبه دەهاته ناو ئاوایی، هێشتا لەدەرەوەی ئاوایی بوو، سەگەڵ به غار چواردەوریان لێ دەدا. خاوەن سەگەل به گۆچانی حەیزەرانی ئەستوور دەکەوته وێزەیان زۆر جار گۆپاڵی تاین لەسەر پشتی سەگەل و تووڵه قاچ کورتەکان چەند جار دەشکا، داوای گۆپاڵی بەهێزتری دەکرد. به خڕکه بەردان دەکەوته سەریان چفەچفه.. سەروگوێلاك و لەشیان شەلاڵی خوێن و ئارەقه

دەبوون وازیان نەدەهێنا خۆ لەباتی چغە بیگوتبا حەل لەلا کس، کس پیاویان ونجڕونجڕ دەکرد. کەچی ئەوەتا گاڕانێکی گەورەو زەلام بە پارچە پەڕۆیەك بەبێ یەك و دوو بێدەنگ دەبن، بەڵام بە قسەی مام بەختیار نە بەقسەی ئەو. تەوار تەنیا بوو پارچە پەڕۆکەی چەند جار لادا سنووقی بێشەرم بە قسەی نەکرد. لە بەختیاری پرسی.

- مامە بەختیار ئەو شتە سەیرە چییە؟

- کام شتە سەیرە تەوارگیان؟ئەو سندوقەی بەرامبەرمان، بەختیار هەستی بە شەرمەزاریەك کرد، باشە ئەمن لە کەنگێوە قسەی گەورە گەورەی سیاسی بۆ تولفەمنداڵێك دەکەم. کەچی فەقیرە. چوزانێت باسی چیم کردووە. لەدڵی خۆیدا گوتی.. تف لە گەمژەیی من، بەڵام زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی تەوار پرسیاری کردووە، گرنگ دەنگی بێت لە ژیاندابێت. تەوار وای زانی بەختیار پرسیارەکەی گوێ لێنەبووە یان پشت گوێی خستوە، بەڵام خوڕەوەشتی تەوار وابوو ماوەیەکی باش چاوەڕوانی وەڵامی دەکرد، قەت وا ڕێك نەدەکەوت دەستبەرداری وەڵام بێت. چەند دوادەکەوێت گرنگ نییە.. بەختیار بەدەم گۆڕینی کەناڵەکاندا بۆ دۆزینەوەی ئەفلام کارتۆنێکی دیکەی خۆش. بە تەواری گوت، ئەوشتە سەمەرەیە ناوی تەلەفزیۆنە. چەند جارێك میلەکەی بادا بەولا و ئەولادا. هەر دەنگوباس و وێنەی بەرەکانی جەنگ و شەڕە تۆپ و فڕۆکە و کەشتی گەورەگەورە بوون، لەسەر شاشە سەرەگایەکی زۆر گەورە بەجلوبەرگی سەربازی، زۆر تووڕەبوو، چەند تانج و نەجمە و داڵی کەرخۆری بە سەر شان و سینگ و بەرۆکییەوە بوو.. پەنجەی ڕادەوەشاند. لەوپەڕی تووڕەبوون و دەرمارگرژی، دەمی تەواو دادەپچڕی و حیلکەحیلک قاقا پێدەکەنی، لە شوێنێکی کە هەر ئەم کەسە بوو. لەناو ئاپۆڕای خەڵك بە قووڵەبڕنەوێکی زەردی زێڕباو، تاق، تاق فیشەکی بە هەوای دادەدان پێدەکەنی.. خەڵکی وەکوو مەیموون بە چواردەوریدا هەڵدەپەڕین جار جارێك بە ترسێکەوە دەستیان ماچ دەکرد.. زۆریان بە جلوبەرگی کوردی بە تفەنگ و فیشەکدانەوە لە بەرێی هەڵدەپەڕین. کابرا منداڵی بەرگ سپی بە سنگییەوە دەنان و بۆنی پێوەدەکردن. ئەوە کێیە؟ بەختیار گۆڕی کەمێك ناوچەوانی تێکچوو.. سەدام حوسێنە.

دیاره منداڵی خۆشدەوێن؟ بەختیار سەری لەپرسیارەکە سووڕما! بەڵام زانی نایناسێت، تەوارگیان نەك منداڵی خۆش ناوێن، تەنانەت ڕقی لە خۆشیەتی. تەوار هەندێك چاوەکانی هەڵگلۆفین.

- ئەدی بۆ وا بچووك بوو؟ بەختیار پێکەنی.. ئەم کەسە بەقەد لەندەهۆرێك درێژە، بەلام لەناو ئەو شاشەیە بچووك دیارە، ئەو ئاژەڵ و داروبەردەی دەی بینی هەر هەمووی دروستکراون بۆیە پێیان دەڵێن فیلمە کارتۆنیەکان! ئەدی ئەو پێشمەرگانە کێ بوون، لەپێشی هەڵدەپەڕین؟ بەختیار بەسەرسووڕمانە تەماشایەکی تەواری کرد، تەوارگیان ئەوانە پێشمەرگە نەبوون، جاشن، ڕاستە ئەوانیش جلکوبەرگی کوردیان لەبەرە، بەمیراتیان بێت، بەڵام پێیان دەڵێن جاشی، کوڕی کەر. تەوار چەند جارێك بە توندی کۆکی. ماوەیەك بەردەوام بوو بەری هەناسەی گرت. چاوەکانی سوور هەڵگەڕان، چەند خوێنێکی ئاڵ لە دەمی هات، بەبەر گەردەنیدا شۆڕبووەوە. بەختیار شڵەژا پەرداخێك ئاوی بۆ هێنا. خوێنی بەر گەردنی سڕی.. شووشەیەك شرووب و دەرمانی کۆکەی بۆ هێنا، بە زەحمەت خواردیەوە دیاربوو زۆر تاڵ بوو، تەوار ڕەنگی تێکچوو. لە گۆشەیەك پاڵکەوت. چاوەکانی بە ژوورەکەدا گێڕان.

دووبارە بێدەنگی هەڵبژارد، بەختیار چەندجار تەوارگیان چیتە؟ وەڵام نەبوو.. بەو چەند وشەیە بەختیار کۆتایی بە قسەکانی هێنا. تەواری کردە باوەشیی و سەر لێشێواوانە بە حەوشەدا غاری دا، بە نارامکردنەوەشی، هیچ نییە گوڵەکەم، هەر ئێستا دەتگەیەنمە خەستەخانە و لای باشترین دکتۆر چارەسەرت دەکەن. دەرگا ئاسنە ژەنگاوییەکەی کردەوە، هەروا بە ئەژنۆی بەیەکی دادا، تەوار لەگەڵ تەقەتەقی دەرگاکە ناوڕی دایەوە، بەختیار تەواری بە باوەشێوە، سەر بەرەو خوار هەڵات، هەر چاوی بە کۆڵاندا دەگێرا، منداڵێکی پێخاوسی جلکوبەگ شڕ دەستی بۆ دواوە ڕاداشت، مامەبەختیار جێبەکەت لەوێ ڕاگرتووە، ناوڕێکی دایەوە، لەبەر سێبەری سەر گۆشەیماڵییان جێبەکەی بەدیکرد، لە ژێر تیشکی بەهێزی خۆرەتاوەکە تەواو داخ بووبوو، گەڕایەوە ساتمەیەکی برد، جیرە لە قۆندەرە لووسەکانی هات، بە لای ڕاستدا ئەو باسکەی تەواری توند پێگرتبوو بە لاداهات، خەریك بوو بکەوێت، خۆیگرتەوە و لەنگەڕی ڕاگرت، ڕەوە قازی ملدرێژ و مراوی قاچکورت، لەگەڵ چەند جووجەڵەیەکی زەرد، بەقووقە قووق بە نیمچە هەڵاتن و نەرمەفڕینێکەوە پەرشوبڵاوەیان لێکرد، چەند دەنگێکی ژنانە بە

هاوارەوە، خودایە بیپارێزە، یا خەوسی گەیلانی! ئاوڕێکی بەرەو لای دەنگەکان دایەوە، دراوسێیەکانی بوون، بە سەرسووڕمانەوە تێیەوە ڕادەمان، ئەو منداڵە نە خۆشە کێیە لە باوەشی؟ لە پێش جێبەکە مام سوفییەکی ڕیش سپی سمێڵ پاک پاک تاشراوی نوورانی پێشی پێ گرت، کوڕم بەختیار بۆ وا شپرزەی، وەڵامەکەی هەر ئەوەندە بوو، هیچ نیە مامە، تۆپەڵێك کلیلی لە باخەڵی دەرهێنا، لە دەستی کەوتە خوارێ، مام سوفی گورجێك لە ناو قوڕاوە تەنکەکە هەڵی گرتەوە و بە پشتێندە سەوزەکەی پاکی کردەوە و دەرگای جێبەکەی بۆ کردەوە، کوڕم بێم لەگەڵت، بەختیار سەرێکی ڕاوەشاند، نا مامە نا، خەجاڵەتم! کەواتە با خەسرەو لە تەکتا بێت.. پێویست ناکات.. مام سۆفی بە هێواشی دەرگاکەی پێوە دا، چەند جار دەستی بە ڕیشەسپییە خوورییەکەیدا هێنا، خوا ئاگادارت بێت لە حیفزی خودای گەورە دابن. لە بیران ڕاچوو بوو، ئەو کوڕە لەوەتەی دەیناسین، هەر تەنیا و سەڵت ژیاوە، هاموشۆی لەگەڵ کەسدا نییە، هەتا ئەمڕۆکە کەس لە دراوسێیەکان مێینەیەکی بە چاوی خۆی نەدیوە، پێ لە دەرگای ژوورەوە بنێت، لە ماڵ بۆ خوێندنگا، یەکسەر بۆ ماڵ، کاروپیشەی دیار نییە چییە؟ بەردەوام بەستەیەک کتێبی لەبن هەنگڵدایە، خەڵکی نەک گەڕەک بەڵکوو تەواوی شارۆچکە خۆشییان دەوێت و ڕێزی لێ دەگرن، ئەویش بەرامبەر بەهەموویان بەڕێزە، تەنها لەگەڵ دوو جاشی گەڕەک زوو زوو لێیان دەبێتە دەنگە دەنگ و دەمەقاڵێ، زمانی پیسی جاشەکان، تووشی گفتولفتی زبری دەکەن، جاشەکان بەرەو ڕوو پێ دەڵێن، بەڕەلای بێکەس، ئەویش بەبێ سڵکردنەوە، هەر خۆتان بە خۆتان بن چڵپاو خۆرینە! تاک و تەنیایە ڕاستە، بەڵام چەند ڕۆژە ئەدی ئەو کیژۆڵە لەڕولاوازە نەخۆشە، چی گەیاندیە ماڵ و باوەشی بەختیار، ئەوە لوغزێکە و کەس هەتا ئێستا پەی پێنەبردووە. هەرچەند ئەویش وەکوو بەختیار قەت سەرێک ناکێشێتە دەرەوە، هیچ نەبێت لەگەڵ کچانی گەڕەک یارییەک بکات. بەختیار بە جێبە کۆنە خەڕەکە شکاوەکەی پێی بە بەنزیندانا و زۆر بەخێراییەکی شێتانە دەرچوو، تە ماشای ئەولا و ئەولای هەر نەکرد، مام سۆفی هەتا لەچاو بزر بوون، دوعای بۆ دەکردن. هەر بەو خێرایی ڕەشەبا بەناو شەقامەکانی شاردا تێدەپەڕی. تەوار سەری لەو هەموو جەنجاڵیەی شار سووڕمابوو، هەتا ئەوکاتە ئەوەندە مرۆڤەی بەیەکەوە نەدیتبوو، هات و هاوڕێیان ئەوەندەی دیکە سەرنجی ڕادەکێشا، کوتاڵی باش، فەرشی باش، وەرنەوە وەرنەوە، بامیە و باینجان و تەماتەی خۆماڵی،

جووتێک کۆتری تەقڵەباز، بە پێنج دینار، بۆنی کەباب و گوڵەدان و گۆشتی برژاو دنیای تەنی بوو، چەند جارێک کەسێک دەکەوتە پێشی جێبەکەیان، بەڵام بەختیار بە هۆڕن ئاگاداری دەکردنەوە، لەگەڵ زانی تەوار هاتووەتەوە سەر خۆیی و بە بێدەنگی لە جامەکەوە سەیری دەرەوە دەکات، خێراییەکەی کەم کردەوە. هەر بەدەم ئاژوشتنەوە بە دەستەسڕێکی سپی خاوێن ئارەقەی ڕووخساری تەواری دەسرییەوە، جارجارێك لێی دەپرسی، تینووت نییە، برسیت نییە؟ تەوار بە سەر وەڵامی دەدایەوە، تەوار لەژێر لێوەوە پرسی، ئەو خانووە گەورەیە، قوتابخانەی پشدەرە؟ بەختیار بە سەرنجێکەوە وەڵامی دایەوە، بەڵێ! بەڵام ئەتۆ چووزانی؟ تەوار وەکوو خەون شێوەی بابی دەهاتەوە بەرچاو کە زۆر جار دەستی دەگرت و بە قات و بۆینباخی پەپولەوە ئەویش بە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگی ئۆرزدیەوە بۆ قوتابخانە لەگەڵ خۆی دەیبرد. بەختیار زنجیرەی خایاڵاتی پێپساند و دووبارە پرسی، وادیارە خوێندەواریت هەیە، تەوار بەدەم تەماشاکردنی باخی شار، هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.. بەختیاریش هەموو هەوڵێکی زوو بەخەستەخانە گەیشتن بوو.

بۆ دواجار خۆی گەیاندە خەستەخانە، پاش چەند جار پرسیار کردن و ئەو ژوور و ئەو ژوور. لە قاوشێك گیرسانەوە. ژوور ژووری بچووك بوون قەدەرێك چاوەڕوانیان کردن، چەند جار پەرستار و سستەر دەهاتن چەند پرسیارێکیان دەکرد. لەتەبەڵەکەی دەستیان دەیان نووسی. پاش نیوەڕۆ دکتۆرێك بە بەرگی سپی پاکوخاوێنەوە پەیدابوو، ڕووە سافولووسەکەی وا دیاریدەدا قەت گوێزان بە ڕووخساری نەکەوتبێت، بەڵام خاڵەڕەشە گەورەکەی سەر ڕوومەتی لای چەپی ئەو بۆچوونەیان ڕەت دەکردەوە، چونکە چەند موویەکی ڕەشی قەترانی بە تیژی سەریان دەرهێنابوو. هاتە سەر سەری تەوار، چەند یاریدەرێکی لەگەڵ بوو، لە پەرستار و سستەر. دکتۆر زۆر بە میهرەبانییەوە دەستێکی بەسەرسەری تەواردا هێنا.

- کچە جوان ناوت چییە؟ تەوار تەماشایەکی بەختیاری کرد. بەبێ ئەوەی سەر بەرەو دکتۆر بەرزکاتەوە، دەستی کرد بە لوول دانی کەزیە زەردە درێژەکانی. دکتۆر هیچ خۆی تێکنەدا، دیارە نامانناسی بۆیە وەڵام نادەیتەوە، بەپرسیارێکی کە دووباندی.

لەکوێ ئازارت هەیە؟ دووبارە، وەڵام نەبوو. بەختیار بە کەمێك شڵەژاوییەوە. جەنابی دکتۆر.. ئەوە کچمە ناوی کەنارە، دکتۆر کەوتە خوێندنەوەی تەبەڵەکەی دەستی.. هەوکردنی سیوسنگی، هەناسەتەنگی، لەرزوتای بەردەوامی بەهێز لەکاتی کۆکین خوێنفڕێدان.. ڕووی لە یارمەتیدەرەکانی دەوروبەری کرد. پشکنینی تەواوی چەند وشەیەکی بە لاتینی گوت.. بۆدەکرێت. بەردەوام سێلاین و جارجار بە گوێرەی هەناسەتەنگییەکەی ئۆکسجین بەتایبەتی شەوان بۆی بەکاردێنن. لێدانی دڵ و پێوانی پاڵەپەستۆی خوێن. پارچە ئاسنێکی لە شێوەی کەوچك دەرهێنا، دەمت بکەوە.. تەوار کەمێك دەمی کردەوە، زیاتر.. بەتەواوی دەمی کردەوە.. هالاوێکی گەرمی زۆر ناخۆشی لە دەمی هات. دوو لێو و زمانی سپی سپی و شەقارشەقار بووبوون. پارچە ئاسنەکەی لەناو دەمی نا هەتا سەر زمانە بچکۆلەی برد پاشان لایتێکی بچووکی زۆر بە شەوقی لە باخەڵی سەدریەکەی دەرهێنا، دووجار لایتی لەدەمی دا، تەوار قرخەیەکی کرد، هێڵنجی هاتێ. دکتۆر چەند پارچە کلێنکسی دایە دەستی.. سنگی پشکنی چەند جار لە پشتی دەستی خۆی دا، کەوا لەسەر پشتی دانابوو.. ماوەیەك بەرامبەری دۆشداما، وەکوو ئەوەی بیر لە شتێك بکاتەوە.. کراسەکەی پێدانا تەوار شەرمی کرد. خۆی بە سەرچەفەسپیەکەی سەر ڕانی داپۆشی.. دکتۆر کەمێك بزەگرتی. شەرم دەکەی؟ دەتوانی بڕۆی؟ تەماشایەکی بەختیاری کرد. کاکە دەتوانێت بڕوات.. بەڵێ کەمێك قاچەکانی لاوازن. ماوەیەك لەمەوبەر لەرزوتایەکەی بەهێزی گرتی زۆر توانای جووڵانەوەی نەماوە.. دکتۆر دەستی گرت بردیە ژوورێکی نزیك ڕاڕەوە درێژەکە.. پەردەیەکی هەڵدایەوە، تەواری ناردە ژوورەوە. لەپشت پەردەوە بە بەختیاری گوت، با جلکوبەرگەکانی داکەنێت بەس دەرپێ کورتی لەبەربێت. بەختیار داوای لە تەوار کرد خۆی ئامادە بکات.. لەلایەن تەوارەوە هیچ جووڵەیەك نەبوو. بەرامبەر بەئاوێنەیەکی گەورە. لەسەروپرچ و دەموچاوی خۆی ورد دەبووەوە، یەکەم جاری بوو ئاوا بەگەورەیی خۆی ببینێت. تەماشای بیلبیلەی چاوی دەکرد بازنەیەکی ڕەشی تۆخ، لەدەرەوەی بازنە بازنەیەکی گەورەتری شین شین، بە وردە دەماری سوور لە بەشی سپێنەکەی جودا دەکردەوە، بۆ یەکەمجاربوو زامەکانی سەر ڕوومەت و لاملی بەدی دەکرد، کەمیک ترسا ڕووی خۆی وەرگێڕا. دوو پەرستار هاتن، بە چەند قسەیەکی خۆش ڕازییان کرد جلکەکانی داکەند.. لەشێکی سپی وەك بەفری سپی کوێستانی. لەخوار مل و

لەسەر سنگیەوە پەڵەپەڵەی سووتاوی گەورەگەورە لەسەر پێستی تۆپەڵ تۆپەڵ خڕببوونەوە. دکتۆر ماوەیەك بە دەست كێشە سپیەكانی كەوتە خوراندن و كڕاندی پێستە زیادەكان، بۆی دەركەوت تەنها پێستەكەیە و كۆنە.. دووبارە داوای لە سستەرەكان كرد. پۆشاكەكانی لەبەر كەنەوە. دکتۆر بەختیاری بردە ژوورێكی دیكە.. ماوەیەك چاوەكانی قەپات كردن. بە دوو پەنجەی ناوچاوان و چاوەكانی خۆی گوشین. ئەو كچە بەچی وای لێهاتووە؟ بەختیار زۆر شڵەژا. نازانم، وا بزانم سووتاوە.

- بەچی سووتاوە؟ وابزانم بە شەكری كوولاوە.

- چەند دەبێت؟ هەروا شەش حەوت مانگە.. باشە ماوەی ئەو شەش حەوت مانگە، نیشانی دکتۆری دیكەتان داوە؟ بەڵێ دکتۆر. هی منداڵ بوو یان دکتۆری گشتی؟ نا هی منداڵ نەبوو. لەكوێ؟ لەشارەكەی خۆمان.

دکتۆر ماوەیەك لە دەم و چاوی بەختیار ڕاما. بەدوو چاوی تەڕەوە تەماشایەكی بەختیاری كرد. براكەم دەڵێی كچمە لە لایەكی دیكە وەڵامەكانت هەرهەمووی بە نازانمە، چارەسەر بەو شێوەیە ناكرێت. پێش هەموو شتێك دەبێ بزانم دایك و باوكی ئەو كچە كێن؟ بۆمی نیمزا بكەن. یان ڕاستتر بۆ خەستەخانەی نیمزا بكەن لەكاتی چارەسەر و پشكنین هەرچی بەسەرهات بۆ خۆتان بەرپرسن، بەختیار شڵەژا. دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو. داك و باب، باشە جەنابی دکتۆر ئەمن وەكوو بابی ئامادەم چی پێویستی بە دایكە. دکتۆر سەرێكی ڕاوەشاند، داوای لێبووردن دەكەم، بەبێ ڕەزامەندی دایكی، ناتوانم. كێ دەڵێت كچی تۆیە؟ تەمەنی خۆت چەندە هەروا بیست بیست و یەک ساڵ دەبیت، قوربان بیست و چوار ساڵم، ئەو كچە نۆ دەساڵێک دەبێت. ئەگەر گوتبات خوشكمە ڕێی تێدەچوو. باشە دکتۆرگیان با فەرمایشتی جەنابتان بێت، خوشكمە، بەس بەزووی چارەسەری بۆ بكەن. هەر وەكوو پێم گوتی، بەر پرسیارییەتێكی گەورەیە، ئەگەر لە خەستەخانە نەبوایە دەمتوانی چارەسەری بكەم، بەڵام لێرە هەموو نەخۆشێك، جێگا و ڕۆژی لەدایكبوونی دیارە. بەختیار هەر ئەوەندەی بۆكرا، كاكە لەبەر خاتری ئەو كەسەی منی ناردوومەتە لای تۆ؟ كێ تۆی ناردۆتە لای من؟ كاك فەرەج.. ئەتۆ كاك فەرەج لەكوێ دەناسی.؟ دکتۆر وەكوو كوندەیەك ئاوی ساردی پێدا بكەن، لەسەر كورسیەكەی خۆی وشك بوو. پەرستارێك هاتە ژوور. بەڕێز دکتۆر. نەخۆشێكمان هەیە شادەماری نادۆزمەوە زۆر قەڵەوە.. دکتۆر كەمێك

بەناڕەحەتییەکەوە.. باشە بڕۆ دەرگاکە داخە، هەر ئێستادێم. کاتێك دوو قۆڵی مانەوە. بەختیار خۆی بەسەر دەستی دکتۆر دادا. وەکوو کوردێك لێتدەپاڕێمە چارەسەری بکە بێکەسە لێقەوماوە.. قوربانییەکی زۆر نامرادە لەو ژیانە. دکتۆر دەستێکی بەسەری بەختیار داهێنا کاکە ناوی جەنابت بەختیارە. بەڵێ بەختیاری برا بچووکت. کاکە بەختیار ئەمن مێشکم زۆر جەنجاڵە. باوەڕبکە زۆر جار خەوتنم بە جلکوبەرگی سپییە. هەتا ناوی خۆشم لەبیر دەچێتەوە. کاك فەرەج دوێنێ شەو زۆر شتی بۆم باس کرد. زۆریم لەبیر نەماوە. بڕۆ بیگەڕێنەوە ژوورەکەی خۆی، وەرەوە بۆ لام. لەسەر قسەی دکتۆر فرمێسکەکانی سڕینەوە و تەواری بردەوە ژوورەکەی خۆی. گەڕایەوە لای دکتۆر خەریکی تەلەفۆنکردن بوو، پاش کەمێك دکتۆر، بەرهەڵبێنەیەکی سپی دایە دەستی بەختیار و وەرە لەگەڵم، بەڵام بە هیچ شێوەیەك قسە لەگەڵ کەس ناکەی.. بەختیار سەدریە سپییەکەی لەبەر کرد کەوتە دوای دکتۆر.. دکتۆر لە باخچەیەکی بچووك پەڕیەوە. ماوەیەك بە پشتی خەستەخانەدا سووڕایەوە چەند جار بەناو دار و بەردا ڕێگای گۆڕی.. بەختیار قەت نەیدەزانی ئەو خەستەخانەیە ئەوەندە گەورەیە.. لەوبەری ئەوبەر دوو هۆڵی گەورە هەبوون. لە هەموو لایەکەوە ئێشکگر و پاسەوانی پڕچەک و ماندوو، چاودێرییان دەکرد، هەر کەسێک بەرەو هۆڵەکان چووبا، لەبەری پێیەوە هەتا تەوقی سەری دەیان پشکنی، ڕوویان لە دکتۆر کرد، ئەوە چکارەیە لەگەڵتدا، خوێندکارە هاتووە شتێک فێر ببێت، بەڵام لەمەوپێش نەمان بینیوە، بەرپرسەکەیان لەگەڵ یەکێکی دیکە لە دەمەقاڵێیەکی توونداوو، بە جگەرەکەی دەستی تێیانی گەیاند، بابڕۆن. کاتێک گەیشتنە ناو دوو هۆڵەکە لەسەرەتا لێك جیابوون. لە ناوەڕاست تێکەڵ بەیەکتری دەبوونەوە.. دووهۆڵەکە ساردوسڕ و شێدار، بنمیچ و دیوارەکانی خوێناوی لەهەموو لایەکەوە کەڕوو لێی دابوون، دووبارە چەند پاسەوانێك لە چواردەوری هۆڵەکان بوون. کاتێك زانیان دکتۆرە و بۆ بەسەرکردنەوەی نەخۆشەکان هاتووە، ڕێگایان پێدا.. بە پڕاوپڕی هۆڵەکان ژن و منداڵی بە ناستەم نووزەیان لەبەرمابوو، لەسەر زەوی ڕەقووروت بەبێ هیچ ڕایەخێک لە زەوی درێژ ببوون، دەست و دەموچاویان هەرچی پێستی هەیانە داماڵدرابوون.. چاوەکانیان وەها بەقووڵداچووبوون تەنها پەیکەرەئێسك و پێستێکی شۆڕبووەوە مابوونەوە، بۆنی هەناسە و برینەکانی سەرلەشیان، مرۆڤی زۆر دڵبەرد جەرگی دەبوو بە ئاو بۆیان، کەف و زەرداو و لە دەمییان دەهات.

ئەوەندە لاواز بوون توانای گریانیشایان نەمابوو. بەجلوبەرگی دڕاوی کوردییەوە. هەندێکیان خامی سپی زەردهەڵگەڕاو کون کونیان لەبەردابوو. سڵیان لە هەمووشتێك دەکردەوە، تەنانەت لە سێبەری خۆشیان. پیاو و کچی گەنجیان لە ناودا نەبوون.. ژن و منداڵی خوار پانزە ساڵی بوون. دکتۆر ماوەیەك بە ناویاندا سووڕایەوە و لە گۆشەیەك ژنێکی جلڕەش بە دانیشتنەوە دوو پێی لێ درێژکردبوو، کۆرپەیەکی نیوە ڕووت بە باوەشیەوە بوو. کۆرپەکەش و دایکەکەش هیچ نیشانەو هەناسەیان نەدەدا. دایکە کۆرپەی بە سنگ و مەمکی چرچی خوێناوی خۆیەوە نابوو. کۆرپە هیچ جووڵەی نەبوو، دکتۆر دەستێکی لە سنگی کۆرپە دا دەمێك بوو گیانی تێدانەمابوو.. بانگی دایکەکەی کرد. خوشکم، کۆرپەکەت تەواو بووە. لەلایەن دایکەوە هیچ وەڵام نەبوو، کاتێك دکتۆر دەستی دایکەی گرت. زۆر پێشی کۆرپەکەی گیانی سپاردبوو. دکتۆر لە پێشەوە و بەختیار لەدواوەی بەپەلە دەرچوون.. لەناو باخچە بەختیار لە دکتۆری پرسی.. ئەوانە چی بوون؟ دکتۆر بە بێ ئاوڕدانەوە. شتێکی درێژی ششششتتت بۆ کرد. کاتێك گەڕانەوە ناو خەستەخانە، بەدەم ڕێگاوە بە بەختیاری گوت.. پاش یەك کاتژمێری دیکە ئەمن دەڕۆم ئەتۆش دەستی کچەکەت دەگری و دەچییە لای ئەو کەسەی ئەتۆی بۆ ئێرە نارد. شەو دێم یەکتر دەبینین.. بەختیار دڵی داخورپا زمان و لێوەکانی وشك بوون، نەیدەزانی چی بڵێت.. هەر ئەوەندە بۆی کرا دکتۆر چۆنی بۆ باس کرد ئەوهای کرد.

کاتێك لە خەستەخانە دەرچوون. تەوار ئاهێکی بەبەردا هاتەوە.. ئەو چەند کاتژمێرەی لە خەستەخانە بوو ناخۆشترین کاتەکانی ژیانی بوون. پاش کەمێك ڕێکردن بەختیار زانی تەوار ناتوانێت ڕێ بکات. لەباوەشی کرد بۆ لای کۆنە جێب. لەڕێگا بەختیار بۆخۆشی نەیدەزانی بەرەو کوێ لێدەخوڕێت. لەهەموو لایەکەوە هۆڕنی بۆ لێ دەدرا. کاکە کوێری؟ ئاگات لە خۆت نییە؟ ئای خودایە ئەو قەسابخانەیە چی بوو؟ لەو شارە شتی وەها هەیە؟ بەخوا شتی زۆر لەوەش گەورەتر دەکرێت ئێمە ئاگادارنین! تەواریش بیری زۆر لە بەختیار پەرشوبڵاوتر بوو.. بەهەر چواردەوری خۆیدا بە پانایی شار، ئێستاکەش و ئەودەمی هاتن بۆ خەستەخانەش، سەری لەو هەموو ئاژەڵ و پەلەوەرە سووڕما بوو. بەسەر شەقام و کوچە و کۆڵان و باخچە و هەمولایەکدا بڵاوبووبوونەوە. برینی گەورە گەورەی سەر جەستە و لەشیان. گۆشتی سووریان بەدەرەوەبوون. لەهەرچی جۆری

ئاژەڵی کێوی ماڵی. ئەسپ پشیلە. گوێدرێژ. بەشی زۆری سەگ و تانجی و شەل و سەقەت و بریندار، باشە ئەوانە هی شارن یان ڕێگایان کەوتووەتە ئێرە؟ ئەگەر وابێت بەڕاستی خەڵکی شار زۆر بێبەزیین بەرامبەر بە ئاژەڵ، باشە ئەو بەستەزمانانە چییان کردووە، هەتا بەو جۆرە لەگەڵیان دەجووڵێنەوە. لە لادێ چەند ئاگادار و چاودێرییان دەکەن، کادێن و تەویلە و گەوڕ و ئاغەڵی تایبەتی.. خاوەن ئاژەڵ پێش ئەوەی بۆخۆی منداڵەکانی تێربن، ئاژەڵەکانیان تێر دەکەن. لەوێش لێدان و تەمێکردن هەیە. کاری قورس، بەڵام ئاوەها بریندار نین. بەختیار زۆر بەتیژی بە ناو شاردا هاتەخوار. دوو ئیڤای پڕ لە کڵاوسوور بۆی هاتن. یەکێکیان لەپەنجەرەوە سەری دەرهێنا. ئەوانی دیکە میلی چەکەکانیان هێنایەوە. خەڵکی بە پەرێشانی و ڕقێکەوە سەیری ئەو دیمەنەیان دەکرد، کابرای سەکن ڕەشێکی ددان درێژ وەکوو شفرەی بەراز، تفێکی گەورەی لە دەموچاوی بەختیار کرد، هێشتا تفەکەی نەسرِیبووەوە. بەڵغەمێکی گەورەتری تێکرت، چاوەکانی وەها لە بەختیار سوور کردبووەوە وەختا بوو چاوە زەقەکانی دەرپەڕن. خۆی خوارکردەوە. دەمانچەی لەسەرسەری ڕاگرت.. بە عەرەبی پێیگوت گەوادی بێشەرەف بۆ وا خێرا لێت دەخوڕی؟ بەختیار کەوتە پاڕانەوە.. گەورەم وەڵڵاهی ئەو کچەم زۆر نەخۆشە و دەیبەمە خەستەخانە. کەر ئەتۆ بەرەو قەڵات دەچووی، وەکوو سەگ بتتۆپێنم. بازنەی خەڵکەکە بەرەبەرە زیاد و بچووکتر دەبووەوە بە چواردەوری بەختیار و چەکدارەکاندا، چاوەکانیان ئاگری تۆڵەکردنەوەیان لێ هەڵدەستا، بە بەختیارییان دەگوت، هیچ نییە لەگەڵتدا‌ین، ئەوەندە نزیکبوونەوە دووکەڵی جگەرەکانیان لە دەموچاوی چەکدارەکانی دەدا، تەواو لە نامادەباشیدابوون، لەنەکاوێک لاسلکیان بۆ کرا. بەهۆڕنلێدان دڕیان بە خەڵکەکە داو بەپەلە ڕۆیشتن. بەختیار بەوەندە مەمنوون بوو، ئاهێکی بەبەرداهاتەوە. تف و بەڵغەمەکەی دەموچاوی سڕییەوە و بۆخۆشی چەنگەتفێکی لە خۆی کرد. سەری ڕێزی بۆ ئاپۆڕاکە دانەواند و دوورکەوتەوە. کاتێك گەیشتە بن قەڵات، چوولە دەرگای ماڵی فەرەجیدا.. کاك فەرەج هاتە دەرەوە تۆقەی لەگەڵ بەختیار کرد. ئەواری بردە ژوورەوە. ها بەختیار چی بووە؟ بەختیار هەر تفی لە خۆی و لە ژیان دەکرد. کاك فەرەج دوایی تێتدەگەینم.. باشە باشە.. بۆچی تەوار لە خەستەخانە نەمایەوە؟ ئەدی دکتۆرتان دیت؟ بەڵێ شەو دێت بۆ ئێرە. فەرموو وەرنە ژوور، کەی هات بە خێربێت.

لەسەر قسەکەی خۆی دکتۆر لە پاش خۆرئاوابوون بە دوو جانتای گەورەوە پەیدابوو. چووە سەرسەری تەوار دەستێکی بەسەریدا هێنا، لەباخەڵی دەنکەحەبێکی گولاجی دەرهێنا داوای ئاوی کرد، هەندێك ئاوی بەدەمی تەوارە کرد. حەبەکەی پێ قوتدا. دکتۆر ڕووی لە فەرەج کرد. کاك فەرەج.. کاك بەختیار خەڵکی ئەو شارە نییە؟ ئەتۆ کوڕی ئەو شارەی.. چۆن، چۆنی بەتەنیا دەینێری بۆ خەستاخانە؟ فەرەج بە شەرمەزارییەکەوە، کاك دکتۆر خەجاڵەت خۆم، نەمتوانی لەگەڵیان بێم. ڕووی لە بەختیار کرد، بەختیار کاك دکتۆر، لەگەڵ خۆمانە و براگەورەی هەمووومانە.

دکتۆر تەماشایەکی تەواری کرد، دەموچاوی تەنکە ئارەقەیەکی کردبوو.. لەخەوڕاچووبوو، داوای سەرچەفێکی کرد، بەختیار بەتانیەکی بە تەواردادا. دکتۆر لای برد. کاکە سەرچەف بەتانی گەرمە، بە پارچە پەڕۆیەکی تەنکی گەورە تەواری داپۆشی. بەختیار زۆر بە ناڕەحەتی هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشا.. کاك دکتۆر ئەوەی ئەوڕۆ دیتمان چی بوو؟.. کاك بەختیار بەدوورو درێژی بۆتانی باس دەکەم. بەڵام ئەمنیش دوو داواکاریم هەیە.

فەرموو کاك دکتۆر.. جارێ مەسەلەی ئەو کیژۆڵە، برینەکانی زۆر لەوە سەختترن وەکوو ئەوەی ئێوە لێی تێدەگەن ئەمڕۆ لەخەستەخانە بیان زانیبا تێکەڵ بەو کەسانەیان دەکرد لە هۆڵەکان بە چاوی خۆت دیتن، تەوار بە چەکی کیمیایی و گازی ژاراوی برینداربووە، پێستی لەسەرەوە سووتاوە، بەڵام لەناوەوە هەتا سەر ئێسقان وەکوو مۆرانە خواردوویوتی، ئەوەی ئەو چەکەی دروست کردووە. حەز ناکات قوربانییەکان وا بە ئاسانی بمرن. دەبێت بەدەم ئازارێکی زۆرەوە ماوەیەکی باش بتلێنەوە. ئەو کیژۆڵە ئەگەر زۆر بە زوویی فریای نەکەوین لە ماوەی یەك مانگ هەتا دوو مانگ زیاتر ناژیت. ئەو خەڵکانەی ئەمڕۆ بە چاوی خۆت دیتن لەخەستەخانە، هەموویان بەو چەکە کوشندەیە برینداربوون. برایەکم ئەفسەری سوپایە دەڵێت لە هەموو سەربازگەکان، بەدەیان هەزار کەسی لەو جۆرە بریندارانە هەن، دەستەدەستە خوێنیان لێدەگرن. هەتا بەتەواوی خوێن لە لەشیان نامێنێت، پاشان دەیان بەن لە بیابانەکانی خواروو دەستەدەستە زیندەبەچاڵیان دەکەن، هەر ئەو خوێنە جارێکی کە بۆ دروستکردنی چەکی کیمیای بەکاردێت. بەختیار بەهەناسەبڕکێوە، باشە کاك دکتۆر دەرمان و چارەسەرتان نییە؟ دکتۆر بەڵێ هەمانە، بەڵام بۆ قوربانییەکان نییە، بەڵکو بۆ

جەلادەکانە. دەبێت بۆ چارەسەری تەوار لەو دەرمانانە هەندێکم لاداوە چاکی بکەمەوە. ئەگەر بتوانن چەند کەسێکم بۆ پەیدا بکەن، دەستی بە جانتایەکەیدا کرد، چەند کیس دەرمانی گیراوە و نەگیراوەی تۆزی دەرهێنان، ئەو دەرمانانە گرتنەوەیان ئاسانە هەر لەگەڵ ئاو تێکەڵ دەکرێن.

بەختیار پرسی، باشە کاک دکتۆر ئەو دەرمانانە چین؟ ئەوانە بۆ چارەسەری ئەو ئاژەڵ و پەلەوەرە بێزمانانەی لەگەڵ ڕاگواستن و کاولکردنی گوندەکان و ئەنفال کردن، بە لێشاو ڕوویان لە شار کردووە، سیخوڕ و پیاوانی ڕژێم بە دەرزی ژاراوی یان پارچە گۆشت وئالیکی ژەهرکراو لە ناویان دەبەن، ئەوانە جینۆ سایدیان تەنها بەرامبەر مرۆڤ نییە هەرچی گیانلەبەرە بە دوژمنی خۆیانی دەزانن. چەند کەسێکم بۆ بدۆزنەوە پارەیان دەدەمێ چارەسەری ئەو ئاژەڵانەم بۆ بکەن، خۆ ئەگەر هیچ نەبێت بتوانین مێش و مەگەزی سەر برینەکانیان لادەین خێرێکی گەورەیە. بەختیار ڕووی لە فەرەج کرد. ڕاستی کاک فەرەج بۆ ئەو کارە باشە، کاک فەرەج کەوا هەتا ئەو کاتە بێدەنگ بوو. وادیارە ئێمە یەکەم کەس نین بیر لەو کارە پیرۆزە دەکەینەوە، زۆردەمێکە لەو شارەی ئێمە خێرخواز زۆرن، لەسەرەتایی ڕاگواستن و کاولکردنی گوندەکان، هەروەك کاك دکتۆر باسی کرد، ناوشار و کوچە و کەلاوە و دۆڵ و دەشت، بە تایبەتی دەوری ئۆردووگاکان پڕ بوون، فەرموو ئۆردووگای پێماڵك، لەبەر کەلاك و ئاژەڵی بریندار دەیان نەخۆشی بڵاوبوونەتەوە. کەسێك هەیە بەناوی (کاك محەمەدی مەلا عومەر*) فریشتەیەکە، هەموو سەروەتی خۆی لەسەر تێرکردن و تیمارکردنی ئەو ئاژەڵانە داناوە، بە تەنها یەکەم جار منداڵە چەتوونەکانی فێر کرد. بەزەییان بە ئاژەڵەکاندا بێتەوەو ئازاریان نەدەن، منداڵان لە نەزانی وساویلکەیی خۆیان، تەنەکە و قتوویان بەکلی سەگ و تانجییەکانەوە دەخست، بە ناو شاردا ڕاویان دەنان بەستەزمانانە لەترسی گیانی خۆیان ئەوەندە ڕایان دەکرد، لەترسی تەقەتەق یان ڕیخەڵۆیان دەپساند یان کلکیان. کاك محەمەد بە سەبر و سەلیقەی مرۆڤانەی خۆی بە پارە وای لەمنداڵ و خەڵکی شار کرد نەك بەزەییان بە خەڵکی لێقەوماو و ئاژەڵەکاندا بێتەوە، بەڵکوو چارەسەریان بکەن زۆر جار وا ڕووی داوە ئاژەڵەکان لە تاو ئازاری برینەکانی لەشیان پڕیان بەدەستی کاك محەمەد دادەکرد. ئەوەندەی بەزەیی پێدا دەهاتنەوە چێژی لەو ئازارانەش دەدیت. تۆڵەی خۆتان بکەنەوە، شەو و نیوەشەو منداڵان لەدەرگای ماڵی کاك محەمەدیان دەدا، مامە تازە چەند

ئەسپێکی بریندار ڕوویان لەشار کردووە، بەبێ یەکو دوو لەخەو بایە لەسەر نانخواردن بەبێ سێ و دوو دەستی دەدایە دەرمان و بەدوای منداڵان دەکەوت. تەماشایەکی کاتژمێرەکەی دەستی دەکرد، ئەگەر کاك محەمەد نەبوایە زەمەن و کات دەوەستا، چونکە تاکە کەس بوو باشترین وەستا و کڕیار و فرۆشیاری کاتژمێربوو، چەند باخەڵی چۆغە و شەرواڵ و کراسی هەیە هەر یەکە و کاتژمێرێکی نرتونوێ تێدابوو، زۆر جار ئاژەڵە بریندارەکانی بە کاتژمێر دەکڕینەوەو تیماری دەکردن و بەرەڵای دەکرد، بڕۆن دوورکەونەوە ئازادن! لە دڵی خۆیدا دەیزانی لەگەڵ هاتنی ئاژەڵی نوێی بریندار بۆ شار دووبارە. لەلادێیەکان تاوانێکی گەورە ڕووی داوە. هەر ئاژەڵێك لە گیانەڵادا بوایە. یان سکی پڕبا و بەچکەی بووبوایە، بەرامبەری فرمێسکی هەڵدەڕشتن. سکیانی دەشێلا، بەر گەردن و لامل و هەتا برینە بەکێم و زلزڵەکانی دەخوراندن و پاکی دەکردنەوە، هەردەمێک ئاژەڵێکی ئاوس بەچکەی دەبوو، بە چەپڵەلێدانەوە ستایشی دایکەکەی دەکرد، ئافەرین بەڕاستی دایکێکی میهرەبانی. هەر ڕۆژێك کوردستان ڕزگاری بوو، هەقە کاك محەمەد و نموونەی ئەو کەسانە هەیکەلێکی باڵابەرز بە قەد چنارێك لەبەر دەرگای باخی گشتی دایەرە، یان لە فوولکەی قەڵادزێ بۆ دروست بکرێت. ئەگەر ئەمن پەیکەرتاش دەبووم، پەیکەرێکی وەهام دەتاشی لایەقی ئەو کەسە لەخۆبردو فریشتەیە بێت. هەیکەلەش پێك دەهات لە کۆمەڵێك ئاژەڵ و پەلەوەر لەگەڵ چەند کەسێکی لێقەوماو لە ئامێز و دەوروبەری کاك محەمەدی باوکی بێدەرەتانان هەست بە ئارامی بکەن. حەیفە! بە ڕاستی زوڵمە ناوی کاك محەمەدی مەلاعومەر لەسەر پەڕەی گوڵ بە ئاوی زێڕ تۆمار نەکرێت، نەبێتە پێشەنگ و سومبولی بەزەیی و وەفا. هەتا ئەوەی داهاتوو لەوەوە فێری مانای پیرۆزییەکانی ژیان بین.

درەنگی شەو تەوارلەگەڵ زرمەیەکی گەورە، پاشان دەستڕێژ لە خەو ڕاپەڕی کارەبا کوژابووەوە. لەژێر تیشکی چرا کزەکە تەوار ڕەنگی زۆر بزڕکابوو، بە دوو چاوی بروژاو بەدوای بەختیاردا دەگەڕا. بەختیار چوو بەلایەوەو تەوار گیان برسیتە، تەوار هیچی نەگوت تەماشای دکتۆری دەکرد.. پاش کەمێك دووبارە لەخەو ڕاچۆوە. دکتۆر ڕووی لە بەختیار کرد، کاك بەختیار لەبەر چارەسەری تەوار، دەبێت لە قەڵادزێ بیت، بۆ ئەوەی ڕۆژانە دەستم بیگاتێ. باشە کاك دکتۆر

جار جار دەڕۆم دەگەڕێمەوە هەردەمێك ئەتۆ ڕێگام بدەی.. بەڵام كاك دكتۆر داواكاری دووەمت نەگوت چی بوو؟

دكتۆر بەبێ بیركردنەوە، ئا ڕاست دەكەی، مەسەلەی كاك محەمەد و كارە جوانەكانی هەموو شتێكیان لە بیربردمەوە، لە نزیكەوە دەیناسم و هاوڕێیەتیمان زۆر خۆشە، زۆرجار دەرمانی بۆ ڕەوانە دەكەم، زۆر منەتبارە، بەڵام ئەویش بە تە نیا فریای ئەو هەموو پەلەوەرە بریندارە ناكەوێت. مەرجی دووەم باسی بكەم ئەگەر بمگەیەنییە ناو پێشمەرگان؟ بۆچی، كاك دكتۆر بەتەمای چیت؟ دەبمە پێشمەرگە، بەختیار بە پێكەنینەوە. بەمەرجێك پاش چارەسەركردنی تەوار. دكتۆر سەری ڕازی بوونی هەژاند.

بەیانی لەسەر قسەی دكتۆر. كاك فەرەج لەگەڵ چەند كەسێك كەوتنە چارەسەكردنی ئاژەڵ و پەلەوەری بریندار ی ناو شار و دەرەوەی، لەلایەن خەڵكەوە یارمەتی دەدران، چەند جار تووشی كاك محەمەد دەبوون. لەگەڵ چەند مندالی خۆی و گەڕەك، بەجلوبەرگی مۆر و سوورەوە، سلاویان لەیەك دەكرد. ببوورە كاك محەمەد هاتووینە سنووری تۆ گەڕەكی شەهیدان. كاك محەمەد دەستی بە باخەڵیدا دەكرد پارەیان بداتێ، وای دەزانی بۆ ئەم كار دەكەن. ماچیانی دەكرد، لەباوەشی دەكردن دووعای بەخێری بۆ دەكردن.. هەتا شالاوی بەدناوی ئەنفال و جینۆساید بێڕەحمانەتردەبوو. لێشاوی میللەت و ئاژەڵ و پەلەوەر قرتر دەكران، پەلەقاژەی مەرگ زیاتر بەرەو شارەكان دەهاتن، لەڕێگا دەكەوتنە بۆسەی جاشەگەل و سوپا. گاڕانی جاشكەكەر زیادیان دەكرد. ئەرك و ماندووبوونی ڕزگاركردن سەختتر دەبوو.. چاوسووركردنەوە و ئازاردان و لێدانی سەرەتا تاقمی یارمەتیدەری لێقەوماوان.. لەلایەن جاش و دەزگا داپڵۆسێنەرەكان. بەكێبڵ و قامچی و حەیزەران دەدران، میللەت كەوتە بەرپەرچدانەوەیان، بە دار و تێلا و بەردبارانیان دەكردن.. كیمیاباران كردن و كاولكردنی هەڵەبجە و ئەنفال و پاش نەورۆز لەیادی بیستوچواری چواری حەفتاو چوار.. چەند ڕژێم دەبابەو تانكی دەڕژاندە ناو شار. میللەت زیاتر لێیان بەڕقدا دەچوو. لەهەموو لایەكەوە خۆپیشاندان و ناڕەزایی، ئاگركردنەوە بوو.. چەند جار بۆ دامركانەوەی ڕقی خەڵك بەدەیان ڕێگایان تاقی كردەوە، بەڵام ڕقی میللەت تا دەهات ئەستوورتر دەبوو، خۆی بۆ شتێكی گەورە ئامادە دەكرد.

# گەمارۆ

زۆر بە تێرامان و سەرسامیەوە لەکۆلکەدارە گەورە سووتاوەکەی تەنیشتیەوە ڕادەما، داخی گرانم! شێوەی هەموو تارماییەک دەدات تەنها ئەو دیمەن و وێنەیەی چەند ڕۆژێك لەمەوبەر نەبێت، ئەوکاتی کۆلکەدار جۆرێکی دیکە بوو. شۆڕەبیەکی گەورەی سەوزی تەڕبوو.. بەچواردەوری خۆیدا لقوپۆپ و گەڵای وردوردی باریکی سەوزی درێژ، هەتا سەر زەوی شۆڕ بووبونەوە دیمەنێکی زۆر دڵڕفێنی بەوناوە دابوو! شۆڕەبی بۆخۆی شۆڕەبی بوو. وەکوو خانمێکی نازدار بەسەر سینگی کانیاوێکی سازگارە و بەدەم شنەی باوە لەنجەی دەکرد.. دەبووە هۆی سەرنجڕاکێشانی ڕێبواران و بنارنشین و کاروانچییان، نەک هەر ئەوەندە جێگای مشتومری مەردووم، زۆر جار پێشمەرگەکان لەنێوان خۆیان و لەگەڵ میوانان گرەویان کردووە، بزانن چەند قۆڵ دەبێت. چوار کەسی قۆڵ و باسکدرێژ دەستی یەکتریان دەگرت، بەدەوری شۆڕەبیدا دەسووڕانەوە دەستیان نەدەگەیشتە یەکتری، کەسی پێنجەم بابێ. شۆڕەبی ناوەکەی کۆڵدرابوو چەندکەس بە ئاسانی لەناویدا دادەنیشتن. خۆ ئەگەر بە پەرشوبڵاوی نەبا، جێگای چوارکەس بۆ خەوتن دەبووەوە کۆلکەدار یان شۆڕەبی چەندان ئەوەی بنار و چیای کۆسرەتی بەڕێکردبوو، کەچی ئەوەتا بۆخۆی دوا ساتەکانی کرداری ڕۆشنە پێك هاتن دەکات. لانەو جێی حەسانەوەو حەشارگەی پێشمەرگەو کاروان چی و، زۆرجار ئاژەڵ و پەلەوەری کێوی لێقەوماو بوو. هەرکەس بە دەوری خۆی. ئاژەڵ بیزانیبایە پێشمەرگەی لەناو دایە دووردەکەوتەوە.. پێشمەرگە هەستی کردبا کاروانچی لەوناوە بەدوای شوێنێکی کەدا دەگەڕا.. زۆر جار شوان وکاروانچی. لە کلۆرەدار شتیان دەشاردەوە، فەردە ئارد، کیسە چا، شەکر، خوێ، ساوەر لەهەمووی پێویستر توووتنی بیتووێن بۆندار زەرد وەکوو کارەبا، یان وەکوو شەپۆلەکانی دەریاچە کەمێك پێش خۆرئاوابوون دەگۆڕان چەند تیشکی هەتاو لاوازتر دەبوو، ڕەنگی دەریاچە بەرەو سووری دەچوو، ئەگەر ماوەیەك ژاراوی نەکرابا.

کاروانچی دانەوێڵەی هەرچی لە خۆیان زیاد بایە.. بە خواردنی پێشمەرگە کۆتایی دەهات.. لە ڕۆژانی لێقەومان. پێش چەند ڕۆژێك فڕۆکە جەنگیەکان هاتاریان بەسەر پاتاریەوە نەهێشت! شۆڕەبیش وەکوو هەموو سەوزایی و دارستانی بنار بووە قوربانی ناپاڵم و چەکی کیمیایی وگازی ژاراوی. لەژێر کۆلکەدار شاهۆ بەڕەنگێکی زەردی پەڕیو، دوولێوی کەفکردوو، ئەوەندەی دووری تەوار ئازاری دەدا نیو ئەوەندە بەتەنگ برینەکانیەوە نەبوو. ئاگری چیلکە و پوشوپەڵاش زوو دادەمرکێتەوە، بەڵام سووتانی کۆڵەکە و دارچنار زۆر ئاستەمە لەیاد بکرێن.

شاهۆ لەژێر کۆلکەدار گوێی بۆ تەتەری نامەهێنە شلکردبوو. تەتەر لەبەر گرمەگرم و ناڵەناڵی تۆپیان، کەوا لەنزیکەوە کۆپتەر و فڕۆکە جەنگیەکان ناپاڵمو بۆمبایان دادەباراند. کەمێك دەنگی بەرزکردەوە. کاك شاهۆ نامەیەکم هێناوە لەشار، بەڵام ناتوانم چاوەڕوانی وەڵامی بکەم. دەستی بە باخەڵی چۆخە شڕدا کرد. برادەران لە شار. کاك بەختیار.. شاهۆ تەماشایەکی چواردەوری خۆی کرد. چەند پێشمەرگەیەك دەهاتن و دەچوون. بە کابرای گوت.

- هێواش برام هێواش.. ناوی کەس مەهێنە! تەتەر دوا قومی لە چایە لێڵەساردە بێشەکرەکەیدا، کاك شاهۆ پاش چەند ڕۆژێکی دیکە دەگەڕێمەوە لاتان، ئەوکاتی باسی وەڵامی نامە دەکەین. هەستاو تۆقەی لەگەڵ شاهۆ کرد.. شاهۆ بەدار شەقەکانی هەوڵیدا هەستێتەوە. کابرا دەستی لەشانیدا و ڕۆیشت.

کابرا هێشتا لەناو بارەگابوو لەگەڵ دکتۆر لە مشتومڕدابوون.. شاهۆ کەوتە کردنەوەی نامەکەی. نامە ئەوەندە بەقایمی وەکوو نووشتە سێگۆشە، لەهەموولایەکەوە بە تێپ و سارغی ناوی پێچرابوو. جەند جار هەوڵیدا بە ددانەکانی بیکاتەوە دەست و دەم و ددانەکانی زۆر بێهێز بوون. بانگی کرد.. باجی خانزاد.. هاوڕێ خانزاد. خانزاد هات بەلایەوە. باشە ئەتۆ بۆ ناوی خەڵك ئاشکرادەکەی؟ بەلای خۆت بە زیادی خێرم نەکرد، بەرپرسیشی، ئەدی هاوڕێیان ناویان نەگۆڕیم بە شەوبا.

ئەو ناوەی دیکەم لەخۆڕا لەکوێ بەبیرداهات. نامەکەی بۆڕاداشت. شاهۆ بە پێکەنینەوە، ببورە هاوڕێ شەوباخان، داوای لێبوردن دەکەم، هاوڕێ شەوبای شۆڕشگێڕ، تخوا ئەگەر ئەرک نەبێت، دەتوانی ئەو نامەیەم بۆ بکەیەوە؟

شەویا چەند جار ئەودیو ئەم دیوی پێ کرد، وەکوو مشك سارغییەکانی قرتاند و کردیەوە، بەڵام دەزانی با جێگاکەت بگوازمەوە، ئێرە زۆر بۆنی ناخۆشە. تۆ سەیری قەوزە و پیسی و زەرداوی ناو کانیەکە بکە. لەخواریانەوە کانیاوێکی بچووکی وشك بوو هەبوو، بەئاستەم زەرداوێکی لێخنی لێڵ قەتیز مابوو تێدا پەنگی خواردبووەوە، لەگەڵ شۆڕەبی مێژوویەکی درێژیان هەبوو، زۆر جار شاهۆ گۆرانی بەسەردا گوتووە. (کانیەکی روونی بەر تریفەی مانگەشەو. جوانترە لە لای من لە دەریای بێسنوور) بەڕاستی هەتا چەند ڕۆژێک لەمەوبەر ئەوکانییە وەکوو چاوی قرژاڵەکانی ناوی ڕوون و سازگاربوو، هەر لەسەر ئەو کانیە یەکەم نیگای پاکژی خۆشەویستیان لەگەڵ یەکتر گۆڕییەوە، دەستپێشخەریەکەش لەلایەن شەویاوە بوو، زۆر بە تێڕادیویانە ماوەیەک لە چاوە گەورە قاوەییەکانی شاهۆی شەرمن و شپرزە ڕاما، پاشان بە دەنگێکی پڕ لە لاواندنەوە و هەستی خۆشەویستی کە چەند ساڵێک بوو هاوسەرگیریەکی نا ئارەزوومەندانەی کردبوو، بێبەش بوو لێی دەیزانی چۆن تیف تیفەی هەوەسی نێرینە دەدات، گوتی دەزانی کاک شاهۆ گەنجێکی زۆر قۆز و کەشخەی.. شاهۆ ئەوەندەی دیکە پەشۆکا و وای زانی گاڵتەی پێدە دەکات، بەڵام کاتێک دەستی گرت و بە سوزو نازێکەوە پێی گوت، ئەوە چۆنە هەتا ئێستا ژنت نەهێناوە، شاهۆ هەر ئەوەندەی توانی بڵێت، هەتا ئێستا کەسێکی وا ڕێک نەکەوتووە، لەدڵی خۆیدا دەیگوت، ئاشقی ئەو چۆڵ و دەشت و چیایانەم، کاتم نەبووە بیر لە خۆشەویستی هیچ ئافرەتێك بکەمەوە. باشە ئەگەر ڕێککەوت. بە دارەدارە دوو هەنگاو چووە پێش، هەستی بە هیلاکیەکی بێوێنە کرد. هەر وەکوو گوتم (نازانم، هەتا ئێستا ڕێکنەکوتووە!) شەویا دووبارەی کردەوە، (بەڵام ئەگەر کەسێک لەبەر دەمت بوو بە ئاشکرا تۆی خۆشویست، چی دەڵێی؟) ئەگەر لەبەر دووری تەوار و بزربوونی شەپول و برینی تازە قەتماغەو زامی قووڵی هاوڕێ شەهیدەکانم نەبوایە، گوایە خوشەویستی و هاوسەرگیری خراپی لە چیدایە، بەڵام هەر وەکوو باسم کرد، ئەو شتانە و دەیان بەربەست و ئاستەنگی لەسەر ڕێمدان، بۆیە لەو کاتە نە گونجاوەی داوای لێبووردن دەکەم، وەنەبێت کەسێکی لەتۆ ناسکتر و ژیرتر لە مێشك و بیرمدا بێتە هەتا بە خەیاڵیش نییە، کەواتە سۆز و هەستەکانمان دەپارێزین بۆ ڕۆژانی داهاتوو، پاشان بۆنگرنەت لە کە سێکی زامداری بێهێزی کەمنەندامی بیماری وەکوو من داوە، دەیان نەخۆشی ناوکی و دەروونیم هەیە، لەچەقەلی ڕەویەوە بە

سەرگورگیدا دەکەوێ. پیاو هەر هەموو یەك جۆر و بابەتین، پاشان ژیانت لەگەڵ من هەر چەرمەسەری و هەڵات هەڵات دەبێت، برۆ بۆ خۆت گەنجێکی ڕێکوپێکی بێکێشە دەستنیشان بکە ژیان و دوا ڕۆژت بەختەوەر بکات. شەوبا بێدەنگ بوو، ئەگەرچی قسەکانی بێهومێدییەکی لە خوشەویستییەکەیان تێدابوو، بەڵام زیاتر بۆ فەرامۆشکردنی ئازارە زۆرو زەبەندە و لەسەر یەك کەلەکەبووەکانی بوو، هیچ وەسەرخۆی نەهێنا، جگە لەوەی کەمێك ڕووخساری سوور هەڵگەڕا (لەخوارتر جێگام بۆت ڕاخستووە؛ بگوازەوە ئەوێ سەلامەت تریشە بن نسار و بن ئەشکەوتە) دوودار شەقەکەی بۆ بەرزکردەوە، بە پارێزەوە چووە بن باڵی ڕاستی، باسکی بەسەر شان و مل و قولەنەرم و ناسکەکانیدا شۆڕبوونەوە، بە پەنجە شووشە و ناسکەکانی، قامکەزەرد و لاوازەکانی شاهۆی گوشین. شاهۆ لەگەڵ ئەو هەموو ئازار و لاوازیەش هەستی بە گەرمیی لەشی شەوبا کرد. دڵی زۆر خێراتر لێی دەدا و وای دەزانی لەناو قەفەسەی سینگی خۆی ناگرێت. بەو چەند چرکەیە بۆ شتەکان هەر هەموویان خڕ گۆڕان، ئارەقە ناوچاوان و لاڕوومەتەکانی داگرت، هەرچەند شان و مل و سنگی نەرم و مەمکی قووتی بێ سووخمە، لە لا پەراسوو لا دڵی دەخشا تەپەتەپی لێدانی دڵی زیاتر هەستی پێدەکرا، چما جەستەی ئافرەت لە ژێر جلکوبەرگیشەوە، ئاواهی کووانوویەکە و گڕ لە جەرگ و دڵی پیاو بەردەدات. ئەوەتا ژنێکی تەڕ و تازە، تەڕتر لە باران و سپی تر لە بەفر لەژێر باڵی وەکوو کارمامزێکی دەستەمۆ وابوو.. هێواش هێواش، تەوژمی هەوەس و ڕامووسان و شەهوەت جێگای ئێش و ئازارەکانی دەگرتەوە، شەوبا بەدوو چاوی ڕەشی گەورە لاڕوومەتی خڕپنی ئاسك. دوو لێوی تەنکی بەبێ سووراو، سوورسوور وەکوو بەلاڵوك و گۆیژ، بەژن و بالای بەرز، ناو قەد باریك چی وا لە شاهۆ کورتر نەبوو، سەر ڕوومەت و سەرلێوی بەردەوام تەنکە ئارەقەیەکی دەکرد. ئەو دڵۆپە ئاوانە، ئەوەندەی دیکە ڕووخساریان سەرنجڕاکێشتر کردبوو.. ئەویش کەمێك شڵەژابوو زۆر جار تەسمیلی تەلیسمی چاوە قاوەیەکانی شاهۆ دەبوو، بەبێ ویستی خۆی ڕایدەکێشا بەرەو لای خۆی. وەرە باوەشم هەست بە ئارامی و چێژ و خۆشەویستی بکە، هەر چەندە هەتا ئێستا هیچ ئافرەتێکم لە باوەش نەکردووە و بۆنی عەتری لاجانگ و سینە و بەرۆکی نەکردووە، با تۆ یەکەم کەس و یەکەم ئەزموون و دواکەس بێت. دەردی دڵی شەوبا زۆر لە هی شاهۆ قورستر بوو، چونکە چێژ و لەزەتی جەستە لەیەك

خشان و ڕامووسان له لای شەوبا گەرمایی چەندەها شەوانی زستانی سارد و سۆڵی گەرم کردبووەوە و مووچڕکە درێژەکانی هەموو ماسوولکەکانی لەشی گرژ کردوونەتەوە، پاشان خاوبوونەتەوە، هێشتا هەستە دەمارەکانی نافۆکی تەواو شل نەبوونەتەوە دووبارە چێژێکی توونده هورژمی بۆ هێناوەتەوە، شاهۆ هەتا ئەو ڕۆژە زۆر دەگمەن دەستی بەبەر دەستی ئافرەت کەوتبوو.. قەت خۆشەویستی نەکردبوو، بۆیە کەمتر هەستی بە خۆشاوی جووت بوون دەکرد، هەستێکی زۆر نامۆی بەرامبەر شەوبا هەبوو.. شەوبا سەردەمی لەگەڵ زراربوو، وەکوو شتێکی پیرۆز سەیری دەکرد، ئێستاش هەروایە، بەڵام جار جارە هەست بە نیگاتیژەکانی شەوبا دەکات، کەنار دەریا و جەستەی ناسکی نیوەرووتی کەفەل و سمتە ساف و بێغەوشەکەی، هەموو دەمێك بەبەر چاویدا گوزەردەکەن. جەستەی گڕکانێکە و ئاگر لە هەموو ئەندامەکانی لە شی بەردەدات، چ بوونێکە، هیچ میسك و گوڵا و عەتر و گیابەندێك، ئەوەندەی بۆنی شەوبا، کاریگەرنین. خۆی لە مژۆڵە جەرگبڕەکانی شەوبا ڕزگار کرد.. وازم لێ بێنە بۆ خۆم دەتوانم بڕۆم. دەیزانی ساتە وەختێک بوو. چەند چرکەیەکی پێچووبا هەموو سنورێك دەبەزێندرا، لە شەوبا وایە شاهۆ بەتەمای نەبێت، بەڕاستی سەرم لەو لاوە خوێنگەرمە دەرناچێت، لەبەر خۆشەویستی نیشتیمان هەموو شتێکی وەلاناوە. هەرچەندە زۆر لەدەمی خۆی بیستووە، خۆشەویستی وڵات و ئەڤینی ئافرەت پەیوەندیەکی ڕۆحی لێکدانەبڕاویان بەیەکەوە هەیە، ئەدی کوا ئەو هەستە بۆ دڵی خۆی بۆ واڵا ناکات و لەباوەشی ناگرێت، دەبوو دەمێک بوایە، خەونەکانی شاهۆ وەکوو هەر نێرینەیەک بگۆڕابان بەرەو ئاوێتەبوونی دوو جەستە، بیری لە خۆی دەکردەوە، بێوەژنێکی لادێیی نەخوێندەوار خاوەنی کۆنەمێردی کەسێکی وانەگریس، ڕابردوو ئەتواری وا دزێو، کەنگێ لایەقی شاهۆ یەکی کەسێکی شارستانی خوێندەواری بەرز، قەد باوەڕناکا پێی ڕازی بێت. شەوبا ماوەیەك دە شاهۆیەوە ڕاما، بە دارە دارە خۆی گەیاندە لای ئەشکەوت.. ئەوەی لە تۆ لەو هاوسەرگیریە، ئەگەر ڕێککەوت چاوەڕوانی دەکەم، تەنها دایکێکی باش و بە وەفا و میهرەبان بێت بۆ تەوار. شەوبا لێی نزیك بووە، بە بێنەوەش تەوار هەموو شتێکی منە، شەو و ڕۆژ لە بیر و مێشکمدایە و سات بە سات زیاتر بیری دەکەم، دەستی کردە گریان، ئاخ تەوارە خێر لە خۆ نەدیوەکەم داخوا ئێستا نەخۆش نەبی ئازارت نەبێت، بە دەم هەنیسکدانەوە باوەشی بە شاهۆدا کردەوە، ئەوڕۆ زیاد لە هەموو ڕۆژان بۆ

تەوار دەسووتێم، دلم ئۆقرە ناگرێت، هەستدەکەم زۆر پێوستی بە ناز و سۆزی منە، لە کوێی کچەکەزییە مەرەزەکەم، چاوەکانم بە تاسەی دوو چاوە شینەکانتە، شاهۆش دڵی پربوو، دەگەڕێتەوە، هەر ئەوڕۆ دێتەوە، لە وەی زیاتر بەرگەی دووری ناگرم. چەند جارێك سەر و ناوچاوانی شەوبای ماچکرد، ئەویش لا ڕوومەت و گەردەنی تووکاوی دەلێستەوە، چەند لێوەکانیان لە سەر لێوی یەکتری بۆ چەند چرکەیەك ئۆقرەی دەگرت. بزانە لەو نامەیە چی لە سەر تەوار نەنووسراوە. نامەکەی کردەوە بۆ خوێندنەوە. خشپە خشپێك گیا سووتاوەکەی دەشێلا. وەکو کەروێشك پێیەکانی بەهەستیاری لەسەر زەوی دادەنا، دکتۆر هات بەلایەوە.

کاك شاهۆ ئێستا چۆنی؟

زۆر باشم! دکتۆر بە شاهۆی گوت. دەزانی ئەو دەرمانانەی لە شارەوە هاتوون، هەر هەمووی دانە دانەن بەنجی سەفەری، لەهەرچی شتی برینپێچان.. کوا کراسەکەت هەڵدەوە با تەماشایەکی برینەکانت بکەم؟ دکتۆرگیان ئەگەر دەکرێت پاش کەمێکی دیکە. نابێ وەختیەتی شاهۆ تەماشایەکی شەوبای کرد، هێشتاکەش تام و هەوەسی ماچەکان بە سەر سامی و بێگانییەوە بەرامبەریان وێستاندبووی.. دکتۆر گوتی دەتوانێت لێرە بێت، یارمەتیمان بدات، لۆکە و لە فاف و دوو شووشەی ڕەنگقاوەیی دایە دەستی شەوبا، ها یاریدەرە زیرەکەکەم، کەی داوای شتێکم کرد بیدە دەستم، خۆ لە برین و خوێن ناترسی، ڕاستی زۆر، بەڵام کەسێکم خۆش بوێت، هەست بە ئازاری برینەکانی دەکەم، بەزەییم پێدادێتەوە، دکتۆر دەست بەکار بوو کەوتە کردنەوەی لەفافەکان و لۆکە فڕێدان، هەر هەمووی بە خوێن و دەرمان بوون، دەمی برینە قووڵەکان وەکوو شەوێلاگی مار کرابوونەوە، خوێنیان لێدەچوڕایەوە، شەوبا چاوی خۆی گرت و کەرەستەکانی لەسەر زەوی دانان و بە بێدەنگی دوورکەوتەوە، دکتۆر بە پێکەنینەوە بزانە ئافرەت هەر ئافرەتە لە هەرشوێنێك بێت، پێشمەرگە بێت، سەرباز بێت، لەبەرەکانی جەنگ، یاخود لە باخچەی ساوایان سەرپەرشتی کاری منداڵان بێت، سۆز و بە زەیی مرۆیی بە تەواوی بە سەریدا زاڵە و قەت بەها مرۆڤایەتییەکان بە کەم سەیر ناکات. کەوتە پاککردنەوەی برینەکان قەتماخەیان کردبوو.. دکتۆر نا، نا باشە برینەکان کاریگەر نین. دوو فیشەکیان سەرچیغ گۆشت و پێستی سکتیان بڕیوە. فیشەکەکەی سێهەم بەبەر هیچ ئەندامێکت لەناو سك نەکەوتووە.

بەند ڕۆژێکی دیکەیە بەیەك جاری چاك دەبیەوە. شاهۆ زۆرباشە، لەخوای
هویست دکتۆر لە کۆڵی بێتەوە. دکتۆر برینەکانی دەرمانکرد و پێچایەوە و
ۆیشت. کاتێك شاهۆ بە تەنیا مایەوە بە تامەزرۆییەوە کەوتە خوێندنەوەی نامەکە
نووسرابو هاوڕێیانی ئازیز پێشمەرگە قارەمانەکان، هاوڕێ شاهۆی زێدە لەبەر
لان! سلاوێکی گەرمی پڕ خۆشەویستی. برام کاك شاهۆ. دەزانم حەز دەکەی
مستپێکی نامەکە بە دروشمی نیشتمانێکی ئازادو گەلێکی بەختیار دەست پێ
کەم، چونکە لە هەموو نامە و نووسینەکانت دەنووسرێت، بەڵکوو وێردی سەر
ار و زبانتانە و وا ڕاهاتوون، یان وایان ڕاهێناون، بۆ بە دیهێنانی ئامانجەکانی
ووێنی خۆتان فیدا دەکەن، دیارە کارێکی مرۆڤانەی گەورەیە، بەلام هەرچەندی
ەماشا دەکەم، نیشتیمان نەک ئازاد نەکراوە و گەل بەختیار نییە، بەڵکوو هەتا
ەر ئێسقان لە خوێن وەردراوە. بەرحاڵ بەگەرمی ئەولا و ئەولات ماچدەکەم..
سلاو و ڕێزم بۆگشت برادەران، هیوام ساخی و سەلامەتیتانە، هەموو کەس
ارەزوو دەکات بگاتەلاتان وجێگاتان لەگەڵ بگۆڕێتەوە. دەزانم حەز بە درێژدادری
اکەی، بەلام بۆ خوت دەزانی ڕۆژنامەوان کاریان شت گەورەکردن و
درێژکردنەوە و تیف تفەدانی بچووکترین و بێبایەخترین هەواڵی سواوی ڕۆژانەیە،
، کوردییەکەی "مێشێک دەکەن بە گامێشێک، جا بۆیە کە نامەکەم چەند پەڕێك
، ڕۆژنامە ڕوو زەردەکانی ئەو ڕوژگارە پتر بوو، پێشوەخت داوای لێبووردن
ەکەم، دووەم شت بۆ خۆم ناوم بە ختیارە و بە هیچ شێوەیەك هەست بە
ەختەوەریی ناکەم، لەوانەیە بڵێیت، کاکم لە شار لەوپەڕی خۆشیدا دەژیت و
سی نا کامەرانی و نابەختەوەری دەکات، ڕاستە ژیانی تایبەتی خۆم، ئۆتۆمبێل،
انوو، بروانامەی بەرز و ژیان و گوزەرانم مسوگەرە، بەلام خۆ من تەنها و تاك
ڵ لەو ولات و خاك و هەسارەیە نازیم، با خۆپەرست نەبین، ئەگەر تەواوی
ەسوکار و دەرودراوسێ و میللەت لە زەلیلی و نەداری و کلۆڵیدا بژین، مالی
نیا بۆ من و تامی ژیان دەبێت چی بێت؟ لێرە لەو زیندانە گەورەیە کە ناوی
انی شارە و لە ناو جەرگەی شارستانیەتی مەملەکەتی ناوەژووکراو، کە سێك
یە متمانەی پێ بکەی و دەردی دڵی خۆتی بۆ هەڵڕێژی، هەتا لە کەسە
ێکەکانی خۆشت، چەند کەس لە سەر خەون گیراون پاشان لە سێدارە دراون،
یە بە دەرفەتی دەزانم بۆ خاڵی کردنەوەی دەروونی هەڵچوو و شێواوم،
پکردنەوەی پەستیم، وشە مەترسیدارەکانم بەرەو چیا و شوێنی پاراستنی

نهێنیە گەورەکان بنێرم، زۆرجار لە هەژموونی کاریگەری ڕووداوەکان شەو هەتا بەیانی خەریکی نووسینم، شەبەق پێش ئەوەی چاوییان بە ڕووناکی هەڵبێت، هەموو لاپەڕەکان دەسووتێنم، هەتا نەبنە مایەی سەرهێشە بۆ خۆم و بۆ کە سی تر، کە نیمە، بڕیارمداوە نووسینەکانم ڕەوانەی شاخ بکەم بۆ دەستی تۆ بەڵکوو بتوانی بیان پارێزی، یان چەند ڕوژێك لە شار نیشوکارەکانی خۆم و حیزب و تەوار ڕادەپەڕێنم دێم بۆ لاتان، دەزانم زۆر تامەزرۆی بیستنی هەواڵی تەواری، ئەو ماوەی لێت دوور کەوتوومتەوە چەند پەرێشانی بۆی. لەگەڵ خوێندنەوەی ناوی تەوار چاوەکانی پڕبوون لە ئاو. نامەکەی لەدەست بەربووەوە، بەتووندی ناوچاوانی خۆی گرت، قووڵپی گریان ئەوکی گرتبوو، سەلکە سەگ بوو بە هەواڵی باری تەندروستی و گوزەرانی تەوار دەستت پێ نەکرد، ئەو خورشید و خاوەرە چییە بۆمی دەنووسی، ڕۆژنامەنووسی، وتارنووسی چ پەیوەندی بەمنەوە هەیە، وەرە سەرباسی تەوار. دووبارە نامەکەی هەڵگرتەوە کەوتەوە خوێندنەوەی. بەتاسەی دیتنەوەی تەواری. ئەویش ئەوەتا لە تەنیشتم دانیشتووە، بووکێکی تیسکنی قسەکەری لە خۆی گەورەتری لە باوەش کردووە و دەیلاوێنێتەوە، دەڵێت دەستوچاوەکانی مامەشاهۆ ماچ دەکەم. بەخۆشحاڵییەوە تەوار پاش چارەسەر زۆر باشە، تەندرووستی وەکوو گوێزی ساخ وایە. لە لایەن دکتۆری خۆمانەوە بەردەوام لەژێر چاودێری دایە. ئەوەی بە دڵم نییە و دەمسووتێنێت، ئەتۆ بزانە تەمەنی نزیکی دەساڵە زۆر حەزی دەکرد نامەیەکت بۆ بنووسێت، بەڵام داخەکەم خوێندەواری باش نییە.. لەماڵەوە زۆر خۆمی پێوە هیلاك دەکەم، ناویم نووسیوە و دەی نێرمە بەرخوێندن با لەژیان دوانەکەوێت، ڕێگانادەم هیچی لەمنداڵی خوداپێداوەکان کەمتر بێت، جانتای ڕەنگاڕەنگ و قەڵەم و دەفتەر و قەڵەم دادەر و ڕاستە و لاستکی ڕەشکردنەوە و پەندان و جۆرەها ماجیکم بۆ کڕیوە، هەتا توره سەناعە و پرگالیشی هەیە، بۆیە تەیار و ئامادەیە، لەو ڕۆژانە لە قوتابخانەیەکی نزیك خۆمان، کێوەڕەشی سەرەتایی کچان، دەست بە خوێندن دەکات، پاش گەڕان و سووڕان و پرسیارکردن، کەسێک بەناوی نازە نەیدەناسی، بەڵام بەناوی تەوار دەزانی چەند سەرە داوێکم دەست کەوتووە، تەوار خەڵکی شارە، گوایە خوشکێکی هەیە بە ناوی تەلار، نازانم لەکوێ دەژیت. بەسەرهاتێکی زۆر گەورەی لەدوای خۆی و خانەوادەکەیاندا هەیە، گوایە داکو بابی هەڵەبجەیین پێشی دەساڵ ماڵیان هاتوونەتە قەڵادزێ، بابی مامۆستا بووە، بەتەواوی دڵنیا نیم،

زۆر ناتوانم بە ئاشكرا پێداچوون بکەم، یەکەم لەبەر دڵی تەوار با بۆ ماوەیەک ئەو کارەساتەی بەسەری هاتووە کۆن ببێت، هەتا هەندێک گەورەتر و هەراشتر دەبێت، ئەو کات کامڵتر دەبێت و ساناتر لە ڕووداوەکان دەگات، چونکە ئێستا بەشێک لە چارەسەرەکەی پەیوەندی بە باری دەروونییەوە هەیە، چەند کەمتر غەمبار و مەلوولتر بێت، ئەوەندە زووتر چاک دەبێتەوە، دووەمیش ئەگەر زۆر خەڵک بیناسێت، دەترسم ئاشکرا ببێت و بەڵایەکی بەسەر بێت، بەڵام لە نامەی داهاتوو بەتەواوی بۆت دەنووسم، هەتا ئەوکاتە لەوانەیە تەوار بەیەك جاری لەلای خۆم بمێنێتەوە. تا دواڕۆژێ ڕووناك بێت و پارێزراو بێت. لەو شاخ و کێوە چی بکات؟ ئەوەتا ئێوە بۆ خۆتان جێگاتان لەق بووە و ژیانتان کوڵەمەرگییە. هەردەمێك حەزت کرد دەتوانی بێی بۆشار سەردانی بکەی. بە مەرجێک ژیانی خۆت و هاوڕێیەکانت نەکەوێتە مەترسییەوە، دەربارەی داودەرمان غەمتان نەبێت، ئەوەی بۆمان ناردن زۆر زیاترمان هەیە، لەدەرفەتێکی کە بۆتانی ڕەوانەدەکەین..
ماوەتەوە پرسیارەکەت دەربارەی ڕەنگدانەوەی شاڵاوی ئەنفال لەناو شار؟ ڕۆژانە خەڵکی شار بە غەم و پە ژارەیەکی زۆرەوە، نەك هەواڵی قڕکردن و جینۆسایدی گەلەکەیان دە بیستن، بەڵکو لەگەڵ ڕووداوەکان دەژین، ئەوەی من تێیدەگەم، کورد زۆر دەمێکە تەنها بە جەستە و لەش ئەنفال نەکراوە، لەبیر و هزر و ڕوحیدا بەبێنەوەی هەست بکات، یان هەستی خۆی مراندووە، بەبێویستی خۆی بۆشی هەیە بە ئارەزووی خۆی شمشێربازی چاخەکانی ڕابردوو، تووی بازی بە توخم و نەژادی خۆی چەکەرەی کردبێت. دەترسم زەبروزەنگ وا لە میللەت بکات دەستەمۆ ببێت و بەنارەزووی خۆی لەگەڵ ئەنفال بژیت. هەمووشی دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕینی پەیامەکەی، خاوەنی پەیامێك بوو تژی جوانی و لێبووردەی، ئامۆژگاری گاتانە پیرۆزەکانی پەیامنێر، گۆڕینی پەیامی ئاشتیخوازانەی پڕ لە بەها مرۆییەکان، بەردەوام دووشت بەراورد دەکەم، پەیامێکیان ناسراوە بە درێژایی مێژووی کۆن، ئەگەر کەسێک دڵگران و دڵمەند بوو لێت، شەقازللەیەکی لەلای چەپتدا بۆ دامرکاندنەوەی ڕق و قینی هەڵچووی، لای ڕاستی بۆ بەرە پێش و بەلێدانی ئەولایەش هەست بە شەرمەزاری دەکات، ئەوەیە بە خشندەی و دڵفراوانی، بە پەیامێکی ئاگراوی هەر کەسێک گوڵەگەنمێکی خواردی خەرمانێکی لێ بسووتێنە و خوێنی بکە کاسەوە و وەکوو ئاوی زەمزەم فڕی بکە، زۆر دەترسم، ئەوەی داهاتوو هەست بەزامی قووڵی ئەنفال کراوان نەکات و

ئەنفالچیان نەناسێت؟ دەزانم بۆچوونێکی زۆر ڕەشبین و بێدەسەڵاتانەیە، بەڵام ئەو بەدبینییە پشت بە دیرۆك و ئەو ژیانە تاڵەی ئەو سەردەمە دەبەستێت.. کورد دەستە، دەستە زیندە بەچاڵ دەکرێن، دەڵێن میللەت زۆر تووڕەیە بەدوای تۆڵەدا دەگەڕێت، ئاوا بڕوات لەماوەیەکی کەمدا تووڕەیی جەماوەر بەسەر زۆرداراندا دەڕژێت و ڕادەپەڕێت. ئەو پەرچەکردارە هەر هەموومان نەک لە چاوەڕوانیداین، بەڵکوو شەووڕۆژ کاری لەسەر دەکەین، بەڵام من هەست بەو تووڕەبوونە ناکەم، لەلایەک قەڵاچۆکردن و ڕەشەکوژی بەردەوامە، لەلایەکی دیکە شایی و لۆغانی سەرکەوتنە، هیوادارم ئەمن لە بۆچوونەکانم هەڵە بم. دووبارە غەمی تەوارت نەبێت لە چاوی خۆمان زیاتر پارێزراوە. برای دڵسۆزتان. ب. ا. ق. کاتێك شاهۆ نامەکەی خوێندەوە باوەڕی بە چاوەکانی خۆی نەکرد. چاوەکانم ڕێشکە و پێشکە دەکەن، بەڕاستی پێویستم بە چاویلکەیە، یان وشەکان گاڵتەم لەگەڵدا دەکەن، چەند جار نامەکەی ئەودیو ئەودیو پێکرد، شخارتەیەکی لە باخەڵی دەرهێنا، لەژێر کاغەزە گەچڵاوەکەی ڕاگرت، بۆ سووتاندن نەبێت، کەڵکی هیچی دیکەی پێوەنییە، نامەنووسین ئاوا دەبێت، ئەو نامەیە زیاتر بۆ دەهریکردنی نووسراوە، نەک بۆ ئەهوەنکردنەوە و ڕوونکردنەوە و وەڵامی پرسیارە و داواکارییەکانی، ئاگری دەنکەشخارتەکە گەیشتبووە ناوپەنجەکانی، چزەی لە پێست و گۆشتی هەستاند، لە حەژمەتان هەستی پێ نەدەکرد، ئەو نامە ناوازەیە وەکوو ئەوەی مستەکۆڵەیەک یان گورزێکی قوڕس بێت و بە تەوێڵیدا کێشا بێت. تاس بردیەوە، مەبەستی لەو هەموو ڕاوەڕێوی و هێنان و بردنە چییە؟ بۆ یەکەمجار هەستی نەک بە ساویلکەیی خۆی کرد، بەڵکوو بە گەوج و گەمژە خۆی دەهاتە بەرچاو، بزانە چەند بە دەبەنگم، بەپێی خۆم، بە بڕیاری تاک لایەنی خۆم، هەموو شتێک خۆم، خۆم بە خۆمم کرد، ناخۆم بە تەوارم کرد، بەناو ئاو و ئاگردا، ڕووحی خۆم و تەوار و چەندین هاوڕێم خستە مەترسییەوە، بۆ ئەوەی سووک و ئاسان، تەوار بدەمە دەستی کەسێکی لەبلەبان و زمان و قەڵەملووس، بزانە چۆن بە ئارەزووی خۆی گەمە بە وشە و مێشکی مرۆڤ دەکات، ئاخ بەختیار! داخوا تەوار ئێستا لەو سەفەرەی بە زۆر پێی کرا چەند غەمبار و پەشیمان بێت، هەر ئەوەندەشی لە دەست دێت، خۆی بخواتەوە و زامەکانی قووڵتر بێت، مام کۆسرەت بەو هەموو ئەزموونەی لەژیان هەیبوو، چەند ڕێگای لەپێشم و لەگەڵم بەکارهێنا، بەڵام پێداگری نەکرد، کەچی بەختیارێک هەر بە خورتی فڕاندی، مام کۆسرەت یادی

بەخێر، کەسێکی دڵسۆزی ساکاری دڵ و دەروونخاکی و کوێستانی بوو، خەڵکی شار بەگشتی و بەخە بەتایبەتی، شەیتانی بەلاڕێدا دەبەن، هەر هەمووی تاوانی خۆمە، با لەناو نانێکی گەرم بۆت بمێنێت، بەخەی نەگریس. کەوتە وڕێنەکردن، تێناگەم، کەسێک هەیە لەو نامەیە تێم گەینیت،، دووبارە کەوتەوە خوێندنەوەی، کەوتە بۆڵەبۆڵ و هاوارکردن.. دەیفەوتێنن، بۆخۆم دەمزانی لەناوی دەبەن. خوێندەواری چی و قوتابخانەی چی! ئەوە وا دەزانێت بۆ ماوەیەك تەوارم ناردوومەتە لای، چارەسەری تەواوی بەپەلەی بکات و بۆم بنێرێتەوە، کەچی باسی، مەکتەب و خوێندنم بۆ دەکات، نەدەبوو بڕوام بە هیچییان کردبا، لەگەڵ خۆم هێنابامەوە.. بە خوا جوانە، مامۆستا سەرباز و شەوبا و دوو پێشمەرگە هاتنەلای.. دەم و لێوی کەفی کردبوو لە تووڕەبوونیان دەلەرزین، ڕەنگی ئەوەندەی دیکە زەردبووبوو، ئەگەر لە ناویان نەبرد ئەمن شاهۆ نەبم.. شەوبا هات، مەتارەیەك ئاوی ساردی بۆ هێنابوو هەندێکی بەدەمیەوە کرد. کەفی دەم و لێووی سڕیەوە، شاهۆگیان چی بووە؟ شاهۆ ڕووی لە مامۆستا سەرباز کرد. هاوڕێ ئەتۆ بۆخۆت مامۆستای وانییە؟ بەڵی مامۆستا بووم، زۆر باشە دەتوانی وانەی کوردی بەمندالآن بڵێی؟ ئەگەر منداڵ هەبن بۆ نا، نەك کوردی هەموو ماددەکان. دەباشە ئەمن و ئەتۆ دەتوانین خوێندەواری فێری تەوار بکەین.. مامۆستا زۆر ئاسانە.. کاتێك گەڕایەوە بە منی بسپێرە، شاهۆ نامەکەی دایە دەست شەوبا، بۆمان بخوێنەوە، بزانە چی نووسراوە، بەپەلە بۆم بخوێنەوە! شەوبا ڕەنگی سوور هەڵگەڕا، ئەوەیە گرێکوێرەی نێوانمان نەك بەردێکە بەڵکو گاشەبەردێك کەرتە چیایەکە لەڕێگای خۆشەویستی تازە و ساوای نێوانمان، ئەگەر دوودڵ جارجار لەپەنهانییەوە بۆ یەکتری لێدەدەن، ئەوەندەی ئاسمان و ڕێسمان لە یەکتریەوە دوورن، ئاخ سەد خۆزگە هەردووکمان کوڕ و کچی لادێ بواین، ئەمان توانیبا ناوی خۆمان بنووسین، یان باشتر بوو هەردووکمان هی شار بواین و هەردووکمان مامۆستا بوونایە، هەتا لەنامە و دەردی دڵی یەکتری تێگەیشتینایە.. وەکوو ئەوەی نامەکە چەند پۆلویەکی سووری ئاگربێت و پەنجە ناسکەکانی هەڵپڕوکاندبێت بەپەلە دایە دەستی مامۆستا سەرباز. بیخوێنەوە فریای نەکەوین دەیفەوتێنن لەناوی دەبەن. مامۆستا نامەکەی لێ وەرگرت، بەوردی کەوتە خوێندنەوەی.. جارجار سەروڕیشی خۆی دەخوراند. ناوچاوانی تێکدەنا، سەری قایل بوون و سەرسامی لەڕەنگ و ڕوویەوە دیاربوو. دێر بە دێر

بەسەلیقە و سەرنجەوە دەیخوێندەوە، وشەکان ئەوەندە جوان و کاریگەربوون، چاوەکانی نەدەترووکاند، کە لێ بووەوە، تەماشایەکی شاهۆی کرد، بۆ دڵنیاکردنەوەی، ئەگەر ڕێگا بدەی بە دەنگەوە بیخوێنمەوە هەتا هاوڕێ شەوباش تێبگات مەسەلەکە چییە، بە بێ چاوەروانی وەڵام بە بێپسانەوە کەوتە خوێندنەوەی سەر لەبەری نامەکە، بەڵام ئەمن هیچ شتێکی خراپ لەو نامەیە نابینم. هەر هەمووی هەواڵی دڵ خۆشکەر و ئارامبەخشن، ڕووی لە شەوباکرد وەکوو ئەوەی داوای یارمەتی و پشگیری لێ بکات، هاوڕێ شەوبا، چەند جار نووسراوە تەوار تەندروستی باشە. وەڵامدانەوەی برینەکانی تەوار بۆ چارسەر، کەواتە لەماوەیەکی کورتدا بە یەکجاری چاک دەبێتەوە، ئەوەش هیوا و ئاواتی هەرهەموومانە، نووسەری نامەکە، کەسێکی دڵسۆز و غەمخۆری تەوارە، کەسێکی ڕۆشنبیر و وریاش دیارە، ئەمن بۆخۆم ئەو هەموو ساڵە مامۆستا بووم، ناتوانم نامەیەکی ئاوا جوان و ڕێکوپێک بنووسم، نامەنووس دەڵێی پارێزەرێکی زۆر وریایە، ئەوەی سەرداوێك لە دۆزینەوەی کەسوکاری تەوار هەیە، ئەوەشیان کارێکی نەك باشە، بەڵکوو کلیلی کێشەکانە زۆر لە نهێنییەکان ئاشکرادەبن، یان حەز ناکەی تەوار بە کەسوکاری شادبێتەوە؟ سەری زمانی خۆی گەست، ئارەزووتە تەنها لەلای خۆت گەورەبێت. ئەتۆ چۆنی دەبینی هاوڕێ شەوبا؟ شەوبا وەکوو خوو و ئەتواری جوانی بەردەوامی، هەرچەند لە شڵەژان و باری ناجۆری شاهۆ زۆر پەشۆکابوو داخوا ئەو چەند وتەیەی کەمێك ئارامی دەکاتەوە، بۆیە هەوڵیدا بە میهرەبانی و شێوەیەکی ناسکتر لە هەموو دەمێك بدوێت، ماموستاگیان، هەرچەندە زۆر لە نامەکەی کاك بەختیار تێنەگەیشم، بەڵام ئەگەر لە ئێمە دڵسۆزتر نەبێت، لە هەمووومان کەمتر خەمخۆری تەوار نییە، ئەوەتا ژیانی خۆی وەلاناوە و بیر لە ژیانی هەموو کەس دەکاتەوە.. ئەگەر کەسێکی خوانەخواستە نەك خۆپەرست بەڵکوو بیری تەنها لە ژیانی خۆیی کردبایەوە، کە زۆربەی خەڵك وا دەژین، ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە، چ کاری بە سەر ئەو دەردی سەرییەوە بوو، لە باتی ئەوەی سوپاسی بکەین، بە هیچ و خۆرایی یارمەتیمان دەدات، دەرمان و ئازووقەمان بۆ دەنێرێت، نەك ئاگای لە تەوارە بە ڵکوو ئاویەتە بە خوێندن و چارسەری برینەکانی دەکات. شاهۆ ئەوەندەی دیکە دەمارگیرتر بوو، مامۆستا ئەوەتا نووسراوە تەوار لە شار دەمێنێتەوە.. قەت ڕێنادەم ئەو کارە ڕوودات، بەو بریندارییەشەوە لەو شەو زووتر نییە دەڕۆم بۆ

شار لەگەڵ خۆم دەیهێنمەوە. مامۆستا بە دەم نووشتاندنەوەی کاغەزەکان بۆ دۆخی جارانی، بڕیار لە دەستی خۆتە، هیچی خراپ ڕوونەداوە، تەوار ساغ و سەلامەتە، دەمێنێتەوە لە سەر ئەوەی کەنگێ دەگەڕێتەوە، ئارەزوو بکەی هەر ئەوشەو دەچینە ناو شار و لەگەڵ خۆمان دەیهێنینەوە. شەوبا و دوو پێشمەرگەکەی دیکە تەماشایەکی یەکتریان کرد، زانیان شاهۆ شتێك بڵێت دەیکات، ئەگەر سەری خۆی لەسەر دانابێت بەتایبەتی ناوی تەواری تێدا بێت. ئەگەر هەتا شار لەسەر سینگ وەکوو مار خشابێت بۆ لای تەوار دەخشێت. مامۆستا داوای لە شاهۆکرد، تکات لێدەکەم کەمێك هێوربەوە بزانین چی بکەین باشە؟ شاهۆ تەواوی لەشی بەسەر ئارەقە کەوتبوو، بۆ یەکەم جارە لە ژیانیدا، ئەك هەست بەدەستەوەستانی و ورە بەردان بکات، بەڵکوو خۆری ژینی بە یەکجاری ئاوەدیوبووە، ئاهومێدی تەواوی جەستەی داگرتوە. مامۆستا داوای لە شەوبا کرد، هاوڕێ تکایە ئەتۆ هێواشی بکەوە. شەوبا بە پەرۆی دەستی کەوتە سڕینەوەی ئارەقەی دەموچاو و گەردنی، شاهۆگیان وەرەوە سەر خۆت، ئەو قسانەی هەروا لە بەردڵی تۆ نووسیوە.. چوونە شار و هێنانەوەی تەوار کارێکی ئەوەندە ئاستەم نییە. مامۆستا لەگەڵ پێشمەرگەکان ڕۆیشتن، شاهۆیان بەجێهێشت و کەمێك لەولاتر زۆر بەچڕی کەوتبوونە ڕا و تەگبیرکردن، چۆن بتوانن هاوڕێ زامدارەکەیان قایل بکەن، چونکە دەیانزانی بە تەواوی هیوا و بڕوای بەرامبەر بەخۆی و ئەوان و بەختیار و شار و دکتۆرەکان و چارەسەر و شار و بنار و چیا و هەتا ئەو پۆشاکەی بەریشی لەدەستداوە، دەبێت چەند وشە و ڕستەیەکی کاریگەر بدۆزنەوە بۆ ئەوەی دووبارە بڕوای بە ژیان پەیدا بکاتەوە. پستەپستیان دەکرد چەند هەنگاوێکیان دەما بگەنە لای بەو مەلوولیە دەیان دیت، بەپەلە پرۆزە دەگەڕانەوە، دواجار بە پارێزەوە شەوبا لە پێشەوە و مامۆستا سەرباز لە دواوە و دوو پێشمەرگەی گەنجیش لە پشتیانەوە. ماوەیەك بێدەنگ بەرامبەری وەستان، بە دوو چاوی پڕ لە بێبڕوای بێدەنگ تێیانەوە دەڕوانی، بەلەش داهێزراوی لەگەڵ خود و ئاخی خۆی بەجێهێشت، هەتا بکەوێتە دنیای تەنیای کە تەواوی ژیانی لە چرکەساتە دژوارەکانی لە سەری ڕاهاتبوو، بۆئەوەی بتوانێت بۆ خۆی، خۆی هێوربکاتەوە و بڕوای بەوە بێنێت، مەسەلەی گەڕانەوەی تەوار بۆ باوەشی تەنها مەسەلەی ڕێککەوتن و کاتە، لەو ساتەوەختەی سیمای وەکوو باخەوانێکی کارامەی ئاشقی گوڵ و گوڵزار دەرکەوت، پاش وەرزێک چاند

و پەروەردەکردن و خزمەتکردنی باخچەیەکی ڕازاوەی گوڵستان، نەک گوڵێکی لێ سیس و ژاکاو بوو بێت، بەڵکوو تەواوی باخچەکەی شێلداربێت و شێوێنداربێت، بەدیار مەرگی گوڵە ڕەنگاوڕەنگەکانی شیوەن بکات، ئەو گوڵ و لالەزارەش بۆ ئەو تەوار بوو. کاک شاهۆ مامۆستا سەرباز هەر بۆخۆی بەتەمای شار بوو، دەتوانین هەر ئەو شەو بڕۆینە ناو شار و تەوار لەگەڵ خۆمان بێنین. تەوارەکەم ماوە و دەژیت و هەناسە دەدات، پێدەکەنێت، دەگەڕێتەوە، کەنگێ هیواگیان؟ بۆ خۆم لەگەڵتان دێم. هەر بەدانیشتنەوە کەوتە خۆڕێکخستن و ئامادە باشی، ئێوە بەختیار ناناسن چەند گەنجێکی کەڵلەشەق و سەرەڕۆیە، بە قسەی کەس ناکات، گوێ بۆ هیچ کەسێك ناگرێت، مەگەر بۆ خۆم لەگەڵتان بم، ئەگەر بەخۆشی تەواری ڕادەستمان کرد باشە ئەگەرنا بە زۆرەملێ و بە ناخۆشی وەریدەگرینەوە، نا ئێوە هەتا ئێستا بەختان نەناسیوە، ئەگەر گوتێ نا، مانای نا، بە هیچ هەڕەشە و گوڕەشەیەك نایەتە ژێربار. سەرەتا شاهۆ ڕازی نەبوو دەیەویست بۆخۆی بڕوات، شەوبا لەگەڵ پێشمەرگەکان ڕەخت و فیشەکدانی بەست بوو هاتە لای شاهۆ، ئەمنیش دەچم لەگەڵیان، شاهۆ بە دوو چاوی پڕگومانەوە لە شەوبای پرسی، گوڵەکەم لە خۆت ڕادەبینی؟ شەوبا زۆر بە دڵنیاییەوە گوتی، ئەرێ بۆنا خۆ ئەمن لە تەوار و پێشمەرگەکان زیاتر نیم. باشە تەواری بڕفێنە، پێشمەرگەیەك کە ناوی هیواڕەش بوو، لەپشت شاهۆوە خەریکی بەستنی ڕەختەکەی بوو، جگەرەیەکی بەلا لێویەوە بوو، دەموچاوی لەناو دووکەڵ بزر بوو، نا کاکە نا، با گوڵەکەت لێرە بێت شۆربای کاردووت بۆ دروست کات، ناوی سازگاری کانی و لایلایەت بۆ بکات هەتا بە ئارامی بخەویت. شاهۆ ئاوڕێکی لە دواوە دایەوە، وەرە ڕەشەی چەپەڵ. هیوا هات بەلایەوە، سەریگرت، ماوەیەك لە دەموچاوی خۆی دەخشاند، چەندجار یەکتریان ماچ کرد، هیواگیان ئاگاداری خۆت و تەوار بە، گفتم دەدەیەی هیوا؟ هیوا، شاهۆگیان دڵ لە دڵ مەدە سبەی شەو بە تەوارەکەتەوە لەگەڵ لوولە کەبابی شار لەلاتین، سۆز و شەرەف. ئەوە بوو پاش کەمێك هەر سێ پێشمەرگەکە بە یاوەری تەتەری نامەهێنەر بەرەو شار بەڕێکەوتن. هەتا لەچاو بزربوون شاهۆ چاوی لەسەر هەڵنەدەگرتن. هیواش زوو زوو ئاوڕی بەلای شاهۆدا دەدایەوە. باڵەکانی بەرز دەکردنەوە و ڕایدەوەشاندن وەکوو باڵداریکی چوست و چالاك بفڕێت. بەناو دۆڵێکی دووڕودرێژدا بەرەو دەریاچە و شار کەوتنە ڕێ.

هەر ئەو شەوە، بەبێ پشوودان بە هاوەڵی تەتەری نامەهێنەر خۆیان گەیاندە قەراغی شار، سێ پێشمەرگەکانی لە ناو گۆڕستانی شار دانا، براینە دوو ڕۆژە لە شار هاتووم، نازانم چ باسە، ئەگەر هەتا بەرمبەیان نەهاتمەوە چارێکی خۆتان بکەن. لەلایەکی خوار گۆڕستان چەند چاڵێکی گەورە دیاربوون بە شۆقڵ هەڵکەندرابوون، خۆڵ و گڵەکەیان تازەبوون. کابرا پێش ئەوەی بڕوات، کاکە لەو چاڵانە دوور نەکەونەوە. لەناو تاریکی ناو دارستان بزربوو. مامۆستا ڕووی لە دوو پێشمەرگە هاوڕێیەکەی کرد، کاکە نابێ ڕووداوی چالاکمان لەبیر بچێت، با کەمێك لێرە دوور کەوینەوە نەوەك ناپاکیمان لەگەڵ بکات، خۆ ئەوەی ناپاکی لەگەڵ چالاك و هەڵکەوت کرد سەد لەو کەسە زیاتر جێگای باوەڕپێکردن بوو، بەڵام ئادەمیزاد مادام شیری خاوی خواردووە، هەموو دەمێك جێگای شك و گومانە. هەرچەندە دەزانم کاك شاهۆ زۆر باوەڕی پێ بوو، بەڵام خۆ کەس لەناو دڵی کەسدا نیە! ئەوەی تێناگەم ئەو چاڵە گەورانە، لەو گۆڕستانە بچووکە بۆچی؟ لەسەرووی خۆیان گردێکی بەرزی بە دار و سەوزای هەبوو، لەبەرزایی دیار بوو مۆڵگەی جاش و سەربازگە بوو. لەبن تاشەبەردێکی گەورە دەست لەسەر میللی چەکەکانیان بەرامبەر گۆڕستان کەوتنە چاودێری کردن. بچووکترین جوڵانەوەیان چاودێری دەکرد جارجار لە دوور، لەناو شار دەنگی تەقە دەبیسترا. پاش کاتژمێرێك چەند چاوی سووری گەورە لەدوورەوە بەدیار کەوتن چەند زیل و نیڤای سەربازی بە لایت و چراخانەکانیان بەرەو گۆڕستان هاتن. پێشمەرگەکان کەوتنە ئامادەباشی مامۆستا باشمان کرد لەوێ دوورکەوتینەوە، وای زانی ئەوەندە ساویلکە و نەزانین لە شوێنی دیاریکراو ناجووڵێین، هەر وا بە ئاسانی دەکەوینە داویانەوە، تەماشاکەن! هەر ڕەوە سەرباز و جاش بوون، بەپەلە لە زیل و نیڤاکان دابەزین و بە هەرچواردەوری گۆڕستاندا بڵاودەبوونەوە. ژمارەی ماشێن و زیلەکان ئەوەندە زۆر بوون نەك لەناو گۆڕستان، بەڵکوو لە دەوروبەری گۆڕستانیش جێگایان نەدەبووەوە. بە دیتنی سەربازەکان، مامۆستا هەڵاتنکەی خۆی بەبیرهاتەوە. ئەمنیش وەکوو ئێوە بۆ سێ مانگ هەڵخەڵەتابووم، بەڵام زوو وەهۆش خۆم هاتمەوە. لە ناخەوە شانازی بەخۆیەوە دەکرد، ئەگەر دەستگیری دەکەن، جگە لەوەی پێشمەرگەیە، چەکیشی فڕاندووە. لە هەمووی خراپتر هەڵاتووی (جەیشی شەعبیە) لە تیرمبارانکردن کەمتر هیچ چارەنووسێکی دیکە چاوەڕوانی ناکات. بەڵام هەرچی دەبێت بابێت. پێشمەرگە لاوە خوێنگەرمەکە،

زووزوو له مامۆستای دەپرسی.. هاوڕێ بۆ تەقەیان لێ نەکەین؟ کوڕە تەقە لەچی دەکەی سوپایەکی چەند بەتالیۆنییە، ئەو گارانە بەکێ تەواو دەبن نابینی لەسەرمانەوە سەربازگەیە. پاشان ئێمە بۆچی هاتووین؟ سەربازەکان زۆر بەبێدەنگی له زیلەکان. خێراخێرا شتی قورسی له بەتانی و خامی سپی پێچراویان هەر لەدوورەوە فڕێدەدا ناو چاڵەگەورەکان، زیاتر بە گۆڕی کۆمەڵ دەچوون. ماوەی نیو کاتژمێر هەر شتیان کێشانەوە و چواردەستەکی بۆ ناو چاڵ. پاشان ڕێگایان چۆڵ کرد دوو شۆفڵی دەمگەورەی ددان تیژ کەوتنە پڕکردنەوەی چاڵەکان. چۆن هاتبوون ناواش بەبێدەنگی لەتاریکی شەوە زەنگەکە لەپشت کێلەکانەوە بزربوون. هیوا ڕووی له مامۆستا کرد، هاوڕێ بە ڕای تۆ ئەوەچی بوون لەناو ئەو چاڵەگەورانە شاردیانەوە؟ وەڵام نەبوو. پاشان بۆچی سەرییان داپۆشتن؟ بە گوێرەی ئەوەی بە نیوەشەو هاتوون دیارە شتێکی زۆر نهێنی هەیە، بۆیە وا بە دزی کارەکەیان کرد.. ئەو هەموو شت کێشانەوەش هەر هەمووی لاشەی خەڵك بوو، بزانە داخوا قوربانی کام ناوچەی ئەنفالکراون.. پێشمەرگە لاوەکە داوای له مامۆستا کرد، وەکوو ئەوەی شەڕمان لەسەر نەکردن، با بچین سەریان هەڵدەینەوە. مامۆستا بە نیمچە پاڕانەوەیەك. هاوڕێگیان ئەو کارە دەکەین، بەڵام له گەڕانەوەمان. دەبێ نهێنی ئەو کارە هەر بزانم. ئەوکاتیش تەوارمان لەگەڵ دایەو ناکرێت!

هەرسێکیان بە بێدەنگی مانەوە و بە بێئارامیەوە چاوەڕوانی هاتنی کاك فەرەج و تەتەری نامەهێنەریان کرد. لەماندووبوون و کەم خەویان هەرسێکیان چاویان قورس بوون، وەنەوزیان دەدا، دوانەکەی دیکە چاویان تەواو بروژابوون، تەنها مامۆستا نەبێت، چاوەکانی بەدوای گچکەترین شتدا دەگەڕان. لەپێش گۆڕستان ڕەشایەك پەیدابوو، بوون بەدوان، زۆر بە هێواشی بەناو کێلەکاندا دەگەڕان، له تاریکایی بزربوون. مامۆستا هەستا و برادەرەکانی هەستاند. برادەران هاتن. کێ هات؟ ماوەیەك چاودێری چواردەوری گۆڕستانیان کرد، هیچ جووڵەیەکی نائاسایی نەبوو. بەرەو گۆڕستان شۆڕبوونەوە. له دوورەوە کاك فەرج و برادارەکەی لەمەڕ خۆیان ناسینەوە. باوەشیان بەیەکدا کرد. کاکی تەتەر کەمێك سەرکۆنەی کردن. وادیارە باوەڕ بە ئێمە ناکەن خۆتان شاردووەتەوە، مامۆستا نا کاکە نا مەسەلە باوەڕ نییە، نازانن لێرە پێش کەمێك چی ڕوویدا؟ کاك فەرەج بەدەم لادانی خۆڵی سەرچاڵەکان بە قاچەکانی، برام ناگادارین،

لەڕێگای جاشێك ئاگادارکراینەوە، قوربانیانی ئەنفالن لێرە لە گۆڕی کۆمەڵ شاردیاننەوە. زۆر لەغەمی ئێوە دابووین، بەڵام بەردەوام دەمگوت، پێشمەرگەی سەردەمی ئەنفالن و خەمیانت نەبێت، بۆخۆیان دەزانن چی دەکەن، بەڵام مامۆستا سەرباز خێرە بەو پەلەپەلە هاتوونەتە ناو شار، خۆ شتێکی خراپ ڕووی نەداوە؟ مامۆستا، نا هاوڕێ، هاتووین دوای تەواردا. تەوار لە ماڵی منە. کەواتە بۆ لەگەڵ خۆت نەتهێنا، جارێ ئەمن دوو ماڵم هەیە بێژنم.. لەماڵەکەی قەڵادزێم، ئەمن چەند ڕۆژە لەو ناوەی نەبووم، ئەمڕۆ بەکارێك هاتوومەتەوە. ئەگەر بۆ مەسەلەی تەوار هاتوون، تەندرووستی زۆر لەوەی ترسناکترە کە ئێوە دەیزانن و باسی دەکەن. دکتۆر یەك مانگ هەتا دوو مانگی بۆ داناوە، چارەسەری تەواوی بۆنەکرێت، ئەو دنیایە بەجێدەهێڵێت. مامۆستا شڵەژا، ئامان با ئەو شتە نەگاتەوە بەر گوێی شاهۆ، لەپاش تەوار یەك ڕۆژ ناژیت. ئێستا چی بکەین؟ فەرەج ڕووی لە پێشمەرگەکان کرد، وەرن بڕۆینە ماڵی من، بزانم بەیانی چیم پێدەکرێت، ئەگەر هاتوو دکتۆر بە تەواوی داودەرمان و چارەسەری تەوار ڕووی لە چیا کرد، ئەوکاتی گەڕانەوەی تەوار ڕێی تێدەچێت. هەر پێنجیان بەبەردەم گۆڕستانەکەوە، یەك لەدوای یەك بەرەو شار بەڕێکەوتن. قرچەقرچی شکانی قەمیش و دار و چیلکەی تەڕ لە ژێر پێیان، ئارامی ئەو ناوەیان دەشێواند و دەنگێکی زۆر نامۆی لێ دروست دەبوو، بەناو شاردا چوونە گەڕەکێکی لاچەپەکی خانوو گڵ، لە باخچەی پشتەوە خۆیان کرد بە ژووردا، خانووەکە دووبەش بوو، بەشی سەر شیووەکەی باخچە بوو، بەشی سەر کۆڵانی چوار ژووری بەسەر یەکەوەبوون. تەتەر لێیان جیا بووەوە، گفتی پێدان سەردانیان بکات. ئەو شەوە خەوتن بەیانی پێش هەتاو هەڵاتن فەرەج چوو بە دوای تەواردا.

جێبە شڕەکەی بەختیار بە تەقەتەق و جیڕەجیڕ ڕێگای دەبڕی. واتدەزانی ها ئێستا ها کەمێکی دیکە لێک و پێک دەبێتەوە و هەر پارچەی بەلایەکدا دەڕوات. کاتێك گەیشتە سەرپردی بەرامبەر ماڵی فەرەج هێز و گوڕی تێدانەمابوو، بەختیار ڕووی لە فەرەج کرد:

تۆبڵێی بمان گەیەنێتە ماڵتان؟ کاکە ماڵی من بۆ خۆتدەزانی هەر لەو پردە تێپەڕین دەرگای ماڵمان بەرامبەرمانە، دەڵێی چاك لەبیرت نەماوە، دکتۆر دەستێکی بەسەری تەوار داهێنا و بەپێکەنینەوە ڕووی لە بەختیار کرد. کاك فەرەج، کاکە بەختیار بووە بە قەڵادزەیی دەیکەینە زاوای خۆمان. هەموویان

پێکەنین، لەسەرپرد شۆڕبوونەوە شرەجێب وەکوو ئەسپێکی شلوشەنگ سەربەرەو خوار باڵی گرتبوو، فەرەج چەندجار لە داژڤوولّی بەردەمی دا، خەرەکەشکاو، ئەوەی بە بێوەژنی کردت بە کچێنی بتکردبا، ئەو هەموو ڕێگایە بە پاڵیش نەدەرۆی سووتاین لەبەر گەرما و هێربووین لە بەر بۆنی بەنزینی سووتاو، بۆن لاستیقی تایەکانی، کاکە بەختیار نیازت نییە بیگۆڕیت و دانەیەکی نموودی باشتر و جوانتری هەبێت، پەیدا بکەی. ئەوەیان لە سەر حیزب و ئابوونەی باش دەمێنێت، بەڵام جارێ ئیشوکاری خۆمانی پێ مەیسەر دەکەین. لەناکاوێک چەند چەکدارێکی نەناسراو لەودیو و ئەودیوی پردمخۆڵاویەکە، بۆیان هاتن. فەرەج واقی وڕاما، دڵی داخورپا، چاوێکی لەسەر دەرگاڕەشە ئاسنە قەپاتکراوەکەی بەرامبەریان بوو، ماڵەکەی خۆی دەکات، کە سێ پێشمەرگەی هاوڕێی تێدان. چاوێکی لەسەر چەکدار و سەرباز و جاشە کان بوو، لوولەی چەکەکانیان تێکردن. ڕاوەستن، کەربابینە بۆ کوێ؟

مغاورێك بە جلکی بەڵەك بەڵەك بێریەکی سووری لەسەربوو، بەعەرەبی تێیانی ڕاخوڕی، بۆ کوێ؟ فەرەج و بەختیار نەیانزانی چی بڵێن، دکتۆر بە دەنگ هات، بە ئەفسەرەکەی گوت، ئەمن دکتۆرم ناسنامەکەی دەرهێنا.. لەو گەڕەکەی ئەودیو سەردانی نەخۆش دەکەم! ئەفسەرەکە تەماشایەکی ناسنامەکەی کرد. دەمانچەی ڕووتی بەدەستەوە بوو.. ناسنامەکەی بە دەم و چاوی دکتۆر دادا، بگەڕێنەوە گەوادینە. یەڵڵا؟ فەرەج تەماشایەکی سەربان و چواردەوری ماڵی خۆی کرد. بەپانتایی دەشت و سەرتەپۆڵکە و سەربان و باخچەی ئەك ماڵەکەی بەڵکوو بەچواردەوریدا دراوسێیەکانی هەڵدەهاتن. جاشەکانی نەدەناسی، دیار بوو لە شوێنێکی دیکەوە هێنابوویان. بەختیار بە جێبەشرەکەی هەر ئەوەندەی پێکرا بە گێکی لێدا و پشتاوپشت گەڕایەوە. ئەو جارەی هەورازبوو سەرنەدەکەوت. ڕووی لە فەرەج کرد، کاك فەرەج برادەران لەماڵی تۆن؟ هەتا ئەمڕۆ بەیانی هاتم لەماڵ بوون. چەند کەسن؟ سێ پێشمەرگە. کێ و کێن؟ مامۆستا سەرباز.. هیوا.. ئەوی دیکەیان ناناسم! بەختیار دووجار لە ناو چاوانی خۆی دا، فیکەیەکی درێژی لێدا. ئەی هاوار چ کارەساتێکە، ئێستا چ بکەین. نازانم. چۆنچۆنی ئاگاداریان بکەینەوە؟ سەربان و بن بان و چواردەورییان گیراوە، چۆنچۆنی خەبەریان بۆ ببەین. دکتۆر دەستی دا جانتاکەی دەستی، ئەمن دابەزێنن، بەڵکوو بەو جلکوبەرگە سپیانەوە بتوانم بە ناوی دکتۆرێک خۆم بگەیەنمە لایان. فەرەج بە

شڵەژاوییەکەوە، کاک دکتۆر بە چاوی خۆت دیتت وەکوو سەگ پڕیان داینێ، ئەتۆش دەگیرێی ئەوکاتی غەمەکەمان دەبێت بە دوو غەم، بەڵام دەتوانی دەستی تەوار بگری و بڕۆی، دوایی یەکتر دەبینینەوە، بەڵام تکایە لە تەوار غافڵ مەبە، بەدوای چارەسەرێکدا دەگەڕێین. هەر لەوێ دەستی تەواری گرت و دابەزی، بۆخۆشی نەیزانی بەرەو کوێ بڕوات، هەتا جێبەکە و سەرنشینەکانی لە چاو بزربوون تەوار بە دوو چاوی پڕ فرمێسکەوە تەماشای کردن، شاهۆ نەما، بەختیار ڕۆیشت، لەگەڵ دکتۆرێکی نەناس هەنگاوی دەهاویشتن، پێیەکانی لەدووی نەدەهاتن، قاچی لێکدەئالآن. دکتۆر هەستی بەلاوازی تەوار کرد کردیە باوەشی و کەوتە دڵدانەوەی، ئەوشەو دەگەینە لای مامە شاهۆ و هاوڕێیەکانی.

بەختیار و فەرەج بەپەلە خۆیان گەیاندە لای تەتەری برادەری فەرەج، کاکە برادەران چواردەوریان گیراوە. ڕاستە هەموو شار دەزانێت. ئەدی چ بکەین؟ نازانم.. دەتوانم خۆم بگەیەنمە لای کاک شاهۆ. کاك شاهۆ لە شاخ برادەران لە شار گەمارۆ دراون.. کاك فەرەج ئەتۆ لەگەڵ ئەو برادەرەی، مەبەستی بەختیار بوو بگەڕێنەوە لای ماڵتان، منیش دەچمە ناوشار بزانم چ باسە؟ فەرەج گوتی، کاکە ئەمنیش لەگەڵتان دێم. نا کاکە لەماڵی تۆدان، بۆ تۆ باش نییە، کەست لەماڵە بێجگە لە پێشمەرگەکان؟ نا کەسی چی؟ لێیاندا ڕۆیشتن.

لەماڵی فەرەج، مامۆستا لە ناوەڕاستی ژوور دانیشتبوو خەونی بۆ دوو پێشمەرگەکان دەگێڕایەوە. تەپەتەپێك لەسەربان هات. پێشمەرگەکان سەرێکیان بەرەو بنمیچ بەرزکردەوە. مامۆستا بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەی خەونەکەی خۆی، دوێنێ شەو لەخەونمدا. لە بارەگای کەڵەمێووێ بووین بەسەریان دادایین، برادەران دووبارە بەرەو گۆڕستانی قەڵای شەهیدان چوون، کونێکی گەورە هەبوو لە شێوەی کارێزی پێشمەرگە یەك یەك بەناو کونەکەدا دەڕۆیشتن، ئەمن مامەوە نەمتوانی دەربازببم. لەناو تاریکایەکە هەر دەگەڕام و دەسووڕام، نە کونێک هەبوو بۆ دەربازبوون نە بۆگەڕانەوەش، هیوا بەتەنها بۆخۆت بووی؟ نەوەڵآ دووبرادەریشم لەگەڵ بوون. کێ بوون؟ هاوسەفەری شارم بوون. مەبەستت کێیە؟ هەردووکتان. مامۆستا ئەو قسانە ناخوات، بۆ خۆت بە تەنیابووی. لەو قسانەدابوون دەرگای دەرەوە ڕمبەیەکی لێهات فرپە ناوەڕاستی حەوشەی. دەنگی گرەگڕی کۆپتەر بەسەر ماڵدا دەسووڕایەوە. لەپشتی دەرگای دەرەوە، دەنگی بڵندگۆ بەرزبووەوە، بە کوردی هاواری کرد، چواردەورتان گیراوە،

گەماڕۆدراون، یەك یەك بێچەك وەرنە دەرەوە. پێشمەرگەكان دەستیان دایە چەكەكانیان، مامۆستا دەستی لەسەر شانیان دانا، كاكە كێ دەیەوێت چەكەكەی لێرە دانێت با بڕاوت؟ هەرچەندە دڵنیام بەهەردووك باردا هەر مردنە؟ یەكێكیان بەسەربەرزی و ئەوی دیكەیان بە سەرشۆڕی.. ئەمن لە لایەن خۆمەوە، فیشەكێكی گڕداری لە ناو كەتافەكەی سەر شانی دەرهێنا، ئەوە دوا فیشەكمە. لە هەموو فیشەكەكان لەلام خۆشەویسترە، دەمێكە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەم دەكرد. مادام تەوار لەدەرەوەیە هیچ غەمم نیە. تەوارگیان چاوەكانت ماچدەكەم، پێشمەرگەكەی دیكە فیشەكی لە باخەڵی دەرهێنا، ئەوەی منیش چی لە هی تۆ كەمتر نییە. بەس هیوا مابوو، مامۆستا، ڕووی لە هیوا كرد، ڕەشەگیان ئەتۆ دەڵێی چی؟ هیوا بە پێكەنینەوە ڕووی لە مامۆستا كرد، گیانی ڕەشە، ئەمن فیشەكەكانم دەژمێرم بزانم پێش خۆم چەند ناپاك دەتۆپێنم، بە حسابی خۆم سێ سەد و چل و یەك فیشەكم پێیە، یەكیان بۆخۆم ئەوانی دیكە دیاری بۆ دوژمن. مامۆستا تەماشەیەكی كاتژمێرەكەی دەستی كرد، لە یانزە شتێك لایدا بوو. هەرسێكیان دەستیان لەناو دەستی یەكتر دانا و بە دەنگێكی بەرز، لە چاوی تەوار. كۆمەڵێك داباری بوونە ناو حەوشە و بەردەرگا، لەسەربان هەر تەپەتەپ بوو، دیواری خانووە قوڕ، هەریەكەی یەك مەتر ئەستووربوون، چەند تاقەیەكی بچووكیان تێدابوو. دوو ژوور بە سەر یەكەوە. لەتەنیشت دوو ژوورەكە ژوورێكی دیكە بەرامبەر ژوورێكی بچووك. (بڵند گۆ) دوا مۆڵەتی دا، هەتا دە دەژمێرم. یەك.. دوو.. سێ.. مامۆستا هاتە پێش پەنجەرە و هاواری كرد، لە دیوی دەرەوە دەرگا لەسەرمان داخراوە وەرن بیكەنەوە، هەتا خۆمان ڕادەست بدەین. بەپەلە خۆی گەیاندە ژووری تەنیشت دوو ژوورەكە. لەنێوان ژوورەكان ناوبڕ و تاقە هەبوون. حەوت هەشت جاش هاتن ئاڵقەڕێزی دەرگا بكەنەوە جاشێكیان دەستی بۆ ئاڵقەڕێز برد. مامۆستا لەدەستەڕاست و هیوا لەدەستی چەپ، هاوڕێیەكەیان لە ناوەڕاست. لەیەكڕا جاشی بەردەرگا و ناو حەوشە یان بەبەر دەستڕێژی گوللەدان. مامۆستا نارنجۆكێكی فڕێداناویان، ئەوانەی بەر دەرگا فریای هیچ نەكەوتن، ئەوانی حەوشە بەسەر یەكدا دەكەوتن، هەڵاتنە دەرەوە. بریندارەكان لە بن دیوار و حەوشە دەیان ناڵاند. بە جارێك ئاگر ڕووی لە ژوور و حەوشەكرد. لەسەربانەوە دەنگ نەما. دەنگی دۆشكە و گڕمگڕی كۆپتەر و هاوار هاواری جاش و سەرباز گوێچكەی پیاویان كەڕ دەكرد. فیشەك و هاوەن وەكوو تەرزە

دەبارین، هەتا دەنگی تەقە نزمتر دەبوو بازنەی گەمارۆ بچووك تر دەبووەوە. هەرکە پێشمەرگەکان وەدەست دەهاتن، لاشەی جاش و سوپا لەسەر دیوار و بەردەرگا و حەوشە زیادیان دەکرد، کە دەیان زانی لەحەوشە تەقەکردن کەمتر دەبووەوە، بە دۆشکە و چەکی قورس هێرش دەکرایە سەر پێشمەرگەکان، بۆیە هەوڵیان دەدا، بەردەوام چەند کەسێك لە حەوشە بە زیندوویی بمێننەوە. بەرپەرچی تەقەکردن دەبوونە تاك تاك. دەنگی تەقە نەما، پێشمەرگەکان جێگای خۆیان قایمتر کرد. دوامۆڵەتی دکەیان پێدرایەوە، هەرچی سوپابوو هەوڵی بە زیندوویی گرتنی پێشمەرگەکانیان دەدا، پێشمەرگەش لەلایەن خۆیەوە دەیویست فیشەك بە خۆڕایی نەتەقێنێت، دەنگ نەبوو، لەگەڵ زرمبەیەکی زۆر گەورە تەواوی شاری هەژاند، دیواری دەرموەی بەیەك جاری هەڵگرت، ئەوەی زۆر یارمەتی پێشمەرگەکانی دەدا، دارێکی گەورەی پێش دوو ژوورەکە بوو، زۆربەی فیشەك و هاوەن و ئارپیجی دەگەڕاندەوە، زرمبەی دووەم بەدوایدا، گورزە ئاگرێکی گەورە دوو ژووری بەرامبەر دەرگای هەڵتەکاند، سەربان و دیوار نەمان، تەپ و تۆز و خۆڵ دنیای تاریك کرد، بەدوایدا هێرش کرا. لەناو دار و بەرد و خشت و بلۆك، پێشمەرگەی بریندار هەستایەوە و بە چواردەوری خۆیدا ڕشاندی، چەند جاش و سەربازی دیکەی بەردایەوە، هەر لەو شوێنە دەنگی یەك فیشەك هات، مامۆستا و هیوا زانیان چی ڕوویدا. هێرش و ئاگرباران زیادی کرد، دەنگی تەقینەوە و دۆشکە بەهێزتر بوو، لەو کاتانەدا پێشمەرگەکان بێدەنگ دەبوون، وایاندەزانی نەماون، بە لێشاو هێرشیان دەکرد، هەر ئەوەندەیان خۆش بوو هەتا دەگەیشتنە نزیکی ژوورەکان، دەسترێژ قیرەبڕی دەکردن. ماوەی دوو کاتژمێر هێرش و بەرپەرچدانەوە بەردەوام بوو، پێشمەرگە هێواش هێواش ناو و فیشەکی کەم دەبووەوە، تەپوتۆز و بۆنی باڕوودی سووتاو، زیاتر هەراسانی دەکردن، تەقە لەلایەن پێشمەرگەوە کزبوو، هیوا بەیەك جاری دەنگی نەما. چوونە بەردەرگاکەی دەنگی فیشەکێکی تاك هات، جاش و سوپا بەرەو دواوە هەڵاتنەوە، مامۆستا بە تەنیا مابووەوە، زۆر بە شارەزایانە تەقەی دەکرد، پێش ئەوەی بەیەکجاری سەربانەکە بەسەریاندا بڕوخێت، دەنگی تاك فیشەکێك هات. جاش و سەرباز گەیشتنە سەر خانووە ڕووخاوەکە و کەوتنە هەڵپەڕین و سەماکردن، ستایشی بەعس وسەرۆکیان دەکرد. دوو لاشەی پارچەپارچەکراوی پێشمەرگەکان، فڕێدرانە ناو زیل و زیاتر لە سەد لاشەی سووتاو و پارچەپارچەی جاش و

سەرباز کۆکرانەوە. لاشەی مامۆستایان بە دوای نیڤایەکەوە کرد، بەناو شاردا ڕایان کێشا و گەڕاندیان، گۆشت و خوێنی مامۆستا سەرباز بە جادە و کۆڵانەکانەوە نووسا. خوێندکار و قوتابی تازە بەربووی قوتابخانە، کچ و کوڕ بەپانتۆڵ و تەنوورەی ڕەساسی و کراسی سپی، بەدیتنی لاشەی خوێناوی دەگریان بە جانتا و دەسرەکانیان چاوی خۆیان دەگرت. هەر ئەوشەوە لەئاسمانی کوردستان سێ ئەستێرەی گەشی گەورە چوونە پاڵ ئەستێرەکانی دیکە.

# پەرداخێك ژەهر..!

مامۆستا، هێشتا دەسرەسپییە سادەکەی لەسەر دوو دەستیان لا نەبرد بوو! بە دوو چاوی قەپاتەوە لەژێر پێڵوە تەنکەکانی، لەبەر خۆیەوە، زۆرجاریش لەژێر لێوەوە نزاو پاڕانەوەی دەکرد، ئەو دوو جووتە تازە زاوا و بووکە بەمرازی خۆیان بگەن، منداڵ و نەوەی ساڵح و بەڕەوشت بێننە ژیانەوە. بەدەسرەکەی سەر دەستیان ئارەقەی دەموچاوی سڕی. تۆقەقەیەکی گەرمی لە گەڵ شاهۆکرد و دەستی دوو گەواهی دەرەکەی گووشی، پیرۆزبایی لە بووك و زاوا کرد، ڕووی لە تازەبووك کرد، یاخوا کچم خودای گەورە ئاگادارتان بێت، ئاوا بەڕووسووری مێردت کرد. مامۆستا پارچە وەرەقەیەکی دایە دەستی شاهۆ. بەروار و ناوی شاهۆ بوو و ناوی (گەواهی) دەرەکانیشی تێدابوو، ئەوەش لەباتی کاغەزی هاوسەرگیریتانە، دوێنێش لە مەرگەی کارێکی خێریی لەو جۆرەم ئەنجامدا، لەماڵێک بانگکرام، وەکوو بانگهێشتنێکی لێهات، هەرچەندە ئەمن زیاتر ڕێبوار بووم، کەسیانم نەدەناسی، بە پرسیارکردنی کوڕەکەم، گەیشتمە ئەوێ. خوان و سفرەیەکی باشیان ڕازاندبووەوە، بەڵام ڕەنگ و ڕووی خەڵکەکە بە پێچەوانەی خوانەکە، زۆر غەمبار و بیر پەرشوبڵاو بوون. پاش نان خواردن کاتێک پرسیارم کرد، بۆ وا داماون، کوێخا بە ئەدەبەوە پێی گوتم، مامۆستا ڕاستی بۆیە حەزمان کرد لە خزمەتت دابین، لەسەر دەستی کەسێکی ئایینی بە گوێرەی شەریعەت کوڕەکەم پاش هەشت منداڵ ناچارە خێزانەکەی تەڵاق بدات و لێک جیاببنەوە، منداڵەکانیش سەرگەردان ببن، بەڵام وەکوو باسم کرد هیچ چارەی دیکە نیە. لێم پرسین، ئایە کابرا مێشکی تەواوە پاش ئەو هەموو ڕەوە منداڵە ژنێک و هەشت منداڵ سەرگەردان بکات و ماڵ لە خۆی تێک بدات. بابەکەی بێدەنگ بوو، داکی وەدەنگ هات، داکت بمرێت سوارە هەتا بەو گازەی زامدار نەبووبوو، کەس لەوی مەند و مەستوور و بابێکی باش نەبوو، بەڵام تازە سێجار بەبەر چاوی چەند کەسەوە تەڵاقی خواردووە و تەڵڵاقی وەکوو عەقڵی کەوتووە. کاتێک کابرا و ژنەم دیت، لە ڕێگای کۆنە زامەکانی دەموچاوییەوە بە کیمیایی حەرام پێکراوە..

مامۆستا بێدەنگ بوو، داوای لە شاهۆ کرد یارمەتی بدات بۆ دۆزینەوەی کوڕەکەی:

کوڕێکم لەوناوەی پێشمەرگەیە، بەدوایدا ناردوم بچمەلای، چەند ساڵە نەم دیتووە! شاهۆ پرسی، باشە مامۆستا ئەدی بەسەرهاتی ژن و پیاوەکە چی بەسەرهات؟ مامۆستا بە ڕستەیەک کۆتایی بە مەسەلەکە هێنا، پێیانم گوت، مادام کابرا بە چەکی کیمیایی بریندار بوو بێت، حسابی ئەک ئینسانی بەڵکوو بەبەنی ئادەم ئەژمێردراوە و بۆنەکراوە بۆیە تەڵلاقی ناکەوێت. شاهۆ ماوەیەک بەرامبەر مامۆستا تاس بردییەوە. زەردەیەکی هەستکردن بە شانازی کردن بە مامۆستاوە لەسەر لێوەکانی بوو، بە ڕێزێکەوە پرسی:

کوڕەکەی بەڕێزتان چ لایەنێکە؟ مامۆستا بە پێکەنینەوە، پێشمەرگەی پاسۆکە. شاهۆ بە بزەیەکەوە، پاسۆک و کورد و کۆردۆ دوو شتی تەواوکەری یەکترن، ڕاستی ئەوەندەی ئەمن بزانم برادەارنی (پاسۆك) بارەگای دیاری کراویان لەو بنارە نییە، بەڵام چەند پێشمەرگەیەکیان، لەو سەرەوەی ئەو قووتەی ئەودیو بوون چەند ڕۆژ لەمەوپێش هاتن شەوێك لەلامان بوون. ماوەیەك لەمەوپێش لەناو دەریاچە تووشی شەڕێکی قورس هاتین، بەفریامان هاتن و دوو بریندار و شەهیدێکیان بوونە قوربانی ئەو شەڕە. مامۆستا کەمێک ناوچەوانی تێکچوو و شڵەژا، بە بێویستی خۆی بەپەلە و دەنگی بەرز پرسی، شەهیدەکە ناوی چی بوو؟ شاهۆ وەکوو ئەوەی مامۆستا دڵنیابکاتەوە، ناوی شێخ فاخر بوو، خەڵکی لای خانەقین بوو، کەسێکی بوێری ئازای دڵسۆز بوو، زۆر دەمێك بوو هەڤاڵەتی و برادەرایەتیمان بەیەکەوە هەبو، هاوبیرێکی بیروبڕوا پۆڵاین بوو، بەرامبەر بە نیشتیمان و ڕێبازەکەی لە هەمووی جوانتر، ئەگەر چی خاوەن بڕوانامە و پلەوپایەی بەرز بوو، کە چی مرۆڤێکی وەکوو خاکەکەی خاکی بوو، دواجار بەڵام داخەکەم شەهید بوو. مامۆستا بەهەمان هەڵچوونەوە پرسی، تەمەنی چەند دەبوو؟ شاهۆ ماوەیەک کەوتە بیرکردنەوە، وەکوو ئەوەی ڕەنگ و تەمەنی بێنێتەوە بەرچاوی خۆی.. لەجەنابتان گەورەتر بوو، چونکە ڕیش و سمێڵی تەواو سپی بوو، مامۆستا ئاهێکی بەبەرداهاتەوە، کەمێک ڕووگرژییەکەی نەما و لەبەر خۆیەوە گوتی، ئەویش هەر کوڕی ئەو میللەتە بووە، لەگەڵ کوڕەکەم جیاوازی نییە، زۆر غەمبارم بۆی مامدام شەهیدی خاک و گەلە بەهەشتییە، ئەوانە قوربانی و شەهیدی بە ڕەنگاربوونەوەن مەرتەبە و جێگا و مەکانەیان گەورەتر دەبێت.

مامۆستا بەیاوەری دوو پێشمەرگە پاش پشوویەکی کورت بەڕێکەوت. پێشمەرگەیەکیان بەپرتاو گەڕایەوە، وەکوو ئەوەی شتێکی گرنگی لە یاد چووبێت، یان بەتەمای ڕۆیشتنێکی یەکجاری بێت. ماوەیەك بە هەناسەبرکێ و بێدەنگ بەرامبەر شاهۆ و هاوڕێیەکانی وەستا. چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد، ئەو پرسیارەی لە دڵیدایە و بۆی ناکرێت، لە ئاکار و ڕووخساری بیخوێننەوە، چونکە شاهۆ لەو جۆرە خوێندنەوەی جووڵەی ماسوولکەکانی دەموچاوی هەڵبزرکاو کارامەیە. دەستی بە باخەڵیدا کرد بەناوی هەمووماں ئەو دیارییە پێشکەشی بووکی تازە دەکەین. پارچە پەڕۆیەکی دایە دەستی شەوبا، شەوبا لەشەرمان ئەوەندەی دیکە سوورهەڵگەڕابوو. پێش ئەوەی پشتیان تێبکات و بڕوات، شاهۆ پشتێند و قایشی قەدە باریکەکەی بۆ ڕاستکردەوە و سەری بە سەریەوەنا و بە لێو کروشتنەوە و بەدەم سەر ڕاوەشاندنەوە، شۆڕش گیان، بە لێزانانە ببیە سەر گۆڕەکانی بەر بێلایی شووشکەی، گۆڕی ناوەڕاست هی کورکەیە، ناوەکەی لە سەر کێلەکەی نووسراوە. پێشمەرگەکە بە بێ هیچ پرسار و ڕوونکردنەوەی دیکە ڕۆیشت. کاتێك شەوبا پارچە پەڕۆی کردەوە، تاکە گوارێکی نیوە لیرە بوو! شەوبا بزە گرتی و نیشانی شاهۆی دا، ئەوە چییە؟ ئەوە لە شار پوورم دای پێم بۆ دیاری ژنهێنان. باشە ئەدی بۆ لەلای شۆڕشە؟ وامزانی ئەو پێشی من ژن دێنێت، بەڵام نەسیب وا ڕێککەوت. شەوبا بە بەدگومانیەوە لە شاهۆ ڕاما، بەڵام شۆڕش ژن و منداڵی هەیە لەشار. ئەدی بۆچی تەنها یەك تاکە؟

شاهۆ بە گاڵتەوە هەرجارەی لەلاگوێیەکتی بکە، هەتا کونەکان کوێرنەبنەوە. بەڕاست تاکەکەی دیکە لەکوێیە؟ شاهۆ بێدەنگ بوو، غەمێکی قووڵ دای گرت، لەبەر خۆیەوە چەند هەناسەیەکی هەڵکێشا. شەوبا وای زانی پەیوەندی بە تەوارەوە هەیە، تاکە گوارەکەی دایەوە دەستی، زێڕم بۆ چییە؟ بۆخۆت زێڕیت. شاهۆ ڕووی لە شەوبا کرد، باشە کەس نەمابوو شوو بەکەسێکی برینداری وەکوو من نەکەی؟ ئەمن بابایەکی پێشمەرگەی بێلانە و جێگا و ڕێگا، ئەوەی هەمە و نیمە چەکێکی ژەنگاوییە، ئەویش هی حزبە، هەرکاتێك دامنا یان لێیان سەنمەوە دەکەوێتە دەستێکی دیکە، هەروەکوو ئەوەی ببڕای ببڕای لە دەستی مندا نەبوو بێت. دوورنییە ڕۆژێك هەر ئەو چەکە ئاراستەی سەر سینگی خۆم بکرێت و کۆتایی بە ژیانم بێت، بە قەد یەك دنیا لێی وەڕسم، بزانە ئەو لاوە خوێن گەرمەی ئەو باوکە داماوەی ئاگری جگەر هەڵیگرتووە و شاخ و کێو و بەندەنی

لەو ڕۆژگارە سەخت و ئافاتەی بڕیوە، بۆ دیدەنی، ئەو چوزانێت چەند پارچە ساچمەیەکی تیژی بێبەزەیی لاویەتیان لێساندووەتەوە. قەت هەتا ئەوڕۆژەی سەرسینگم گلەبان دەکەن دیمەنی ئەو لاوەم لەبەر چاو لاناچێت، ڕووخساری مندالآنەی خەڵتانی خوێن ببو، کەچی بە چاوکراوەیی بە ژیان پێدەکەنی، دەنگی هاوبیرەکانی، کە بە پەروشە بانگیان دەکرد.. کورە لاو کوردە دەنگت بێت وەلاممان بدەوە، تاکە وەلام و جوڵەی بزە و چاوە لێل و پەشۆکاوەکانی بوون، هەر چەندە پێڵوەکانیان قەپات دەکرد، بای ڕوانینێکی یەکجاری بێ ئاراستە و مەبەست دەمانەوە. دکتۆر هات پیرۆزبایی لە هەردووکیان کرد. هاوڕێ بە بێسیم داوات دەکەن، دەتوانی بڕۆی یان دەزگاکەت بۆ بێنین. شاهۆ بەسەرسووڕمانەوە! بە بێسیم هەواڵەکە بە مامۆستا مەڵێن، شۆڕش بۆخۆی دەزانێت چۆنچۆنی هەواڵی ئەمانی کوڕەکەی پێدەدات. دکتۆر بەدەمی داپچڕاوەوە دەستێکی لە ناوچاوانی شاهۆ دا. لەڕێی شادەماری دەستی کەوتە پێوانی لێدانی ترپەی دڵی. سەرێکی ناقایل بوونی بادا و دووبارەی کردەوە، دەستێکی بە باخەڵیدا کرد، حەبێکی بۆ ڕاداشت، سەری مەتارە فافۆنەکەی قەدی کردەوە، ئەو حەبە ئاوەدیو کە و پشوویەك بدە، زۆر وەستان و مەڕاقخواردن لەبەرژەوەندیت نین، هاوڕێیان لە سەرکردایەتییەوە لەسەرهێلن چەندجار داوایان کردووی، دەتوانی بگەیە لای دەزگاکە، یان بۆتی بێنین؟ بەلام بۆی هەیە لێرە لەو چالآییە وەری نەگرێت و پەیوەندی بپچرێت. شاهۆ هاتەوە سەر خۆی، زانی ئەگەر بێت و زوو ڕووداوەکان فەراموش نەکات، وا وابەستەی ڕابردوویەکی پڕ کارەسات و خوێناوی دەبێت، ژیانی لە بازنە و جوغزێکی چەق بەستووی خنکێنەر دێت ودەچێت و بیرکردنەوە و ئەندێشە دەبنە پێکهێنەری تەواوی ژیانی و لە هەموو کەس و دەوروبەر دادەبڕێت، هەر کەمێك پێش ئێستا بە نزیتکرین و خوشەویسترین کەس لە ژیانی دەگوت، هەر چرکەیەك بۆی هەیە گەردەلوولی مەرگ لوولی بدات و بەیەکجاری بسڕێتەوە. خۆئەگەر ئەوەش ڕوویدا چی لە دەست دەدات؟ نائومێدی برسییەتی، مەرگی خۆی، شەونخونی، تاریکی خرمەی تفەنگ، ناڵەی تۆپان، زیڕەی زارۆیان، ئاهونزوولەی پیرە دایك و باوکانی جەرگ سووتاو. ئەو شتە پڕوپووچانە کەی شایەنی ئەوەن مروڤ بە ئاواتیانەوە بژیت. ها، هاوڕێ بڕیاری چیتدا؟ بۆ دەزگاکە چاك کراوەتەوە؟ بەڵێ، ئەمڕۆ بەیانی وەکار کەوتووەتەوە. کەواتە بۆ خۆم دێم لێرە باش وەری ناگرێت. بەبێ دارشەق دیار بوو باشتر بووبوو هەندێك

سەرکەوت. پێشمەرگەیەك لەلای بێسیمەکە دانیشتبوو، گوێی بە بیستوکی دەزگاکە وەنابوو بە هەوای لێولێو هاژەهاژەکەی سەری بادەدا. ویستی بڕاوت. شاهۆ داوای لێکرد لەلای بێت. بە دەنگێکی نووساوی باریك دەستی پێکرد. هەلاو سێ، سێ، شاهۆ.. شە هید عەلی حاجی* بنار ئالەکووك چاکی نەبیسم، وەڵام. ماوەیەك بێدەنگ بوو گوێی هەڵخست. هاژەهاژەکە بەرەبەرە نەدەما، هەتا بە یەکجاری نەما، دە نگێك لە دوور کەوتە خوێندنەوەی ژمارە و شفرەکان. شاهۆ کەوتە گوتنەوەی سێ. سەرباز.. هیوا.. مامۆستا.. کاروخ.. شەش. ڕت. نەوەد و نۆ. ماوەیەکی باش بەردەوام بوو لە گوتنەوەی ژمارە و هێما و ناو. داوای لە پێشمەرگەکە کرد دووبارەی بکاتەوە. پاش دووبارەکردنەوەی دەزگاکەی قەپات کرد. دەفتەرێکی کۆنی شڕی پڕ ژمارە و هێمای دەرهێنا کە زۆر لە پەڕەکانی خوێناوی بوون، دەفتەری تاین چەندان شەڕی پێشمەرگەی دیتبوو، هەواڵی سەدان نەبەردی و سەرکەوتن و نووشستی و تێکشکانی لێ تومارکرابوو. پێشمەرگەکە کەوتە لێکدانەوەی شفرەکان. شاهۆ سیغارێکی پێچایەوە و دانەیەکیشی دایە دەستی پێشمەرگەکە، لێکدانەوەی زۆری دەوێت؟ هەروا چارەگێك. شەوبا پەیدابوو. هاوڕێ شاهۆ دوو میوان هاتوون داوات دەکەن. هەستایەوە، باشە واهاتم. ڕووی لە پێشمەرگەکە کرد، هەرکە تەواو بووی لەلێکدانەوەی شفرەکان ئاگادارم کەوە. لەگەڵ شەوبا هاتە خوارێ، نازانی کێن؟ نا، یەکەم جارمە بیانبینم. لە شارەوە هاتوون؟ شەوبا دەستێکی بە بەرمەمکە قووتەکەی لای ڕاستییەوە گرت و دەستێکی بە قەدی شاهۆوە گرت، ڕەنگ و ڕوویان بە چیانشین دەچن، نەك شارنشین! شاهۆ دەستی لەسەر شانی شلتر کرد، پاشان بە میهرەبانییەکەوە شانە نەرمونۆڵە ناسەکەکەی گوشی و بە خۆیەوە نووساند، جا باشە خانم شێوەی شاریی و لادێ چۆنچۆنی لێکجوودا دەکەیەوە؟ یان لە ناوچەوانیان نووسراوە، سەر ڕووتی ناو شار یان پالە و جووتیاری لادێ. شەوبا وەکوو هەموو جارێك کە باسی خوێندەواری و نووسین دەکرا، هەستدەکرا لە جێگای خۆی دەست و پێی ساردەبوونەوە، یەکسەر بابەتەکەی دەگۆڕی یان لێی دەگۆڕا، بەڵام ئەو جارەی وەکوو ئەوەی زیاتر شارەزای شاهۆ بووبێت و تێی ڕادەدیت، ئەگەر ئەو شتە ئەوەندە بەلای شاهۆوە گرنگ با دەبوە بە بەربەستێك لەسەر ڕێی هاوسەرگیریان. کەچی زۆر بە سوپاسەوە داوای ژیانی بەیەکەوەی لێکرد. زۆردەمێکە ئەو غەمەی ماوەی

تەمەنی ئەڤینداریبیان مۆتەکەیەك بوو سەر سینگی شەوبای بەرنەدەدا ڕەویوەتەوە، بۆیە کەوتە ڕوونکردنەوەی بۆچوونەکەی، وەکوو دیارە خەڵکی شاریی پۆشتە و پاك و خاوێنن، بەڵام خەڵکی لادێ ئەوەندە کاتیان نییە گوێ بە ژیانی خۆیان بدەن.

هەڵکەوت و دکتۆر لەگەڵ میوانەکان دانیشتبوون. هەرکە شاهۆ گەیشت، هەردووکیان هەستان ڕۆیشتن. دووميوانەکە یەکێکیان ڕیش ماشوو برنجی، ئەوەی کەیان گەنجێکی باریکی درێژ بوو. شاهۆ بە خێراتنی کردن، فەرموون لە کوێوە هاتوون. بەتەمەنەکەیان ڕووی لە شاهۆ کرد.

جەنابت، کاك شاهۆی؟ شاهۆ بەڵێ.. کێ ئەو ناوەی پێ گوتن؟ لە کوێوە هاتوون؟ شەوبا هات سێ چای هێنا بوو بە خێرهاتنی میوانەکانی کرد. کابرا بە شاهۆی گوت:

بۆ دڵنیابوونت ئەك ناوی تۆناوی مامۆستا سەرباز، هیوا، دکتۆر بەردەوام دووبارەیان دەکاتەوە. مامۆستا سەرباز، هیوا چی دەربارەیان دەزانی؟ ئەمن ناوم ڕەحمانە، ئەوەش برازامە ناوی مەریوانە. بەخێربێن. کابرا لەبەری مەرگەی ڕاهاتووین! کاریمە قەیاغەوانین ماسی گرین. دەستی بە باخەڵیدا کرد، لەناو کیسەتووتنەکەی تاکە گوارەیەکی دەرهێنا. ماوەیەك فووی لێکرد بە پشتێندەکەی پاکی کردەوە، دایە دەستی شاهۆ.. بۆن تووتنی گرتبوو، شاهۆ ماوەیەك ئەودیوئەودیوی بە گوارەکە کرد. باوەڕی بە چاوی خۆی نەدەکرد. دایە دەستی شەوبا، ئەویش بەراوردێکی لەگەڵ هی خۆی کرد. ماوەیەك لەهەر دووکیان ڕاما، ڕووی لە شاهۆ کرد، دەزانی ئێستا نازانم کامە کامیانە، بەڵام بە قوڵابەکانی ڕاستوچەپ دیار دەکەوێت. شاهۆ گوتی جارێ واز لەو قسانە بێنە دەتوانی بە تەنیا بە جێمان بهێڵی. شەوبا هەستا ڕۆیشت.

شاهۆ بانگی کرد، کوا گوارەکان. کابرا ڕووی لە شاهۆ کرد ناسیتەوە؟ شاهۆ دوو چاوە قاوەییە گەورەکانی ئەوەندەی کە گەورەتربوون. تێم ناگەیەنی ئەو تاکە گوارە بەکوێدا گەیشتۆتە لای تۆ. تەماشەیەکی پێشمەرگە پاسەوانەکەی بەرامبەری کرد، دوو پەنجەی لەژێر چەنەگەیەوە بەرز کردەوە، واتە لە نامادەباشیدا بە، ڕووی لە دووکەسە کرد. ئەوە تاکە گوارەیە لەلای پێشمەرگەیەکمان بوو بەناوی (شەپۆل) شەهید بوو چی ئێوە دەکات؟ کابرا ترسا. کاك شاهۆ ئەگەر ئێمە پیاو خەراپ بوونایە و بەپێی خۆمان نەدەهاتینە

نێره. دوایی خاوەنی ئەو تاکگواره شەهید نەبووە، لەخوای بەزیاد بێت لەژیاندا ماوە. شاهۆ قوڕگی وشك بوو، چۆن چۆنی؟ تێم ناگەیەنن بەبەر چاوی خۆمەوە لێی درا ئاو بردی. کابرا.. ئەوەیان ئاگادارنیم، بەسەرهاتەکەی لەلای ئێمە نییە بەڵکوو کەسەکە لەلامان پارێزراوە... هەتا دوێنێ زمانی شکابوو، چەند جار لە شار دکتۆرمان بۆ هێنا، برینەکانی سارێژبوون بەڵام ئاگای لەخۆی نەبوو. لەدوێنێوە بە تەواوی بە هۆش خۆی هاتۆتەوە. گوایە لەشەڕێکی قورس پێکراوە و ئاو بردوویەتی، قسەکەی ڕاستە لەبەر ئەوەی مستەفای کاکم وەکوو من ماسیگرە، پێشی یەك مانگ زیاتر کەمتر نازانم. چونکە کاکم وەهای شاردبووە، هەتا ژن و منداڵەکەی خۆی نەیانزانی بوو. شاهۆ هەستایەوە و چەند جار ئەو لاو ئەولای ماچکردن، ماڵی کاکت لە کوێیە؟ ئەویش لە خۆمان نزیکە، کەواتە چەند پێشمەرگەتان لەگەڵ دەنێرم بابی هێننەوە. کابرا گوتی: دەزانی زۆر بێتاقەتە.، نازانم دەتوانێت ڕێ بکات یان نا، بەڵام دەتوانن لەگەڵ ئێمە بێن. شاهۆ هەر بەپەلە سێ پێشمەرگەی ئامادە کرد، شەوبا بە شاهۆی گوت ئەمن دەچم، کەسیان نای ناسن لەمن زیاتر. شاهۆ زۆری پێخۆش بوو. بانگی دکتۆری کرد هاوڕێکیان دەتوانی داودەرمان لەگەڵ خۆت ببەی لەگەڵیان بچی؟ دکتۆر زۆر بە کەیفەوە خۆی ئامادەکرد، شاهۆ هەر پێنجیانی بانگکرد. ئەو نیشان و قسانەی ئەوانە باسی دەکەن هەر هەمووی ڕاستن، هەستێکی زۆر بەهێزم هەیە شەپۆل ماوە نەمردووە ئەو جارەش ناوچەوانی شەپۆلم ماچ کردبا، ئاخ شەپۆل بەس بۆ خۆم دەزانم چی داخێکت بە جەرگمەوە ناوە، دەبێ زۆر وریا بن، لەسەر هەستبن، کەس کەس بەجێنەهێڵێت. کابرا هات بەلای پێشمەرگەکان. دووبارە دڵنیایی کردنەوە، کاك شاهۆ برادەران، باوەڕبکەن هەر لەگەڵ دەرچوونتان هەتا گەیشتنەوەتان بۆ ئێره، مەرجی پیاوەتی لە چاوی خۆمان زیاتر دەتان پارێزین. شاهۆ پێی گوت، مامە گیان مەسەلە باوەڕ پێکردن نییە، زۆر ناپاکیمان لە لایەن نزیکترین دۆست و لایەنگری خۆمان لێ کراوە بۆیە بە گومانین بەرامبەر بە هەموو کەسێك. کابرا جا بۆ دڵنیابوون، ئەم کوڕە لاوەی برازام با لە لاتان بێت هەتا پێشمەرگەکان بە سەلامەتی دەگەڕێننەوە! ئێمە خانەوادەی (کوێخا سەرشێوی) هەموو ژیانی خۆمان لەگەڵ پێشمەرگان بردووەتە سەر، لە بنەماڵە و تایەفەکەمان شەست و دوو شەهیدی پێشمەرگەمان هەیە، لە شۆڕشی ئەیلولەوە. شاهۆ دڵی ئاوی خواردەوە.

پاش کەمێك شەوبا و سێ پێشمەرگە، لەو شوێنەی مامۆستا سەرباز و هاوڕێیەکانی ئاوەدیو بوون و نەگەڕانەوە. لەهەمان قوتە شەوبا هەتا لەچاو ئاودیوبوو، ئاوڕی بەلای شاهۆدا دایەوە. شاهۆ حەزی دەکرد شەوبا پەشیمان بێتەوە و بگەڕێتەوە، بەڵام لە پێش پێشمەرگەکان لەچاو بزربوو. شاهۆ ماوەیەك تاس بردیەوە. تەواوی شەڕەکەی دەریاچەی هێنایەوە پێش چاوی خۆی، لێدان و برینداربوونی خۆی، بەبەر چاوی خۆیەوە شەپۆل چەند فیشەکی گڕدار لەپشتی دران و لە سنگی دەرچوون، لەناو ئاو، دیتی باڵەکانی بڵاوکردبوونەوە ئاو بەرەو خوار بردی. زۆر سەرکۆنەی خۆی کرد باشە بۆچی خۆم بە ئاوێدانەدا و فریای نەکەوتم؟ بەهەموو باوەڕی خۆی شەپۆل شەهید بووبوو پاشان شەڕەکە زۆر قورس بوو، دەبوو سەرپەرشتی شەڕەکەی بکردبا، ئەگەر بەهانای شەپۆلەوە چووبا دەیان گوت هەڵاتووە. لەلایەك زۆر خۆشحاڵ بوو بە بیستنی هەواڵی شەپۆل بە زیندوویی. لەبیران ڕاچووبوو باشە مامۆستا و ئەوانیکە بۆ دەنگیان نەبوو؟ پێشمەرگەی سەر دەزگاکە هات، زۆر بەکزیەکەوە پارچە وەرەقە و دەفتەرەکەی لە پێش داناو بە دوو چاوی تەڕەوە تەماشای شاهۆی کرد. شاهۆ پارچە وەرەقەی دەستدایە لەگەڵ خوێندنەوەی یەکەم ڕستە، وەکوو نارنجۆکێك بە ڕوویدا تەقیبێتەوە. وەرەقەکەی لەدەموچاوی دوورخستەوە دووبارە دەستی کردەوە بە خوێندنەوە. ئەوە چییە هاوڕێ؟ پێشمەرگەکە زیاتر بێدەنگ بوو، وەڵامم بدەوە چی نووسراوە؟ ئەوەی خوێنتەوە هەر ئەوە نییە، تەماشایەکی دەفتەرەکەش بکە. دەفتەری چی مامۆستا و هاوڕێیەکانی شەهید بوون بەداخەوە ئەو ڕێگایەی لەسەری دەڕۆین ناوی خۆی بە خۆیەوەتی، پێشمەرگە لەدەفتەرەکەش نووسراوە بە زووترین کات خۆتان خڕدەکەنەوە. جەنگی هەشت ساڵەی ئێراق و ئێران کۆتایی دێت. شاهۆ سەرەگێژەی گرتبوو نەیدەزانی چی ڕوودەدات.. وەکوو مردوویەك بەسەر دنیاوە نەمابێت. ئەوەشیان هەر تاوانی منە، کەسی وەکوو من بۆ ژیان باش نییە! مردنی زۆر باشترە. ئەگەر لەبەر خاتری تەوار نەدەبوو دەستی بۆ دەمانچەکەی بن سەری برد، پێشمەرگە خۆیان بەسەر دەستیدا دا، کەوتنە ماچکردنی، دەستەکانی شلبوون. لەگەڵ شەهیدبوونی هەر پێشمەرگەیەك شاهۆ، نەك سەرکۆنەی خۆی دەکرد، بەڵکوو لەژیان تەواو وەڕەس دەبوو. ئێوارە لە ڕێگای ڕادیۆ شرەکەی بارەگاوە، گوێیان لێ بوو ئیمام خومەینی گوتی، ڕاگرتنی جەنگ بۆ من خۆزگە پەرداخێك ژەهرم خواردبایەوە بڕیاری

ڕاوەستانی جەنگم نەدابایە. بەڵام جەنگ جەنگی نێوان دوو وڵاتنی دراوسێ نییە جەنگی ئێرانە بەرامبەر بەزۆرینەی عەرەب و تەوای ڕۆژئاوا. ڕاوەستانی جەنگ، ئەگەر بۆ خومەینی پەرداخی ژەهربێت، لەهەر دووك لا چی لەئێراق، چی لە ئێران، بۆ کورد بەهەزاران قوربانی لێ دەکەوێتەوە؟ لەباتی یەك شاڵاوی ئەنفال، دەبێ ئەنفال لە دوو ئەنفال بژمێردرێت! هەرچی گازی ژاراوی و کیمیایی هەیانە پێویست ناکات بەیەکتری داکەن، برا موسڵمانە کوردە هەژارەکە، ئاسانترین و باشترین برای دین و دنیایە بۆ سەرفکردنی باقی کیمیایەکە. هەرچی سەرباز و جاشی بەرەکانی جەنگ هەیە، بەرەو کوردستان ڕاپێچی دەدەن، بەڵام کوردیش هەروا دەستەوستان ڕاناوەستێت.

شاهۆ لە ژیانیدا، بە قەد ئەو ڕۆژە بیرو هۆشی پەرشوبڵاو نەبووا هەرچرکەیەکی بە ساڵێك لێ دەڕۆیشت. کەسی وای لەدەورە نەمابوو.. سێ بریندار بۆخۆی بریندار، بنار سووتا و چیا گڕگرتوو، کوردستان وێرانە و کەلاوە، بە هەموو ئامار و لێکدانەوە زیاتر لە نیوەی کورد، لێقەوماو و سەرگەردان، شۆڕش لەوپەڕی لاوازی، پێشمەرگە ورەی بە قەد لووتکەی هەموو چیایەکان بەرز. قوربانیانی (هەڵەبجە و، ئەنفالو، گەرمیان و، بادینان، زۆر بڕستی لێ بڕی بوو. چارەنووسی تەوار بە کوێ گەیشت؟ هەتا شەو داهات. دەستەیەکی زۆر گەورەی پێشمەرگە لە گەرمیان، هەولێر، سلێمانی، لەزۆربەی ناوچەکان، ڕوویان لە چیای کۆسرەت کرد، بۆ خۆشاردنەوە و ڕاوێژکردن لەسەر ئەوەی چەند پێشمەرگەیەکی دەستەی بچووکی گەنجی ئازای چوست و چالاك، وەکوو پارتیزان لەو ناوە دەمێننەوە. لەناو هێزەکە چەندان بریندار و ژن و منداڵی پێشمەرگە و هێزی پشتگیری.. شاهۆ لەگەڵ هاتنەوەی شەوبا و هاوڕێکانی. بە یاوەری شەپۆل دوو هاوڕێ کۆنە بریندارە بێهێزەکە یەکتریان لەئامێزێ کرد، لە ماچکردنی یەکتری بێزار نەدەبوون، بەڵام شاهۆ بە دیتنەوەی (تەوار) هاتنی لەگەڵ هێزەکە، بە یاوەری (کاك فەرەج و دکتۆر)، برینی خۆی برینی شەپۆل، قاچ شکانی شەوبا لەکاتی هێنانەوەی شەپۆل لەبیر چۆوە. شاهۆ بە دوور و درێژی باسی سەفەر و ناو شار و هەموو شتێکی لە تەوار پرسی. بەڵام تەوار لەبەر هیلاکی و نەخۆشی، هەرچەندە زۆر باشتر بوو لە جاران، وەڵامەکانی کورت بوون. شاهۆ کاك فەرەجی جیاکردەوە زۆر بەووردی کەوتە پرسیاری چۆنیەتی شەهیدبوونی سێ هاوڕێیەکەیان، ئایە دەستی ناپاك بووە؟ یان ڕێکەوت.

فەرەج ئەوەندەی بیری کردەوە نەیتوانی بۆنی ناپاکی لە ڕووداوەکە بکات، لەدوای شتەکە دەچین، بەڵام بەڕاستی ئەو سێ شەهیدە قارەمانە بۆ دۆست و دوژمنیان سەلماند پێشمەرگە مانای چییە؟ دکتۆر بەو نیوەشەوە دووبارە کەوتەوە پێچانەوەی قاچی شەوبا، هەردووک دکتۆر لەسەر ئەوە کۆک بوون، قاچی تەنها کوتراوە و ئێسقانەکانی ساغن. شاهۆ هەرچی ڕوی دا، لەبەر چاوەکانی تەواردا توانەوە، لە ژێر ڕووناکی مانگە شەوەکە، تەوار پاش چارەسەر دوو چاوە شینەکانی دەدرەوشانەوە... لەناو چاوەکانی هەرچی خەموو ئازار هەبوون توانەوە! تەواریش لە باوەشی شاهۆ نەدەهاتەدەر. شاهۆ ڕووی لە هەموو پێشمەرگەکان کرد، داواکاریەکم لە هەمووتان هەیە، با تەوار نەك تەواری ئەنفال بێت، با تەواری هەرهەموومان بێت، ژیان و کاتی خۆمان بۆ تەوار تەرخان بکەین، پێشمەرگە نەك لەو بارەگایە جەنجاڵە.. لە هەر شوێنێك با ناوی تەوار مانای زۆر قووڵی دەدا. کۆست و کارەسات، جینۆساید، کیمیای ژەهراوی بوون، لەبەرامبەردا خۆڕاگری، چاونەترسی دەریایەك لە نهێنی.. هەرئەو شەوە پێشمەرگە بەناچاری بنە و بارگەی تێکنا، هەرچی بریندار هەیە بە چەند ئەسپێك لەگەڵ تەوار و شەوبای پێشکاو، بەو شەوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی کۆیە، لە سماقوڵی سەروچاوە فڕۆکەی جەنگی لە هەموولایەك کیمیای باران بوو. لە ئاوەگرد سەنگەرە کۆنەکانی شۆڕشی ئەیلوول، دووبارە لێدرانەوە و قووڵترکران بۆ بەرەنگاربوونەوە، دوژمن وای زانی دەشتی کاکی بە کاکییە، لەوسەری هەتا ئەو سەری تەراتێنی تێدا بکات. لە ئازمنین نزیکەی سەد پێشمەرگەیەك بەرەنگاری چەند هەزار جاش و سوپا بوونەوە. خۆبەختکەرانی سەدام، بە کۆپتەری بارهەڵگر و فڕۆکەی جەنگی لە بەرزاییەوە بەپەرەشووتی ڕەنگاوڕەنگ بۆ دەوروبەری گۆڕەپانی شەڕ دادەبەزین، ناوچەیەکی دیاریکراو نەمابوو بۆ شەڕ و پێکدادان، بەرەی جەنگ هەموو شاخێك، هەموو کەلاوە گوندێك، سووتابوون منداڵ لەناو بێشکە بەتەنیا جێ هێڵدرابوون، ئەگەر جاران یەك تەوار هەبوو.. ئێستا کەس ناپرژێتە سەر ژماردنی تەوارەکان، میللەتی کورد هەرهەمووی ئەنفالکراوە. دوژمن دەیەویست بیسەلمێنێت پێشمەرگە نەماوە، ڕێگا لە کاروان بگرێت نەگەنە جێگای عاسێتر، گەیشتنی پێشمەرگە بە(قەندیل) مانای جەنگی سەرتاسەر و درێژخایەن، پێشمەرگە چەند وەخت بوو بەدوای شەڕی دەستە و یەخەدا دەگەڕا. جەنگ تەنها بە فڕۆکەی جەنگی مەرگهێنەر بوو، دۆڵ و ئاسمان و زەوی، هەتا

چاو بڕیکات سەربازی تایبەت بە پەڕەشووت بەرەو خوار شۆڕدەبوونەوە، باڵ و پێیەکانیان بۆ دابەزین شل دەکرد، سەرەتا بە دووربین دەبیندران، وەکوو داڵاشی گەورە چەند پێچێکیان دەخوارد، هەتا دەکەوتنە سەر زەوی بە فیشەکی پێشمەرگە چەندجار پێکرابوون، ئەگەر پشیلەی حەوت گیانبان، قەت گیانێکیان نەدەگەیشتە سەر زەوی. لەچیای (ئاوەگر) لە هەموو لایەك بە کیمیایی هێرشی کرا سەر، شەڕ و پێکداداان بوو. ڕژێم هێشتا شەڕی نە لە دژێ ئێران، نە لەدژی کورد ڕانەگرتبوو، بە سەدان هەزار جاش و سەرباز و خۆبەختکەری سەدام، بە نوێترین و کوشندەترین چەك هێرشی هێنایە سەر پێشمەرگە. کاروان تەنها نەبوو بەپانای دۆڵی بالیسان، لە هەموو لایەکەوە خەڵك بە ڕووت و پێخواسی بەبێ نان و ئاو بەرەو کۆچ و لەناو نیشتمانی خۆی ئاوارە دەبوو، هەر ساتێك تێدەپەڕی ڕێگاکان زیاتر دەدەمخران بە ڕووی خەڵکدا نائومێدی گەورەتر دەبوو. بۆ شەوی دووەم بەرەو هەورێ و دۆڵی بالیسان. لەڕێگا تەوار بووبوو بە حیکایەتخوانی شەوبا و، شەپۆل بە هی شاهۆ.. شەپۆل گیان ئێستاش باوەڕ بەچاو و دڵی خۆم ناکەم ئەتۆ و تەوار بۆ من ماون، شەپۆل بەنووزەنووز کەوتە گێڕانەوەی بەسەر هاتەکەی، ئەو شەوەی لە ناو دەریاچە شەڕمان کرد، هەر ئەوەندەم ئاگا لەخۆ بوو چەند گوڕە ئاگرێك لە سنگم دەرچوون.. فیشەکەکان بەهێزی خۆیان فڕێیاندامە ناو ئاو، زۆر بە تیژی بەرەو خوار ڕای دام. هۆشم بەبەر خۆمەوە مابوو، توانای هاوارکردن و زۆر جوڵەم نەمابوو. ئەتۆم دەدی لە ناوئاگری گڕدارەکان. پاش کەمێك پارچە شتێك هاتە بەردەستم، نازانم پارچە بەلەم بوو، لاشە بوو، گرنگ شتێك بوو بەسەر ئاوەوە. بەبەر سنگم دا. لە کەناری ئاو دوور نەبووم. سەرەتا دەنگی هەموو تەقەکانم گوێ لێ دەبوو، پاشان، هیواش هێواش دنیا لەبەر چاوم ڕەشتردەبوو وای لێهات نەمزانی چیم بەسەرهات، هەتا لە ماڵی ماسیگرێك چاوم کردەوە. لەپشتەوە شاهۆ دەنگی نەمابوو. لەپێشی ئەسپ شەپۆل چەند جار بانگی شاهۆی کرد.. شاهۆ وەکوو ئەوەی لە خەوێکی قووڵ وەخەبەر هاتبێت، بە شڵەژاویەکەوە، ها هاوڕێ گیان. شەپۆل پرسی، شاهۆ خەوتبووی. نا. دەزانی ئێستا لەکوێین؟ نا. دنیا زۆر تاریکە و چاوەکانم زۆر بەلێڵی لە پاش برینداربوونەکەم دەبینن! ئەگەر دەستم نەگرن بەرچاوی خۆم نابینم. ئێرە دۆڵی بالیسانە، ئەو قوپەی ئەوبەر کاروخە، ئاخ کارۆخ ئەو شوێنە مەرگهێنەرەی تەوارمان لێ دۆزیەوە. چاوەکانی پڕبوون لە ئاو، دەنگی قوڵپی

گریانی به ئاشکرا دەبیسترا. شەپۆل ئێرە پڕی بۆسە و مۆڵگەی جاش و سەربازگەیە، هەر لێرە دەرچووین لەپشتی کارۆخ مەترسی کەم دەبێتەوە، لە پێشیەوە تەوار خۆی بە شەوبا گرت بوو، شاهۆ داوای(ڕێناس و چاوساخی) کرد. پاش کەمێك کابرایەکی خڕکەڵەی چاو گەورە لە پێشیەوە ڕاوەستا، فەرموو هاوڕێ داوای منت کردبوو. ئەتۆ ڕێناس و چاوساخی ئەو هێزەی؟ بەڵێ هەتا کونەکۆتر شارەزام، لەوێوە کەسێکی کە دەبێتە چاوساخ. زۆر چاکە، لەگەڵ نزیکی کارۆخ بووینەوە بزانە ڕێگات بگۆڕە، ماوەیەك بیری کردەوە، کاك شاهۆ بۆخۆت بەو ناوەیدا هاتوچۆت کردووە، زۆر ئاستەمە کارۆخ تێپەڕێنین، بابزانم چۆن دەبێت؟ لەتاریکی شەوە زەنگەکە، کاروانی هیلاك و بریندار و پەککەوتە و ژن و منداڵ، زۆر بە هێواشی ڕێگایان دەکرد. چەند پێشمەرگەیەکی گەنجی ئازای چاونەترسیان لەگەڵ دابوون، هەموو ئەرك و شەڕەکان زوو، زوو، کورت و جەرگبڕ، لەبەر برینداەرەکان خۆیان لەشەڕ دەپاراست. زۆر لەناکاو چەند دەستڕێژێك بەسەر سەریان داکران، ئارامی شەویان شڵقاند، ئەسپی شەوبا و تەوار چەمووش بوو، لە ترسی تەقەکان ڕەویەوەوا هەرچەند هەی های و هەوڵیاندا گوریسەکەی بگرن. بە چوار ناڵی بەبەر چاوی هەموو پێشمەرگەکانەوە، لە پێشی هەموویانەوە ئەسپ بەرەو مۆڵگای جاشان هەڵات، شاهۆ چەند جار هاواری کرد، تەوار، شەوبا خۆتان فڕێ دەن. بەڵام ئەسپ ئەوەندە بە تەوژم قەڵەمبازی دەدا، کەس نە تەوار و، شەوبا هیچ سوارێك زاتی ئەوەی نەدەکرد خۆی فڕێ بدات، هەڵات گوێیان لێبوو جاشەکان هاواریان دەکرد، بیانگرن قوتاریان نەکەن. هاوارێك هات گرتمانن. لەتاوی تەوار و شەوبا، شاهۆ و شەپۆل لە پێشەوە و نزیکەی سەد پێشمەرگە خۆیان بە مۆڵگای جاشاندا کرد. شاهۆ پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد، کەس تەقە نەکات، تەوارررررررررررررررر. شەو با.

بەیاوەری تەوار کەوتنە دەستی جاش وسوپا.

# نسکۆ

بەپانایی و درێژایی دۆڵی گرگرتووی بالیسان، ئەو دۆڵەی زۆری هەرمزۆری جەستە بێنازە هەڵپروکاوەکانی هەڵگرتووە  بە تێڕوانینێکی ورد، لەژێر هەر تاشەبەردێك، هەر تیکە شاخێك، هەر دەوەنێك، دۆڵ و پێدەشت و کۆسار، چەندین مرۆڤی بێشومار لەگەڵ گەڵای وەریوی درەختەکان لەسەرکێشیدان، هەردوولامان بە گازی ژاراوی هەڵوەریوین، بەڵام کامەمان ژمارەمان زیاترە، کەس نازانێت ئەنەوەی قەڵاچۆی کردووین ئەنەوەی فرمێسکی تیمساحی بۆمان دەڕژێنێت، هەتا چاو هەتەر دەکات لەو گۆڕەدا پەرشوبڵاو بوونەتەوە. ئەوانە دەربازبوانی شاڵاوی ئەنفالن. بەچ کوڵە مەرگییەک چەند هەنگاوێک مەرگیان لەخۆیان دوورخستووەتەوە، کەس لەکەس ناپرسێت ئەتۆ خەڵکی کام دەڤەری ئەنفالکراوی، هەرموویان دەزانن ئەوانە، خەڵکی ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستانن، سیما و جەستەیان گازی ژاراوی و کیمیاییان لێدەبارێ. یەک ڕابردووی پڕ لە هەوڵی سرینەوەیان، داهاتووشیان وەکوو ئێستان پڕ کارەسات و لەناوچوونە، ئەو ناوانە زۆرتر لەگەرووە تاسواوە نووساوەکانەوە بەرگوێ دەکەوتن. قوربانیانی دۆڵی جافایەتی سەرگەڵو بەرگەڵو، پاشان ناوچەی قەرەداخ بازیان و چەمچەماڵ و کەلار و کفری و باوەنور  هەرچی گوند و شارۆچکەی سەر بە کەرکووك و خورماتوو و قادرکەرەم. لەولاشەوە سەنگاو و قۆڕیچایی. تەقتەق و دەربەندیخان و ناخجەلەر. شوان قەرەهەنجیرە. لەمەلەکان و لە ناوچەی ئاکۆیان، لە شێخ وەسانان، بێتوێن و سماقوڵی و گەلی سماقووڵی سەروچاوە. لە هیران و نازەنین، لە کونەفلووسە و، کامووسەك و شەقڵاوەی خۆشناوەتی و ڕەواندوز و چۆمان و سۆران. لەو ناوچانە لە هەموو جۆرە گازی ژاراوی کیمیای بە خەستی و بێ بەزەییانە بەکارهاتوون. هەتا چاو بڕ بکات سەد هێندەی ئەوان چەکداری مەرگهێنەر دەست لەسەرچنگ لەئامادەباشیدان بۆ تەقەکردن لەهەرچی گیانلەبەربێت و بجوڵێتەوە. لەناو ئەوانە پاش ڕەوینەوەی ئەسپی چەمووشی (تەوار و شەوبا) ڕووەو مۆلگای جاش و سوپا.. چاوەڕوانی

ڕوودانی کارەساتێکی گەورەی چاوەڕواننەکراوی ناخۆش دەکرا. بەتایبەتی لە گەرماوگەرمی توندوتیژی ئەنفال. لەو کاتەیدا لەهەر بستەخاکێکی کوردستان لافاوی خوێن لە هەموو لەیەك هەڵدەستێت. پێش وەستانی جەنگی هەشت ساڵەی کاولکەری دوو وولات. هەروا چەند مانگێك بگرە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر، پێشمەرگە بەشی زۆری ناوچەکان لەژێر چنگی پۆڵاینی دابوون و ئازادبوون، کەچی ئەوەتا ئەو شکستیە سەربازی و دەروونییە وای کرد، دووبارە پاوەن و داگیرکرێنەوە. ببنەوە بە زەوی و خاکی قەدەغەکراو. لافاوی خوێنی بە ناهەقرژاو، لە هەموو کونج و بستەخاکێکی ئەو وڵاتە خاپوورکراوە هەستاوە. هەرچی مانا و هەستی مرۆڤایەتی هەیە نەماون. خوێن هەرزانترین شت و خوێنڕشتن ئاسانترین کارە. کورد دەزانێت بەعس بە خوێن هاتووەتە سەر دەسەڵات و بەردەوام دەبێت لەسەر خوێنمژین، هەر بە خوێنیش کۆتایی دێت. هەرچی جاش و سەرۆکجاشی لەدەورەی خۆی کۆکردوونەتەوە، ئەگەر خوێنمژیش نەبن دەیانکاتە خوێنمژی شانۆگەرییە تراژیدییەکان.

قوربانیان و بەرکەوتووان، سەرەتا بە فرمێسکڕشتن دەستیان پێدەکرد، هەتا سۆمای چاویان دادەهات، پاشان زەرداو کەفاو لەدەمولووتیان دەهات، بە توندی تووشی ڕشانەوە دەبوون، پڕ بە دۆڵی بالیسان هاواریان دەکرد، داوای بەزەیی و ڕەحم و یارمەتی و چارەسەر. چاوەکانیان وەکوو گۆمی خوێنی لێ دەهات، لەتاوی ئازار و سووتانەوە، تەنگی هەناسە. پڕیان بە چەکی دەستی پێشمەرگەدا دەکرد، یان داوای چەقۆیەك، خەنجەرێك شتێکی تیژ هەردووك چاوی خۆیانی پێهەڵکۆڵن، کۆتایی بە ژیانی خۆیان و ئەو هەموو ئازار و مەینەتییە بێنن. بەبێ جلوبەرگ و خواردن لەو دۆڵە بێکۆتایی و ساردوسڕە دەسووڕانەوە. برینەکانیان خوێنی لێ دەچۆڕانەوە. هەرکەسێك بەلایاندا تێدەپەڕی بەپەلە لێیان دووردەکەوتەوە. هەندێکیان بە گریان و فرمێسك ڕشتنەوە گرتبوویان، زۆربەیان بە پێکەنینەوە. لەسەر جۆری گازە ژەهراویەکەدەما. سەدان دایك لەبەر چاوی خۆیان کۆرپە و منداڵە برسیەکانیان گیانیان لەدەست دەدا، هۆش یان توانای ئەوەیان نەبوو بەلایاندا بچن. ئا لەوکاتە هەستیارە و لەناو ئەو ئاپۆڕای کۆچبەرە، شاهۆ بەئاشکراو لەدڵی خۆیدا بۆ سەدەمین جار نەك سەرکۆنەی خۆی دەکرد، بەڵکوو زۆر ڕقی لە خودی خۆی هەڵدەستا، باشە بۆچی تەوار لەشار لەلای بەختیار نەمایەوە؟ شار باشترین جێگا بوو بۆ تەوار. چارەسەری تەواوی بۆ

دەکرا، دەناردرایە بەر خوێندن. بەختیار ڕاستی دەکرد، لەو کێو بەندمنە جگە لە کیمیایی و مەرگەسات چی دیکە بەدی دەکەم؟ ئەگەر ئەوکاتی لە (گۆڕستانی قەڵای شەهیدان) لەگەڵیان نەبوایە و لە شار با، نە دووپشکە ڕەشە پێوەی دەدا و چزەی لێهەڵدەستاند، نە ئاواش ژیانی دەکەوتە مەترسیەوە. ژیانی لەهی پێشمەرگە قورستر و برسیەتی قوڕبەسەری، هەتا ئێستا کەسێك خزمێك ناسیاوێکی هەر دەدۆزیەوە؟ کچێك بەو تەمەنە پەپوولەیە، ژەهر و ژەهراویبوون کاڵایەکە و بەباڵای بڕاوە، باشە بەختیار دەیگوت کەسوکاری هەڵەبجەین. نا. نا دەگەڕایەوە (هەڵەبجەی شەهید)و ئەویش دەمێك بوو، وەکوو هەزاران پەپوولەی گیانهەڵومری و قوربانیان لەژێر خاك دابوو. خۆ ئەگەر هیچ نەبایە لەنزیک کەسوکاری خوشک و براکانی دراوسێ و خزم و دۆست و ناسیاوەکانی دەبوو، لەگەڵ هەموو منداڵە چاوگەشە پڕ لە کیمیایی شاری بەبەرچاوی هەموو گەردوونەوە بۆ چەندین جار لەخاچدراو دادەبوو. هەرچەند جارێک بە دارە ڕاست و چەپەکەدا دەکرێت، ویژندانە ترساو و تۆقیوەکان چاویان دەبڕنە ئاسمان، بزانن گیانی هەزاران کەسی لە عیسا پاکتر لەئاسمان دادەدەزبەنەوە، کەچی لە شوێن گوڵە حاجیلە و چڵە نێرگزەکان سەروەدەر دەنێنەوە، ئەوە چ سەرهەڵدانەوە و ڕابوونەوەیە، بە ڕۆندک و ئەسرین بەڕێ دەکرێن بە خەندە و قاقا دەگەڕێنەوە. شاهۆ بە بێ ویست و ئارەزووی بەشێک بوو لە و فرمێسک و قاقایە ئایا ئەوە سەرەتایی شێتتیەکی یەکجارییە، یان یاخیبوون و ڕاماڵینێکی سەرتاسەرییە، هەرچەندی دەکرد، جیڕە جیری ددان کرۆشتنی لێوە تەزیوەکانی، زۆر هەوڵی دەدا لەو چرکەساتە دژوارە ددان بەخۆیدا بگرێت. لەبەر خۆیەوە هەر دەیگوت و دەیگوتەوە ڕزگاری دەکەم، هەرچی کردوومە لەبەر خاتری تەوار کردوومە، ئەوەندەی لەبەر چاوی خۆم بووە لەچاوی خۆم باشتر پاراستوومە. شاهۆ بەسەر ئەسپەوە شەپۆل لەگەڵی بوو ماوەیەك بوو بەو جۆرە مابووەوە. بۆیە لێیان پرسی، هاوڕێ چی بکەین؟ نزیکەی سەد پێشمەرگە زۆر بە دڵێکی پڕ لە حەسرەتەوە چاوەڕوانی دوا قسەی شاهۆیان دەکرد. شاهۆ زۆر بڕوای بەخۆی و هاوڕێیە گیان لەسەردەستەکانی بوو، دەیزانی هەرهەموویان کوڕی دڵسۆزی نیشتیمان و ڕێبازەکەیانن. بۆیە ڕووی لە هەموویان کرد.. هاوڕێیان ئەوڕۆ ئەو ڕۆژمیە، چرکەساتێکە لەنێوان ژیان و مردن، لەنێوان خۆبەدەستەوەدان و دەستە وەستان چاوەڕوانی مەرگی تەواربکەین، یان بەخوێنی خۆمان ڕزگاری

بکەین. دەمێکە بە خوێنی خۆمان پاراستوومانە، چەندین قارەمانمان لەسەر مانەوەی تەوار لەژێندا شەهیدبوون. ئەورۆ رۆژی بەرخۆدانە، خوێنی خۆمان دەرێژین لە پێناو بەرگریکردن لەهەموو لێقەوماوێك بەتایبەتی تەوار. . ئەوەتا لەودیو ئەوگردە لە مۆڵگای جاشان گیراوە. ئەگەر فریای نەکەوین کارلەکار دەترازێت، تکایە دوام کەون. شاهۆ و هەموو پێشمەرگەکان زۆر بە تووڕەبوون و دەمارگیریەوە، بەبێ هیچ خۆ لە زەوی دان و گوێ بدەنە گەورەیی یان بچووکی مۆڵگا، هەرکەسە لەبەر خۆیەوە میلی چەکەکەی هێنایەوە و بۆ شەڕێکی قورس بەرەو پێش چوون. . پێشمەرگەکان زۆر دەمێك بوو شەڕی دەستەویەخەیان لەگەڵ جاش و سوپا نەکردبوو، هەر لەئاسمانەوە وەکوو هەموو جارێك مەرگ باریوە. هەڵوێستەیەکی دووبارە چاوی بە هەموو هاوڕێکانیدا گێڕایەوە، بێدەنگ بووەوە لەبیرانڕاچووەوە، بەڕاستی کارێکی زۆر خۆپەرستییە، خەریک بوو هەست و سۆز و بەرژەوەندی وام لێ بکەن شتەکانم لێ تێکەڵاو ببێت و وەکوو ئەوەی گیانی ئەو هەموو هاوڕێ نازدارە بۆ ئەوە هەبن بە گوێرەی ویستی من کۆتاییان پێ بێت، باشە چ ویژدانێک، کام یاساو نەریت ڕێگا دەدات لەپێناوی ژنێک کە خێزانمە پێشمەرگە لەو قات قڕییە شەهید ببن، ئەوە تەوار خاتوون و شازادە بێناز و تاقانەکەمانە ئەدی شەوبا چی؟ ئەمن ماف و ئەرکی سەرشانی خۆمە گیانی خۆمیان بۆ فیدابکەم، بەڵام ئەوانی دیکە بۆ ئەوە نەیانداوە شاخ. بۆیە ڕووی لە هاوڕێیەکانی کرد و بەدەم دابەزینی لەسەر ئەسپەکەی، هاوڕێیان تکاتان لێدەکەم ئێوە بڕۆن و بەردەوام بن لەسەر کاروان و ڕۆیشتنەکەتان، ئەوەی ڕوودەدا و هەوڵی ڕزگارکردنی تەوار و شەوبا دەدەم بەتەنها بەرپرسیاریەتی و ئەرکی خۆمە، دەمرم یان ئەوەتا لاشەی دابێژراوم لەپێش تەلبەندەکانی مۆڵگا و سەربازگەکان دادەبێژرێت و بەتەڵدرەکانەوە هەڵدەواسرێت، یان ئەوەتا ڕزگاریان دەکەم، ناوساری ئەسپەکەی شەپۆلی دایە دەستی پێشمەرگەیەک، لاوێکی بارێکی چاو درەوشاوە، دیار ڕەشتاڵکە ئاگات لە شەپۆل بێت، بەدەم ئەو چەند وشانەوە بەبێ ئاوڕدانەوە، بەڵام هەنگاوە سستەبە ئازارەکانی دڵنیایی بڕوابوونێکی زۆریان لێ دەباری، بەرەبەرە بەپێچە بارێکە خوار و خێچە غەمبارەکاندا دووردەکەوتەوە و لەبەرچاو بزر بوو.

پێشمەرگەکان هەرهەموو یان حەپەسابوون، بە تایبەتی شەپۆل لەگەڵ شاهۆ (دوو گیانی پرزە لێبڕاوبوون لە یەك کەللە و جەستەیەکی بیماردا) ساڵانێکە

سەرما و برسیەتی ڕەهێڵە و زریان کوێستان و گرەی گرکانی ئارانی گەڕمێنێ، گولله و خومپاره و ناپالمە زەبەلاح و بێبەزییەکان بەیەکەوە ئەوان هەردووکیان، بە جووتە و تاك تاك، چەند ماوەی نێوانیان بە کێو و زنجیرە شاخی یەك لە دوای یەکی ئەپساوەی سەر لەسەر هەورە غەمبارەکان درێژتر و دژوارتر بووبێت، لێك تێگەیشتنیان تەنانەت بە بێ ئەوەی دەنگیان بگاتە یەك یان جوڵەی دەمولێو و بە ئاکاری یەکتر بزانن، بە هەستە هەستیارەکەیان حاسەی شەشم ژان و ئازاری یەکتری دەچێژن، کاتێك شەپۆل نابینا دەبێت، بەڕۆژی ڕووناك بە ئاستەم تارمایی و تارووسکایی بەدی دەکات، وەکوو تیشکی زەردەپەڕی ئێواران لە ناو دارستانێکی چڕی درەختی سنەوبەر و دارکاژی لقوپۆپ تێك چرژاو و تێکەلاو، دەترووسکێنەوە، چاوە کزەکانی لەو تاریکەشەوە شوومە بێدەسەڵاتی و دەستەوستانی و ناچاری لێدەباری، ڕاستە کەسێکی گیانبەخشی هەمیشە ڕووح لەسەردەست بوو، ئەوەندە نافرەندراوە دەبێت ملکەچی بڕیاری کەسێکی لەسەرووی خۆیەوە بێت. یان ئەوەتا وەکوو هاوڕێیەکانی لەچاوەڕوانی بیستنی چەند دەسرێژێک بێت، کە ئاراستەی سەر سینگی کەسێکی ڕابەر و هاوڕێیەکی دڵسۆزی بەئەزموونی بەگیان لەخۆبردوو دەکرێت، ئەو هەمووساڵە بەیەکەوە، برسیەتی و جەنگ و سەرکەوتن و تێکشانەکانیان، ئامۆژگاری سەرنج و دڵسۆزیەکانی شاهۆیان، ئەوەتا هەر بە داواکاری و فەرمانی خۆی تاک و تەنها بەبەر چاویانەوە مەرگی هەڵبژارد، هەتا لە دواچرکەکانی ژیانیشی بیری لە خۆی نەکردەوە و خۆپەرست نەبوو، بە بیانووی ئەوەی باڵادەستە و بریندارە خۆی دابایە لایەک و بەردەوام با لەسەر دوورکەوتنەوە و بە چەند وشەیەک فەرمانی کردبا، بڕۆن یان ڕزگاریان دەکەن یان بۆخۆتان تێدادەچن، گاڵتەی بەو کەسانە کرد، بەرامبەر بە دیل شێر و لە مەیدانی جەنگ ڕێوی و لە کاتی دەستگیرکردنی کەروێشکێکی ترساو، بۆ خۆ قوتارکردن و گیاندەربازکردن، بەپاڕانەوە ئەمن دیلی شەڕ نیم، ئەمن دەستبەسەرکراوی بێتەقەی ڕێگای ئیشق و بەرەو پەردەی زاوایی و شاری هەنگوینی دەچووم، ئەوین و هەوای ئەڤین و ڕامووسان ڕای کێشام، نەک تەور و خوێن و تۆڵە و لەناوبردن، هەرچەندە دەڵێن ئەو دیلە بێچارانەی گوایە بە تەوری من پارچە پارچەکراون، ئەو منداڵانەی بە جەمادانەی کوردایەتی من خنکێندراون ئەو کەزی و پێست و بە دارگوێزەکانی پشتاشانەوە هەڵواسراون بەناوی هاوڕێ هودا، کارە قێزەوەنە زۆر و زەبەندەکانی منن، گوایە ئەو کات

واش بووبێت، ئەگەر تاکە فیشەکێکم بەڕووتاندا تەقاندبا، ئەوە مافی خۆتان بوو، لەناوم ببەن، بەڵام لەژێر چاوە شۆڕەکانی هێڵەوردە چرووپرەکانی دیمەنی سەدان دیلکوشتن بەدیدەکران. ئەتۆ ئەوجۆرە کەسەنیت، تۆ ئەو شاهۆیەی، ئەوەتا تەنها و تاقەکەس لەودیو گردۆڵکەیەکەوە بزربووی، شەپۆل بەدەم ئێش و ئازاری دەروون و جەستەی بۆ یەکەم جاربوو و بکڕووزێتەوە، وەرە و تەنیا مەڕۆ هاوڕێ و شەهێنەکەم، تەنیا مەڕو، لێت ناپاڕێمەوە لەو تاریکە شەوە لەو مەرگەساتە دەستم بگرە و واز لە هەموو شتێك بێنە، دەزانم، چما هەست ناکەم بە دەم بانگەوازی مەرگی تەوارەوە دەچیت. لە ئاست ناڵە و چریکەی دواهەناسەکانی تەوار هەرچی هەناسەی ناو سیەکانتە خەفەت کردووە و زیاتر و زیاتر پڕ بە پانایی ئەو گەردوونە  لە هەناوی خۆتدا هەڵبگری بۆ ئەوەی بەشی ئەوەندە بکات، هەناسەپێدانی تەوار بەردەوام بێت لە ژین، هەتا بە ساخ و سەلامەتی و تەندروستیەکی باشەوە ڕادەستی میللەت و کەس و ناسیاو و بنەماڵەی بکرێت، بە شانازییەوە ئەوەتا شازادە پرزەلێبراوەکەی ژان و ئازاری ئەنفال.. تەوار توانی هەموو مێردەزمەی خواکانی شەڕو ئەهریمەن و کاولکردن و قڕکردن تێك بشکێنێت. هەر ئەوەندەتان لەسەرە، هەتا ئەگەر تەوار جەستەیەکی سەرتاپا خۆخواردنەوە و بێدەنگی بوو، لە چاوە شینە ژاکاوەکانی لە پێستە پسی پاتە وەکوو پەلکی لیمۆ زەرد و گەچ لاوەکەی کەزی و بسکە شێواو و چەند مانگ شانە نەکراوە و ئاڵۆزکاوەکەی.. لەچاوەڕوانیتاندایە، شەپۆل و هاوڕێیەکانی.

به هەنگاوی خێرا خۆیان گەیاندە شاهۆ، هێشتا بە هەنگاوی وردورد بەرەو پێش دەچوو، کەسیان ورتەیان لێنەهات، بێدەنگ شانبەشانی بە چواردەورەیدا بە چاودێریکردنەوە هەنگاویان داویشت، شاهۆش پێبەپێی ئەوان دەڕۆیشت، ئەوەندە سەرگەرمی بیرکردنەوە بوو، لەو هاتنەیان، نە دڵمەند بوو، نە خۆشحاڵی  لە جووڵە و جەستەی بە دیدە کرا، بە ئارەزووی خۆتان هاتوون و بەشداری ئەو سەمای مەرگە دەکەن، کەس پەلکێشی نەکردوون، کە بۆخۆتان وەکو خۆم فێری سەرکەشی  و سەربزێوی و یاخیبوون و چەقۆ لەمل و گەردن سوینن، ئەوە بڕیاری خۆتانە، منیش بام لە کاتێکی وا هەستیار و بڕیاردەر نەك هاوڕێ پێشمەرگە گیان لەسەردەستەکانی ڕێگا دژوارەکان، بەڵکوو هەرکەسێکی کە بوایە، بۆ ڕزگارکردنی ژیانی دوو ئافرەتی دوور لە هەرچی ویست و ئارەزوو گیانی تۆڵەکردنەوە، سەری خۆیان هەڵگرتووە و ئاوارەیی بە هەموو ژان و ئازارە

کانیانەوە لە کوڵ دەنێن، دەستبەرداری خۆشەویستان و سەرتاپای یادەوەرییە تاڵوشیرنەکان دەبن، بە هەمان گیانی گڕگرتووەوە بە شداریم دەکرد. مادام هاتوو وەرن با لە هەموو لایەکەوە خۆمان بە مۆڵگای جاشانداکەین، چۆن ئەوان بە گاڕان بە گەلەکۆمەکی و لە ناکاو خۆیان بە بارەگا و جێگای خەوتن و داڵدەماندا دەکرد، ئەوەی هاتە پێشیان لەبن گردێك، لەبن ساباتێك لە پێش سیمی تەلدڕووی مۆڵگا، چاوەڕوانی سەدان چەکداریان دەکرد. بەڵام لەتاریکایی کەسێك بە چەکەوە وەستابوو، بانگی کردن.. برادەرینە! کاکە، ئاوساری ئەسپەکەی تەوار و شەوبای لەدەست بوو. وەرە برام هیچ خۆتان تێك مەدەن؟ ئەو دەنگە میهرەبانی و دڵسۆزی لێدەباری، دەنگێك بوو دوور لە خواستی شەڕ، بەپاڕانەوە تکای دەکرد تەقە مەکەن. کاتێك شاهۆ ئەوەی دیت ئاهێکی بەبەرداهاتەوە، ڕووی لە برادەکانی کرد.. تکایە کەس تەقە نەکات؟ کابرا ئەسپەکەی بەدوای خۆیدا و بەرەو پیریان هات. تۆقەیەکی لەگەڵ شاهۆ کرد، ماندوونەبی کاکە. زۆر بەئەسپایی لامل و دەموچاوی ئەسپەکەی دەخوراند، بۆ ئەوەی وەکوو پێشمەرگەکان هێوری بکاتەوە. بە تەوار و شەوبای دەگوت، مەترسن ئەمن برای خۆتانم. شاهۆ لە خۆشیان لەماچکردنی کاکی جاش تێر نەدەبوو، وەکوو ئەوەی برای بڕبڕەی پشتی بێت و چەندەها ساڵ بێت لەیەکتری دابڕابن. وەها تەواری بەسنگی خۆیەوە نووساندبوو، خەریك بوو هەموو پەراسواکانی بشکێنێت، ئەویش ئەوەندە تامەزرۆی باوەشی بوو زیاتر بە سنگیەوە دەنووسا. بەپێکەنینێکەوە بە هاوڕێیەکانی گوت: توخوا ئەوە جاشە یان فریشتەیە؟ کابرا ئاوساری ئەسپەکەی دایە دەستی شاهۆ. کاکە هیچ نییە، ئاگاداربە تووند ڕیشمەکەی بگرە. ئەو ئەسپە زۆر ڕکێف کوتە کەسێکمان چەکی لەدەست دەرچوو! چەند فیشەکی لە ڕانی خۆیداوە لە سەربازگەی سەرەوەش وەڵامیان داوە. ڕاستە ئێمە جاشین، بەڵام زۆربەمان سەر بەلایەنێکی پێشمەرگەین، بۆ پاراستنی خۆمان و گوندەکانمان چەکمان هەڵگرتووە، یارمەتی پێشمەرگەش دەدەین. هەمووومان براو کەسوکارمان پێشمەرگەن و لەناو پێشمەرگەن. هەتا ئەمڕۆ خراپەکاری کەسمان نەکردووە. هەرکەسێك لەناو هۆزەکەمان پیاوخراپی بکات، بۆخۆمان لەناوی دەبەین. دەستەدەستە پێشمەرگە و کاروانچی و خەڵکی گوند و شار بێرەدا تێدەپەڕن، ئێمە دەزانین ژیانتان چۆنە و چەند قوڕسە؟ لە پاش ڕاوەستانی جەنگ، هەموو ناوچە و بارەگاکانتان گیراون.

ئاگادار بن (ئەگەر هاتباو هەروا چەند سەدمەترێك بەرەو سەر ئەسپەکە هەڵکشابا، سەربازگەیەکی ئەوەندە گەورەیە، گیران و گوللەبارانکردنیان سەد دەر سەد دەبوو). پێشمەرگەکان بە دوو چاوی پڕ گومانەوە لە جاش و سەربازەگەی سەرەوەیان دەڕوانی. بە ئاشکرا ترسێکی گەورە لەقسەکانی جاشەکە هەست پێ دەکرا. لەبەرامبەریانەوە، چەند جاشێك بەبێ چەك لەپشت تەل و سیمە بەرزەکانەوە تەماشای پێشمەرگەکانیان دەکرد. کاتێك زانیان تەقەیان لێناکەن. ئەوانیش هاتنە پێشو بەگەرمی کەوتنە ماچکردنی پێشمەرگەکان. شاهۆ هەر لەڕووخساری تەواری ووردەبووەوە، زۆر نەدەپرژایە سەر قسەکانی کابرای جاش، تەوار دیاربوو لەکاتی ڕەوینەوەی ئەسپەکە لەخەودا بوو، لەگەڵ دەنگی دەستڕێژ وەخەبەر هاتبوو، شەوبا تەواری بە پشتێند لە پشت خۆی باش شەتەك دابوو، بۆ ئەوەی بەهیچ لایەکدا نەکەوێت. دوو چەکداریکە هاتن، پاش سڵاو و ماچکردنی پێشمەرگەکان، فەردەیەکی گەورە کالە، دوو فەردە نان و دوو نیوە فەردە فیشەکیان بۆ پێشمەرگەکان هێنابوو.. هەرموویان دایە دەستی پێشمەرگەکان، هەرکەس لەوێ کەوتنە گۆڕینی پێڵاوە کۆن و دڕاوەکانیان زۆریان ماوەیەکی زۆر بوو بە پێی پەتی بەناو زیخەڵان و دڕك و گۆماودا ڕێیان کردبوو. لە بری ئەو چاکە گەورەیە شاهۆ ڕووی لە جاشەکان کرد، کاکە دکتۆرمان لەگەڵ دایە و دەتوانێت چارەسەری بریندارەکەتان بکات. جاشەکان گووتیان. نا ڕەوانەی سەربازگەی سەرەوە کراوە، تکایە ئەگەر دەکرێت بە زووی لەوناوە دوور کەونەوە. جاشەکان، پێشمەرگەکانیان بەسەلامەتی بەڕێکردن. تەوار و شەوبا وا تاسابوون، نەیاندەزانی چی لەدەورەیان ڕوودەدات. پێشمەرگەکان هەموویان گەڕانەوە، لە تاریکایی شەوە تەمومژاوییەکەدا بەردەوامبوون لەسەر ڕۆیشتن. ئەو جارەی شاهۆ ئەسپەکەی گۆڕی بە هی خۆی، گوریسەکەشی لە پشتی خۆی قایم کرد، نابێت بە بست لێم جیاببنەوە. شەپۆل بەدەم ڕێگاوە خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕی. . بڕوا بکە لەگەڵ دۆزینەوەی تەوار لێلایی چاوەکانم نەمانوو، بەو تاریکەشەوە دنیا تەواو لەبەر چاوم ڕووناك بووەتەوە. بەڕاستی قەت لەو باوەڕەیدا نەبووم لەناو ڕژێمێکی ئاوا زاڵم چەکداری وا بە ویژدان هەبن. هاوڕێ ئەمن بۆخۆم لەو ناوەی چەندجاریکەش ڕووبەڕووی خەڵکانی وەها دڵسۆز بوومەتەوە. ئەوانە هۆز و تیرەن دابونەریتی کوردەواری لەناویان بەچاکی پارێزراوە. . چەند زیاتر لە کارۆخ نزیکتردەبوونەوە، وشکە سەرما زیادی دەکرد،

کزەبایەکی وەکوو شمشێر تیژ پێستی دەموچاوی پێشمەرگەی دەبڕی. بەدرێژایی ڕێگا تووشی کاروانی پێشمەرگە دەبوون.. شەش ئەوەندەی هێزەکەی خۆیان گەورەتر و ماندوو هیلاك تر، هەردەستە و هێزێك لەلایەکەوە هاتبوون! ئەوانیش وەکوو شاهۆ و هاوڕێیان، بەئاشکراو دەنگی بەرز سەدان پرسیاری بێ وەڵامیان دەکرد کەس باوەڕی وا نەبوو بەس بەڕاوەستانی جەنگی( ئێراق و ئێران) هەروا بەئاسانی پێشمەرگە وا شپرزە ببێت، ئەو ناوچانەی بە خوێنی خۆی گرتبوونی لە ماوەیەکی کورت نەیانتوانی بەرگری لێ بکەن. هەرکەس لەبەر خۆیەوە دەیپرسی بۆ؟ پرسیارێك بوو. وەڵامی نە لە لای پێشمەرگەی ماندووی ڕەش و ڕووت و نە خەڵکی ئەنفالکراو نەبوو. دەبوو زۆر دەمێك بوو بیر لەوەی کرابایەوە، ئەگەر جەنگ نەما چی بکەن؟ ئەدەبوو چارەنووسی میللەتێك و شۆڕشێك بە جەنگێکی کاولکارانەی بێ مانای وەکوو جەنگی (ئێراق و ئێران) گرێ بدرێت. کێ بەر پرسیاریەتی ئەو تێکشان و شکستییە گەورەیە دەخاتە ئەستۆی خۆی؟ لەبەرامبەر میللەتی ئەنفالکراو.. کێ هەست بەڕووڕەشی دەکات؟ بەس دوژمن، یان هەموو ئەکتەرەکانی سەر شانۆی تراژیدییەکان.

هەر بابابوو خۆی بگەیەنێتە سنووری مەرگ، ئێران. شاهۆ داوای چاوساخی ڕێناسی کرد. زۆرمان ماوە بۆ کارۆخ؟ تا ئەو دۆڵەی ببڕین پاش ماوەیەك ڕووبەڕووی کارۆخ دەبینەوە! بۆخۆشت دەزانی کارۆخ ناوچەیەکی بەرفراوانە. دەزانم کاکە بەڵام نابێ لە کارۆخ ڕاوەستین؟ هەتا ئارازن پشوونادەین. ڕێناس لەهەموویان پرزە لێبڕاوتربوو، بەڵام برادەران زۆر هیلاکن ژن و منداڵ و برنیدارزیاتر لە چواردە ڕۆژە دۆڵو شاخ و دەشت بە برسیەتی و بێ ناوی دەکووتنەوە. ئەگەر بەسەرهاتی هەڵاتنی ئەسپەکە نەبوایە دەبوو دەمێك بوایە پشوومان دابا. زۆربەیان بەدەم خەوەوە ڕێ دەکەن، بەرچاوی خۆیان نابینن. ئەوەندەی بە دۆزینەوە بزرنەکردنی ڕچەڕێ و باریکەڕێ سەرقاڵین دە ئەوەندە لەملاو ئەولا خەڵك لە بزربوون دەگەڕێنینەوە. بەرپرسیاریەتێکی ئەوەندە مەزنە لەو ڕۆژی قیامەتە، پاراستنی گیانی ئەو خەڵکە ناتوانم بۆ چرکەیەکیش چاو لێك بنێم. بزانە بە بچووکترین هەڵە کەم تەرخەمی خەریك بوو بەگیانی دەیان کەس کۆتایی بێت. دەتوانین، یان لە پێش کارۆخ یان لە پاش کارۆخ پشوو بدەین؟ شاهۆ پێیداگرت، ئەوناوە بە هێزو چەکدار تەنراوە. ڕێناس ڕاستە، بەڵام بە چاوی خۆت دیت جاشی ئەو ناوە زۆر باشن؟ نەك کاریان بەکاری پێشمەرگەدا نییە،

بەڵکوو پارمەتیشی دەدەن. کاکە نابێ ئەوەندە خۆش باوەڕبین، ئەوە تەنها جاشێکی باش بوو، ئەگەر لەلایەن سەرۆك جاش یان سوپاوە فەرمانی پێ دەکرێت ئەوجا دەزانی چەند دڕەندەن! هاوڕێی ڕێناس، هەر سەری بادەدا. ئەو خەڵکە پرزە لێبڕاوە چۆنچۆنی دەگاتە کارۆخ؟ نەخوازە چەند کاتژمێرێکیش بێتە سەری. کارۆخیش، هەتا بڵێی جێگایەکی مەترسی دارە، بۆ ئارازنیش زۆری ماوە. کاکە بەرامبەریەکن. ئەوەندەی شاهۆ هەوڵیدا خۆیان بگرن، بەڵام کاروان هیلاك و بێتاقەت هەر کە گەیشتنە بن چیای کارۆخ لەبن ڕەوەز و تیکەشاخ بنەوبارگەیان داناو هەرچی کۆنە بەتانی و شڕە پەڕۆ هەیە بە خۆیاندادا.. ناڵەناڵی بریندار و گرمەگرمی تۆپ و تەقینەوە لەنزیکیان زیاتر پێشمەرگەی لەسەر هەست دادەنا. هیلاك و ماندووبوون بێزاری لەلای پێشمەرگە نەبوو، خۆیان بۆ ڕۆژی زۆر لەوە ڕەشتر ئامادەکردبوو. شاهۆ باش شارەزای ئەو ناوەبوو، چەند جار پێیدا تێپەڕیوە، ئەوەندەی کارەساتی دڵتەزێن لەو دەڤەرە رووی داوە، لەهیچ جێگایەکی دیکە ڕووینەداوە. لە خوارەوەیان لە دەشتایی نزیکەی بیست هەتا سی گۆڕێك دەبوون بە تەنیشت یەکەوە تازە بوون. چەند مانگ لەمەوپێش ئەو گۆڕانە نەبوون. شاهۆ ماوەیەك چاوی بە چواردەوری خۆیدا گێڕا، ئەگەرچی دنیا تاریك بوو، بەڵام هەستی کرد لەو شوێنەی نزیکە بۆ یەکەم جار تەواری لێ دۆزیەوە. ئەوەتا لەخوار گۆڕەکانەوە نەك شوێنەواری ڕەشماڵەکان بەڵکوو سنگ و دارەڕاو ئەستوندەگ ئێستاکەش شوێن پارچە پارچەی کۆنەدەواریش ماون. هەرچەندە بۆ گەنیوێکی زۆر بەهێز دێت. کاریگەریی گازی ژاراوی و کیمیایی مابوو، بەڵام لەتەواوی کوردستان چەکی کۆمەڵکوژ بەکار هاتبوو، ڕاهاتبوون لەگەڵی، بۆیە زۆر هەستیان پێ نەدەکرد. ئەوەی سەری لێ دەرنەدەچوو ئەو گۆڕانەبوون، نهێنی گۆڕەکان چین؟ شاهۆ هەرچەندی کرد خەو نەچووەچاوی، ئای ڕێناسی ئەگریس! چی دەبوو ماوەیەکیکەش، بەرەو سەر هەڵکشابای؟ هەرچەندە کەمێك بە چیا هەڵگەڕابوون، ئەوەك لە نیوەشەودا هێرش بکرێتە سەریان. ئەگەر.. ڕووەو چیا بن، دەتوانن بۆی دەرچن، بەڵام ئەگەر لەدەشتایی بخەون، چیایان لێ بگرن کاریان تەواو دەبێت. چوار ئێشکگر دوانیان لەخوار گۆڕستان، دوانەکەیکە لە بەرزایی. شاهۆ ماوەیەك ئەم دیو ئەو دیوی کرد، تەوار لە تەنیشتییەوە، لەنێوان خۆی و شەوبا هەردووکیان لە هیلاکیان لاکەیان. دەهات کەوتووبنە پرخەپرخ. ئەو پرخەیە پرخەی ئارامی نییە لە

کەروێشکە خەوەکەت لەگەڵتدا نیم. خەون شتێکە هەموو کەس بەتەنیا دەیبینێت، بەڵام دڵنیام یادەوەری تاڵی ئێرە بۆ تۆ تەوارەکەم، دەبێتە مۆتەکەیەك و گەردنت بەرنادات، لەهەموو ژیانت وەکوو سێبەری خۆت بەدواتەوە دەبێت. ژان و ئازارەکانت لەکاتی زیندەخەوی پچڕپچڕ دەبنە کورتەفیلمی تۆقێنەر. شاهۆ هەستا ماوەیەك بە پێوە تەماشای ئەملاو ئەولای کرد، پاشان بەلاڕێیەکدا ڕۆیشت. ئێشکگر دیتی، دەستێکی لە شاهۆ بەرز کردەوە. وەکوو ئەوەی بیهەوێت پرسیار بکات. ئایە هیچ لە گوڕێ هەیە. ئەوەندەش دووربوو لەبەر هاوڕێیان حەزی نەدەکرد هاواربکات. زیاتر چاوی بە چواردەوری خۆیدا گێرا. شاهۆ دەستێکی بۆ ڕاوەشاند دڵنیای کردەوە هیچ جووڵانەوەیەکی نا ئاسای بەدی نەکردووە. ماوەیەك بەلا ڕێدا بەردەوام بوو لەسە ڕ ڕۆیشتنەکەی خۆی، سووڕایەوە بەرچە ڕێیەکدا سەرکەوت، کۆمەڵێك تاشەبەردی گەورە هاتنە پێشی، لەپشت تاشەبەردەکان ئەشکەوتێك بەدیار کەوت. زۆر تاریك بوو، ماوەیەك لە زالکی ئەشکەوتەکە مایەوە، هەتا بەر چاوی کەمێك ڕووناك بووەوە. لایتێکی بچووکی لەدەست بوو، کەوتە گەڕانی کون و قوشبنی ئەشکەوتەکە. مووچڕك لەبەری پێی هەڵساو لە تۆقی سەری نیشتەوە هەموو دەمار و ماسوولکەکانی گرژبوون، گرژبوونێك وای هەست دەکرد، گشت ئەندامەکانی جەستەی لە کارکەوتوون. لەبن میچی ئەشکەوت دڵۆپە ئاو دەکەوتنە خوارێ، جۆگەلەیەکی بچوکیان دروست کردبوو، چەند دڵۆپەئاو کەوتنە سەر دەموچاوی. دڵۆپەئاوەکان سارد سارد، وەکوو تەرزە، بەڵام لەبەر گەرمداهاتنی سەرتاپای لەشی. هەستی بە دڵۆپەئاوەکان نەدەکرد، هوروژمی یادەوەرییەتاڵەکانی دەروونی ئازاری برینەکانی لەبیر بردبووەوە. بەسەرهاتی ئەو ئەشکەوتە ڕێچکەی ژیانی گۆڕی بەرامبەر بە هەموو شتێك. پێش ئاشنابوونی بەو ئەشکەوتە کەسێك بوو، پاش دۆزینەوەی نهێنیە پڕ ئازارەکان کەسێکی تر. ئەو ئەشکەوتە کردیە کەسێك. لێرەوە لەژیان تێگەیشت. وای وریاکردوە لەناخەوە هەژاندی. لەگەڵ هەر دەنگدانەوەی ئاوازی دڵۆپە ئاوە ساردەکان، دینگ دینگ دەرسێکی مەزنتر خۆی دەخزاندە ناو هەگبەی پڕ ئەزموونی. ئەشکەوت و دڵۆپەئاوەکان پێیان دەگوت، چاو لە وردی تنۆکە ئاوەکانمان بکە و دەرس وەربگرە، بزانە کاریگەرییمان چەند بەرد کوندەکەین، سینگی خاک دەدڕین، جۆگەلە و جۆبار دروست دەکەین، هەر ئەو جۆگەلە و جۆبارە تێکەڵی زێ و دەریاچە و پاشان تێکەڵی قووڵی و هێمنی

دەریا دەبن، دەبێ لە ئێمە زۆر بەسەبرتر و هێمنتر بێت، ئەگەر ئێمە بتوانین بەچەند ساڵێك بەردێك کون بکەین. جار هەیە چەند سەدەیەک بگرە پتریشی پێ دەچێت، لەسەر ڕەقی و جێگا و جۆری مادەی کەڤرەکە دەمێنێت، بەڵام پەلەمان نییە، ئەو کارە هەر دەگەیەنینە ئەنجام، بە درێژایی تەمەنمان وا ڕێک نەکەوتووە، لەو کارە پاشگەز بووبینەوە و تاکە بەردێکمان بواردبێت، بڕوانە هەر چەندە تاریکە، بەڵام بە هەست و زەینت ببینە، ئەو نەخش و نیگارەی هەڵمانکۆڵیوون، بەدەست و پەنجەی کام پەیکەرتاش و نیگارکێش دەکرێن، چاو و لووت و گوێ و پرچ و هەیکەلی تەواومان ئافراندووە، هەرکەسێک گیانلەبەرێک پەلەوەرێک لێیان وردە بێتەوە، وێنەی خۆی تێیاندا دەبینێتەوە، وادەزانێت ساڵانێکی دوور و درێژ لەسەر تاشەبەردێک دانیشتوە و وێنەمان کێشاوە. هەرچەندە ئەو تاشەبەردە خڕ و لووسانە نەیار و ناحەزی ئێمەنین، بەڵام بۆ ڕازاندنەوە و شۆخکردنی دیمەن و نیگاریان دەبێت خۆڕاگربن بە هەموو ئازارێک، بەچەند ڕۆژ و هەفتە و ساڵێک نابێت پشتی خۆتی لێ ساردکەیەوە و بەچەند ڕووداوێک ورەبەربدەی، ئەتۆ دەبێت بەچەند ڕۆژێك قۆناغە دژوارەکان تێپەڕێنی. تێپەڕاندنێك وەها بە هەستیارانە، بۆ ئەوەی داهاتوو هیچ بواری ئەوە نەبێت بەناچاری بەسەریدا بچنەوە و دیرۆکی نەنووسراوە و نەخوێندراوە دووبارە بەخوێن بنووسنەوە. ئەوەندە ئازار لەهەناوی خۆتدا خەفە بکە، بەشی ئەوەکانی داهاتوو نەکات. ئەشکەوت پەیامێکی پێڕاگەیاندم، ئەو پەیامەش ئەسرەوتن تا سەرکەوتن. شاهۆ هەناسەی سواربوو. ئەشکەوت هەمان ئەشکەوتە کە تەواری تێدا دۆزیەوە. پارچە لبادەکە هەر لە شوێنی خۆی بوو، دووپارچە گوریسی کۆنی گەورە. هەندێك کۆنەجلك و مەتارەیەکی فافۆنی ئاو. بۆنێکی ناخۆش لەو ناوەی دەهات، بەبۆنی مەرگەسات دەچوو. چەند ئێسقانی مرۆڤ و گیانلەبەر لەهەموو گۆشەیەکی ئەشکەوت دەبیندران.. ئێسقانی گەورە منداڵ کەللەسەری کونکون شاهۆ دوو کەللەسەری بەدەستەوە گرت، لەگەڵیان کەوتە وتوێژ. داخوا هی چی قوربانییەکی ئەنفال و کیمیاباران بن؟ نەك هەستدەکرا لەناو ئەو ئەشکەوتە و لەوناوەی کارەساتێك ڕووی داوە! بەڵکوو دڵنیابوو لە ڕووداوەکان. ئای ئەو ڕۆژەی تەواری لێرە دۆزیەوە. پارچە لبادەکە هەرلەوێ مابوو شێدار و زۆر قوورس بوو، هەرچەندی کردی بۆی بەرزنەکرایەوە. لایەکی لادا، سەری خستە ژێری بزانێت شتێك لەتەوارەوە بەجێ نەماوە. لەوکاتەیدا شتێك لەبنی دەرپەڕی، شاهۆ کەمێك

کشایەوە. شتەکە خۆی بە قووڵایی ئەشکەوتدا کرد. لە پشت تاوێرێك بزربوو. ئەپڕژایە سەر ئەوەی بزانێت چییە. لەبن ئەو پارچە لبادە تەڕە ئەو کاتی تەڕتڕ و قورستربوو تەواری بەبێهۆشی دۆزیەوە. هەناسە گچکە ژەهراویەکانی، مژدەی بوونیان نیشاندەدا. کە لەباوەشی کرد وەکوو شێت لە ئەشکەوت دەرپەڕی لێرە زۆر دوورنەکەتبوونەوە، چەند جار نەك هەستیان کرد بە دوایانەوەن، بەڵکوو لە کاتی سووڕانەوە لە تیکەشاخ دەستەیەکی پەنجا کەسیان دیت، دوور و نزیك چاودێرییان دەکردن. باشە ئەو دەمی لەیەك دابڕابوون، بۆچی تەقەیان لێ نەکردبوون؟ خۆ ئەوکاتی وەها پەرشوبڵاو بووبوونەوە، کەس ئاگای لەکەس نەبوو. دیارە نیازیان بووە، هەر هەموویان بخەنە بۆسەوە. دەنگی ئێستاش لە گوێچکەکانی دەزرنگێتەوە، کاتێك هاتە لای، هاوڕێ ئاگاداربە بەدوامانەوەن؟ کەس بەقەد جیڤارا لەسەر هەست نەبوو، لەکاتی کفتبوونی لە هیلاك و وەنەوزدان، بە نەمەبارانێك لەخەوڕادەپەڕی، بەتۆز و خۆڵی بەرپێی دەیزانی کەنگێ کەسێك بەوناوەدا تێپەڕیوە. شوێنهەڵگرێکی ئەوەندە لێهاتوو و کارامەبوو، قەت دوژمن زەفەری پێ نەدەبرد بتوانێت ئەو هاوڕێیەکانی وەگیر بێنێت.. بۆسەی وەهای بۆ دوژمن دەنایەوە. وەکوو تەونی جاڵجاڵۆکە ورد و تۆکمە، وەکوو مێش و مەگەز دەکەوتنە داوی. دەستەیەك جاش و مغاویرن. ئاگادارم جیڤۆ گیان.. لەسەر هەست بن لە خۆتانەوە تەقە مەکەن دەڕۆین لە دوامان دەبن، لەو ناوە با دوورکەوەینەوە بۆ ئەوەی کەس بە هاواریان نەگات. هەرکە پێشمەرگەکان هەنگاوەکانیان گورچتر دەکرد یان پشوویان دەدا، ئەوانیش بەدەستووری پێشمەرگەکان دەجووڵانەوە پشوویان دەدا، چاوەڕوانی هەلێکی باشیان دەکرد. هەتا نزیك کۆنە گوندی سەران خافڵاندیانن. زۆر جار هێزەکە وەها لێیان نزیك دەبووە، نەك چەکی قورس بەڵکوو چەکی سووکیش دەیان گەیشتێ. دیار بوو پلانێك لەسەری شاهۆ دەهاتودەچوو. لەگەڵ جیڤارا تاوتوێیان دەکرد، جارێ بەردەوام بن لەڕۆیشتن. پێشمەرگەکان بەبەر چاوی ئەواندا وا دەڕۆیشتن کە ئاگاداری هیچ نین. ڕووبارێکی کەمێك قووڵ هاتە پێشیان، لەودیو پردێکی خۆڵ، لەپاش پردەکە بە بازنەیی وشکە کەڵەکەبەرد هەڵچندرابوون.. لەپشتی کەڵەکەبەردەکان گردێکی ڕووتەن بوو، چەند پێشمەرگە بەسەر گردەکە هەڵگەڕان بەو دیویدا بەهاتنە خوارەوە. لەپشتی کەڵەکەبەردەکان دامەزران. جاش و سەربازەکان بەدیان کردن هەنگاوەکانیان گورجتر کردن. دوودوو سێ سێ، هەتا

دوا جاش هاته ناو کەڵەکەبەردەکان. لەدەشتایی بەپەلە بەرەو گرد دەڕۆیشتن، شوێن پێشمەرگەکان کەوتبوون، زانیان ژمارەیان زۆر نین. جاش و سەربازەکان لەنێوان خۆیان دەیان گوت، لەو دیو گردەوە بە گیریان دەهێنین. لەنەکاو لەیەکڕا لەهەمووڵەیەکەوە درانە بەرخرمە خرمی دەستڕێژی گوللە. لە ناوەڕاست مابوونەوە فریای هیچ دەستکردنەوە نەکەوتن. لەگەڵ یەکەم دەستڕێژ و چەند نارنجۆکێك نزیکەی بیستیان کەوتنە سەر زەوی. چەند جاشێك یەکسەر بە بێ تەقە خۆیان بەدەستەوە دا، هەرچی سەرباز و ئەفسەرەکان بوون لەشەڕی نیزامی تربوون، بەیاسای سەربازی دەجەنگان. ئەفسەرێك لەبن بەردێك بەرگری بە هێزی دەکرد، شەڕکەرێکی بەئەزموون بوو. بەهەر چوار دەوری خۆیدا تەقەی دەکرد.. لەلایەن پێشمەرگەکانەوە پێکرابوو، بەڵام زۆر بە بێدەنگی تەقەی دەکرد. کاتێك بن بەردی گواستەوە ڕیخۆڵەکانی ناوسکی لە زەوی لەگەڵ خۆی ڕادەکێشا. لەگەڵ دەستڕێژی جیڤارا دوا هەناسەیدا. شەڕ گەرم بوو، ئەوەندە لێکنزیك بوون، چەکەکانیان ئاراستەی سەر سینگی یەکتری دەکرد. جێگای سەرباز و جاشەکان ئەوەندە ڕووتەنوون و بێ پەنابوو. کەوتبوونە بەر ڕەحمەتی ئاگری چەکی پێشمەرگە. لەگەڵ هەر تەقەکردنێك داوای خۆ بەدەستەوەدانی پێشمەرگەیان دەکرد. لەبن دەوەنێکی بچووك سەربازێك بە لاسلکی داوای هێزی دەکرد. بەکوشتنی سەربازەکە، لەپشتەوە درانە بەر دەستڕێژی گوللە. وادیاربوو سەربازو جاشەکان بووبوون بە دووبەشەوە. ئەو بەشەی وەگیرهاتبوو ئەوانەبوون لەناو بازنە ڕەوەزەکان. لەپێشی کەڵەکەبەردەکان بەرەنگاربوونەوەیەکی بەهێز هەبوو. زۆربەی پێشمەرگەکان لوولەی چەکەکانیان بەرەو ئەوان سووڕاند. ماوەیەك لەبەرگریدابوون. بە کوژرانی بەشێکی زۆر، کەوتنی چەند لاشەیەك، لەسەر زەوی هەڵاتن و کۆتایی بە شەڕەکە هات. ئەوانەی بەتەواوی گەمارۆ درابوون دەستیان بەرزکردەوە کەوتنە پاکانە لەخۆکردن و پاڕانەوە، گوایە بەزۆر ناردوویانن بۆشەڕ. وەك کەروێشکی تۆقیو لەسەر زگ درێژ ببوون. پێشمەرگەکان هێشتا بە دیلەکانەوە لەوناوە دوور نەکوتبوونەوە، کۆپتەر و فڕۆکەی جەنگی کەوتە دابێژان و کوتانەوەی ئەوناوە. هێزێکی زۆر گەورە هێرشی هێنا، بەڵام پێشمەرگەکان بە خێرایی لەو ناوە دوور کەتنەوە. پاشان جاشە بەدیلگیراوەکان باسی کوشتارگەی بن ڕەشماڵیان کرد، یەکەم جار بە کیمیایی لێیان درابوو، پاشان هێرشمان کردەسەریان. چوار پیاویان شەڕ و بەرگریان کرد ئەوانیشمان

گوللەباران کردن. لەو شەڕەدا دوو پێشمەرگە برینداربوون، کاریلەی تەواریش بەبەر دەستڕێژی گوللە کەوت، شاهۆ و کچۆڵە لە هۆشخۆچووەکەی نیشاندان، ئەو کیژە دەناسن؟ بەوردی تەماشایان کرد، بەسەر لەقاندنەوە.. نازانین کێیە! بەڵام لەو قۆڵەی ئەو دیوی کارۆخ، کۆمەڵێک سەرباز چەندین ژن و منداڵییان بەدیل بردن؟ بۆ کوێ بردیانن؟ نازانین وەکوو ئەوانی کە ئەنفالکراون و بۆ خواروی وڵات ڕەوانە دەکرێن. دیلەکانیش و تەواریش بە بێهۆشی گەیاندیانە چیای هەورێ، بارەگای سەرەکی لەوێ بوو. بەپەلە کەوتنە چارەسەری تەوار.. کەواتە کەسوکاری تەوار لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکدا بوون لەناو ڕەشماڵ و دەوروبەری ئاوا کەل و پارچە کرابوون، هێشتا هۆی ڕاستی تەواوی وەشاخدانی بنەماڵەی تەوار بە تەواوی نازانێت، بەختیار هیچ نامەی دیکەی بۆ نەنووسی بزانێت سەرەداوەکانی بەکوێ گەیشت. فەرەج هەر ئەوەندەی تەواری گەیاندە بناری کۆسرەت بزر بوو.. ئاخ تەوار چەند کەسێکی تەنیاو بێکەسی لەو جیهانە گەورەیە). لەو خەیاڵە لینجاوەدابوو، لەتاریکی شەوەزەنگی ناو ئەشکەوت هەناسەی تەنگ بووبوو چاوەکانی قورس ببوون، دەستێك لەسەر شانی دانرا. شاهۆ ڕاچڵەکی! بەپەلە ئاوڕی دایەوە، توند دەستەکەی گرت، دەستی بۆ دەمانچەکەی برد، زەلام کێی؟ لایتی لە چاوی دا، دوو چاوی شینی برژاو و کەمێك خەواڵوو. تەوار خۆی بە باوەشی شاهۆدا کرد، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت، شاهۆ لەباوەشی کرد. تەوار گیان بۆهاتی؟ هەتا ئێستا نەخەوتووی؟ با بەڵام خەومبینی وەخەبەر هاتم، خەوێکی خۆشبوو. تەوار ماوەیەك بێدەنگ مایەوە پاشان دەستی کرد بە گێڕانەوەی خەونەکەی، لەخەونمدا، باران بوو بارانێکی زۆر، لەگەڵ دایکم و باوکم و خوشك و برایەکەم بووم، هەر بەڕێگادا دەڕۆیشتین برسیمان بوو. تەقەی زۆرمان گوێ لێ دەبوو چەکدارێکی زۆر بەدوامانەوە بوون. تەنها نەبووین، خەڵکی برسی لەگەڵمان بوون (تێبین و تەلار) بچووك بوون، لەبرسان دەگریان بۆنێکی ناخۆش دەهات هەناسەمان نەمابوو، لەدایکم و باوکم خوشك و براکەم بزربووم، هەرچەندی گەڕام نەم دۆزینەوە. تەوار، وەکوو شاهۆ چاوی بە ئەشکەوتەکەدا دەگێڕا. شاهۆ لە باوەشی کرد، وەرە تەوار با بڕۆین، بە دوای شتێکدا دەگەڕام نەم دۆزیەوە. تەوار ڕووی لە شاهۆ کرد، مامە شاهۆ دەزانم ئێرە کوێیە؟ باشە ئێرە کوێیە تەوار گیان؟ ڕۆژێکی لێرەبووم، دەنگی تەقە دەهات لەولاتر ماڵمان لە خوارێ بوو. دەنگی تەقەی زۆر دەهات، جارجار، لەگەڵ

کاریلەکەم دەهاتمە ئێرە. باوکم هات ئەمنی لە شتێك وەرپێچا.. چوو بۆ لای خوشك و براکەم لەگەڵ دایکم ئەوانیش بۆ ئێرە بێنێت، بەڵام نەهاتەوە ناگام لێنەما. مامە شاهۆ.. دایکم و باوکم، تێبین و تەلار لە کوێن؟ بۆ لێرە نەماون؟ شاهۆ زیاتر لە باوەشی کرد، نازانم تەوارگیان بەدوایاندا دەگەڕێین هەردەیان دۆزینەوە. شاهۆ بۆ ئەوەی لە پرسیارەکەی هەڵبێت، کەوتە پرسیارکردن.. باوکت ناوی چییە؟ مامۆستا نزار! ئەدی دایکت.. مژدە، چەند برا و خوشکت هەن؟ تێبین و تەلار لە خۆم بچووکترن.. خوشکێکی گەورەم هەیە ناوی تارا کچێکی بچووك بچووکی هەیە، ناوی... ماوەیەك بیری کردەوە و ئەوەندەی مێشکی خۆی گوشی وەبیری نەهاتەوە، بەڵام لەگەڵمان نەهات، لەکوێ لەگەڵتان نەهات؟ نازانم.. لەو قسانە دابوون بە ڕمبەیەکی زۆر گەورە ڕاچڵەکین، چەند دەستڕێژێك بەدوایدا. لەنزیك بوون، دەنگی شەڕ و پێکدادان دەستی پێ کرد.. گرەگرِی کۆپتەر و فڕۆکەی جەنگی. تەواری بردە گۆشەیەکی تاریك و لە باوەشی گرت. لەودیو ئەشکەوت دەنگێك بانگی کرد، هاوڕێ شاهۆ بەسەریاندا داین.. کاتێك شاهۆ دەستی تەواری توند گرتبوو لە ئەشکەوت هاتەدەر. دوو پێشمەرگە و شەوبا بە شەلەشەل هاتن بۆ لای. شەوبا پری بە تەواردا کرد، ئەوە لە کوێ بووی؟ دەستی کرد بە ماچکردنی، تەوار و شاهۆ تەماشایەکی یەکتریان کرد. ئاگربارانێك بوو، لە هەموو لایەکەوە شەڕەتەقە و دەنگی تەقینەوە دەهات. فیشەك و گوللە ئاربیجی بەسەر ئەشکەوت دەکەوتن و گیڤەیان دەهات. دوو پێشمەرگە هاتن شاهۆ و تەوار و شەوبایان لەگەڵ خۆیان برد. نابێ بگەڕێنەوە جێگای خۆتان شەڕەکە زۆر گەرمە. لەدەشتایی ئاگربارانێك بوو لەنێوان پێشمەرگە و سوپا و جاش گوللە ڕووناکەرەوەکان، یەك یەکی نەك پێشمەرگەکان بەدیار دەخست، بەڵکوو تەواوی ئەو ناوەیان وەك ڕۆژی ڕووناك لێ کردبوو. دوو ئەسپیان هێنان هەر بە تیلەی شاخەوە بەلاڕێدا سەرکەوتن. شاهۆ داوای لە هاوڕێیەکانی کرد، لەگەڵ ئەسپەکان برۆن. هەتا بۆخۆی بگەڕێتەوە ناو شەڕەکە. هاوڕێ پێشمەرگەی ئازای شەڕکەر ئەوەندە زۆرن، جێگا بە خۆیان ناگرێت. ئەتۆ برۆ ئەو ژن و منداڵ و بریندارانە ڕزگار بکە. پاش کەمێك لەگەڵ شەپۆل و دوو بریندار و کۆمەڵێك ژن و منداڵ چەند پێشمەرگەیەکی گەنج بە خێرایی دوورکەوتنەوە.. هەتا دەهات دەنگی زرمبە زرمب و ناڵ ناڵ و شریخە تۆپ و تەقینەوەی ڕۆکێت زیادی دەکرد. شاهۆ هەرچەندی دەکرد، لەو بارودۆخە

سەختە نەیدەتوانی هاوڕێیەکانی بەجێ بهێڵێت. ویستی بگەڕێتەوە بۆ لای شەڕەکە، بەڵام ڕێگایان نەدا زیاتر لە هەشتا پێشمەرگەی لێیە، ئەتۆ و بریندارەکان دەرچن. شەوبا ڕووی لە تەوار و شاهۆ کرد، باشە بەو نیوەشەوە سەرمایەی لەکوێبوون؟ هەردووکیان تەماشایەکی یەکتریان کرد، کەس هیچی نەگوت. هەتا زیاتر سەردەکەوتن دەنگی شەڕەتەقە و دەنگی فڕۆکە جەنگییەکان کەمتر دەهاتە بەر گوێ.. شاهۆ بە برادەرەکانی گوت، با لێرە چاوەڕوانیان بکەین؟ ڕێناس هاتە پێشەوە، ئەوانیش شارەزایان لەگەڵ دایە، هەمووشیان کوڕی گەنجی ئازا و بەتوانان، گورگی شاخ و کێون. ئەوانەی لێرەن، زۆریان نەخۆش و بریندار یان ژن و منداڵن، منداڵی وایان تێدابوو کەس نەیدەزانی کەسوکاری کێیە! زۆر بە هێواشی ڕێگا دەکەین پاش ماوەیەکی دیکە پێمان دەگەن. لەڕێگا لەگەڵ چەند کاروانی دیکەی پێشمەرگە و بریندار تێکەڵ بەیەکتربوون. ناڵەناڵ و گرمەگرمی تۆپی و خومپاران وەکوو هەوری سەرسەریان لێیان جیا نەدەبووەوە. بەدرێژایی ڕێگا بۆنی بارود و بۆن سووتا و بۆنی سیر و سێو دەهات، بەڵام بە سووکی. دووبارە کۆمەڵێك پێشمەرگە لە پێشیانەوە کەوتنە بۆسەوە، شەڕو پێکدادان دەستی پێ کردەوە. کەمێك بەرەو دوا گەڕانەوە. پێشمەرگەکانی لێیان دەبڕابوون پێیان گەیشتن. کۆمەڵێك دیل و برینداریان لەگەڵ چەك و جبەخانەیەکی زۆر هێنابوو. دوو شەو و دوو ڕۆژی دیکە بە شەڕ و دەرچوون بەردەوام بوون، ئەگەر فەردە نانی جاشان نەبوایە دەمێك بوو لە برسان دەمردن. هەتا زیاتر لە قەندیل نزیکتر دەبوونەوە ڕێگاکان باریکتر و هەڵدێتر دەبوون. کاروانی نەپساوەی هیلاك و ماندوو بەناو بەردەڵان و باریکەڕێی زیخندا پێیەکانی لەدووی خۆی دەکێشان. سنگی ڕووتی پێشمەرگە و ژن و منداڵ، بە وشکەسەرمای کوشندەی قەندیل سڕدەبوون. لوورەلووری ڕەشەبا، لەگەڵ خۆی هەرچی هاتبایە پێشی لوولی دەدا. تەواوکەری گرمەی بۆردوومان بوون لە هەموو لایەکەوە. سێهەم ڕۆژ لەخوار کێوەڕەش، لە ماخۆبزنان کەوتنە بەرامبەر قەندیل. لە دوورەوە چیا دەکولا. لە ئاسمان و لە زەویەوە هێرشی بۆ دەکرا. لەسەری کێوەڕەش ڕاجیمە و تۆپە قورسەکان و هەرچی ئاگری چەکەکانیانە ئاراستەی کونەکۆتر دەکرا. ماوەی شەش حەوت کاتژمێر بە خەستی بۆردوومان بەردەوام دەبوو، هێرش دەکرایە سەر پێشمەرگە. بەرپەرچیان دەدرایەوە، هەرچی جاش و سەرباز هەیە ڕووەو خوار دەشکان و هەڵدەهاتن. ڕژێم بەخەستی کیمیای لەو

ناوچه دەدا، هەروەکوو ناوچەکانی دیکە، بە درێژایی چیای قەندیل هەر لە کوونە کۆترەوە بۆ سوورە دێو، ئاشقولکە و پشت ئاشان.. تا ساوێن و بەدرێژایی هەورازی چەکووش، دۆڵەکۆگە، کیمیاباران بەڕەشەبایەکی کوێستانی بەهێز، (تفی سەرەو ژوور بە ڕووی خۆیاندا درابوو) هەرچی گازی ژاراوی هەیە بەرەو سوپا و جاشی مۆڵ خواردوو شکست هێناوی ئەو بنار و دۆڵە هەیە بەبەر کیمیای خۆیان کەوتبوون. ئەوجار هەستیان بە ترسناکی کیمیایی و گازی ژاراوی کرد، ئەو هێزە جارێکی دیکە شەڕی پێ ناکرێت، بەسەر لێشێواوی هەڵاتبوون، دەمیان گووت، کیمیای لە ناو چیاو سەرماو بەفر زۆر کاریگەر نەبووە، بەڵام سووپا لەناو دۆڵ ودەشت دابوون نێچرێکی زۆر ئاسانی گازی ژاراوی خۆیان بوون. هەر لەو دۆڵو دەشتە بە دەیان ژن و منداڵ و بێتاوان بەگازی ژاراوی خنکان. لەنیوە شەودا نەك شەڕ کزبوو، بەڵکوو هەر نەما. لە هەردووك لا وچانێکیان پێویستبوو سوپا بۆ ئەوەی خۆی ڕێککاتەوە و بۆ هێرش. پێشمەرگەش بۆ ئاوەدیوکردن و پەراندنەوەی پاش ماوەی هێزەکانیان. بەرەبەیان بەپەلە بە هەرچی خەڵکی لەوناوە لە پێشمەرگە و ژن و منداڵ بەرەو کونەکۆتر سەرکەوتن. هەر لە قەدپاڵی چیا هەتا نزیکی کونەکۆتر لاشە و کەلاکی سەرباز و جاش کەوتبوون، بە کوژراوی سووتاوی هەڵاوساوی پارچەپارچەی جاش و سوپا بوو. دەبێ چەند ڕۆژ شەڕی خوێناوی گەورە ڕوویان دابێت. بۆیان دەرکەوت ئەو هەموو شەڕ و پێکدادانە بە هەزاران سەرباز و مغاویر و جاش و( خۆبەتکەری سەدام) بەرەنگاری پێنج پێشمەرگە بوونەتەوە. کاتێك گەیشتنە کونەکۆتر، ئەوەندەی پێنەچوو، دووبارە دەنگی تۆپ و گرەگری کۆپتەر و فڕۆکەی جەنگی دەستی پێ کردەوە. بە هێزێکی بێشوومار لەهەموولایەکەوە هێرشیان هێنایەوە.

# قەندیل و .... کونە کۆتر گڕ دەگرن

ئەشکەوتی کونەکۆتر، بە یەکێك لەهەرە سەختترین و ئاسێ ترین ئەشکەوتەکانی زنجیرە چیای قەندیل دەژمێردرێت. هەتا بڵێی ئەشکەوتێکی گەورەی قووڵی بە پەناوپێچە. ئەگەر بەدوای کۆتاییدا بگەڕێیت قەت کۆتایی نایەت. یەك چوونە ژوورەوە و سەدان دەرچوون. هەر ڕێگایەک و سەدان ڕێچکە ڕێی لێ دەبێتەوە، تونێڵ و کونەشاخی تەڕی تەنگەبەر، ئەگەر بێت و بەدوویان کەویت هەریەکەی لە دووری چەند کلۆمەترێك لەلایەکی دیکە دەردەچن... هەندێکیان چەند شەو و چەند ڕۆژ ڕێدەبن! لەناو خۆی کانیاو و سەرچاوەی ئاوی زۆرە. لەهەمووی نامۆتر بە هەزاران کۆتر گمەگم دەگمێنن، بۆ کەسێك شارەزای ئەو ئەشکەوتە نەبێت، بۆ یەکەم جاری بێت ڕێی بکەوێتە ئێرە، زۆر تووشی سەرسووڕمان و ترس دەبێت! لەگەڵ بچووکترین دەنگ بە هەزاران کۆتر لەشەقەی باڵدەدەن و دەفڕن، شەقەی باڵەکانیان دەنگ دەداتەوە، ئەوەندەی کە دەنگەکان گەورەتر دەبن. پۆلەکۆترە ئاسمانییەکە بۆ هەر جێیەك بچن هەر دەگەڕێنەوە باوەشی کونەکۆتر.. لەهەموو جۆرە ڕەگێکیان تێدایە، بەڵام زۆربەیان کۆتری سپی پەرین. بەچاوخشاندنێک بە ناو ئەشکەوتدا، زۆر وێنەی هەڵکەندراوی سەدان جۆری گیانلەبەر و ئاژەڵی کێوی. لەسەر تاوێر و گاشەبەردەکانی بەدەمیان داستان و شەڕ تۆمارکراون، هەندێکیان تەنها بە وێنەنە بۆی هەیە ئەو سەردەمانەی ئەو وێنانە کێشراون پیت و نوسین هەرنەش بووبێت. بەڵام هەر هەموویان دیرۆکی جەنگەکان دەگێڕنەوە. لە دەرەوەش لە دەوروبەری ئەشکەوت، بەکۆنە سەنگەر و داروبەردی سپی ئەو ناوە بۆت دەردەکەوێت بە درێژایی مێژوو لە جەنگ و بەرەنگاربوونەوەدا بووە. سەرسەخترین دوژمن هەرکە ناوی قەندیل هاتبێت ئەژنۆی لەرزیوە. هێرش بردنە سەر قەندیل مانای لەدەستدانی هێزێکی زۆر و بێشومار. بەرامبەر بە هیچ. هەموو قەڵا و چیایەك لە جیهاندا بگیرێت قەندیل گرتنی زۆر ئاستەمە.. ئەوەندە ڕکن و بەرز و سەرکەوتنی دژوارە، هەتا دەگەیە لووتکەی سەربەتەمە و سەهۆڵاوی هێزی ئەژنۆت دەشکێت. لە زنجیرە چیای قەندیل.. لەنێوان دوو لووتکە بەدرێژایی چەندان کاتژمێر بەفری سەدان،

بگرە هەزاران ساڵەی لەسەر یەك کەڵەکە بووە. لەژێر بەفر ڕێگای پان و بەرین هەن کاروان و جەڵەبی چەند سەد سەر مەڕومالاّت بە ژێریدا دەڕۆن. کاروانچی و قاچاخچییەکان لەژێر بەفەر بازاڕ و کڕین و فرۆشتن دەکەن.. ئەشکەوتی کونەکۆتر بە پۆلەکۆتر، لەگەڵ یەکەم گرمەی هاتنی تۆپ و ساروّخ هەرهەموویان دەفڕن، ئەگەر گمە و فڕینی پۆلەکۆتر ئەوەندە دەنگدانەوە بداتەوە، دەبێ تەقینی سەدان ڕاجیمە لە یەك کاتدا چ هەرایەك بنێتەوە. خۆ ئەگەر زۆر بچیە ناوەوەی ئەشکەوت، ئەدەنگ، ئەناگات لەوە دەما لەدەرەوە چی ڕوودەدات، دنیایەکی کپ و ئارامە، دەکەویە دنیای تاریکایی.. لەناو ئەشکەوت شاهۆ لەتەنیشت تەوار دانیشتبوو هەوڵی دەدا بزانێت لەو هەموو کۆترە دەترسێت، دەزانی ئەو کۆترانە ماڵین؟ تەوار بە دوودەست چەپڵەی لێدەدا، هەرچی کۆتری ژوورەوە بوو هەڵدەفڕین. شاهۆ زۆر غەمبار دەبوو لەو کاتە دژوارەی ناتوانێت شەڕ بکات و لەگەڵ پێشمەرگەکان بێت. برینداری و بێهێزی لەلایەك، تەوار و شەوبا و بریندارەکانی دیکە لەلایەك.. هەرئەوەندەی پێدەکرا ئەو دوانە بپارێزێت. لەناو ئەشکەوت لەبن تاوێرێك چەند بریندارێکی بەرگریکردن لە کونەکۆتر دەیان ناڵاند.. دکتۆر هاتە سەریان دوانیان زۆر بە خەستی بریندار نەبوون. زیاتر ساچمەیان بەر کەتبوو. لەگەڵ سڕینەوەی خوێنی سەر و دەموچاو و لاملیان بۆ شەڕکردن دەچوونەوە دەرەوە. ئەوەی زۆر پەرێشانی دەکردن کیمیایی بوو، لەبەر هەناسەتەنگی سییەکانیان تووشی هەوکردنێکی بەهێز ببووبوون زۆر جار ناو ئەشکەوت بۆنی سێو، سیر، بۆنی بۆگەنیو. پێشمەرگەیەکی کەمێك بەتەمەن.. سەرتاپای لەشی لە خوێنی تازەو کۆن وەردرابوو، جەمەدانیەکی لەسەر و دەموچاوی ئاڵابوو بە دووکەس گرتبوویان، هاواری دەکرد! هیچم نییە وازم لێ بێنن، دەتوانم شەڕبکەم. دەستی لەزەوی دەخشاند بە دوای تفەنگەکەیدا دەگەڕا. دکتۆر جەمەدانەکەی لەسەر دەموچاوی لابرد. چاوێکی بە تەواوی بەس ڕەگ و دەمارەکانی بەسەر ڕوومەت و لاملیدا بڵاو ببوونەوە، قووڵی چاڵی چاوی تۆپێك خوێنبوو. سەرشانەکانی هەڵتەکابوون، دکتۆر دەرزیەکی لێدا، سەرێکی ماوەیەکی باش بادا. باشە ئەوە چۆن، چۆنی ماوە؟ کەچی داوای چەکەکەی دەکات. دەستی کرد بە پێچانی برینەکانی.. هێرشەکان چڕتبوونەوە، ماوەی چەند کاتژمێرێك هەتا پاش نیوەڕۆ دەنگی بۆردوومان و ناڵەناڵی تۆپان دەهات.. بن بەرد و بستەخاکێك نەدەما چەند تۆپێکی بەر نەکەوێت. شاهۆ دەستی دایە چەك و لەگەڵ چەند

پێشمەرگەیەك لە ئەشکەوت هاتنەدەر. گەرمی تۆپ باران، سەرمای کوشندەی کپکردبوو. ئاسمانێکی قاوەیی، لەهەندێك لا زەرد زەرد. کەس سەری لەو ئاسمان و چیاو بنارە دەرنەدەچوو. هەر بستە و جۆرە ڕەنگێك بوو.. لەهەموولایەکەوە هێرش دەکرا، فڕۆکە جەنگیەکان وا پەلاماریان دەدا وات دەزانی لەگەڵ وڵاتێکی زۆر بەهێزی دووژمن بەرەنگار بوونەتەوە. ئەو جارەی تەنها پێنج پێشمەرگە نەبوون. نزیکەی شەست کەس دەبوون. چەکی باشی بەهێزی ڕەشاش حەفارۆف، بیکەیسی چەندین ئاربیجی قازیفە، بەبن تیکە شاخ و تاوێر و سەنگەرەکاندا بڵاو بووبوونەوە. جاش و سوپا ئەوەندەیان کیمیایی خۆیان هەڵمژیبوون گێژ و هوڕبووبوون، شارەزای ئەو ناوچە ئاسێیەش نەبوون.. لەزۆربەی قۆڵەکان دەستەی تیربارانکەر لەگەڵ سوپادابوو، لەگەڵ هەڵاتنیان لە پشتەوە گوللەباران دەکران. لە لایان گرنگ نەبوو چەند گوللەباران دەکرێن، دەمیان سەدان، گرنگ شەڕ بەردوام بێت، سوپا ترسنۆك و بەزیو دیار نەبن. سوپا بەهەشت ساڵەی جەنگ بە قەد ئەو چەند مانگەی شەڕی پێشمەرگە هیلاك نەبووبوون، بۆخۆشیان نەیاندەزانیی ورەی پۆڵاینی پێشمەرگە لە چییەوە هاتووە. ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە چەند جار هێرش لە دوای هێرش دەکران، چیا گڕی گرت، هەرچی پووش و پەڵاش و داربەروو کۆنەخانوو کەپر هەیە ئاگری گرت، دەنگی تەقینەوە وەکوو بوومەلەرزە دەتەقیەوە، کەس باوەڕی بەوە نەبوو گیانلەبەرێك بە زیندوویی مابێت. دوژمن هەرچی هێزی هەیەتی لەو ناوە کۆیکردنەوە سەریەك هەتا نیوەشەو بۆردوومانی بە خەستی کرد. لە نیوە شەودا دەنگی بۆردوومان وەستا، هێزی جاش لەپێشەوە و سەرباز و مغاویر بەدواوە، لەخواری بنارەوە هەتا ناوەڕاستی چیا بە ئارەزووی خۆیان بەبێ بەرگری سەرکەوتن، وایان زانی لەگەڵ لێدانی کیمیایی کەس نەماوە

شەڕی ئەو قەندیلە نەفرەتیەمان لەکۆڵ بێتەوە! جەنگی گەورەش لەگەڵ ئێران نەماوە دەگەڕێنەوە، ناو ماڵ و منداڵی خۆمان، چەند سەربازێك لەگەڵ یەکتری قسەیان دەکرد، پێشمەرگەکان گوێیان لێ بوو، بەڵام چاوەڕوانی ژمارەیەکی زۆرتریان دەکرد. ئێمە سەربازین ناچارین دەبا ئەوان دوورکەونەوە لەو ناوە لەو چیا ڕەق و ڕووتە خۆ بیرە ئەوتی لێ نییە بەرگری لێ بکەین؟ پێشمەرگەکان بە بیستنی قسەی سەربازەکان دەستیان شل دەبوو، چونکە دەیانزانی بە ناچاری ڕاپێچی ئەو ناوە کرابوون، بەڵام کە ناوی جاشیان گوێ لێدەبوو دەمارگیتر

دەبوون، دەیانزانی ئەگەر لێیان نێیەنە دەست، تەفر و تونایان دەکەن. سەربازەکان دڵیان خۆش بوو، ئەگەر وا بڕوات هەتا لووتکە بەرگری نەبێت مانای وایە کۆتاییان پێهاتووە. پێشمەرگەکان چاریان نەما.. سنووری خۆیان بەزاند. لەناکاوێك کەوتنە بەرئاگری چەکی پێشمەرگە، لەهەموو لایەك ئاگردەباری. جاش و سەرباز سەریان لێشێوا بە تێکشکاوی سەربەرەو خوار هەڵدەهاتن، چەندین لاشە و بریندارییان بە جێهێشت. لەنیوە شەودا سێ کەس پەیدابوون نهێنی شەویان گوت، لە لایەن پێشمەرگەکانەوە ناسرانەوە، سێ پێشمەرگەی ماندوو و هیلاك هاتنەوە ماوەیەك هەر چاویان دەگێڕا، بەرپرسەکەیان پرسی، ها چیتان کرد؟ لەسەر قسەی دوو جاشە باشەکەی خۆمان چووین. لەبن پردەکە چاوەڕوانمان بوون، ئەو کاتی هاتنە سەرەوە بۆسەرتان ئاگاداربووین، دەمانتوانی تەقەیان لێ بکەین و زۆریان لێ بکوژین، بەڵام ئێمە بۆ چالاکییەکی گەورەتر چووبوین. جاشەکان ئێمەیان برد لەگەڵ خۆیان جلوبەرگی سەربازیان پێ لەبەرکردین.. پاك پاك ڕیشیان پێمان تاشی، وەختابوو لەناو جلەکان بخنکێین، بردیانینە لای ئەفسەرێکی کورد. هەموو کەس لایان وابوو سەربازین. کابرا هەندێك مین و تەقەمەنی و تی ئێن تی نیشان داین و بەخێرایی فێری کردین چۆنچۆنی ئامادە دەکرێن، هەموو لایەکمان (تی ئێن تی) مین ڕێژکرد. هەمووی بە کاتژمێر چرکەچرکی دەکرد، ژمارەی گەورەی سووریان لەسەربوون، ماوەیەکی باش بەناو مۆلگا و سەربازگەکەدا سووڕاینەوە. پاش تەواوبوونمان بەکوێدا چووین بەوێشدا گەڕاینەوە. بۆخۆشمان نازانین چی ڕوودەدات.. ئەوەندە بەسەر هاتنەوەی پێشمەرگەکاندا تێنەپەڕی بوو چەند ڕمبەیەکی گەورە هەستان، تەقینەوە هەتا دەهات زیاتر دەبوو، ئاگری تەقینەوە هەتا نیوەی چیا چڕەدووکەڵە دەهات. چەند تەقینەوەکان زیاتر دەبوون پێشمەرگەکان شادمان تر دەبوون، جارجار لەولای ئەشکەوت تەقەی خۆشییان دەکرد. ئەو شەوە هەتا بەیانی زرمبە زرمب نەبڕایەوە، هەرچی جبەخانە هەیە تەقی بووەوە. ئەوانەی لەوێ بوون باسیان دەکرد ماوەی یەك مانگە، هێرش لەسەر هێرش دەکرێت، هەموو جارێك تێك دەشکێن. لەگەڵ هەر تێکشانێك، دەستەدەستە لێرە و لەوێ پێشمەرگە و ژن و منداڵ پەیدا دەبوون. بڕیاریاندا هەرچی نەخۆش و بریندار و ژن و منداڵ و پەککەوتەیە بڕۆن بەرەو سنوور لەو ناوە دوورکەنەوە. ئێستا ژمارەمان زۆرە با بەشێکمان بڵاوەی لێ بکەین بچین بە هانای پێشمەرگەکانی دیکە. شاهۆ لەگەڵ

تەوار و شەوبا و چەند بریندارێك و چەند پێشمەرگەیەکی دیکە بەو دیوی کونەکۆتر ڕووەو (تاتی دۆیو گۆرتی سویێ) بەڕێ کەوتن، دکتۆر و چەند پێشمەرگەیەکیان لە کونەکۆتر بەجێ هێشت. دکتۆر شاهۆی جیاکردەوە، بە زووترین کات تەوار بگەیەنە خەستەخانە. لەو کێوە چۆڵوهۆڵە لە فڕۆکە جەنگی و کیمیایی زیاتر چیدیکە دەست دەکەوێت؟ ئەو کچە بەستەزمانە برینەکانی قووڵن و کاریگەرن، بە زووترین کات چارەسەری پێویستە. ئەو دەرمانانەی هەمبوون هەر هەموویانم بەکار هێنا، باشە هەر ئێستا خراپ نییە، بەڵام دەرمانەکان چارەسەر و تیماری یەکجاری نین، تەنها ئازارشکێن بوون، بۆ ساڕێژبوونی تەواوی برینەکان خەستەخانەی تایبەتی پێویستە. شاهۆ بۆ خۆشی برینەکانی کاریگەرتر بووبوون و هەناسەی زۆر تەنگ بوو. تەواریش دووبارە زەردوو لاواز بووبوو. ڕۆیشتن ڕوویان لەهەر لایەك دەکرد هەر شەڕ بوو. لەبەری قڕناقە و پشت ئاشانیش هەر شەڕ و پێکدادان زۆر بە دژواری بەردەوام بوو. لەسەنگەرەکانی پێشەوە، پێشمەرگە بەسەدان دیلی سەرباز جاش و هێزی تایبەتی بە دیل گرتبوون. زۆر لەو سەربازانە، میسری و ئوردنی و سودانی و فەڵەستینی بوون. کاتێك لە دیلە بێگانەکانیان دەپرسی بۆچی هاتوون؟ بۆ یارمەتی دەانی سوپای ئێراق لەدژی داگیرکەری ئێران، بەڵام جەنگ لەگەڵ فارس تەواو بووە. وەڵامیان نەبوو. ئەفسەرێکی دیلی بەسڕایی زۆر بە سەختی زامدار بووبوو، دکتۆر هەوڵی دەدا تیماری بکات. خوێن لە تەواوی جەستەی دەچۆڕایەوە، بەرگری دەکرد، دەستی دکتۆری لادەدا چارەسەرم بۆ چییە؟ ئەمن خەڵکی بەسڕەم ئەوەتا لەدوور ترین چیا لە قەندیل برینداربووم هاتووین خاکتان داگیر بکەین بۆ خۆتان و ماڵ و منداڵتان بە کیمیایی بسووتێنین کەچی بە برینداری چارەسەرمان دەکەن، بەڕاستی شەرمەزارییە، کەسانی وەکوو ئێمە هی ئەوەنین چارەسەربکرێن، ئای گەلی کورد چەند میللەتێکی بەخشندە و مرۆڤ دۆستی، بەڵام قوربانییەکی زلهێزەکان و خوێن خۆرەکانی ناوچەکەی! بەدەم ئەو چەند وشەوە گیانی دەرچوو. هەتا شەڕ توندتر دەبوو دیل زیاتر دەبوون.. لەناو ئەو دیلانە شەش جاشیان خەڵکی سوورەدێ بوون هاتبوون گوندەکەی خۆیان بسووتێنن. پێشمەرگەش هەریەکە و خەڵکی شارێك بوون هاتبوون بەرگری لە گوندەکەی ئەوان بکەن، بەدەستی خۆیان گوند و خاکی خۆیان بسووتێنن، بە پانایی دەشت و بنار ڕەوەجاش و ئەوەی پڕۆلیتاریا هێرشی دەکرد. چەند سەد

پێشمەرگەیەك بەرامبەر سوپایەکی گەورەی خوێنڕێژ. بە دەیان هەزار بەس جاشیان لەگەڵدابوون. هەرچی سەربازی بە زۆر هێندراوی خوارو بوون، لەبەر سەرماو شەڕ خۆیان ڕانەدەگرت. بەڵام جاش زۆر بە دڵ، دەیگوت بۆ مزگەوتی دەکەن. تا شەڕ گەرمتر دەبوو لێشاوی جاش زیاتردەبوون.

شاهۆ لە قەندیل کۆمەڵێك پێشمەرگەی بینی زۆر بە غەمبار و هیلاکی ڕێگایان دەبڕی، هەموو جلوبەرگیان خوێنبوو، کەس ورتەی لە دەمی نەدەهات. دارە تەرمێکیان لەسەر شان بوو خوێناوی لێدەچۆڕایەوە. شاهۆ پرسیاری لە پێشمەرگەکان کرد ئەوە کێیە لەناو ئەو دارە تەرمە؟ پێشمەرگەکان هیچیان نەگوت، دارەتەرمەکەیان دانا سەر زەوی. کاتێك شاهۆ کەمێك بەتانی خۆڵاوی و خوێناوی لەسەر دەموچاوی لادا. دەم و چاوێکی کزی زەردهەڵگەڕاو لەژێر باری مەرگ دابوو، هەردووك چاوە کزەکانی کردەوە، لەگەڵ یەکەم نیگا، شاهۆ ئەو دووچاوە هەڵۆ ئاساییەی ناسییەوە! ئەو دووچاوانە بوون لەسەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێوە لەدوورترین شوێن دوژمنی بەدی کردووە. کونە شاخ و لووتکە و دەشتی گەرمایان و بادینان تەواوی خاکی کوردستان نەما شەڕی تێدا نەکردبێت، هەموو تاشە بەردێك، بن پنچکە گیایەك، هەموو چنارێکی باڵا بەرز، هەموو بنە گوێنیەکی کورتە باڵا (گەواهی) لەسەر قارەمانیەتی ئەو کەسە دەدەن. هەر ئەو چاوانەن سۆمایان داهاتووە، چۆنچۆنی دووچاو سۆمایان دانەیەت، دڵۆپە خوێنێك لە جەسەتەی نەماوە. لە ڕێگای شادەمارە پساوەکانی بەسەر تاشەبەرد و خاکدا بڵاو بوونەتەوە، ئێستا دوو چاوەکانی چەند هەنگاوێك پێش خۆیان بە لێڵی دەبینن. ئەو کەڵەپیاوە ئەگەر ئازاد هەورامی نەبێت.. دەبێ کێ بێت؟ هەر سەرکردەیەکی کورد بەچارەگی ئازاد هەورامی دڵسۆز و ئازا و لە خۆبووردووی خاکی بان، کورد زۆر دەمێك بوو بە ئامانجەکانی خۆیدەگەیشت. هەتا توانای هەبوو، خوێن لە دەمارەکانی گەڕابوو، شەڕی کردبوو. لەو کاتەیدا بەبێ ئاگاداری شاهۆ تەوار لەنێوانی کەلێنی (دەستەبەرێکی لە شێوەی دارەتەرم) چاوە شینەکانی لەسەر دووچاوی کاك ئازاد هەڵنەدەگرت... کاك ئازاد، هەرچی هێزی لەشی هەیە کۆی کردەوە بزەیەکی بۆ تەوار کرد، توانای سەربەرزکردنەوەی نەبوو، دەنا لە ڕووخساری شەکەتی مەرگ لێنیشتووی ڕادیاربوو پێش دەرچوونی دوا هەناسە حەزی بە ماچکردنی چاوەکانی تەوار دەکرد، بە نەرمە بزەکەی دەیهویست بە تەوار بڵێیت، ئەمن لە دوا چرکەکانی

ژینمدام و خاکی گەرمی کوردستان لە باوەشم دەگرێت. ئەتۆ و ئەوەی دابێت بەرپرسی کوردستانەکەم دەبن، وەکوو چاوی خۆتان بی پارێزن... تەواریش دەیەویست لە ڕێگای دوا بزە نیگاوە پێی بڵێت. مامە ئازادی خۆشەویست (ئەتۆ دەڕۆی ژن ومنداڵت لەپاش خۆت بەجێ دەهێڵی، ئەمن لەهەموو خێزانم تەنها و تاقانە ماوم. حەزم لە تەنیایی نییە. ڕقم لە تاقانەییە، حەزم لە ئامێزی دایك و باوکمە، لەگەڵ خوشکەکانم و براکەم یاری بکەم... کوان، لەکوێن؟ شاهۆ دانەویەوە بەناوی هەموو کوردێکی بە شەرەف ناوچاوانی هەورامی ماچ کرد. پێشمەرگەکان، چۆن بەبێدەنگی هاتن، ئاواش بەبێدەنگی ڕۆیشتن. شاهۆش بەدڵێکی زۆر غەمبارەوە بەکۆمەڵێك بریندار و نەخۆش و ژن و منداڵەوە بە بەفر و سارد و سەرما ڕەهێڵە و زریان ڕووەو سنووری ئێران ڕێگای دەکرد. هەنگاوەکانیان وەها شل ببوون بەزۆر ڕێیان دەکرد ولآخە بەرزەکان ئەوەندە لەڕ و لاواز بووبوون توانای ڕێگابڕینیان نەمابوو. بەتەواوی نەخشەی ولآتدا بە باری قورسەوە سووڕابونەوە. برینیدار بەدەم ئازارە ئەوەندە هیلاکبوون توانای ناڵەناڵیشیان نەبوو. چەند کاتژمێرێك دواتر هەواڵێك بەخێرایی ڕەشەبا و زریانی کوێستان لەسەر زاری پێشمەرگە و خەڵك و بەناو تەواوی پێشمەرگەدا بلآو بووەوە (ئازاد هەورامی) سەرکردە چووە ڕێزی کاروانی نەپساوەی شەهیدان، ئەوەی دواڕۆژ دەبێ ئەو کەڵەپیاوە بەوەفایانە لەبیر نەکات و هەر دڵۆپە خوێنێکی ڕژاوی جەنگاوەرێك، سەرچاوەی ژیانی بێت. شاهۆ نەمانی ئازاد هەورامی لەدڵەوە بە کوڵ دەگریا.

شاهۆ و هاوەڵەکانی بەدەم ڕۆیشتنەوە بەردەوام گوێیان لە بۆردوومان و گرەگری فڕۆکەی جەنگی دەبوو. زۆربەی کاتەکان بەڕۆژ لەژێر ئەشکەوت و تیکەشاخە بەستووەکان خۆیان دەشاردەوە. تەوار لە پشتی شەتەکدراوی شەوبا، پەراسووە باریک و بەئازارەکانی وێک هاتوونەتەوە و قەفەسەی سینگی تەواو تەنگ بووەتەوە، بەمەبەستی زانینی کۆتایی ڕێگای هاتونەهات، بەچرپەیەکەوە تێکەڵ بە پرمەی ڕەشە ولآخە پرزە لێبڕاوەکان، پرسیار دەکات. دادە بەرەو کوێ دەڕۆین؟ بۆچی وا دووردەکەوینەوە؟ شەوبا وەکوو تەوار سەری لەو هەموو ڕۆیشتن و شەڕ و جەنگە دەرنەدەچوو! هەرئەوەندەی دەزانی چیا و دۆڵ بەناو بەفر و شەختەدا دەبڕن.. هیچ وەڵامێکی پێنەبوو بۆتەوار.. بۆیە جارجارە بە نائومێدییەکەوە دەیگووت، نازانم تەوارگیان بۆ خۆشم وەکوو تۆ نازانم. سەرم

لەو سەر هەڵگرتنە دەرناچێت. بۆ دەبێ هەر لە هەڵاتندا بین؟ قەت کۆچکردن کۆتایی نایەت. بۆ دڵدانەوە و ورەبەرزکردنەوە و باوەڕ بەخۆکردن، بەڵام هاوڕێ شاهۆ و هاوڕێیەکانی دەزانن بەرەو کوێ دەچین.

زۆربەی شەوەکان لەسەر بەفر دەخەوتن. هەتا چاوبڕ بکات هەر سپی دەچێتەوە، لووتکە و چیا و دۆڵ و نەك مرۆڤەکان بەڵکوو وڵاخ و بارەکانیش لەبەفردا وندەبوون. هێشتا لە هاویندان دەبێ زستانی چۆنچۆنی بێت؟ زۆربەی ڕێگایەکانی ئەوەندە باریك و لەبەرزی بوون، وایان دەزانی بە داوە دەزوویەکی باریک بە ئاسمانەوە گرێدراون، هەرکەسێك تەماشای خوارەوەی کردبا بەردەبووەوە پارچەپارچە دەبوو، لەناوچوون و مانەوەیان لەسەر هەنگاوی وڵاخەکان دەما. لەگەڵ هەر هەڵخلیسکان و ساتمە بردنێك بە لەدەستدانی ژیانیان کۆتایی دەهات. پاش چەند شەو و چەند ڕۆژ ڕێگا بڕین، بەناچاری و پرزە لێبڕاوی قۆناغ بە قۆناغ گەیشتنە دۆڵەکۆگە، لەبەرزاییەوە دیاربوو. دۆڵێکی قووڵە و زیاتر خەرمەندێکە، بە تێپەڕبوونی کات، هەرمسی بەفر و چیا ئەو شوێنەی درێوە و ئاو و ئاوەدانی لێ پەیدابووە. جێگای مەنزڵگا و شوێنی مەبەست نەبوو، نزیکی سنووری دەستکردی هەردووك وڵات. دۆڵەکۆگە دۆڵێکی قووڵی بەرفراوانی تەڕ و تووش، کۆمەڵێك کۆنەخانووی داتەپیو، هەرچی جۆری کەسی لێت بزربووبوو لەوناوە دەتدۆزیەوە. فرۆشگا و جێگای کاروانسەرای کاروان چی و قاچاخچیان بوو، گەیشتن بە دۆڵەکۆگە مانای نزیك بوونەوە لە مەنزڵگا. شاهۆ لەگەڵ بریندارەکان دوو شەو لەوێ بۆ پشوودان مانەوە. دیسان بەڕێکەوتنەوە بۆ (ناوزەنگ) ڕێگا ئەوەندە هەوراز و هەڵدێری هەبوو. ڕێگای چەند کاتژمێرێك بە چەند ڕۆژێك دەبڕان. بە تەنیشت لووتکەی سەری سادر و هەورازی چەکوش شۆڕبوونەوە بۆ بێدەلان، لەدامێنی گۆڕەشێر بۆ نۆکان. لەو دۆڵە بێ کۆتاییە، کۆمەڵێك کۆنە بارەگا و خانوو دەستەی پێش ئەمان دروستیان کردبوون. لە سەرووی قاسمەڕەش بە دەیان خێزان زیاتر ژن و منداڵ پیر و پەککەوتە گیریان خواردبوو.. شاهۆ لێیان نزیك بووەوە و لە پیرەمێردێکی پرسی، مامەگیان ئێوە بۆچی لێرەن؟ لەنزیك پایەگای پاسداران! پیرەمێرد پاش ئەوەی چەند جار فرمێسکی چاوەکانی سڕین. کوڕم چیت بۆ باس بکەم، ئێمە کوردی فەیلین، هەموو ژیانی خۆمان لە بەغدا ژیاوین، لەخەڵکە ڕەسەنەکەی بەغدا دەژمێردراین. بابوباپیرانمان هەر لە خانەقین و بەغدا ژیاون. ئەو سەدامە گولە ئێژێت ئێوە

ئێراقی نین، ئەسڵ و فەسڵتان ئێرانین. بە بێئەوەی هیچ شتێك بتوانین لەگەڵ خۆمان دەرکەین.. هەرچی ماڵ و موڵك و زەوی و شتی هەمان بوو دەستیان بەسەرداگرت. بەڕووت و قوتی هەتا مەرزی ئێران ئێمەیان بە زیل و کاروان هێنا، پاشان ئاودیوی ئێران بووین، هەم دیسان ئێمەیان گەڕاندەوە ئێراق، پێ یان گوتین.. ئێوە هیچ شتێکتان لە ئێران نییە. بابوباپیرانتان لە ئێراق ژیاون، هەرچەند جاری دەگەڕێنەوە مەرزی ئێراق، چەند کەسێکمان لێ گوللەباران دەکەن. ئێستاش لەو مەرزە چەند مانگە ماوینەتەوە، زۆر لەوە زیاتر بووین زۆرمان بە نەخۆشی و دەردەسەری و داخی ئەو لێقەومانە مردن. بۆ خۆشمان نازانین چارەنووسمان بەچی دەگات! خۆ ئەگەر یارمەتی پێشمەرگە نەبوایە زۆردەمێك بوو گشتمان تێدادەچووین، بەڵام وەناشکوری نەبێت ئەوانیش تووشی نسکۆ هاتوون بۆخۆیان لە ئێمە خراپترن، خوا ڕەحم بکات. چەند جار لەبەر ئەو زوقم و سەرمایە، جلدڕاو ڕووت و بێبەرگ برسی. ئەو خێزانانە کوردی فەیلی پاسدار دەهات دەری دەکردن و لێیانی دەدا. پاش چەند جار ئاودیوی ئێران بووبون، سنووورداش کرابوونەوە. بۆخۆشیان نەیاندەزانی ئێراقین یان ئێرانین. ڕژێم هێرشی بۆ سەر ئەو ناوچانەش دەکرد، لەبەرزایی مامەندەوە دۆڵی ناوزەنگی بە چڕی تۆپباران دەکرد. زۆرجار تۆپ لەدەوروبەری دەدان، بەڵام وا لەژیانی خۆیان بێزاربوون، مەرگی خۆیان بەئاوات دەخواست. ڕژێم لەگەڵ چڕکردنەوەی هێرشەکانی لێبووردنێکی گشتی دەرکرد! پاش ئەو هەموو ئەنفال و کیمیابارانە لێبووردن، کێ دەبێ لە کێ ببوورێت؟ لە پاش ئەو هەموو تاوان و جینۆساید و کۆمەڵکوژییە لێبووردنی چی؟ هەتا ماوین نە ئێمە لە بەعس دەبوورین نە ئەوانیش لەئێمە ببوورن، دەبێ بە بنەچەی یەکتریدا بچینە خوارێ. ڕۆژ ڕۆژی ئەوانە، جیهان خەساوە، دەستیان نەپاراستووە لە کوشتن و بڕین.. خوێن نابێت بەئاو، ئەوان باڵادەست و بە چەك بەهێزن، بەڵام کە ڕۆژی خۆمان هات چاوبەچاو دەکەوێتەوە، وتەی خۆیانە دەڵێن، ڕۆژێك هی خۆتە ڕۆژێك لە خۆت. ڕۆژی خۆیان دنیایان خەڵتانی خوێن کرد، داخوا ڕۆژی لەوان کەنگێ بێت؟ پیرەمێرد زۆر بە دڵ و بە حەماسەوە قسەی دەکرد، ئەوکاتی پەیامەکەی خۆیان شانازی زۆر پێوە دەکەن، بە سەرەو خواری بۆیان دەنێرینەوە. ئەو ڕەگەزنامەی بە بڕیارێك دەماندەنێ و بە ئارەزوو لێمانی دەستێننەوە. گەرەکمان نابێت، لەجیاتی ئەوە ڕەگەزنامەی خۆمان و بەزمانی خۆمان دەبێت. ئەوکارە نامرۆڤانەی

بەرامبەر خەڵکی ئەنفالکراو و ماڵوێران کرا، بەهەزاران کەس زیندەبەچاڵ کراون لەخواروی وڵات، هەرچی کچی گەنجی کوردە بە پارەیەکی کەم بە شێخەکانی عەرەبی کەنداو و میسرِ فرۆشراون! کێ جارێکی کە باوەڕ بە لێبووردنی ئەو ڕژێمە دەکات؟ ئەگەر وایە با چارەنووسی هەزاران کەسی ئەنفالکراو ئاشکرا بکات. ئەوەتا چرکە لەدوای چرکە جەنگی کۆمەڵکوژی زیاد دەکات. جەنگ وەستا بۆ گیانی کورد و لەنابردنی کورد وەستا پرسیان بەکێ کرد.. جەنگیان دەست پێکرد؟ جەنگیان لە ئەکاوێك وەستاند دووبارە کێیان ئاگادار کردەوە؟

# ئۆردووگای پەنابەران

لە دۆڵی ناوزەنگ، ئەو دۆڵەی بە دۆڵی پارتو ڕێکخراوەکان ناسراوبووا ئێرە نیشتمانێکی بچووک کراوەی هەمەڕەنگە، کەس لێرە لەوی دیکەیان بەرزتر نییە و هەرچی کۆنەبارەگا و کۆنەسەنگەرو، نانەوەخانە و فرۆشگا هەیە ئاوەدان کرابوونەوە.. نۆکان لەخوار چیای مامەندە دەستەخوشکی نیسکانە، زنجیرەی جاسووسان باوەشی بۆ کردووەتەوە. ڕووبارێکی بچووکی کەم ئاو، سنووری دەستکرد لەیەك جیادەکاتەوە.. هەر بەو دۆڵەیدا چووبایە خوار بازاڕ و دۆڵی قاسمەڕەش دەهات، دۆڵێکی هەتا بڵێی قووڵ، بە چەند چیا و گرد و تەلان دەورەدراوە. لەو دۆڵەوە هەموو جارێك شۆڕش سەری هەڵداوە و پاش هەر تێکشکانێك یان نسکۆ، ناوزەنگ باوەشی بۆ ڕێبوارانی پرزەلێبراو کردووەتەوە. کە پێشمەرگە زۆردەبن دۆڵ بەخۆیانەوە ناگرێت، بەسەر ناوچەکاندا دابەش دەبن، هەرکە ژمارەیان کەم دەبێتەوە ناوزەنگ خۆت بگرە و هاتم. ژمارەی پێشمەرگە وەکوو دەنکەباران وایە، جار هەیە بە ڕێژەنە و بە لێزمە دەبارێت، جار هەیە وشکەساڵییە. ژمارەیان لە پەنجەکانی دەست تێپەرناکات، جار هەیە دەنکەکانی گەورە و بە برشتن ناودارن، وا ڕێك دەکەوێت ورد وەرد و بێکاریگەرن، بەڵام بە هەموو باران یەك شتە، هەراسانکردنی دوژمن. بە یەك نامە سەدان سیخووڕ بوونەتە پیاو، ئەوەتا لێرەم دەستدرێژی بکەی دەستت دەبڕم. جار هەبووە بە کوتەکاخەزێکی لاوێك هەروا بۆ ترساندنی (سەرۆك جاشێك) یان پیاو خراپێکی ناردووە، کابرا لە ترسان یان گوندو شاری جێ هێشتوە، یان خۆی چاك کردووە. ئەوەشی وا خۆی نیشان داوە، ئەو نامەیە هیچ نییە و کەفوکوڵە، لەترسان بە هەفتە خەو نە چووەتە چاوی. لەو دۆڵی ناوزەنگەی ئێستا ئەوەتا لەوسەری ئەوسەر سەربازگە و بازگەی ئێران سەرڕێی گرتووە. ئێرە سنوورە، ئێرە (قەرارگەی پێنجی ڕەمەزانە) جەناب سەروانێکی ڕیشنی چاودەرپەڕیو بە پاسدار ناسراون، ئەوەندەی تریاك و حەشیش و ماددەی هۆشبەر و سرکەڕ کێشابوو، چاوەکانی دەتگوت ها ئێستا ها تاوێکی دیکە فرتە دەکەن و دەردەپەڕنە دەرەوە. ڕووی لە شاهۆ کرد.. ئێمە حەز دەکەین هەرچی ئێراقی

هەیە لەو مەرزە دوورکەونەوە و بەرەو قووڵایی ئێران بچن! لەو ناوەی نێرداروی (سازمانی بەینەن میللەلی) زۆرن چاودێری دەکەن بزانن کێ پێشێلکاری لە ڕاوەستانی جەنگ دەکات؟بەتایبەتی چەکدار! نامانەوێت لەگەڵ (ئێراق) جارێکی دیکە تووشی جەنگ ببینەوە، لە بەرخاتری چەند چەکدارێکی بێ سەوادی ئێراقی، کەواتە ئەو ژن و پیاوە قژزەرد و چاوشین سوورفل بە جلکوبەرگی پۆشتە و خاوێنەوە، لەژێر چاویلکە ڕەشەکانیانەوە چاودێری هەموو شتێکیان دەکرد، ئەو کەسە ئەورووپاییە بە ویژدانانە، گوێچکە و چاوەشینە گەورەکانیان، بە قورقوشم ئاخندرابوون، هیچ کام لەو هەموو چیرۆکە ڕاستەقینە جەرگبڕانەیان نەدەدیت و نەدەبیست، کار و پیشەیان هەریەکەیان کامیرایەکی مۆدێرنیان بە ملەوە بوو، هەر دیمەنێکی چیای بە ڕووبار و پردەوە بەرچاوییان دەکەوت بەچەند جۆر وێنەیان دەگرت، ئەو کەسانەی لەسەر پرد و لەژێر پردەکان بەدەم ئازاری برینەکانیانەوە دەتلانەوە، نەدەکەوتنە چوارچێوەی پۆستەرەکانیانەوە دەفتەرێکی گەورەیان لەبن هەنگڵ دابوو، خەریکی نووسین بوون، هەر کە گوێیان لە وژەی ڕەشەبا و هاژەی ئاو و بوایە، بە ئۆتۆمبێلە جامڕەشە بەرزەکانیان لەو ناوە دوور دەکەوتنەوە، بۆ ئەو کارە هاتبوون. دەنگی نەڕەی پاسدار وەگەڕ کەوتەوە، هەرکەسێك سەردانی ئێران دەکات، یان لەوێ دەژیت، دەبێت ئاگاداری ڕێنمایی دابونەریتی میری بێت، نابێ مەستیگەری بکەن حەرامە. یەك دانە ئابجۆ لەدەست هەرکەس بگیرێت.. یان بۆنی سەگی تۆپیوی مەی لێبێت حەفتا (جەڵدەی ئیسلامی) لێ دەدرێت لەگەڵ شەش مانگ زیندانی. چوار دانە ئێراقی شەڕابیان خواردبووەوە پێشێلکاری دەستووری (کۆماری ئیسلامییان) کردبوو، زیاتر لە دوو ساڵە لە زیندانی ئەڤین دەناڵێنن. تریاك و جۆری تریاك کۆکاین و هیرۆین و گژوگیای خاش خاش ئەفغانی و قاتییە مەنی و کولومبی گوگەندە و تەرسە قووڵی پاکستانی، سەروگوێیان وەکوو کەرێ درێژدەکاتەوە، نازانم چی و چی لە سێدارەدانی لەسەرە!. هەموو سەرییان لەوەی سووڕما ئەو هەموو ناوە سەیر و سەمەرەییەی چۆنچۆنی ئەزبەر کردبوون، یان بەینی لەگەڵیان خۆشە. بە هیچ شێوەیەك ئازادی نییە! ژن کچ ڕووی لە تەوار کرد لە گۆشەیەکی چادرەکە، کەوا ڕەشەبا و زریان شەقە شقە ڕەقە ڕەق دەیهێنا و دەیبرد. هیچ حاڵی نەدەبوو، هەر ئەوەندە لە چاوە شەرانگێزەکانی ڕق و کینە و شەڕی بە دیدەکرد.. لەوەش چکۆڵە تر دەبێت سەرپۆش و چارشێ و لەسەر نێن. هەر تاڵە موویەکی بسکی مێینەیەك

وەکوو سەدان خەنجەر وایە بۆ سەردڵی پیاوان. نابێ ژنان و مێینە بەسەر ڕووتی هەتا لەناو ماڵی خۆشیان بجوڵێنەوە.. چوار (بەرگەی تەڕەدوود)ی بەناوی (تیرەی ئاکۆ)دایە دەستی شاهۆ. ئاغای شاهۆ ئەگەر بەو شتانە ڕازین دەتوانن سەردانی کۆماری ئیسلامی بکەن. خۆ ئەگەر ڕازی نین دەتوانم ڕووخسەتەکان پارەپارە بکەم. شاهۆ سەرێکی ڕازی بوونی هەژاند. زۆر سوپاستان دەکەین. جانەوەر ماوەیەك دەستی لە ڕیشە چڵکنە ماشوبرنجە بێسەر و بەرەکەی وەردا، وەکوو ئەوەی بیر لە شتێکی گرنگ بکاتەوە، ئاغای شاهۆ ئەو فارسییە ڕەوانە لە کوێ فێربووی؟ شاهو بزەیەکی بۆ کرد، لە زانکۆ دەرسی فارسیمان هەبوو، پاشان خەڵکی شارێکی سەر سنوورم تەواوی خەڵکەکە فارسی دەزانن، بۆ دوورکەوتنەوە و ڕێگەگرتن لە پرسیاری تر، ئەوەك لە شوێنێك بە هەر هۆیەك بێت ژیوان ببێتەوە لە ڕووخسەتەکەی، جگەرەیەکی بۆ ڕاداشت و بۆشی گرِدا، مژێکی قووڵی درێژی لێدا، بە دەم شاردەنەوەی پاکەتە بەهەمەنە بۆندارەکە بۆ بن لێواری بە تانییەکەی لە سەری دانیشت بوو، بەڵام ئەو فارسی زانییەی تۆ هی چەند دەرسێك و نزیکی سەر سنوور نییە، ئەگەر نەزانم کەنگێ و چەند لە ئێران ماویەوە ناتوانم ڕێگای چوونە ژوورەوەت بدەم. شاهۆ بە بێبیرکردنەوە، کاتی خۆی دوو ساڵێك لە ئێران بەپەنابەری لە ئۆردوگا ژیاوم، چ ساڵێك، کە نگێ، لەکوێ؟ . ساڵی حەتا و چوار و حەتاە و پێنج.. دەورانی شاه بوو. پاسدار چەند جارێك بۆنی بە قتوویەکی ڕەشی بچووکی بۆگەنیودا کرد، لە نەکاوێك هەڵچوو، بڵێ زەمانی ڕەزا شای گۆڕبەگۆڕ لە گۆڕی بابی بەم، سەردەمی غەدر و ناپاکی و فاحیشە خانە. قونگوشادی وا، قووتی ئێرانیانی بە قورگی ئاواراندا دەکرد بە ناوی پەناهەندان. شەپول هەتا ئەوکاتە بێدەنگ بوو، بۆ ئەوەی کۆتایی بەو دەمارگیرییە بێنێت، ڕووی لە جەناب سەروان کرد، جەنابی سەرهەنگ، ئەو سەردەمانە دەمێکە بەسەرچوون، سەردەم سەردەمێکی دیکەیە، ئەمنیش دەزانم سەردەمێکی دیکەیە، جەنابی شاهۆ لە گۆڕەکەی زیندووی دەکاتەوە، ئەو کاتی شاهۆ منداڵێك بووە. بەچەی ئەوانە بابوباپیرییان وەچەی، حەمە ڕەزاشاهی پەهلەویین. خەون بەوەدەبینن سواری پشتی شێرە تۆپیوەکەی شاه ببن و بە ڕەو خورشیدی بۆ هەتا هەتایی ئاوابوو بنوڕن، نە بۆخۆیی و نە ئەوانی کەش نەیاندەزانی لە چی ئاشێك دەهاڕێت. شاهۆ لە دڵی خۆیدا دەیگوت: تۆ پاشماوەی شێر و خورشید و حوکمی چەندین سەدەی بنەماڵەیەکی خوێنمژیت،

ڕەگەزپەرستیشت هەر لەوانەوە بۆماوەتەوە، ڕووی لە شەپۆل وەکوو هەموو جارێك فریای کەوێت، بە چاوتێیگەیاند، دەمی شیرین کە، بۆیە شەپول پاکەتە جگەرەیەکی نەکراوە و سەد تمەنییەکی لە پێشی دانا. ئەویش بە دەستووری پاکەتەکەی دیکە بۆ لێواری بە تانییە بورەکەی ژێری ڕاکێشا. یەکسەر گفتولفتی شیرین بوو، ئەدی برای شیرین من بۆ ئێوەمە، لە غەمی ئەو خانەوادە نەجیبزادە دام، ئەگەر لەوێ قسەی وا بکات تووشی چەرمەسەری دەبێت، ئەگەرنا، ئاغای شاهۆ، کەسێکی بە سەوادە. جەنابی ئەفسەر بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی. لە سەریاز. . ڕوانسەر جوانڕۆ. ئۆردووگای پەنابەرانی ئێراقی، خەڵکی هەڵەبجە هەن. هەر لەوێش خەستەخانەی گەورەی بریندارانی کیمیایی دروست کراوە، بریندارەکان چارەسەردەکرێن.. ئەو بەرگانە بۆ یەك مانگن پاش ئەو ماوەیە دەبێت لەو شوێنەی لێی بوون.. لە قەرارگەی ڕەمەزان تازە بکرێنەوە. ئەگەر نا تووشی سزا و گرتن دەبن. پاش ئەوەی چوار کوتەکاغەزە مۆرکراوەکەیان وەرگرت دەرچوون. شاهۆ ماوەیەك لە پارچە کاغەزەکان وردبووەوە.. وێنەی بەرەی جەنگ بوو. دووکەڵ و تۆپ و فڕۆکەی جەنگی لەئاسمانەوە، ئیمامی گەورە تەماشی بەرەی جەنگی دەکرد، ئەدی بۆ دەڵێن جەنگ کۆتای هاتووە؟ پاشان دروشمی جەنگ، جەنگ تا پیرۆزی چی بەسەرهات؟ یان جەنگ، جەنگ، تا کاولکردن و خۆبەدەستەوە دان بوو!. شاهۆ زیاتر بیری لەوە دەکردەوە، بەڵکوو لەڕێگای خەڵکانی هەڵەبجەی ئاوارەوە بتوانێت سۆراخێکی کەسوکار و خزم و ئاسیاو و کەسێکی تەوار بدۆزێتەوە. ئەوهەموو خەڵکەی هەڵەبجە دەبێت کەسێك مامۆستا نزار بناسێت. هەرچەندە تەوار ناداتە دەستی هیچ کەسێك، بەڵام بۆ زانینی کەسی تەوار زۆر پەرێشان بوو.

شاهۆ، شەپۆل، تەوار، شەوبا.. هەر لەپشتی قەرارگەی ڕەمەزان و لە نزیك بازگەی پاسداران وەستان. گۆڕەپان یان گەراجێکی تایبەت نەبوو بۆ ماشێنە نەفەر هەڵگران. زۆری نەبرد جێبێکی قوڕاوی پەیدابوو. بۆ کوێ دەڕۆن؟ بۆ سەردەشت! سەرکەون هەتا (ئالۆمتان) دەڕۆم لەوێوە بۆ سەردەشت ماشێن زۆرن.. لێرەوە سەردەشت نییە. سەرکەوتن چەند کەسێکی کە لەناو جێبە شڕەدابوون، بە بێزارییەوە چاوەڕوانی نەفەری تەواویان دەکرد. لە ڕێگا کاکی شوفێر گوێی لە گۆرانی دەگرت چەند کاسێتێکی گۆڕی، هەتا لەسەر سروودی لەقەندیلی سەربەرزەوە، وەڵامت بۆ دەنێرمەوە

شەهید بوونم شانازیە، هاوڕێ ڕەنگە نەتبینمەوە

(مامۆستا تاهیری خەلیلی) ڕاگرت. چەند جار تەواو دەبوو. بۆ دواوە دەیگەڕاندەوە، لەبەر خۆیەوە بە مینگەمینگ دەیگوتەوە، بۆ خۆشی دەنگی زۆر غەمگین و خۆش بوو. مسافیرەکان نەیاندەزانی گوێ لە کاك تاهیر یان لە کاکی شوفێر بگرن، بۆیە کەس نوتقی نەدەکرد. با بە ئارەزووی خۆی بکات! لە نزیکی بازگەکان کاسێتەکانی دەشاردنەوە چونکە یاساخ بوون بەتایبەتی دەنگی ئافرەت زیندانیکردنی لەسەربوو. لەهەموو بازگەیەك دابەزن. پشکنینێکی تەواو، ناسنامەکانتان بۆ کوێ دەچن؟ سیغارتان پێیە؟ کاکی شوفێر! ئەوەندە بەو ڕێگاو بانەدا هاتبوو، هەرلە دوورەوە چەند جگەرەیەکی بۆ ڕادەگرتن، لەڕێگا هەر لەخۆیان و ڕژێم و سەرۆکەکەیانی دەبرد. ئەوەندە نەبوو بەڕێ کەوتبوونە لەسەر گردێکی دووردوور دەنگی تەقەی فیشەکێك هات، کابرای شوفێر تۆرمزێکی توندی گرت، ڕای گرت. تەوار هەندێك خۆی لە نزیك شەوبا گرمۆڵە کرد لەتەقە نەدەترسا هەمووژیانی بە تەقە خەوتووەو بەگرمەی تۆپ خەبەری بۆتەوە، لە سەرو ڕیشی پاسدارە چڵکنەکان دەسڵمیەوە. پاش ماوەیەك سەربازێك بە هانکەهانك هات، جلێکی بەڵەکی سەربازی لەبەربوو ڕیشنی کوڵکن، جووتێك کالەی قووڕاوی لە پێدا بوو. بە شڵەژاویەکەوە پرسی.. ئاورو پێیە؟ کابرای شوفێر بە تووڕەبوونێکەوە شخارتەیەکی بۆ هاویشت، با بۆ خۆت بێت؟ دەك لەبرسان بمرن. نازانم ئەو سواڵکەرانە، چۆنچۆنی هەشت ساڵ جەنگیان پێکراوە؟ کابرایەکی وەکوو سەدام، ئەگەر دکتاتۆر و خوێنمژیش بێت میللەتی ئێراقیی تێرکردووە، کەس وەڵامی نەدایەوە. پاش سێ کاتژمێر گەیشتنە لادیەکی کەمێك گەورە، کاکی شوفێر لە گۆڕەپانێك ڕایگرت. پووڵەکانتان ئێرەش ئالۆمتان. ئالۆمتانی چی؟ بەقەدەر هەموو کوردستان سەربازگەی لێبوو! هەر بستە خاکێکی بە سەرباز تەندرابوو.. بەخوا ئەگەر وابڕوات، ئێرەش لەگەڵ دۆزەخەکەی لای خۆمان جیاوازی نییە. هەرکەس پارەی خۆیدا. لە بەرامبەرەوە کۆنەپاسێکی هەژدە نەفەری وەستا بوو، چەند نەفەری تێدابوو، هاواری دەکرد سەردەشت سەردەشت!. شاهۆ و ئەوانی دیکە سەرکەوتن، پاش ماوەیەك پڕبوو بەڕێکەوتن.. بەدەستووری ماشێن و بازگەکانی دیکە لە هەموو بازگەیەك دابەزن بەرگەکانتان. پیاو ژنان دەگەڕان.. سواربنەوە سیغار ئاور.. کاتێك گەیشتنە نزیک سەردەشت. هێواش هێواش هەستیان دەکرد هاتوونەتە وڵاتێکی دیکە. چەند دەچوونە قوڵایی

ئێران و له سنوور دوور دەکەوتنەوە، زیاتر هەستی تاراوگە دەیجووڵاندن. گەیشتنە سەردەشت، شارێکی گەورەی ڕووناك، کاکی شوفێر ماوەیەك بەناو شاردا سووڕاندنیەوە، لەهەموو لایەك کەباب و گوڵەدان برژاندن بوو، خەڵکی هەرهەمووی بە جلوبەرگی کوردی ڕەنگاو ڕەنگ. شاهۆ وەبیری هاتەوە لەنزیك سەردەشت لە (ئۆردووگای ڕەبەتێ) پەنابەربووە. پاش کەمێك گەڕان هوتێلێکیان دۆزیەوە. کابرا گوتی تەنها یەك ئووتاقی خاڵیمان هەیە گەورەیە بەشی هەرهەمووتان دەکات. کلیللی ژووریان وەرگرت، زۆر هیلاك بوون. پێنج قەرەوێڵەی داری یەك نەفەری تێدا بوو، هەرکەس لە هیلاکی و ماندووبوون زۆری پێنەچوو خەویان لێکەوت.. شاهۆ بە دیتنەوەی سەردەشت و ئۆردووگا خەونی بە ڕۆژانی پەنابەری دیت (تەمەنی هەروا چواردە پازدە ساڵ دەبوو، لەنزیکی سەردەشت لە ئۆردووگای ڕەبەت سەرناوی گەرم پەناهیندە بوون بەتەواوی لەپاش بیست و چواری چواری حەفتا و چوار، ئەو ڕۆژەی شاری قەڵادزێ پڕی پێشمەرگەبوو. ماڵیان لەپشت زانکۆی شۆڕش بوو لەگەڕەکی کارەبای کۆن و گەرەکی شەهیدانی پاش ئەو مێژووە. وەکوو هەموو جارێك خوێنکارانی زانکۆ داوای سەهۆڵ و سەوزەو میوەیان کردبوو، لەدەرگا گەورەکەی زانکۆ چووە ژوورەوە چاوی بەخوێندکارانی زانکۆ کەوت، ماوەیەك لەگەڵیان مایەوە داوای ڕۆژنامەیان لێ کرد. ژماردنی چەند دانە؟ بڕۆ چل دانە بێنە.. لە زانکۆ هاتە دەر لە تەلبەندەکانەوە دەیانی دیت. کۆمەڵ کۆمەڵ و دوو، دوو سێ سێ خەریکی پیاسەکردنن. هەنگاوەکانی گورجکردن سەرێکی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە. ڕۆژێکی هەتاوی ئاسمان ساف و بێگەرد.. لەناکاوێك دەنگی چەند فڕۆکەیەکی جەنگی هات. لەبەر چاوی بوون هەندێکیان سپی سپی بوون و هەندێکیان بۆر بۆر بوون.. خەڵکی دەیانژماردن. ئەوەتا ئەوە مێکە دووەمیش مێکە ئەو سیانە سیخۆن. ماوەیەك بەسەر ئاسمانی شاردا سووڕانەوە، نزم بوونەوە. دەنگی چەند تەقینەوەیەکی گەورە، وەکوو بومەلەرزە، تەواوی شاری شڵەژاند. فڕۆکەکان زۆر بە خێرایی و بێ بەزەییانە دەستیان کرد بە بۆردوومانکردنی شار بە ناپاڵم! لە چاوتروکانێکدا زانکۆ و خوێندکاری زانکۆیان بەچەند ناپاڵمی قوڕس لە خوێن وەردان، پارچەی گۆشت و ئێسقان تێکەڵ بە جەمەلۆن و شێلمان و خشت و خۆڵ بوون. خانووەکانی زانکۆ سەریان جەمەلۆن و لەوحی گەورە گەورەبوون. وەکوو سینەما و کارەبا. دیواری بە تەلبەند و سیم بوون، بەڵام سمیی دڕکاوی نەبوون،

بۆیە دیوارەکان و هۆڵە گەورەکانی زانکۆ، لەدەرەوە بەئاسانی بەدی دەکران. چەند خەڵك و خوێندکار بە بۆردوومان و ناپاڵمە قورسەکان پارچە پارچە بوون، دوو ئەوەندە بە فڕینی لەوحەکان. وەکوو باڵی فڕۆکەکان وژە وژیان دەهات. بەبەر هەرکەسێك دەکەوتن دوو پارچەی دەکردن.. لەبەردەم زانکۆ بوو بە هاتوهاوار پێشمەرگەکان هەرزوو کەوتنە ڕزگارکردنی بریندارەکان. پێشمەرگە بە چەکی سووك تەقەیان لە فڕۆکە جەنگییەکان دەکرد.. فڕۆکەکان ئەوەندەی دیکە ناپاڵمیان زیاتر بەردەدایەوە.. کە زانی ناتوانێت یارمەتی خوێندکارانی زانکۆبدات.. بەهەنگاوی گەورە گەورە، کەوتە غاردان.. ناودەمی وشك وشك بوو... بۆنی خوێن و سووتاو تەپوتۆزی خانووی داڕوخاو. ڕوەو خەستەخانەی شار غاریدا، ڕێگا بە خشت و بلۆك و داروبەرد و پارچە لاشە گیرابوو... لە نزیکی فولکەی قەڵادزێ کابرایەکی دیت بەبێ سەر غاری دەدا.. خەڵکی هاواریان دەکرد (ئەحمەدی مریەمێیە) بەبێ سەر غاردەدات، پاش چەند هەنگاوێك لاشەکەی ساردبووەوە و کەوتە سەر زەوی. بەپەلە خۆی بە خەستەخانە دا کرد. خەستەخانە بە تەواوی خاپوور کرابوو، هەرچی توانیبووی هەڵاتبوو. زۆربەی نەخۆشەکان بە قەرەوێڵەکانیانەوە شێلدرابوون پارچەپارچە بووبوون.. بەدوای باوکیدا دەگەڕا. تەرجومانی دکتۆر و خەستەخانە بوو. لەهیچ شوێنێك ئاسەواری دیار نەبوو، دەبێ لەکاتی بۆردوومانکە بەرەو ماڵ نەچووبێتەوە؟ دووبارە فڕۆکەکان هاتنەوە بۆردوومانیان کردەوە.. لە ترسان خۆی لەبن تانکیەك شاردەوە، تانکی ساچمەی بەرکەوت، هەرچی ئاوی ناو تانکییە بەسەرسەری شاهۆدا ڕژا. کەمێك لەولاتر لەبن دارتوویەك لاشەیەك کەتبوو خەڵتانی خوێن بوو. لەسەردەم کەوتبوو شاهۆ هەڵی گێڕایەوە، باوکی بوو. باوەشی پێدا کرد باوکی هۆشی بەبەر خۆیەوە نەمابوو، لەباوەشی کرد، ئەوەندەی خوێن لەبەر ڕۆیشتبوو. باوکی هەر بۆخۆشی کابرایەکی کورتەباڵای زۆر لاوازبوو.. لە حەوشە شاهۆ عارەبانەیەکی دەستی دۆزیەوە.. باوکی سواری عارەبانە کرد، بەکۆڵانێدا بەرەو ماڵ بووەوە، سەرەولێژ بوو. خەڵك بە درێژایی ڕێگا منداڵ و بریندارییان لە باوەش بوون. هەستی دەکرد بۆ خۆشی دەستەکانی بەرەبەرە هێزیان تێدا نامێنێت.. خوێن لەتەپڵی سەریەوە بەرەو گەردنی، لەوێشەوە بەرەو سەرسنگی شۆڕدەبووەوە.. سەری گێژبووبوو دنیا لەبەر چاوی دەسوڕا. سینەما و کارەبا لەنیوەیەوە ڕووخابوون لەوحەکانی سەریان فڕیبوون تەقەتەقی کارەبا، هەر مابوو

لەکار نەکوتبوو... بۆ خۆشی نەیدەزانی بەرەو کوێ دەڕوات! لە بەرامبەریەوە ماڵیان بوو بەسەر یەکدا ڕمابوو. دەرگا و پەنجەرەکانی فڕیبوون بەرەو سینەما و کارەبا ڕۆیشت. لە چاو تروکانێکدا نەك سیمای شار گۆڕا، بەڵکوو خاپوورکرا. کام کەسەی لە هەمووان کۆنترە لەو شارەی بە ماڵی خۆی نەدەزانیەوە، ئای خودایە ئەوە چی ڕوودەدات؟ دووبارە بەبێ ئەوەی مەبەستی بێت، بەرەو خەستەخانە گەڕایەوە. دەستی وەها لە دوو دەسکی عەرابانە گیر کردبوو، لەترسی ئەوەی نەوەك بە ڕەشەبا و بۆردوومان لەدەستی بڕوات. ژاوەژاو و هاتوهاوار دووبارە ناراستەی ڕۆیشتنەکەیا پێ گۆڕی، لەهەموو لایەك زیڕەزیڕ و هاتوهاوار بوو، هەرچەند جارێك فڕۆکە جەنگیەکان ناپاڵمیان دەباراند شار زیاتر کاول دەبوو، قوربانی کوژراو بریندار زیادی دەکرد. خوێنی دەموچاوی سڕیەوە چاوێکی بەپەلەی گێڕا. بە سێدارتووەکان ڕا زانی ماڵیانە، هەرچی گەڵاو لقوپۆپی دارەکان هەیە بڕابوونەوە، بەهەزار زەحمەت توانی خۆی بگەیەنێتە حەوشی ماڵیان، لەگەڵ جادە بووبوو بەیەك، دیواری حەوشە و ژوورەکان بەرسەیەکدا تەپی بوون، ئاگر لە ژوورەکان هەڵدەستا، بۆن پرۆزا و بۆنی خوێن. ناپاڵم پاش تەقینەوەشی تۆپەئاگرێکی گەورەبوو، دامرکانەوەی نەبوو دەتگوت پۆلە پۆلووە و کەسێك باوەشێنی دەکا، بەگەشی دەمایەوە، لە ژووری ناوەڕاست لەناو تاقەیەکی گەورە نیوەی ڕووخابوو، براو خوشکە بچکۆڵەکەی دۆزیەوە لەناو خۆڵ و تەپوتۆز نەدەناسرانەوە زیڕەیان دەگەیشتە بەری ئاسمان، دەستی گرتن بەرەو حەوشە.... دووبارە فڕۆکەکان دەستیان کردەوە بە بۆردوومان، هەڵاتە لای کونەتەیارە لە حەوشە. هەمووی بەسەر یەکتردا ڕووخابوو لەناو دار و بەرد و قوڕ و چلپا و تێکەڵ بە ئێسقان و گۆشت و خوێن توانی بە کراسە قاوەیەکەی دایکی بناسێتەوە، پارچە جلەڕەشەکانی نەنکی زۆریان لێنەمابووەوە. هەستی کرد لەناو کونەتەیارەی داتەپیو زیڕەزیڕ و هاوار هاوار دێت. بەپەلە کەوتە هەڵکۆڵینی کونەکە زۆر قووڵ بوو. لە حەوشە پارچە لەوحێکی دۆزیەوە دەستی دایە داغ بووبوو، چزەی لە هەردووك دەستی هەڵساند، نەپڕژایە سەر ئازار، کەوتە کۆڵینی کونەکە چەند زیاتر دەیکۆڵی هاوارهاوار زیادی دەکرد. ئای خودایە بە زیندوویی زیندەبەچاڵ کروان! لایەکی هەڵدایەوە کەمێك ڕووناکیان بەدی کرد. چەند ژن و منداڵی پرزەلێبڕاوی خۆڵاوی هەڵاتنە دەر بە کۆخەکۆخ بە حەوشەدا بەدوای هەناسەدا دەگەڕان. گەڕایەوە لای باوکی، عارەبانەی لە ناوی پاڵ کەوتبوو نیوەی

خوێن بوو. هاواری کرد بابە بابە وەڵامم بدەوە؟ چەند جار بە قایمی لەدەرگا درا. دووبارە بووەوە. دەرگا بەبەر شەق درا.. شەپۆل خەبەری بووەوە.. شاهۆ. شاهۆ دەرگایە. شاهۆ تەواوی دەموچاو و جەستەی سەر ئاو و ئارەقە گەڕابوو. شەپۆل هەستا و بەرەو دەرگا ڕۆیشت، شاهۆ بەبێ ئاگایی، بەبێئەوەی بزانێت مەسەلە چییە بە دوایدا ڕۆیشت. شەپۆل، شەپۆل بۆکوێ؟. . دەرگایان کردەوە چەند سەروکە لەیەکی ڕیشن بەدیار کەوتن. زۆر بە تووڕەی هاواریان کرد بە فارسی. . بۆچی دەرگا ناکەنەوە؟ شاهۆ هێشتا سەرقاڵی خەونە کابوسیەکەی بوو.. زۆر بەسەرسووڕمانەوە پرسی، بۆ ئێمە لەکوێین؟ یەکێکیان بە کوردی گوتی.. دەڵی مردوون دەرگا ناکەنەوە. باشە فەرموون؟ کوا کارتی شوناسای.. شاهۆ گەڕایەوە لەناوکراسەکەی بەرگەکانی هێنا.. کابرای ئەفسەر تەماشایەکی کرد. کوا مۆری فەرمانداری.. نازانم فەرمانداری چییە؟ نازانی فەرمانداری چییە؟ وەرمن لە دوامان! هەرچواریان خۆیان پێچایەوە و لەگەڵ ئەوان چوون بۆ فەرمانداری! بردیاننە ژوورێك لەپشت مێزێك ئەفسەرێکی خەواڵووی لێ بوو، خەڵکی کوێن؟ کوردین. ئێراقین؟ بەڵی! بەرگەکانیان نیشاندان. چەند شەو لێرە دەمێننەوە؟ بەس ئەو شەو. بۆ ئێوارە نەهاتن بۆ ئێرە، ئاگادارمان بکەنەوە ؟ درەنگ هاتین. نەشمانزانی دەبێ سەردانی ئێوە بکەین. کابرا چاوێکی بەسەریاندا گێڕا. ویستی پرسیاری مەی بکات. کە تەوار و شەوبای دیت، پەشیمان بووەوە. ئەوانە کێن؟ خێزان و کچمن. کوا بەڵگەنامەی هاوسەرگیری. شاهۆ ماوەیەك بیری کردەوە، کاخەزەکەی مامۆستای نیشاندا. واژۆیەکی مەلایانەی لەسەربوو، کابرا کەمێك لەچاوە خەواڵووەکانی نزیك کردنەوە، واژۆی لەسەر بەرگەکان کردن بڕۆن... بۆکوێ بڕۆین. شارمزانین؟ با بمان بەنەوە بۆ هوتێل. ئەو دەستەی کۆمیتە ئێوەیان هێنا بۆ ئێرە. ئەوانە کاری دیکەیان هەیە. حەز دەکەن ئەو شەو لە زیندان بخەون! بەپەلە دەرچوون. هەتا بە پرسیار گەیشتنەوە هوتێل نزیکی بەرەبەیان بووبوو. نەخەوتنەوە یەکسەر بۆ گەراج. بۆ سنە پاشان بۆ کامیاران بۆ پاوە. پاوە لەبەرزایی بوو هەورازێکی زۆر بڵند چراخانی دەمەو ئێوارە ئەوەندە جوان بوو تەوار چاوی لەسەر خانووەکان هەڵنەدەگرت، ئەو خانووانە چۆنچۆنی لەو بەرزاییە دروستکراون، باشە یەکێك پیربێت یان نەخۆش چۆنچۆنی سەردەکەوێت؟ بۆ ئۆردووگای پەنابەرانی سەرپاز. دەمەو ئێوارە بەرەبەری خۆرئابوون گەیشتنە بەردەمی ئۆردووگا تەلبەند

کراوەبوو، سەدان چادری کۆنی قوڕاوی دڕاوی کون کون.. زیاتر بە زیندانێکی گەورە دەچوو. بە پێچەوانەی چادر زۆرەکان ناو ئۆردووگا چۆڵ و هۆڵ دەتگوت خۆڵی مردووی بەسەردا کراوە لەو دەشتایە چەند منداڵی پێخواسی بەرگ دڕاوی لاوازی دەموچاو سووتاو... لە چواردەوریان خڕببوونەوە. بەدەوری تەوار دادەهاتن و دەچوون. خەبەریان دا بەرپرسی ئۆردووگاکە هات، کابرایەکی فارسی تەنگەستوورقەڵەو بەڵام هەتابڵێی کەسێکی بەبەزەیی و میهرەبان و خزمەتکەربوو، بە خێرهاتنی کردن. کەسێکی پیرەمێردی کوردی لوڕی لەگەڵ بوو، زمانەکەی لوڕیبوو، بەڵام ئەوەندە لەگەڵ کوردی گەرمێنێ تێکەڵاو بووبوو، مرۆڤ بەباشی تێیدەگەیشت چیدەڵێت. لەبەر خۆیەوە دەستی پێکرد، خەڵکی ئەو ئۆردوگایە یان لە خەستەخانەن یان لەگۆڕستانن، تازە سێ کەس، بە هۆی بریندارییی قوڕسی کیمیایی گیانیان لەدەست دا و لە گۆڕستانەی ئەودیو خەڵکی ئۆردووگا بۆ ناشتنی مردووەکانیان چوون! گۆڕستان دوو ئەوەندەی ئۆردووگای پەنابەرانی لێهاتووە. ئەگەر زوو هەر کێلێك ناوی لەسەر نەنووسرێت شوێنەکەی کوێر دەبێتەوە، بێدەنگ بوو، نۆرەی کابرای فارس هات. هەندێك قسەی بە فارسی کرد. شاهۆ باش لە زمانەکەی دەگەیشت، بەڵام ڕێگایدا کابرا بۆیان بکاتەوە بە کوردی. براکانم نێژێت، ڕاستی جێگای خاڵیمان نییە، بەڵام هەفتەی ڕابردوو ماڵێك گەڕانەوە ئەم دیو. چادر و کەلوپەلەکانیان هان لە جێگای خۆیان ئەتوانن وەکاری بێنن. ئەگەر بێژم حاڵەکە خاسەخاس نیست، ئێرە وەکوو دۆزەخ وایە، لەگەڵیان چوو. هەندێك بە ناو قوڕ و چڵپاودا وەپێشیان کەوت چەند جار پێڵاوەکانیان لەناو قوڕ بەجێ دەمان. لەوبەری ڕیزی یەکەم، چادرێك بە تەنیا لە ناو قوڕدابوو، دەتوانن بچنە ناوی هەتا بەیانی، بەیانی کەسێك دێت وەشوێننتان بۆ خەستەخانە. کابرای لوڕ و فارس بۆخۆیان ڕۆیشتن. شاهۆ تەواری لە باوەش کرد، شەپۆل بە دوایەوە، شەوبا لە پشتەوە. شاهۆ لایەکی چادرەکەی هەڵدایەوە. ناو چادر تەڕتەڕ سۆپەیەکی کۆنی ژەنگاوی.. لە ناوەڕاست کۆڵەگەیەکی ئەستووری ڕەش ڕاستی کردەوە و دایکوتایەوە.. ناو چادر ئەوەندە قوڕاوی و شێدار و تەڕ، هەر دوولای چادرەکە زۆر بەرەو ژوور هاتبوون. بۆیە ژوورەکە تەواو تەسك و بچوك بووبوونەوە. شاهۆ خۆڵ و قوڕی بەسەر لێوارەکانی داکرد. چووە دەرەوە. سینگ و گوریسی چادرەکەی ڕاکێشان کەمێك لە دوور ئەرزی بۆ کۆڵین دای کوتان، چەند منداڵێکی کزی نەخۆش بە کۆخەکۆخ چەند کۆلکە و دار

و باوەشە چیلکە و پووشیان هێنابوو. بە دووچاوی پڕ خۆشەویستیەوە تەماشای تەواریان دەکرد. تەواریش بە ڕوویان پێدەکەنی، بەڵام لەبەر نەخۆشی نەیدەتوانی هەستێت یاریان لەگەڵ بکات. لەگەڵ منداڵەکان هەستیان کرد زۆر هیلاکن هەستان و چەند باوەش داری کەیان هێنا، شاهۆ کەوتە ئاگرکردنەوە، کۆنە سۆپەی ژەنگاوی پاك کردەوە، ئاگرێکی باشی کردەوە. هەرلەپاش ئاگرکردنەوە. باران بەلێزمە دەستی پێکرد. ئێرە ناوچەیەکی چیای سەختبوو. وەرزی پایزی دەرمنگە و بەرەو سزتان دەڕوات. هەرچەندی تەماشای کۆنی و شەپڕێوی چادرەکانیان دەکرد، زساتانی ئەو دەڤەرەش زۆر سەختە، ئەو زستانەی کەسیان بە سەلامەتی دەرناچن. هەرچوار هاوڕێکە لەدەوری ئاگرەکە کۆبوونەوە. کۆنە بەتانی و لێفە و بوزگوڕیان لە ئاگرەکە نزیك دەکردەوە. تەم و هەڵاوێك لە نوێنەکان هەڵدەستا. ژوورەکەی ئەوەندەیکە شێدارکردبوو، کابرای لووڕ پێش ئەوەی بڕوات پڕێسکەیەکی دابوونە دەست. کردیانەوەچەند کولێرەیەك دوو سەلکە پەنیر. هەندێك میوە و چەند چەرچەفێکی زەردی لە ناودابوون.

هەربەپەلە نانەکەیان خووارد و هەرکەس لەبەر خۆیەوە لەبەر هیلاکی و نەخۆشیان خەویان لێکەوت، ئاگایان لەتەپەتەپ و گرمەگرمی هەورە بروسکە و دنیای دەرەوە نەما. بەیانی لەدەنگی کەسێك وەخەبەر هاتن، بانگیانی کرد. کابرای لووڕبوو لەگەڵ هەندێك هاوسێیەکان هاتبوون، بەرچاییان بۆیان هێنابوو. پاش نانخواردنی بەیانی لەگەڵ کاکی لووڕ ماشێنێکی سەربازی ڕەوانەی خەستەخانەی (ئینقلابیان)کردن

خەستەخانە لە دەشتایی بوو، لەدوور چەند ماڵێك دیاربوون. خانوویەکی گەورەی پەرپووتی کۆن. بە کۆنە سەربازگە دەچوودیوارەکانی زۆربەرزی بە شووورابوون. چەند هۆڵێکی بەرزی دوور و درێژ. لەبن هەر دیوارە و بەدرێژایی هۆڵە گەورەکان قەرەوێلەگی تەختەی ئەستوور. هۆڵەکان جیابوون پیاوەکان بەجیا ژنان بەجیا، لەگەڵ منداڵان. شاهۆ شەپۆل بەیەکەوە بوون لە هۆڵێك. تەوارو شەوبا لە هۆڵێك. هەموو دەمێ دەیان توانی یەکتر ببینن، ئەوەندە بریندار و نەخۆشی تێدابوو، هەرکەسێك هاتبا ئەگەر نەخۆشیش نەبوایە لەناو ئەو هەموو بریندارە قوڕسە نەخۆش دەکەوت، دکتۆرەکان ڕۆژی دووجار دەهاتن، پشکنین و چارەسەریان بۆ دەکردن، هەر کهسێك زۆر برینداری قورس بوایە ڕەوانەی لایەکی دیکەیان دەکرد. هۆڵەکان هەرچەند هەوڵیان دەدا گەرم ڕایان بگرن، هەر

ساردبوون.. چەند ڕۆژێك پاشتر نوێنەری وڵاتانی ڕۆژئاوا هاتن کەوتنە پرسیار کردن، ئەو خەڵکەی لەوێ بوون هەر هەمووی قوربانیانی ئەنفال و هەڵەبجە بوون. شوێنەکە بەناوی هەڵەبجەوە بوو، بەڵام زۆرکەمیان هەڵەبجەی بوون، چەند جارهەوڵیاندا تەوار ڕەوانەی لایەکی کە بکەن، شاهۆ ڕازی نەدەبوو، زۆربەی کات لەلای شاهۆ دەبوو، دواجار زۆر تینییان بۆ شاهۆ هێنا بۆ گواستنەوەی. . شەوبا پێی چاکبووەوە. بەو مەرجەی ڕازی بوو، شەوبای لەگەڵ بڕوات. گواستیانەوە بۆ لایەکی دیکە نەیانزانی لەکوێیە. شاهۆ لەو ڕۆژەی تەوار گوازرابووەوە جێگا بە خۆیەوە نەدەگرت. زوو زوو دەچوو بۆ دەفتەری خەستەخانە، هەر هەموو سەرباز بوون، هەتا دکتۆرەکانیش. پرسیاری لە دکتۆر و خەڵکی دەفتەر دەکرد، وەڵام تەنها، لە چارەسەردایە، دەگەڕێتەوە. شاهۆ شەو و ڕۆژی لەلا تەواو نەدەبوو، لەهاتنەکەی تەواو پەشیمان بووبووەوە، بەڵام ئەگەر نەهاتبا تەوار و شەپۆل دەردیان کاری بوو. شەپۆل ڕۆژ بەڕۆژ باشتر دەبوو، برینەکانی سارێژ دەبوون، چاوی زیاتر دەیان دیت.. شاهۆ پیرەمێردێکی نەخۆشی پەککەوتەی لەلا بوو. لەهەموو بنەماڵەکە ئەومیان بۆ دەرد و بەڵاو نەخۆشی غەم و خەفەت دەرچووبوو، لەکارەساتی هەڵەبجە. ئەویش لەو کاتەیدا لەسلێمانی لە خەستەخانەبووە. پاش چەند ڕۆژ زانیویەتی کوڕ و کچ و نەوە و نەوەزادەکانی لەگەڵ پیرێژنی لە کیمیابارانی هەڵەبجە تێداچوون. شاهۆ پرسیاری لەمام سۆفی دەکرد. مامە مامۆستا نزار لە هەڵەبجە دەناسی. مام سۆفی دەکەوتە ژماردنی مامۆستا و نزارەکان کامیانە.. شاهۆ بۆی دەرکەوت هەڵەبجەییەکان نەك بیرەوەریان تێکچووە، بەڵکوناوی خۆشیان بەتەواوی لەبیر نەماوە، ناهەقیشیان نییە، کارەساتەکە ئەوەندە جەرگبڕبووە، ئەگەر لەهەر میللەتێکی دیکە ڕووی دابایە. ئێستا شوێنەواریشی نەدەما. خۆکاتێك شاهۆ پرسیاری مامۆستا نزارێکی لە سەرەتای هەشتاکان هەڵەبجەی جێهێڵاوە وماڵی بۆ قەڵادزێ گواستووەتەوە. پیرەمێرد ئەوەندەی دیکە سەری لێ دەشێوا و دەستی دەکرد بە گریان. ئەی خودای گەورە، بۆچی منیشت نەکوشت؟ بۆچی لە ژیاندامام، تازە چاوەڕوانی چی بکەم؟ شاهۆ زانی بە پرسیار لێ کردن ئەوەندەی دیکە برینەکانی هەڵدەوەشێنەوە، زامەکانی قووڵتر دەبن، بۆیە بڕیاریدا چیدیکە نارەحەتی نەکات. پاش سێ هەفتە لەخەستەخانە و دوو هەفتە بەسەر ڕۆیشتنی تەواردا تێپەڕی بوو، کەسێك هاتبوو لە ناو خەستەخانە لە شاهۆ و شەپۆل گەڕابوو. کە هاتن

دووکەس بوون یەکێکیانی ناسی. باوەشی بە شەپۆل و شاهۆدا کرد. هاوڕێیەکی خۆیان بوو لە ئێراندا دەنیشت بەناوی ئیرەج. پارە و جلوبەرگی بۆ هێنابوون. شاهۆ پرسیاری لێ کرد. دەنگوباسی وڵات و پێشمەرگە لەچی دایە؟ بۆخۆت دەزانی شەڕ وەستاوە و دەستە پارتیزانەکان زۆریان گەڕاونەوە سەرێ، پێشمەرگەیەکی زۆر چەکیان داناوە. بەرەڵڵاییەکە سەگ خاوەنی خۆی ناناسێتەوە.. لەسەر سنوورەکان دەبێت بە تەنها بە شەو هاتوچۆ بکرێت.. ناوچەکان بەتەواوی لەلایەن جاش و سوپاوە گیراونەتەوە و ڕۆژ بەڕۆژ بارودۆخە ئاڵۆزتر دەبێت. شاهۆ داوای لێ کرد، دەبێ بچی ئەو بەرگانە تازە بکەیەوە، تەوارم بۆ بدۆزیەوە. ئاگادارم بکەیەوە. لەگەڵ خۆت بیهێنە!. دووکەسە بزربوون بۆ ڕۆژی دوایی هاتنەوە و بەرگەکانیان مانگێکی دیکە تازە کردبووەوە، زانیمان لەگەڵ چەند بریندارى دیکە ڕەوانەی تەورێزێ کراون، هیچ غەمت نەبێت، دەڕۆین دەیدۆزینەوە. دووکەسە ڕۆیشتن. سێ هەفتەیان پێچوو.. شاهۆ ڕۆژ بەڕۆژی دەژمارد، بۆ خۆشی و شەپۆلیش برینەکانیان تەواو چاك بووبوونەوە، بەڵام بۆزانینی هەواڵی تەوار و شەوبا زۆر تامەزرۆبوون. لە حەوشەی خەستەخانە پیاسەیان دەکرد. . لە دوورەوە برادەرەکەی پەیدابوو. پێش ماچکردنی کەوتە پرسیارکردنی تەوار.. زۆر باشە و چارەسەری باشی بۆ کراوە، بەچاوی خۆت دیتت؟ ئەدی بۆچی لەگەڵ خۆت نەت هێنا؟ هەروا یەك هەفتەی دیکە چارەسەری پێویستە. دەزانی بە تەمابوون لەگەڵ چەند بریندارێکی دیکە لە ڕێگای (خاچی سووری) نێودەوڵەتی ڕەوانەی دەرەوەی وڵات بکرێت... شاهۆ نارەحەت بوو، کاکە ئەتۆ باسی چی دەکەی دەرەوەی وڵاتی چی و خاچی سووری چی؟ بەڵام بەوەی دڵی ئاوی دەخواردەوە و ئارام بووەوە شەوبای لەگەڵدایە. کابرا هەردووکیانی لەگەڵ خۆی لەخەستەخانە دەرکرد. هەر ئەو ڕۆژە بردنی بۆ شنۆیە. لەماڵی خۆی داینان. دەچم بۆلای تەوار دەیهێنم دێمەوە. کابرا ڕۆیشت پاش دە ڕۆژ بەتەنیا هاتەوە. تەوار و شەوبای لەگەڵ نەبوو. شاهۆ ئەوەندەی دیکە دڵی داخوریا، کاکە جارێ چارەسەری تەواوی بۆ نەکراوە دوو هەفەتەی دیکە. شاهۆ دووبارە چۆوە ناو ئۆردووگای سەریاز. کەوتە پرسیارکردن لە پیرەمێرد و پیرێژنەکانی هەڵەبجەیی، لە سۆراخی مامۆستا نزار. بە بیستنی هەر ناوێك کزە لە جەرگیان دەهات. ئەوەی بەسەر ئەوان هاتوو و دێت بەسەرکەس نەهاتووە. پاش دوو هەفتە دووبارە ئیرەجی بەدوای تەواردانارد. لەبەر ئەوەی

بۆخۆی بۆی نەبوو هەتا تەوریز بڕوات. ئەو جارەیان چارەسەیان بۆکرابوو. تەوار ڕەنگی کرابووەوە، کوڵمەکانی سوورسوور لەگەڵ چاوەشینە گەشەکانی دەدرەوەشانەوە، نیشانەی ژیانیان پێوە دیار بوو. شاهۆ لە خۆشیان باوەڕی بە چاوەکانی خۆی نەدەکرد. پاش زیاتر لە دوو مانگ چارەسەرو دەردەسەری لەڕێگای سەردەشت ئالۆوەتانەوە گەڕانەوە بارەگاکانی ناوزەنگ. بارەگاکان تەواو چۆڵ ببوون زۆربەی پێشمەرگەکان چەکیان دانابوو. کەسی تازە نەك نەهاتبوون بۆ پێشمەرگایەتی بەڵکوو کەسی تازەش وەرنەدەگیرا. لەوێ جێگربوون ڕۆژ بەڕۆژ ژیانی پێشمەرگە دژوارتر دەبوو، چەمێکی بچووك ئێرە سنووری خۆتانە بارەگاکانتان نابێت سنوور ببەزێنن. چەند دەستەیەکی بچووك پێشمەرگە لە هەندێك ناوچە لەخوارەوە وەکوو دەستەی پارتیزان مابوونەوە، پرسیارێك هەموو ڕۆژێك دووبارە نا، سەدبارەبووەوە و بەربینگی بەپرسەکانی دەگرت، کەنگێ دەگەڕێینەوە ناوچەکان؟ لەو دۆڵە پێشمەرگە وەکوو قاچاخچی و کاروانچی لێهاتووە، ڕۆژانە لەباتی گرتنی مۆڵگە و سەربازگە خەریکی سەودا و کڕین و فرۆشتنی تووتن و ئارد و خواردەمەنییە. ڕۆژ بە ڕۆژ لە شێنێ و زەڵی چەکی دەستی پێشمەرگە بە هەرزان دەفرۆشرێت، هەتا بژێوی ژیان دابین بکرێت. هەر چەندە ژمارەی پێشمەرگە ئەوەندە کەم بوونەتەوە، بە هەر هەموویان لە چەند سەد سەرێك تێپەڕ ناکەن، هەندێك پارت و هێز و سازمان هەن ژمارەیان لە چەند کەسێك تێپەر ناکەن. بەشی ئێشکگری شەوانیان نەماوە. پێشمەرگەی ئاسایی نەماوە، هەر هەمووی سەرکردایەتین، جاران هەتا دەبووی بە سەردەسەتەی چەند پێشمەرگەیەك دەبوو خوێنی خۆت کردبا کاسەوە. زۆر جار پێشمەرگە بەو ئاواتەوە سەری دەنایەوە. کەچی ئەوەتا ملازم و جەنەڕاڵ ئەوەندە زۆربوون، زۆربەی پێشمەرگەکان لەبنچینەدا مامۆستا یان نوسەر و ڕۆژنامەنووس بوون، بۆ پێگەیاندی منداڵان کۆنەتەکیەکیان ئاوەدان کردبووەوە ژوورێکی تاریکی لە قوڕ دروستکراو و بەسەر سێ گرووپەدا دەبەش کران. ئەوانەی لە تەمەنی شەش حەوت ساڵی بوون لە سەرەتاوە دەستیان پێدەکرد، هەشت نۆ ساڵی لە پۆلی دوو، هی وەکوو تەوار دە ساڵی یانزە ساڵی لە پۆلی سێ بوون. تەوار و زۆربەی منداڵەکان کەم کەمە خوێندەواریان هەبوو، لێرە و لەوێ فێری خوێندنەوە و نوسین بووبوون. تەوار لەگەڵ چەند منداڵیکی هەرزەکار، چەند مامۆستایەکی پێشمەرگەی بێ ئیش، شەوانە لەبەر ڕووناکایی چرا سەرگەرمی وانەخوێندن

بوون. لەبەر ئەوەی بەڕۆژ هاتوچۆ نەدەکرا. لەمامەندەیەوە ئەو ڕۆژە دەنگی چەند تۆپێك دەبیسترا، دۆڵ و دەشت و بنارییان تۆپباران کرد! دوو دانە تۆپ لە قوتابخانە بچکۆڵەکەیدا بەسەریەکتریدا ڕووخاند. باش بوو لەو کاتەیدا کەسی لە ناو نەبوو. قوتابخانەیان گواستەوە ناو دارستان و چنارە بەرزەکان. لەهەر شوێنێك بان، تۆپباران وەکوو هەوری سەر سەریان لێیان جوودا نەدەبووەوە.

# ڕاگواستن

ڕاگواستن و هەڵقەناندنی بەزۆرەملێ و ناچارکردنی گوند و شارنشینان کارێکی تازە نییە! بە درێژای مێژوو لەسەر ئەو خاکە بێکەسە و بریندارەی... بریندار و زامی قووڵی دووبەرەکی دەرەکی و ناوخۆی دیرۆکی دوور و درێژی هەیە. خەڵکی ڕەسەنی ئەو دەڤەرەش لەگەڵی ڕاهاتوون. خەڵکی زۆر بەئاسانی دەڵێن ئەوڕۆ گوندەکانی دۆڵی گۆاران و سەد و پەنجا گوندی زنجیرە چیای ئاسۆس ڕاگوێزران. کەسێك ناپرسێت ڕاگواستن مانای چییە؟ ئایە تەنها جێگۆرکێیە لە بەرزایی بۆ تەختایی؟ لە ناو شاخ بۆ ناو ئۆردوگای زۆرەملێ. یان هەڵکەندنی لە ڕەگوڕیشەوەیە. لەپاش ڕاگواستنی هەر گوندێك دەبوو بە زەوی پەرژینکراو قەدەغەکراو. خەڵکی ئەوەیان لەبیر نەچووەتەوە، لە کاتی خۆی کۆتایی حەفتاکان لە (دۆڵی ئێسێ) چەند گوندێك بە زۆری ڕاگوێزران. دوازدە لاویان پاش چەند ڕۆژێك بۆ چەند کەلوپەلێك گەڕابوونەوە ناو گوندەکانی خۆیان، هەرلەوێ گولەباران کران! فڕێیاندانە بەردەمی خەڵکی ئۆردووگای پێمالك، هەرکەس هەوڵی گەڕانەوە بدات، چارەنووسی ئەوەیە. ترسی هەمان چارەنووس! دەنگۆی زۆر بەهێزی ڕاگواستنی شاری (قەڵادزێ) زۆر بە خێرایی بە ناو هێزی شکستخواردووی پێشمەرگە دا بڵاو بووەوە. بەو هەواڵە لەناکاوە و چاوەڕوان نەکراوە، شار و گوند و تەواوی وڵاتی تاساند. چۆنچۆنی و بەچ ویژدانێکەوە ئەو کارە دەکرێت؟ بەدەیان هەزار مرۆڤ بەزۆر و بەزەبری کوشتن و تۆقاندن لە سەر زەوی و خاکی خۆیان لەڕەگ و ڕیشەوە، وەکوو چەند نەمامێك هەڵبکەندرێن. لەگەڵ ئەو کارە نامرۆڤانەیەی شەڕێکی یەکجارەکی و سەرتاسەری ڕاگەیاند، هەرچەندە هەر لەیەکەم ڕۆژەوە دەستی لە هیچ نەپاراستووە (تەڕ و ووشکی بەیەکەوە سووتاندووە) کام کارەی مرۆڤانە بووە؟ هەتا چاوەڕوانی کاری باشتری لێ بکرێت. چەند دوژمن شەڕی جینۆسایدی بەهێز دەکرد، زۆر لە ڕێبوارانی کاروانی نەپساوەی هیلاکی بەناو دڵسۆز! نەك جاش و پیاوە خەساوەکانی کلکە سووتەیان زیاتر بۆ دەکرد، بەشێکی زۆرینەش ئەوانەی هەتا دوێنێ (فرمێسکی تیمساحەنەیان) بۆ قوربانیان دەڕشت، ئاڵوودە و ئاشقی

پۆستاڵ و چەکمەی دوژمن دەبوون. سەنگەری خۆیان گۆڕی، لە پێشمەرگەی ولاتپارێز بوون بە جاشی پاشای سەرتەخت. ئەو چەند کۆمەڵە پێشمەرگەی بە سەرسەختی خۆیان مابوون. . لە هەموو لایەکەوە لە خۆئامادەکردندا بوون.. بۆ ڕێگرتن لە ڕاگواستنی شار! پێشمەرگە کۆبووبوونەوە سەریەك، لە هەموولایەنەکان (بەتایبەتی پشدەرییەکان) ڕێگا چارەیەك بۆ کارەساتی ڕاگواستن بدۆزنەوە. هەر هەموویان کۆکبوون لەسەر ئەوەی، ئەگەر هەر هەموویان بکوژرێن، نابێت ئەو کارە ڕووبدات. شارێکی ئاوها دێرین و لانکەی هەموو شۆڕشەکان، هەروا بەئاسانی ڕاگوێزرێت و لەباتی کەسوکاریان عەرەبی بیابانی خواروو و پاسەوان و شایەدحاڵی زیندەبەچاڵکردنی خەڵکی ئەنفال کراو، ئێشکگرەکان لەوە دەترسان کەسوکاری ڕوفات و هێسك و پرووسکی قوربانیان بێن و لە نیوەشەودا، پاشماوەی جلوبەرگی دڕاو خۆڵاوی، گوریس و، پارچە بەنی کلۆتوزجیری دەست و پێی قوربانیان و، کەللەسەرە کون کونیاوییەکان بگەڕێننەوە بۆ جێگای خۆیان. باش دەزانن لەوێوە هەرچی تاوانەکانیانە ئاشکرا دەبێت. چاوەکانیان وەها تیژکردوونەوە بۆ دیتنی هەر جۆرە جووڵانەوەیەك لە بیابانی پان و بەرین ڕووبدات. دێن و داگیرکردنی خاکی خەڵکی کە بە دەسکەوت و مافی خوایاندەزانن فەرهوودە. کاتێك لەسەرخاکی زێدی باب و باپیرانی کورد دادەنیشن، وەکوو مۆرانە وان، جارێکی دیکە بیرلە بەجێهێشتنی ناکەنەوە. لە کەرکووك و زۆر شارەکان چەند پێپەتییەك هاتن لە برسان بە دوای کاروناندا دەگەڕان.. وەکوو ماری سڕ وابوون لەگەڵ گەرمیان هاتەوە، چزمیان لەو دەستە هەستاند کە فریایان کەوتبوون، پاش چەند ساڵێك غەوارە بوونە خاوەنماڵ و، خانەخوێ بوو بە نامۆیەکی نە خوازراو. لەگەڵ هاتنی خۆیان وەکوو هەموو جارێك کلتورێکی سەقەتی نامرۆڤانەی خوێنڕشتن و ڕەگەزپەرستیان هێنا، پەیامەکەیان! نەك جێگای خۆی کردەوە و بوو بەیاساکانی ژیان. ئەو پەیامە بۆگەنەی لە دووری سەدان کلیۆمەتر بۆگەنی هەلاوی لێ هەڵدەستا بوو بە پێوەری مرۆڤایەتی. بەدوای دەوارنشینی خواروو. جاران هەر لەدوورەوە لەپشت تەپۆڵکە خۆڵاویەکانی بیابان، بەدەم نێرگەلە کێشان و قەننەلێدان حەماس دەیگرتن، ژنانیان بەفەرمانی پیاوەکانیان لە کونی زۆر تەڕ و تازە ئامادەی فەرمانی هەموو کەسێك بوون باخەڵە کانیان کەمێك گەرم بێت... ئەوانەن هەڵگری نەك تەنها پەیامی پاراستنی خوڕەوشت، بەڵکوو سەپاندنی بەسەر خەڵکی

هەزاران کیلۆمەتر لە خۆیان دوورتر. وەکوو کۆیلەیەك لەژێر پێی هەموو زەرویەکدا پاندەبوونەوە. پیاوانیان لەپێش ڕەشماڵ چەند چەکدارێکیان بە نەعلی ئیسفنج، ئەوەی دەوڵەمەند و مەڕدار بوایە، ئەگەرنا، زۆری لەوەتەی هەن پێپەتی بوون. بەدەم سەماکردنەوە هاواریان دەکرد. (ئیحنال بەدو وێنەل عەدو) ئێمەی بەدوو لێرەین، دوژمنمان لەکوێن؟ کەچی ئەوەتا پاش چەند ڕۆژێکی دیکە دێنە بەرامبەر قەندیل و لەسەر نەرمە قەرسیل و کانیاو، بە ئاو هەوای هاوینە هەوارەکان هەواری پێشمەرگە و بەرەنگاربوونەوە. لەمەودوا لەباتی ڕانك و چۆغە و شەدە و کڵاو جەمەدانە و شاڵ و مرداخانی کڵاشی هەورامی، نەعلی ئیسفنج و دزداشە و جەفیە و عەگال جێگایان دەگرنەوە. ئەوانەی بەبێ دەسەڵاتی ڕادەگوێزرێن، خوادەزانێت لەکام بیابان کەسوکاریان زیندەبەچاڵ و لە خاچ دەدرێن! کاتی خۆی دوای حەفتا و چوار خەڵکی پشدەر بە (عایدوون، گەڕاوەکان)ناو دەبران. لەکوێ گەڕابوونەوە؟ پاش کاولکردنی شار و گوندەکانیان بە ناچاری ئاوارەی ئێران بووبوون.. پاش دوو ساڵ کڵۆڵی و قوڕبەسەری گەڕابوونەوە. بۆیە گەڕابوونەوە! هەتا بۆ دوژمنی بسەلمێنن واری خۆیان وا بەئاسانی بەرنادەن، لەپاش دەنگۆی ڕاگواستنی شار، پێشمەرگە. هەموو ڕۆژێك بەربینگی سەرکردەکانیان دەگرت. دەبێ ڕێگا بگرین لەو تاوانە گەورەیە! نابێ بێدەنگ بین. بەڵام لەو سەروبەندەی پێشمەرگە لەوپەڕی بێ هێزی و پەرتەوازی دابوو، وەکوو ئاردی ناو زێی لێهاتبوو، هەر یەکە و بەلایەکدا ڕۆیشتبوون، خۆیان ڕادەستی دوژمن کردبوو. بۆچی ڕژێم ئەو کارە دەکات؟ بۆ نەهێشتنی گەیشتنی دەنگی شاخ بە شار و هاتنی کۆمەك و گەیشتنی دەنگی شار بەشاخ. تاکە شارە هەتا ئێستا دەتوانێت بژێوی شۆڕش دابین بکات. ڕژێم بڕیاری تەواوی داوە بەهەر نرخێك بێت دەبێ ڕاگوێزرێت، دەمێکە پلانی بۆ کێشراوە، لەتۆڵەی ئەو هەموو یاخیبوون و خۆپێشاندانەی هەرچی زەبری کوشندەیە لەو شارەوە لە دوژمن دراوە. هەموو جارێك یاخیبوون لەو شارەی سەری هەڵداوەو بۆ دەڤەرەکانیکە پەلی کێشاوە. لەپاش ڕاگواستنی گوندو شارۆچکە دوورەکان نۆرەی شارە گەورەکانە ڕاگوازرێن.. شاهۆ ئەوەی بۆ (ئێشکگری) پێش خۆی ڕوون دەکردەوە، بەڵام هاوڕێکەی ئەوەندە سەرما لەبن هەنگڵی دابوو! خەو هیلاکی کردبوو، دوو کاتژمێر لەناو ئەو هەموو بەفر و زریانە هەروا ئاسان نییە، هاوڕێیەکەی بەدەم باوەشکدانەوە بە شاهۆی گوت. پاش چەند ڕۆژێکی دیکە

هەموو شتێك ڕوون دەبێتەوە، ئەگەر بەدەستی من دەبێت دەست دەخەمە دەستی شەیتان بۆ ڕێگا گرتن. شاهۆ لایت و کاتژمێرەکەی لە ئێشکگری پێش خۆی وەرگت و بەرەو چراخانی شاری قەڵادزێ دانیشت. شار بەئاستەم لە دوور لەدەشتایی دیاربوو (لەسەری سادری) قەندیل لەسەر تاشەبەردێك، چەکەکەی لەسەر بەردێکی بەردەمی دانابوو. بەو نیوە شیوە، هەرچی چیا و بنار و دار و تاوێر و گاشە بەردە ڕەنگی سپی بەفری گرتبوو. لەناو بەفرە سپیەکە هەرچی جووڵەی کردبا زۆر بەڕوونی دەبیندرا. هەتا ئەو کەروێشك و شەمشەمەکوێرانەی جێ گۆڕکێیان دەکرد، بەڕوونی بە دیتنی چاو دیاربوون. بارەگای (سەری سادر) یەکێك لەهەرە بارەگا کۆنەکانە، دووچادری گەورەی تۆکمە، لەبن تاوێرێك. لەسەر دوڕیانێکی هەڵدێر. . . زۆر جار بەتایبەتی ئەو ماوەی دوای بەرپرسی گومرگ، بەردەوام پێیانی دەگوت، ئێرە بارەگای سەرەکی گومرگە، بژێوی ژیانی نەك پێشمەرگە بەڵکوو خاو خێزان و خانەوادەی شەهیدانیش بەدەسکەوتی ئەو گومرگە دەژین، پاشان سەنگەرێکی زۆر پێشی هەموانە بۆ پاراستنی سەرجەم بارەگاکانی دیکە، بۆیە دەبێت هەر چاوێکتان بکەن بە هەزار چاو، هیچ کاروانچی و خاوەن جەڵەب بە لاڕێیەکاندا بۆی دەرنەچن. لەنیوەشەودا شاهۆ لەگەل هاوڕێیەکەی چەند کاروانچیەکیان بەدی کرد، لەگەڵ پێشمەرگەیەکی دیکە گومرگیان کردن. لەچەند سەد سەرمەڕ پارەی دوو مەڕیان وەردەگردت.. کاروانچیەکان بەدەیان بار، جگەرە، وێسکی، ڕۆن و ئارد و دانوێڵەیان بەرەو ئێران دەبردن. زۆربەیان فافۆنیان پێ بوو. پێشمەرگە سەری لە ئاوەدیوکردنی فافۆن دەرنەدەکرد. ئەو هەموو فافۆنە شکاوەیان بۆ چییە؟ لە کاروانچیەکانیان دەپرسی.. ئەو هەموو فافۆنە بۆچی ئاوەدیو دەکەن.. بۆچی بەکاردێنن؟ ئێران بۆدرووست کردنی گوللەتۆپ بەکاری دێنێ، لەزێڕی بە قیمەترە.. لەکاروانچیانیان پرسی لە کوێ ڕاهاتوون؟ لە قەڵادزێ! دەنگوباسی ڕاگواستن. هەموو ماڵێك نامەیان بۆ هاتووە و ئاگادارکراونەوە. دوو هەفتەی دیکە دەگوازرێنەوە. بە چرپە بە پێشمەرگەکانیان گوت، ئاگاداری خۆتان بن. کۆمەڵە جاش و سەربازێکی زۆر بەرەو ئێرە دێن هێرش دەکەنە سەرتان! ئامان ژمارەیان زۆرن فریای خۆتان کەون. شاهۆ چوو هاوڕێیەکانی ئاگادارکردەوە. یەکەم جار ئەو پێشمەرگەیەی ئاگادارکردەوە کە پێش خۆی ئێشکگربوو. هەڵسە هاوڕێ. پێشمەرگە دیاربوو تازە خەو چووبووە چاوی بۆیە بە تووڕەبونێکەوە گوتی، بۆ چەند جار ئۆرەم

دێت؟ شاهۆ پێیگوت کوڕە هەڵسە خێر و بەرەکەت هات. جاش بۆمان هاتوون، شەڕ دەقەومێ! پێشمەرگەکە یەکپێ ڕاست بووەوە بە خێرایی فیشەکدانەکەی بەست، چۆنت زانی، کوا لەکوێن؟ بە قوربانی خۆت و باوکت بم بۆ ئەم هەواڵە خۆشە. ڕەشاشکەی دەست دایە و چاوەڕوانی وەڵامی نەکرد. کاتێك کۆبوونەوە سەر یەك بە تەواوی هەژدە پێشمەرگە بوون، لەماوەی جگەرە کێشانێك هەر هەموویان خۆیان ئامادەکرد. لەسەر بەفر و بەناو داروبەرد و جەنگەڵی ئەوناوە دوو دوو سێ سێ بڵاوبوونەوە و سەنگەریان گرت، ئۆخەیش دووبارە ڕاوە جاشە! خۆزگە سەربازی گوناحیان لەگەڵ نەبن. جاش، مغاوير، خۆبەختکەری تەڕەماش. وەی وەی زوو وەرن زوو، پێشمەرگەیەکیان هاواری دەکرد. شاهۆ بانگی کرد، هاوڕێ ئەگەر سەرماتە و لەرزت لێیە بگەڕێوە ناو چادرەکان. نا. نا باشم. چاوەکانی وەکوو دووربین بەدوای هەرچی شتێکی نامۆ هەیە دادەگێڕا. لەکاتژمێری دووی بەیانی لەسەر سپیایەتی بەفەر لە دوورەوە بەپانایی هەورازی سادر وەك ڕەوە کولە. کڵاو جەمەدانە و خوودەی سەوزی سەرباز بەدیار کەوتن. ڕووەو دوو چادرەکان هەنگاویان دەنا. دیاربوو زۆر شارەزابوون. بەمەزەندەی خۆیان هێشتا زۆریان مابوو بگەنە شوێنی مەبەست. بە دەست هێمایان بۆ یەکتری دەکرد بەتەمابوون لەخەودا بە زیندووی دەست گیریان بکەن، نەیان زانی پێشمەرگە بۆیان دابەزیوەتە خوارێ. ماوەیەکە پێشمەرگە شەڕی نەکردووە، هەر خەریکی خۆشاردنەوە بووە، بۆیە ڕقی ئەو هەموو ماوە زۆرەی بەسەر سەری دەستە جاش و سوپادا ڕژاند. لوولەی تفەنگەکانیان بە بەفر سپی بووبوون. لەگەڵ یەکەم دەسترێژی گوللە، جاش وەکوو هەموو جارێك شڵەژان بەرەو خوار ڕەوینەوە. چەند کەلاکیان لە پاش بەجێ مان، خوێنیان بەفری سوور، سوور دەکرد. سوپا لە جێگای خۆی خۆی لە زەویدا. هاوەن و ئاربیجی وەگەڕ کەوتن. لەو چەند شەڕانەی دوایی پاش وەستانی جەنگ، کەمتر کیمیایان بەکاردەهێنا، سەردەمی جەنگ هەموو جارێك بەملی ئێرانیاندا دەدا. هەرچەندە ئەوانیش بە ئیسلامیانە دەستیان لەهیچ نەدەپاراست، بەڵام ئێستا ئەو بیانوە نەماوە. بۆیە زیاتر شەڕی سەرباز و جاش بە کوشتدانیان دەکرد. پێشمەرگە جێگا و ورەی بەرزتر بوو. چەند هێرش دەکران، پێشمەرگە زیاتر گەرم دادەهات هاڵاو لەلوولەی تفەنگەکانیان هەڵدەستان. کۆنترۆڵی، تەواوی بەسەر گۆڕەپانی جەنگەکەدا کردبوو، چونکە لە سەرەتا بە سنگێکی فراوانەوە بەرەوڕووی دوژمن

بووبوونەوە و لەیەکەم دەستڕێژ گورزی خۆی وەشاندبوو، یاسای جەنگی پارتیزانی وایە، ئەگەر یەکەم گورز بە توندی بۆ خۆت وەشاندت، دووژمن شپرزە دەبێت، بە ئارەزووی خۆت هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەی. چەند شەڕ گەرمتر دەبوو لێشاوی جاش و سوپا زیادی دەکرد، ئەو جارەی وەکوو جاران نەبوو. پێشمەرگە ژمارە کەمتر و پرچەکتر بوون. تۆپخانە و ڕاجیمەکان کەوتنەوە گەڕ. هێزی پێشمەرگەش زیادی کرد. لە زۆربەی قوڵەکانەوە لەماوەی دوو کاتژمێر گەیشتنە (سەری سادر) بۆ هاوکاریکردنی پێشمەرگەکان. لەناو ئەوانە هەرسێك مامۆستای تەوار و وان بە خۆ پرچەككردنەوە هاتبوون. شاهۆ ڕووی لەمامۆستا سەردار کرد. مامۆستا بۆچی هاتی بۆ ئێرە؟ بۆ شەڕکردن! باشە ئەدی خوێندکارەکان؟. زیرەکن پێویستان بە خوێندن نییە. لەگەڵ کوژرانی هەر جاشێك سەربازێك پەڵە خوێنی سەربەفرە سپیەکە زیادی دەکرد. لەبەرەبەیاندا، کار لە پەڵەی سپی نەما، بوو بە جۆگەلەی خوێن! چەند دەستەیەك سەربەرەوخوار ڕاودەنران، دە ئەوەندە بەرەو سەر دەهاتن. کۆپتەر و فڕۆکە جەنگیەکان هەوڵیان دەدا. لە ئاسمانی شەڕ دوور نەکەونەوە، بۆ خۆشیان دەیانزانی لەو چیا بەفراویە زۆر کاریگەر نین. جاش و سەرباز زوو بۆیان دەرکەوت کەوتوونەتە بازنەی گەمارۆ، بەرەو بنار هەڵاتن، پێشمەرگە چاویان سوور بوون، شەڕ لەگەڵیان ناکرێت، خۆیان دایە لایەك، ناڵەناڵ و گرمە گرمی تۆپان دەستی پێ کرد. هەتابەیانی بە خۆڕایی ئەو چیا و بەندەنەیان کوتایەوە. لەبەر ئەوەی لە بارەگای گومرگ زیاتر هیچ کەسی دیکەی لێنەبوو. لەبەرەبەیاندا دنیا لێڵ بووبوو دووبارە جاش و سوپا هێرشی کردەوە، زیاتر بەردەمی خۆیان دەبینی. پێشمەرگە لێیان گەڕان هەتا نزیکی چادرەکان بوونەوە. لە ناوەڕاستی چیاوە پێشمەرگە کەوتنە لێدانی سوپا، بۆ دابڕینی ئەو بەشەی سەرکەوتبوون. جاش و سوپا خۆیان لەبەر هێرشی لەناکاو و کتوپڕ و خێرای پێشمەرگە ڕانەگرت. سەربەرەو خوار هەڵاتن. لەدامێنی بنار کەوتنە بۆسەی دەستەیەك پێشمەرگەی دیکە. ئەو کۆڵەی لە چادرەکان نزیك بوونەوە لە سەرەوە و لە خوارەوە هێرشیان بۆکرا زانیان کەوتوونەتە بۆسەیەکی بازنەی خۆیان بە دەستەوەدا. پرسیار لە جاش و ئەفسەرە دەرەجەدارەکان کرا لەسەر ڕاگواستنی شاری قەڵادزێ. گوتیان هاتن و هێرش کردنی ئێمە بۆ ڕاونان و خافڵاندنی پێشمەرگە بووە، ڕاگواستنی بەس مەسەلەی کاتە، ها ئەمڕۆ ها سبەی، لە نیوە شەودا دەست پێدەکەن! بۆ ڕۆژی

دوایی بۆردوومان هەر بەردەوام بوو. لەو ناوەی لە خوار بنار سەربازگە و سەنگەریان لێدان، لەسەر هەر تەپۆڵکەیەك بەرزاییەك مۆڵگایان دانا، پێشمەرگە ڕێگای نەدەدا پشوو بدەن، لەزۆربەی قۆڵەکانەوە هێرشکردن بوو تێکشکانی سوپا زۆر کتوپڕ بوو.. بۆشەوی دواتر شاهۆ لەگەڵ دەستەیەك پێشمەرگە بانگکران بۆ چوونە ناو شار، لەوێوەش بۆ بناری کۆسرەت. شاهۆ حەزی لە بەجێهێشتنی شەڕ نەبوو. پاشان لە نزیکەوە ئاگای لە تەواربوو. بەناچاری دەستە پێشمەرگە چوار کەسیەکە، هەمان ڕۆژ بەڕێکەوتن، لە ئاوزەنگەوە بۆ بناری ئاسۆس.. لە کەڵکان و گەرمکان بۆ دەشتایی (شێخ مەحمود و شێخ ڕیشوان) پاشان لە کەندە دلۆپەیەوە بۆ ناو شار. کاتێك خۆیان بەشاردا کرد چۆڵ و هۆڵ، دەتگوت خۆڵی مردووی بەسەردا کراوە. بەسەرباز و جاشی هەموو ناوچەکان چواردەورە درابوو. پاش ئەوەی چاویان بە پێشمەرگەیەکی شار کەوت، دوو شەو لەماڵی خۆی دانیان بۆی ڕوونکردنەوە، بەرگری کردرن ناکرێت، لەهەر ساتێك دەست کەن بەڕاگویزان لەناو شار دەگیرێن. شەڕکردن لەگەڵ ئەو هەموو هێزە بێ هودەیە، وەکوو هەڵەبجە کاولی دەکەن، دەبێ بەزووترین کات لە شار دەرچن. ئەوە دوا بڕیار بوو! شاهۆ زانی بێ هودەیە لەگەڵ پێشمەرگەکان لەشار ماوەیەك بەناو کۆڵانەکانیدا هاتوو چوو، لە هەموو کوچە و کۆلانێك، لەسەر هەر سیلە و سەربانێك کۆمەڵ، کۆمەڵ جاش و سوپا مۆڵدرابون. جاشی هەموو ناوچەکانی لێ خڕکرابوونەوە لەسەر سیلەیەك لەپشت مزگەوتی کارەبا، کە بۆ ناو بازاڕ دەچێت، کۆڵانێکی تەنگەبەری چوارڕیان لەنزیك ماڵی مام برایم ئەو کاتی شاهۆ هەروا ساڵێك و چەند مانگێك دەبوو، پێشمەرگە بوو، لەگەڵ حەوت پێشمەرگەی دیکە لە چالاکیەکی دلێرانە گەڕابوونەوە. گوررێکی باشیان وەشاندبوو لەو سەر سیلەی گەرەکی مام ساڵحی پۆستەی کەوتنە بۆسەیەکی زۆر دژوار لە هەموو لایەکەوە لەرسەبان و بنبان درانە بەر دەستڕێژی گوللە. لەماوەی چاوتروکاندنێکدا کۆڵان بوو بە یەك پارچە ئاگر، شاهۆ لەبەر بێ ئەزموونی جەنگ کەمێك تاسا. وەلامدانەوەی پێشمەرگەکان بەتایبەتی هاوڕێ ڕەحمانی حەمەلۆزی جووتیاری خوێنگەرمی لاو. ڕەحمان گەنجێکی باڵا کورت تەنکەڕیشێکی ڕەش، چاوڕەشی چاووورد لەگەڵ لەو باڵاکورتیەش دنیایەك بوو لە ئازایەتی و خۆڕاگری، بە بیروباوەڕی چینایەتی گۆشکرابوو. دەستڕێژی ڕەحمان پاشەکشەی بە دوژمن دەکرد. هەموو پێشمەرکان خرمەخرمی تفەنگەکانیان.. ترس و دڵەڕاوکێیان

دەخستە دڵی دوژمنەوە. بەدەستڕێژی ژێرسێ چەند تەقینەوەیەکی گەورە کۆتایی بە شەڕەکە هێنا. بەیانی شار خامۆشتر بوو لەجاران. چەتۆ، بە چەتوونی خۆی یەکەم کەس بوو گەیشتە سەر لاشەی لەخوێن شەلاڵ بوو، سەری لەسەر ئەژنۆکانی دانابوو، خاڵە چاوەکانت بکەوە و بمناسەوە، کوڕە خوشکەکەت ببینە، وەکوو ئەوەی خۆی پێبناسێنێت، عوسمانی خوشکەزات، لەو شارەی عوسمان زۆرن، بەڵام هەموو عوسمانێک کوڕی محەمەدی ئەحمەد ئالا نییە، هەموو عوسمانێک خاڵی وەکوو تۆی نییە، چەتۆ نییە، هەر بۆخۆت ئەو ناوە نهێنییەت بۆمدانا، بە گوێتدا دەچرپێنم، سۆزی هاوڕێیەتی ڕێبازەکەت بەرنەدەم. خەڵکی لە لاشەی خوێناوی شەهید ڕەحمان کۆبوونەوە، باخەڵی گەڕان بزانن کێیە و کوڕی کێیە؟سەد فلس، لوولێك نانە ڕەقی خوێناوی لە باخەڵی دابوو. پیرەمێردێك بە گریانەوە بە خەڵکەکەی گوت، ئەوەیە پێشمەرگەی میللەتی ڕاست و دروست.. لەپاش خۆی لوولەیەك نانەڕەقی جێ هێشت! خەڵکی هەرکەس هەوڵی دەدا پارچەیەك لەونانە ڕەقەی دەست کەوێت، هەتا بیکات بە هەوێنی شۆڕشگێری خۆی و منداڵەکانی و دەوروبەر و ئەوەی داهاتوو. هەوێنێك فێر بکرێن. پێشمەرگە جێگای خەوی بەردی ڕەقە و پێخەفی هەورە و خواردنی نانەڕەقە. ئەو پارچە نانەڕەقانە وەکوو یادگارییەکی خۆشەویست لە سەر سینگ، لەتەنیشت پەڕەی دڵ جێگایان بۆ دەکرایەوە. شاهۆ بیستیەوە لە خەڵك و پێشمەرگە پاش ئەوەی هەواڵ دەگاتە پیرەدایکی، پاش بە خاکسپاردنی، کچان و ژنان و هەتا زۆری کوڕ و پیاوانی ڕەشپۆشانی شار لەسەر گۆڕەکەی گریابوون. شێرەژنی پیرە دایك دوو چنگی خۆڵی لەسەر گۆڕەکەی شەهید ڕەحمان هەڵگرت و بە ئاپۆڕای خەڵکەکەی گوت: ئەمن وەکوو دایکی شەهید داوا دەکەم کەس فرمێسك نەڕێژێت چەند گڵ لەسەر سینگی ئەو شەهیدەی گەل و نیشتمان و ڕێبازە پیرۆزەکەی هەیە، سەد ئەوەندە تەمەنی هەموو پێشمەرگە و هاوڕێیەکانی درێژ بێت. ڕێبازەکەی بزر نەکرێت، سەربەرزم. لەو ناوە چەند سیخوڕێکی ڕژێم هەبوون. پیرەدایك ئەك جەرگی سووتا بۆ خۆشی گیرا. شێرەژن بۆ یەکەم جار نەبوو، لەزیندانی تەنیایی دیل دەکرێت. بۆ بێدەنگکردنی دەنگی هەق و دلێرانەی، کام زیندانی لەهەر هەمووان دژوارتر و سەختر بوو بۆ ئەشکەنجەدان و ڕووخاندنی ورەی خەڵك، لەئاست بوێری دایکی شەهید ڕەحمان بەچۆکدا دەهات. ژنێك بوو، خەباتی شار و، دابین کردنی هەموو پێداویستییەکانی شاخ و پێشمەرگەی

لەئەستۆی خۆی گرتبوو. کەسوکارەکەی ئاگادارکرایەوە.. ڕیش و جلی ڕەش، هەتا پرسە دانان قەدەغەیە، ئەو شەڕە دواتر بەدیار کەوت، سەرەتای شەڕی نەگریسی براکوژی بوو. ئەو شەڕە خۆخۆرییەی کوردستانی نیوسەدە بەرەو دواوە گەڕاندەوە. خەڵکی شار بە تێکڕا زانیان ئەو داستانە پڕ قارەمانییەتە، بە خوێنی ئاڵی شەهید ڕەحمانی حەمەلۆز و بە خۆڕاگری جووتیارێك و دوو هەژار و یەکێکیان بریندار و، هەمەزە سوورێکی وەکوو خوێن و ڕێبازەکەی سوور. پاڤێڵکی پشدەری نەك ڕووسی، بەڵام شێوازی شەڕکەری ڕووسی. . پەنجە لەسەر پەلاپیتکە هەڵنەگرتن، هەتا دوژمن ئاڵای سپی، سپی سەر شۆڕی بەرزدەکاتەوە. ئەو پاڤێڵەی خۆشترین ساتەکانی ژیانی لاویەتی. لەسەرەتای هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێی گوڵانەوە، بە بە داربەڕوو و کوێستانە سەربەتەمەکان و برسیەتی و ڕووت و قووتی گۆڕیەوە. لەجیاتی پێخەفی گەرم، بنەگوێنی پەناگەی بوو. ئاسمانی تەماوی بەخۆیدا دەدا و، خاکی شێدار ڕادەخست. بەردی سارد سەرینی بوو. ئەو ژیانە سادەیەی بە بەژیانی هیچ سوڵتان و پادشای حەوت مەملەکەتان نەدەگۆڕیەوە، چۆنچۆنی بیگۆڕمەوە. کاتێک ڕووبەڕووی هەر کەسێک دەبمەوە، لە شەوەتاریکە ئەنگوست لە چاوەکانی لادێ، یان لەبەر چراخان و جەنجاڵی شار، باوەشم پێدا دەکەن و بە ڕزگارکەر و فیداکاری خۆیانم دەزانن، لەگەڵ یەکەم چرکەی دەستدانە چەکی زۆر بڕوابە خۆبوون گوتی: مەرجەمەرجی پیاوەتی. دروشمی یان کوردستان یان نەمان. . لەکاتی بەرەو مەرگبوونەوە، لەگەڵ هەر موویەکی سینگەپڕەکەی دەبوونە سەرەنێزە تیژتر لە خەنجەری دەبان. ئەو بیرەوەریە و دەیان ڕووداوی جەرگبڕ. هەر کونجێکی ئەو شارە خامۆشە یادەوەری تاڵو شیرنی تێدایە. پێشمەرگەکان لەجێگای دیاریکراوی پاش شەڕ و لێکدان و دابڕان، لەگەڵ برینداڕێك چاوەڕوانی ڕەحمانیان کرد. ئێستاو ئەو دەمیش نەهات. بەناچاری ئەو ڕێگایەی پێیدا هاتبوون، بە بەری ئاسۆسی، کوڕەتاوڵ، پاشای بێتووش، دوولکان بارەگای، دۆڵەسێو پاش سێ ڕۆژ و سێ شەو ڕێگا کووتانەوە، دووبارە ئامێزی بۆگرتنەوە. شاهۆ زانی لەناوشار لەگەڵ خەڵکی ڕادەگوێزرێن بۆیە بە دڵێکی شکاوەوە بۆی دەرچوون. بەچیای ئاسۆسدا بەرامبەرسندۆلان بە دوو ڕۆژخۆیان گەیاندە. بناری کۆسرەت، باوەڕی بەدڵ و چاو و هەموو هەستەکان خۆی نەدەکرد و لە ناخی خۆیدەپرسی، ئەو خاکەی لە سەری وەستاوم، بە تامەزۆرییەوە لە باوەشی

گرتووم، وەکوو کورپەیەکی سێوی تەزیو سەرما بردەلەی زستانێکی تووش، بێبەرگ هەڵدەلەرزم. نیشتیمانم کهوتوته کوێی ئەو گۆی زەوییە؟ پرسێکە و لەو ڕۆژەیەوە زمانم گۆی کردووە وێردی سەر زبانمە، لەبەشی وشکانییە، یان لە ناو دڵی دەریا و زەرییانە، لە نەخشەی جیهان هەیە، مادام لەناو دڵی ملیۆنان کەس هەیە کەواتە، بوونی هەیە، بەڵام پێش ئەوەی بناسرێت هەوڵی سڕینەوەی دەدرێت، بە ناسینی لە بەرزایی چاودەگێرم، ئەوەتام بەسەر ترۆپکی چیاوە، بنار هەمان بنارە، چیا هەر ئەو چیایەی جارانە. هێشتاش لەسەر پەلکی گەڵای دارەکان و کانیاوە سەبکراوەکان بۆنی بۆگەنی سیر و سێو دێت، دووکەڵی ڕەشی کیمیایی هێشتا بڵاونەبووتەوە و نەڕەوییوەتەوە، ئەوەی گۆڕاوە.. تەنها چۆڵتر بووە. هەناسە تەمومژاوییەکانی کۆسرەت، ئەگەرچی کورت و سارد و سڕن، بە کوانوی هیچ گڕکانێک گەرم نابنەوە، تژین لە بۆنی شەختە و تەزووی بەستراویان لێ دێت. ئارامبەخش نین و ماوەیەکی دوورو درێژە نائاسوودەن بەبێ هەستڕاگرتن و گوێ نان بەسینگی خاک، بۆ بیستنی هەڵچوون یان شادمانی. وەکوو هەموو لووتکەکانی دیکە لەبەرزاییەوە زۆر دەمێکە لەچاوەڕوانی ڕۆژێکی وەکوو ئەو ڕۆژەدا بوون، کاڵە شڕ و پێشمەرگە ڕووتەکانی بگەڕێنەوە، ئاوێتەبوونی ئەو دوو شتە، مێژوویەکی ئەوەندە کەڤنارە، لەبیرو هزری هیچ زیڕووحێکی ئەو سەردەمە نییە، دەستەدەستە مەڵەغانی دەمتیژی زەمانە گیانە شیرینەکانی درووینەوە، هەر لەهەمان شوێن چین و دەستەیەکی دیکە سەرییان وەدەرنا، ئەوانیش وەکوو لەیزتۆکێک دێن و دەچن، پاشان خەزانی تەمەنی ئەوانیش لەگەڵ گەردەلوولی ڕووداوەکان. بێبەزەییانە بە زۆرەملێ، وەکوو هاوڕەگەزەکانیان چۆن هاتوون ئاواش بێنووسینەوە تێیدەڕن. وەرچەرخانەکان سەرەتایان دەگەڕێتەوە بۆ سەروبەندی جەنگی چاڵدێران، واتە زیاتر لەچوارسەد و نیوە، بۆ یەکەم جارە، نرکە و ناڵە و ئاه و نزوولەی بێدەرەتانان دەبیسرێت، پڕاوپڕە. لەنەفسانەی تێکشکان لەدووی نسکۆ و لەت لەتکردنی جەستەی یەک خاک و لێکترازانی یەک ماڵ و یەک هۆز و یەک میللەت. پاشان بووژانەوە و سەرکەوتن دووبارە نووشستی هێنان. چیا دەڵێت، ماوەی چەند ڕۆژە، پاش گەڕانەوەتان، بەسەر خاکی پاوانکراودا، بۆیە پەیامەکەم بۆ ئێوە بەیان دەکەم، دەزانم ئەنگۆ سەربە هەموو کوونجیکدا دەکەن. . بەشێک لە ڕووداوەکانی ئەو مەملەکەتە وێرانەیە دەزانن، سەرە زڵلەکان پاش ئەوەی. لەودیو سنوورەکانەوە

بەکاوەخۆ هاتن و لێرە لەباوەشی مندا لەهەف جڤیان. چەند ڕۆژان مەردووم ڕەش و ڕووتی ئەو وڵاتە بریندارە دەیانەویست چەپکەگوڵی ڕزگارکردنیان بەگەردنیەوە هەڵواسن و لەسەر شان و باسکی ماندوویان هەڵیان گرن و بە تەدارەکی شاهانە بیان بەنە سەر تەختی فەرمانڕەوایی، چی دیکە لەبەر دەرگای ماڵی دوژمن پاسەوان و کاسەلێس نەبن. بە پێچەوانەی ویستی غەمخۆرەکانیانەوە، لەسەر تاجەگوڵینە نەدەگەیشتنە یەک، کامەیان شایەنی ئەوەن لەسەری بنێن. دوای چەند ڕۆژ لەسەر ئەوەی ڕێک کەوتن کەناتوانن ڕێککەون، هەڤپەیڤن و دانووستاندنی درێژ چشتەکەش ژێ شینەبوو. جەواڵ و فەردە کۆنە قەوانی فیشەکی ژەنگاوییان پێبوون. هەر هێنایان و تەواو نەبوون. هەرچی ڕەشە وڵاغی کاروانچی و قاچاغچی وزیل و ماشێن و لۆری هێزی دراوسێی داگیرکەر هەیە بە سوغرە گرتبوویانن، بۆ گواستنەوەی. مشتومڕیان لەسەر ئەوەی بوو. لەداهاتوو. داهاتی وڵاتی ئەنفالستان لەسەر کەموزۆری ئەو قەوانانە دابەش دەکرێت. خەرمانی یەکەم دووەم سێیەم. هەتادەهات خەرمانەکانی کۆنە قاوان زیادیان دەکرد. . داخوا کامیان زۆرترین فیشەکەی بە ئەیارەوە ناوە، ئەوەی ئەمن بۆنم دەکرد. زۆر لەقەوانەکان بۆنی باروود و خوێنی هەکاریی و پشتئاشان و سەری ساوێنی و دەمیان قەسابخانەی براکوژیان لێدەهات. هەر کەس بەزمانێک دەئاخافت و لە یەکتری تێنەدەگەیشتن، هەرهەموویان ئەوەی یەک نەتەوەو یەک وڵات و یەک پەرچەم بوون. . بەڵام ئاسمان و ڕیسمان لێک دووربوون، چەند نوێنەری خێرخواز کەوتنە بەینیان، بۆیە هەریەکە و لەباسکێکدا و چەند داربەڕوویەک لەیەکتری دوورکەوتبوونەوە هاتن و چوون بۆ لێک نزیک کردنەوە، برا لەلای کوێخای ئەودیوی هاتووین، بۆ دانووستاندن. میری ئەوبەر بەرپەرچی دەدایەوە. قسەکانتان لەدەمدا بەشەکربێت، هەرچی چەپەری ئەولا گووتیان، نازانین باسی چیان کردووە، پێچەوانەکەی لای ئێمە ڕاستە. . چەند دەستە و تاقم و سەرەک هۆزی گۆڕان، وەڵام هەر ئەوەبوو، پێک هاتن نابێ و ناکرێت. هەتا غەوارەیەکی سیسەڵەی پایەتەختی جەنگ هات، بەیەک چاو سوورکردنەوە سەری خۆیان کز کرد و بە خێسە و پشوولەیەک خواردنەوە لێک جوودابوونەوە. پاش ڕۆیشتنیان قەوانەکانم لێک جیاکردنەوە، ئەوەندەی بەسینگی یەکترو میللەتیانەوە نابوو، زۆر زۆر پتربوون لەوانەی ئاراستەی بەدوژمنیان کردبوون. قەوانەکانم کۆکردنەوە تێکەڵی

ئەوانەی جەستەی خۆمم کردن، لەناو ئەشکەوت و کۆنەسنگەر و بن تاشەبەرد و گاشەبەرد، هی ناو ماهیە قووڵە بێ تروسکاییەکان. ڕەنگی خۆڵیان گرتبوون، کەچی بۆنی خوێنیان هەر لێ دەهات. بڕیارمدا. وەها دووریان خەمەوە کەس مێژووی خوێناوی ئەو قاوانانە نەزانێت، هەتا نەوەی نوێ دوور لە شەڕی خۆکوژی و کۆنەقەوانی خوێناوی کۆکردنەوە ببێت. . لەودیو سنوور ویستم فڕێیان بدەم، یاخود ژێر خاکیان بکەم. . مەردووم و گیانلەبەری ئەو دیوی ڕۆژهەڵات. . هاواریان لێهەستا، قوربان ئەو بەڵایە لێرە مەنێژە دووریان خەوە با تووخم و تۆویان نەمێنێت. گەرای ئەوانە، ئەگەر تەنها چەند سەرەمێکوتە و هێلکۆکەی بۆگەنیو بن. لەچاوتروکاندنێکدا زاووزێ دەکەن و ژمارەیان لەگەڵای دارو زیخی دەریاو درووی ناودڕوەڵان زیاتر دەبن. . ئەو بەڵایەی بۆ ئێمەت هێناوە نەخۆشیەکی شێرپەنجە خوێنی درمە و بە خێرایی ڕەشەبا تەشەنە دەکات، هەرئەوەندە چەند کەسێک بەو نەخۆشی پەتای براکوژی و یەکتر سڕینەوەڕاهاتن و دەستیان سووربوو. تەشەنە دەکات و یەکەم جار لەناو وڵات، پاشان بەرەو سنوورە دەسکردەکان وەك ئەختەبووت پەلداوێت، چەند جار ئەو فیتنە و دووبەرەکیەیان بۆ ئێمەش هێنا، بەڵام کەس خوی نەچووە سەر ئەوان. پاشان لەگەڵ دوژمن ڕێکدەکەون و ئەو قەوانە ژەنگاویانە لەگەڵ کۆنە فافۆن تێکەڵاو دەکەن و فیشەک و تەقەمەنی تازەی لێ دروست دەکەن و هەموومان قڕ دەکەن. بەناچاری هێنامنەوە و لەهەناوی خۆمدا حەشارمدان. . ئێستاکە سەرەتای بەهارێکی ڕازاوایە و پیر و گەنج و منداڵ و نێر و مێ، بۆ پێشوازی نەورۆزی ئازادی ئەوساڵ بە جلکوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ و ئاڵووالاوە ڕوو لە هەردودەشت و کێوەکان دەکەن هەرکەسێک بۆ سەیران و خۆشی دێن، ترسم هەیە جێگای ئەو هەموو گردە کۆنە قەوانانە بدۆزنەوە. ئەوە نهێنیەکە و هەموو لووتکەکان دەیزانن، بەڵام هەرکەس دیزە بەدەرخۆنەی لێ دەکات. ئەگەر بێت و هەموو خەرمانەکانی ئێسکەکان کۆکەینەوە سەریەک. مەملەکەتێکی گەورەی ئیسکمان دەبێت.. بۆ خۆیان بێشەرمانە لەسەر قوچەکی کۆنەکا بەباکردن هیچی لێ ناکرێت. بەبێ ناڵە و گرمە پێم بڵێ چۆنچۆنی لەناویان دەم. . لەلایەنی پێشمەرگەوە، زۆرکەم ڕێگایان کەوتووەتە ئێرە، خۆ ئەگەر لێرەش مابنەوە، زۆر بەژمارەی کەم و بۆماوەی کورت. بنار چی بەسەرهات! هەرچی شوێنەواری ژیان هەیە بەدی ناکرێت. دەنگدانەوەی چیا چیم پێدەڵێت و چی بە چاوی خۆم دە

بینم، کەس نییە بچێت بۆ هەرەوەز و شەوارەی. . شەدا و تۆڕیماسی گرتن دروست ناکرێن، هەرچەندە بەهار بەسەرچووە و ناوەڕاستی هاوینە گوڵە نێرگز و حاجیلە بەسەر چووە، بەڵام هێشتا بنار بۆنی بەهاری لێدێت، بەڵام چۆن بەهارێك، خەزانی مەرگهێنەر. ماوەی نزیکەی ساڵێکە شەڕ و پێکدادانی لێنەکراوە. لەهەموو لایەکەوە مۆڵگا و سەربازگە و تەلبەندی دڕکاویە، خەڵکی چیانشین، لە شار جێنشین بوون، زۆربەیان بەرەو خواروو ڕاپێچراون.. یان دوا مەنزڵگایان شاری خامۆشانە. دەریاچە سەربەرەو خوار بە شەپۆلی گەورە دەڕوات بەدرێژای و پانای بەلەمو قەیاغو زەورەقە گەورە گەورەکانی جەنگی پێشبڕکیو ڕاوەماسی دەکەن. ماوەیەکە دەریاچە شەڕی لێنەکراوەو ژاراوی نەکراوە. شەپۆلەکانی سپی سپی. شاهۆ دڵی بەوە خۆش بوو تەوار و شەوبا لە ناو زەنگ لەگەڵ چەندین خانەوادەی پێشمەرگان مانەوە. تەوار خەریکێ خوێندنە. ناهێڵم جارێکی کە ڕوولە چیاسەختەکان بکات. سەرگەردانی بەسە. . شاهۆ لەگەڵ چوار پێشمەرگەی قارەمان گەڕابوومەوە بۆ بناری کۆسرەت، یەکێك لەوانە شەپۆلی قارەمان بوو. ئەو شەپۆلەی نە ڕیزە فیشەك نە دەریاچە نە سارد و سەرما و برسیەتی. تۆزقاڵێك لە وەرە و ئازایەتیان کەم نەکردبووەوە. سیانەکەی دیکە هەریەکەیان دانەدانە بوون، هەرچەندە شاهۆ زۆر شارەزایان نەبوو، بەڵام بە ڕۆیشتن و هەڵسوکەوتیان دیار بوو کوڕی تەنگانەن. لەلێواری دەریاچە لەناو کۆنەناشی داڕماو چاوەڕوانی گەیشتنی هاوڕێیەکانیان دەکرد. کاتێك تاریك داهات برادەرەکانیان هاتن، پێنج پێشمەرگە بوون. هیلاك و کز و برسی چاوەکانیان بەقووڵدا چووبوون. دەمار و ماسوولکەی لەشیان تەواو دەرپەڕیبوون. لەتاریکی شەودا. باوەشیان بەیەکدا کرد هەر لەیەکتریان دەڕوانی. شاهۆ سیانی دەناسین، دوانیان لەلای نامۆنەبوون. پاش پشوویەکی کورت. شاهۆ ڕووی لە هاوڕێیەکانی کرد، برادەران ئێوە ماوەی نزیکەی ساڵێکە لێرە بەتەنیا ماونەتەوە. خۆڕاگری خۆتان نواند. بەڕاستی جێگای ڕێزن. ئێستاکەش ئێمە هاتووینەوە. ئاگاداری زۆر ئەو ناوچەیە نین. ئەگەر ماوەیەك لەگەڵمان بمێننەوە باشە. هەرچەندە زۆر ماندووبوون دەردەسەریتان زۆر دیت. ئەگەرنا دەتوانن بەو ڕێگایەی ئێمە پێیهاتین بڕۆنەوە ناوزەنگ پشوویەك بدەن. دەتوانین. پێشمەرگەیەکتان لەگەڵ بنێرین بۆ شارەزایی ڕێگا.. یەکێك لە پێشمەرگەکان کەوتە باسی ئەو ناوچەیە و ئەو ماوەی چۆنچۆنی ژیاون! وادیارە هەمووتان

شارەزای ئەو بنارە و ئەو چیایەن، بەڵام پێش ساڵێك بە جێتان هێشتووە، لەماوەی ئەو ساڵە زۆر شت گۆڕاوە، هەربستە خاکێکی بە مین و تەقەمەنی چێندراوە، بەردەوام هێزێکی گەورە لەگەڕاندایە، کون و قوژبنی نەك ئەو بنارە بەڵکو بەدرێژایی و پانی چیای کۆسرەت و دەریاچە دەگەڕێن. لەگەڵ حەپین و قروسکە قروسکی هەرسەگێك، هەستمان پێدەکەن دەگەنە سەرمان. . . ئەو سەگانەش بۆ خۆیان ڕایان هێناون بۆ دۆزینەوەی پێشمەرگە. جا بۆیە لەگەڵ هاتنی هەر سەگێك نابێ فیشەك بە کار بێنن دەبێ یان ئەوەتا بە پەت و گوریس بیان جنکێنن یان جێگاکەتان بگۆرن، هەر جێگا گۆڕینێك بە ڕۆژ مانای تووشبوون. لەگەڵ هەر ئاشکرابوونێك مانای کوژران. لەزۆربەی کاتەکان زیاتر خۆ شاردنەوە و خۆپاراستن بووە، نابێ بە هیچ شێوەیەك باوەڕ بەکەس بکەن. پێشمەرگەکان هەموویان داوایان کرد لەگەڵیان بمێننەوە. شاهۆ پاش گوێگرتن لە قسەکان، قسەی خۆی کرد. ڕاستە هێزی پێشمەرگە تووشی نسکۆ بووە، بەڵام سەرکردایەتی باوەڕی بەهێزی هەیە، لەماوەیەکی کورت گۆڕانکاریەکی گەورە ڕوودەدات. ڕژێم دەڵێت پێشمەرگە و شۆڕشەکەی لە ناو چوون، پێش ڕاگواستنی قەڵادزێ و دەوروبەری. دەبێ لەماوەیەکی کورت بیر لەوە بکەینەوە، لێرە چالاکیەکی گەورە بکەین بۆ سەلماندنی بوونی پێشمەرگە، مەبەستمان چەك و تەقەمەنی گرتن نییە، بەس سەلماندنی خۆمان بسەلمێنین. ئەو شەو جێگایەکمان دیاری کردووە دوایی بەتەواوی باسی دەکەین، پاش ئەنجامدانی چالاکییەکە بەرەو شار دەڕۆین. بەڵام پەیوەندی لەگەڵ شار هەیە؟ پێشمەرگەکان وەڵامیان دایەوە، نەخێر، زۆر هەوڵماندا، بەڵام خەڵکی بەڕاستی چاو ترساوکراون! پێویستیمان بە بەلەمێك دەبێت، بۆ چوونە ناوشار. ئەویش هەیە بەڵام بێ ماتۆڕە.

. هەر ئەو شەوە هەموو پێشمەرگەکان بە دۆڵێکی تەنگەبەردا ڕووەو لووتکە ڕۆیشتن. لەسەر گردێکی گەورەرە، مۆڵگا و سەربازگەیەکی لێبوو. لەچواردەورەی بەچەند مۆڵگای بچووك بچووك دەورە درابوو. کەمێك لە بەرزاییەوە ماوەیەك پێشمەرگەکان چاودێرییان کرد. سەربازگەیەکی گەورە دیاربوو، چواردەوری بە سیمی دڕکاوی تەلبەند کرابوو. بە هەموو لایەکدا لێکیان دایەوە. لەبەر ئەوەی ماوەیەکی درێژبوو چالاکی لەو ناوە نەکرابوو، زۆر بێغەم دەهاتن و دەچوون، سەربازگەکە بە چەند بلاجکتیۆرێك ڕووناك دەکرایەوە. وا دیار بوو بلاجکتۆرەکان هەرهەموویان چوار دانەبوون لەبەرزایی بە عاموودێکی بەرز

بەسترابوونەوە. بەهەر چواردەوری خۆیاندا دەوروبەریان ڕووناك دەكردەوە. پێشمەرگەكان ببوون بە دوودەستەوە. چواریان لە سەر گرد پاسەوان و پشتگیری دەستەی هێرشبەر بوون. شەپۆل و شاهۆ لەگەڵ چوار پێشمەرگەی دیكە دەستەی هێرشبەر بوون. لەگەڵ لێدانی یەكەم ئاربیجی دەبوو شەپۆل بەدەست ڕێژێك بلاجتۆرەكان لە كار بخات، لەتاریكە شەوە تەماویەكە، هەرهەموویان چاوەڕوانی شاهۆو كاتژمێری سفر بوون، بەتەواوی لە دوانزە نیوە شەو یەكەم ئاربیجی جێگای سەرەكی ئێشككگرتن هەڵكەندراو بەودیوی گردۆڵكە بە سەربازو جاشەكانەوە ئاوە دیوبوو، هیچی لەپێش بەجێ نەما، هەموو لایەك چاوەڕوانی شەپۆل بوون بۆ لێدانی بلاجكتۆرەكان. دەنگ نەبوو، لەگەڵ سووڕانی بلاجكتۆرەكان پێشمەرگەیەكی دەسەتەی پشت گیری بە دەستڕێژێك تاریكی كردن. ئاربیجی دووەمو سێهەم. یەك بەداوی یەكدا سەنگەرە پڕ لە جاش و سەرباز بەرەو ئاسمان دەفڕین. لە جێگای سەنگەرە سووتاوەكان جاش و سەرباز هەڵدەهاتن دەكەوتنە بەر دەست ڕێژی پێشمەرگە. شاهۆ بانگی شەپۆلی كرد، هاوڕێ بۆ دەنگت نییە؟ ئەو ئاوچەوانە سێزدەیە چەكەكەم وەستاتەوە. جووتەی دەكات. بە خێرایی برووسك سەربازگەكەیان بەسەر یەكدا خاپوور كرد. هیچ دەنگی تەقە و بەرگری نەدەهاتە بەرگوێ، بەڵام لە مۆلگا و سەربازگەكانی دیكە بەرەو پێشمەرگەكان ئاگردەباری. بەو دۆڵەی پێدا هاتبوون بەپەلە لەو ناوەی دوور كەتنەوە. . كاتژمێرێك پاشتر لەسەر دەریاچە بوون لەبن تاشەبەردێكی گەورە بەلەمێك ڕاگیرابوو. هەر دە پێشمەرگەكە بەرەو شار كەوتنەڕێ. دەریاچە لەئاگری تەقینەوە و بلاجكتۆری كەنار و چیای كۆسرەت سوور دەچووەوە. هەر پاش چەند خولەكێك نەك هەستیان كرد، بەڵكوو بەئاشكرا لە زۆر كونی گەورەی بەلەمەكەوە ئاو دەهاتە ژوورێ بە دوو دۆلكەی تەختەی گەورە چەند ئاویان دەردەدا دوو ئەوەندە ئاو دەهاتە ژوورەوە. چار ناچارە دەبێت بەردەوام بن. گەڕانەوە بۆ بنار كارێكی خۆكوژی بوو. هەتا بەرەبەیان توانیان لە دەریاچە بپەڕنەوە. دنیا بەرەو ڕووناكبوون دەچوو، لەگەڵ دەسگیركردن لە لێواری بەلەمەكە تلیشەدار و پارچەداری تەڕی كۆنە بەلەمەكە بەدەستیانەوە دەهات. لەگەڵ گەیشتن بە كەنار، بەلەم خۆی كێشا بە تیكەبەردێكی تیژ، دوو داری لەوسەر هەتا ئەو سەر بونە دووپارچە، بەلەم نقووم بوو. بە چوار پێشمەرگە كەوتنە ڕاكێشانی بۆ قەراغی دەریاچە، بەڵام شاهۆ بانگی كردن! هاوڕێیان وازی

لێ بێنن، کەڵکی بەکارهێنان و چاککردنەوەی نەماوە. ئەگەر بە ڕۆژ بەو حاڵەی بم دیتبا، حەوت شەو و حەوت ڕۆژ شەڕی ڕەومجاش و سوپامان کردبا باشتر بوو، ئەوەك ببیەنە شەهیدی بەلەم. چیا لەبەرامبەریان ئاگری دەگرت، لە هەموولایەکەوە تۆپبارانو فڕۆکەو کۆپتەری جەنگی دووبارە بە گڕمگڕ کەوتنەوە. ئارامی ئەو ناوچەیە شلقا. پێشمەرگەکان ماوەیەك لەسەر نەرمەگیا تەڕەکە دانیشتن کەوتنە بیرکردنەوە، ئێستا چی بکەن باشە؟ لەدەرەی شار بمێننەوە هەتا شەو دادێت، یان بە تاریکوڕوونی خۆیان بەشاردابکەن. هەموو پێشمەرگەکان بەدەوری شاهۆدا کۆببوونەوە، هەندێکیان زۆر بێباکانە دەیانگوت: برادەران خۆمان بە ناوشاردا دەکەین تەواو بڕایەوە. سەردەستەی پێشمەرگەکانی کە ڕووی لە شاهۆ کرد. هاوڕێ ئەتۆ بۆ خۆت لەهەمووومان کۆنتری لە پێشمەرگایەتی. ئەزموونێکی زۆرت هەیە بۆخۆت بڕیاربدە. دەزانی هاوڕێ ئەقیب، هاوڕێیانی دیکە گوێ بگرن، مەسەلەکە ئەوە نییە کێ بڕیاردەدات؟ لەو سەردەم و بارودۆخە دژوارەی زۆر ئاستەمە بڕیاردان لەسەر چارەنووسی دەکەس. ئەگەر مەسەلە تەنها ژیانی خۆم با، یەکسەر بەبێ یەك و دوو خۆم بەناوشاردا دەکرد. بەڵام ساڵێکە لەو ناوەی دوور کەوتوومەوە خوێندنەوەم بۆ هەموو شتەکان هەتا لێدانی سەربازگەکە هەڵەبوو. ئەوەی داوا لەمن کرا، لەبارەگای سەرەکی ناوزەنگ، تەنها پاراستنی گیان ئێوەو خۆم بوو، تەماشا بکەم بزانم ئایە دەتوانین لێرە بژین؟ یان بگەڕێنەوە بۆ ناوزەنگ. هەرچەندی بیری لێ دەکەمەوە ناوزەنگ مانای خۆبەدەستەوەدان. ژیان لەژێر فەرمان و بۆ چوونی پاسدار و قەرارگەی ڕەمەزان دایە. ڕاستە پێشمەرگە تێر و پڕتر و ژیانی پارێزراوە، زۆریان حەزیان لەو ژیانەیە پێیان بڵێن پێشمەرگە و سەڵەوات لەدیداری پاکی ئاخوندیان بدەن، بەڵام خۆ ئێمە دەستمان نەداوەتە چەك بۆ خۆپاراستن. دارلاستیك و قۆچەقانیمان بەدەستەوە نییە، ئەو چەکانە بۆ پاراستنی سەر و ماڵی خەڵکە، ئەمن بەش بەحاڵی خۆم ئەگەر بزانم ناتوانم بەرگری لەخەڵك بکەم بە چەکی دەستم، دەیدەمە دەستی گەنجێکی لەخۆم وریاتر و لەخۆم لەخۆبوردوتر. ئێستا هەموومان دە کەسین. دەیخەینە دەنگدانەوە ئەمن دوا کەسم بتوانم دەنگی خۆم بدەم. چەند سیغارێکی پێچانەوە، دایەدەستی یەکە یەکە پێشمەرگەکان. حەوتیان سیغاری بوون. سێیان نەك جگەرەنەکێش بوون، بەڵکو زۆر ڕقیان لە دووکەڵی بۆگەنیوی جگەرەش بوو. یەکێکیان ناوی سورکێو

بوو، ئەرێ هاوڕێیان ئەو هەموو دووکەڵی کیمیایە بەس نییە، لەناو بەلەم. لە بارەگا. لەناو ئاودەست چوزانم، بەردەوام قانگمان دەدەن. بەدەست من بێت، هەرچی ناوی دووکەڵ بێت لەناوی دەبەم. ماوەی جگەرەکێشەکە تەواوبوو. هەستیان کرد تەواو دنیا ڕووناك بووەتەوە. ها بڕیاری چیتاندا. شەش لە پێشمەرگەکان لەگەڵ مانەوەدا بوون هەتا شەو. شاهۆ هەستا بۆ خۆشم هەر لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا بووم. ئێستا بەکۆی دەنگ بڕیارتاندا بە مانەوە لەو ناوەی. با بڕۆین بەناو بیشەلآن و دارستاندا هاتن. زۆر لەسەر هەست دەڕۆیشتن، لەگەڵ گچکەترین دەنگی باڵندە، ئاژەڵ، هەتا خرتەخرتی مشکیش هەڵوێستەیەکیان دەکرد، کە دەیانزانی هیچ نییە بەردەوام دەبوون. ئاونگ و خوناو لەسەردارەکان بۆنی خۆشی پنگ و تەڕی خاك برسیەتی وەبیر دەهێنانەوە. لەناو دەرستانە چڕەکە شەش پێشمەرگەیان جێهێشت، تکایە لێرە بن هەتا دەگەڕێینەوە؟ شاهۆ و شەپۆل، لەگەڵ سوورکێو و سەردەستەکەی کە هاوڕێ قەندیل ڕۆیشتن بۆ هەمان ئەو ڕەزانەی. کاتی خۆی شاهۆ کە لە چالاکی کوشتنی سەرۆك جاشەکە هاتبوونەوە، بەهێواشی لە لایەکی پەرژینەکان خۆیان بەناو ڕەزداکرد. دەنگە دەنگێکی نزم لەناو ژوورەکان دەهات. ماوەیەك گوێ قوڵاخ بوون. بزانن کێن لەوێن زۆر بە ئاگاداریەوە چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەی کەسێکیان دەکرد. شەپۆل ویستی بچێتە ژوورێ. شاهۆ دەستی گرت. هاوڕێ دەنگەکان زۆرن. چاوەڕوان بە. لەپشت چەند دەوەنێك لەنزیکی بیرێکی سەرداپۆشراو خۆیان شاردبووە. دووبارە شەپۆل ویستی هەستێت. شاهۆ دووبارە دەستی گرت. تکات لێدەکەم چاوەڕان بە، نازانم ئەوە چۆنچۆنی نۆ مانگ لەسکی دایکت ئۆقرەت گرتووە؟ لەو بێدەنگی و ئارامیە پێشمەرگەکان دەستیان لەسەر میلی چەکەکانیان بوو. لەپشتەوە زۆر لەناکاو دوو سەگی گەورەی سەروگوێلاك قەبە بە مڕەمڕەوە خۆیان پێدادان، شەپۆل قۆنداغێکی لە دەمی یەکێکیاندا پڕی دایە دەستی شەپۆل بە خوێنی داهێنا. پێشمەرگەکان شڵەژان کوڕێکی گەنج بە هەڵەداوان هەتە دەرێ. . . چفە چفێکی کرد بۆ سەگەکان هات، شاهۆ هەستایەوە تفەنگی لەسەر سینگی دانا. کوڕە ترسا هاواری کرد، هاوڕێ شاهۆ تەقەمەکە، سەگەکانی ڕاونا. . لەگەڵ پێشمەرگەکان کەوتە ماچکردن. خزمێکی فەرەج دەرچوو. هاوڕێ شاهۆ خێرە ڕێگاتان کەوتۆتە ئەو ناوەی؟ شاهۆ بەدەمگرتنی دەستی برینداری شەپۆلەوە، ئەتۆ خزمی کاك فەرەجی. بەڵێ مامە فەرەج مامم بوو ناوت چییە؟

شاخەوان. . شاهۆ ناوچاوانی تێکچوو، کاك فەرەج مامت بوو. کوڕە زانی هەڵەیەکی گەورەی کردووە، ویستی ڕاستی بکاتەوە، مامە. فەرموون وەرنە ژوورێ. ئەوە هاوڕێ شەپۆلە؟ بەڵێ چۆن ئەدی شەهید نەبوو، با بەڵام زیندووبووەوە. دووبارە دەستی کردەوە بەماچکردنی شەپۆل. بە قوربانت مامە شەپۆل دەزانی کە زانیمان شەهید بووی لەماڵی چەندت بۆگریاین. بەخوای ئەنکم هەردووك چاوی کوێربوون بەگریانێ. . شەپۆل هەر خەریکی بەستنی دەسەتی بوو. کوڕە گەنجەکە پەڕۆیەکانی کردنەوە. دەرمان و مەڵحەمی هێنا. دەستی شەپۆلی بەست، بەخوای ئەك سەگەکان بۆخۆشم و کەسوکارم بە قوربانی تۆ دەبین. کاتێك چوونە ژوور. دایکی شاخەوان لەگەڵ دوو کچی کوڕێکی پارچەڵە خۆیان بە پێشمەرگاندا دا بۆ ماچکردن. شاهۆ ئۆقرەی لێهەڵگیرابوو، زوو زوو لە شاخەوانی دەپرسی. مامت لە کوێیە؟ چی لێ بەسەرهات. کوڕە هەندێك ناوچەوانی خۆی خوراند. با بچم چایەکتان بۆ لێنێم شاهۆ ڕووی لە پێشمەرگەکانی دیکە کرد. ئەو ماوەی لێرەبوون چی لەسەر کاك فەرەج دەزانن؟ پێشمەرگەکان زۆر بەسەرسووڕمانەوە تەماشای یەکتریان کرد، سەردەسەتەکە شانێکی بادا.. باوەڕ بکە هەرناشی ناسم. نازانم باسی کێ دەکەن! کوڕە گەنجەکە بە دایکی گوت، دایە ئەتۆ باشتر بەسەرهاتی مامەفەرەج دەزانی بۆیان باس بکە. شاهۆ ڕووی لە دایکی شاخەوانکرد. تەمەنی لە پەنجاساڵی دەبوو، بەڵام سوورە و چوست و چالاك بوو، ڕووخسارێکی هەتا بڵێی دڵگیری هەبوو. کاك شاهۆ دەمێکە دەنگوباسی کاك فەرەجی نازانی. لەو کاتەی هاتە کۆسرەت و تەواری هێنا، گەڕایەوە نازانم چی بەسرهات، ژنە لەگەڵ گوێی لەناوی تەواری بوو دەستی کردە گریان، تخوا تەوارەکەمان چۆنە؟ لە کوێیە؟ لەهەر شەش منداڵی خۆم خۆشترم دەویست. ئەی دادیلۆکە، بەخوای نامراد و بێکەسە لەو ژیانەی بەزۆر لەمنیان ستاندەوە، دەنا ژیانی خۆم لەسەری دادەنا. بەو قسانە دەیهەویست مەسەلەی فەرەج لەبیر شاهۆ بباتەوە. شاهۆ ئۆقرەی نەما. واز لە تەوار و من بێنە کاك فەرەج چی بەسەرهات؟. ژنە گریا دەتخوا کاك شاهۆ واز لەو مەسەلەی بێنە؟شەپۆل بەدەستی بەستراوە هەستا. شاهۆ تەماشایەکی کرد. ها هاوڕێ خێرە. هیچ ئەدی هاوڕێیانمان لەبیرچوو، شاهۆ فیتوویەکی درێژی لێدا. هەر ئێستا دەچم بە دوویاندا. شاخەوان لە دەرێ لەگەڵ شەپۆل و پێشمەرگەیەکی دیکە چوون بەدوای پێشمەرگەکانی دیکە. شاهۆ ئاگر لە دڵ و

هەناوی بەربوو. خوشکم هەتا کەنگێ شێر و ڕێویم بۆ دەهێنیەوە. ژنە ماوەیەك لەبەر گریان هیچی پێندە گوترا. شاهۆ گیان واز لەو بەسەرهاتەی بێنە. شاهۆ لێك لێك سوێندی لێدەخوارد. پاشان ژنە بەناچاری کەوتە قسەکردن.. شاهۆ گیان لەلای شاخەوان باسی مەکە. ڕووی لە منداڵەکانی کرد، بڕۆن نان و چای ئامادە بکەن. کەوتە گێڕانەوەی بەسەر هاتەکە. مەسەلەکە لە گەڵ خەبەرلێدانی سێ پێشمەرگەکان ڕوویدا. مامۆستاو هاوڕێکانی. شاهۆ زیاتر لێی هاتە پێشێ ئێ ئەوان ئیخباری کرابوون؟ ئەدی چۆن!. دراوسێی فەرمجی بوو. باشە. . پاش شەهیدبوونی سێ پێشمەرگەکە چی ڕوویدا؟ فەرەج ئەوەبوو خۆی شاردەوە. وابزانم هات بۆ لای تۆ.. ئاوابوو تەواری بۆم هێنا. ئەوکاتی بابی منداڵان لەگەڵ خەسووم و خەزوورم، دوو دشی من بە کوردی. داکوباب و دوو خوشك و برایەکی لەسەر فەرەج گیرابوون. فەرەج لەبەر تەوار و لەبەر تۆ بەسەر خۆی نەهێنا، هەرکە لە کۆسرەتی هاتەوە بۆخۆی بەرەو پیری مەرگ چوو، پێیانی گوت، هەرچی هەبێت ئەمن بووم بمگرن لە سێدارەم بدەن گوللەبارانم بکەن، ئەو خەڵکەی بەردەن. ئێ پاشان ئەوانی دیکەیان بەردان؟ نا هەتا ئەمڕۆ بێسەر و شوێنن، هەموو ڕۆژێ منداڵەکان داوای بابیان دەکەن. بەس شاخۆ تەمەنی هەزار ساڵ بێت، تێدەگات. ئەوەتا بەو وەختەی هاتووینەتە سەر ڕەزی بۆخۆ ژیاندن. مانای وایە گیراون. نازانم کەس نازانێت ماون نەماون. وەکوو ئەوانەی ئەنفال بێسەر و شوێنن. کێیە ئەو کەسەی ناپاکیەکەی کردووە؟ ژنە ماوەیەك دەموچاوی خۆی بە لیچکەکەی گرت، نازانم شاهۆ گیان. ئەوە بشزانم. بەخوای دەستی لێبدەن ماڵ و منداڵمان لەناو دەبەن.. باشە دادە ئەتۆ بەختیار دەناسی؟ بەختیاری ئەحمەدی ئامۆزام، نا. تەواوە. تخوا باسی بەختیارم هەر وەبیر مەهێنەوە. برینی وی لەهەمووان گەورەترە. چۆنچۆنی؟ لەو کاتەیدا پێشمەرگەکان و شەپۆل وەژوورکەوتن لەگەڵ بەخێرهاتن و جێگا بۆ کردنەوەی مەسەلەکە نەما. شاهۆ وازی نەهێنا، ئێ دادە مەسەلەی بەختیار؟ ئەویش ئەو زاڵمە لەناوی برد. کێ لەناوی برد. ئەوکەسەی فەرەج و وانی بەگرتدا و بە غەدر سێ پێشمەرگەکانی بە شەهیدکردن دا. چی لە بەختیار کرد؟ ژنە بەگریانەوە، ئەوەندە بەنا ئینسانانە لەماڵی خۆی سەری بڕیبوو، سەرەکەشی پارەی پێ وەرگرت بەناوی ئەوەی سەرە پاسدارە و هێناویەتی. جا باوەڕیان پێکرد! بۆ نا لاشەکەی نێژرا بەبێ سەر. ئەو ڕۆژە شاهۆ ئەوەندەی بەسەرهاتی جەرگبڕ بیستن دنیا

لەبەر چاوی دەسووڕا. لە گۆشەیەك پاڵی دایەوە و هەتا پاش نیوەڕۆ بە سیغارکێشان لەبیر کردنەوەدا بوو. لە داوی نیوەڕۆ خەوی لێکەوت هەتا شەو. کاتێك بە خەبەر هات، دنیا تەواو تاریك بووبوو. هەستان و خۆیان پێچایەوە بۆ ناو شار. هەرکە گەیشتنە ناو شار چوونە ماڵی کەسێکی خۆیان. لە زووە لەگەڵیان دابوو. یەکەم هەواڵ. دەنگوباسی ڕاگواستنی شاری قەڵادزێ بوو. لەگەڵ خانەخوێ باسی دواماڵی قەڵادزێی کرد ڕاگوێزرا، گوررزێکی لەهەموو گوررزەکان کوشندەتربوو بە دڵی کەوت. بۆ کوێیان بردن؟ بەسەر زۆر جێگای ئۆردووگا زۆرەملێیەکانیان دابەشکردن. لەنێوان هەولێر و موسڵ. وا بزانم ناوی (جدیدە)یە لەوێ دەست بەسەرن و بۆ ماوەیەکی کاتی، پاشان بەرەو خوارووی ئێراق دەیانگوازنەوە. ئەو چەند ڕۆژەی شاهۆ ئەوەندەی کارەستای گەورە و جەرگبڕ بیستن... لەتوانایدا نەما گوێ لە بەسەرهاتی دیکە بگرێ، مردنی خۆی بەئاوات دەخواست، بەس بیری لە تۆڵەکردنەوە دەکردەوە.

# تۆڵە

لەژێر باڵی تاریکی شەوەزەنگ کەوا باران بە لێزمە و لێشاو بە باوە دەباری. کەسی وا بەدەرەوە نەبوو، تاك تاکە. پاسەوان و حەس حەسەکان، جار جارێك شاور سافیرەیان لێدەدا. لە دوور دەنگی دەسترێژ و تەقینەوە دەهات، بەڵام لەبەر گرمەگرمی هەورەبروسکە دەنگەکان زوو کپ دەبوونەوە. چەند باوبۆران بەهێزتر دەبوو، لێشاوی قوڕاو زیاتر دەبوو، دەتگوت شار بەتەواوی بەسەریەکدا ڕووخاوە.

کەمێکی دیکە هەرچی دار و دەوەن و ستوونی کارەبا هەیە لەبنەوەڕا دەردێن. جۆگەلە و تەنکە ڕووبار قوڕاوی خوڕخوڕ دەهاتە خوارێ، لەگەڵ خۆیان پوشوپەڵاش و گەڵاولق و پۆپۆی داریان سەربەرەو خوار ڕادەدا. هەر لەو شارە لە (خوار قوتابخانەی سەرەتایی تێکەڵاوی کێوەڕەش) لەبەرباران، سێ چەکدار بە باڵتۆی سەوزی سەربازی، بەجلوبەرگی کوردی کڵاو جەمەدانە لەسەر. لەترسی باوبۆران و ڕەشەبا، لە نیوەی شەودا لەبن دار چنارێکی گەورە لە چاوەڕوانیدا بوون. یەکێکیان لە دوانەکەی دیکە وریاتر بوو. چاوێکی هەر لەسەر دارچنارەکە بوو! ئەو دارچنارەی لە ژێری وەستابوون، جیڕەجیڕ و خرتەخرتی، تەواو چاوەڕوانی شکان و بەربوونەوەی لێ دەکرا. هەمان چەکدار مژێکی لە جگەرەکەی دەستی دا و بەبرادەکانی گوت، لە ناوەڕاستی ئەو گرێیەی دەبینن؟ گرێیەکی گەورەی خواری هەبوو! لەوێڕا بەسەر تەپڵی سەرماندا بەردەبێتەوە. کابرا ئاوی دەموچاوی سڕیەوە.. چەکدارێکی دیکە پێی گوت، ئاخر ئەگەر ئیڤایەکە هات دەڕوات و نامان بینێت. پاشان ئەگەر پێشمەرگەمان لێ پەیدابوون، دەڵێی گورگن، ناوەڵڵا دەڵێی مارن، ناویان هات پەیدا دەبن، بەتایبەتی شەوێك باران یان بەفر ببارێت. . کوڕە پێشمەرگە کوا ماون. هەموویان هاتنەوە و لەمن و تۆ جاشی ئەسڵیترن، حەمەی پوورزام دواکەس بوو هاتەوە. دەیگوت، بەیەك ڕۆژ پێنج سەد کەس بووین هەموومان کلکمان لەناو گەڵی خۆنا. ئادڵی خۆت بەو قسە هەڵەقوبولقانە بدەوە. ئەمن ئەوەندەی دەزانم، ئەگەر دانەیەکیان مابێت وەکوو مار پێتەوە دەدەن.. دەڵێن شۆڕش نەخۆش دەبێت، بەڵام قەد نامرێت! بەدەم ئەو قسانەوە، بەدوام کەون. دوو چەکدارەکەی دیکە بەبێ پرسیارکردن کەوتنە

شوێنی، بۆ بەری ئەوبەری هەرسێکیان لە جادەی پەڕینەوە. لەکاتی پەڕینەوەدا یەکێکیان دەشەلی، بەلای ڕاستدا تەواو خواردەبووەوە لەپشت کۆمەڵە سنەوبەرێك لەژێر چەتری فولکەی شار وەستان. جارجار سەری یەکێکیان بەدیار دەکەوت. کامەیان مووکەیە؟ کاك شاهۆ هێواش، ئەوەی بە شەلەشەل پەڕیەوە. ئەها بەرامبەرمان وەستاوە، لەژێر چەتری فولکەکە. وەکوو پۆلیسی هاتووچۆ چاودێری تەواوی هەر چوار لای دەکرد بەردەوام لە جووڵەدا بوو لەهیچ شوێنێك ڕانەدەوەستا. ئەوکاتی لەبن دارچنارەکە بوون هەروا یەك شورای بە دەوەنی بچووك بەینیان بوو لەگەڵ شاهۆ و هاوڕێیەکانی.. کەواتە وەختییەتی خۆتان ئامادەبکەن.. شەپۆل ویستی هەستێتەوە شاهۆ دەستی گرت و بەپەلە داینیشاندەوە. پەلە مەکە، تەماشای بەرامبەرت بکە! لە کوێ؟ چاوم لەهیچ نییە! نە گوێم.. کوڕە ئەها لەبەرامبەر خۆمان لەتاریکایی شتێکی ڕەش دیارە. نا دوانن، دانەیەکیان پاڵتۆی درێژی لەبەرە ئەوەی دیکەیان هیچی لەبەر نییە، بۆسەیە دەنگ مەکەن جێگاکەمان نازانن، بەڵام خەبەریان هەیە کە سێك لە دوویانە. شەپۆل چاوەکانی خۆی سڕینەوە چەند جار چاوەکانی هەڵگلۆفین. وادیارە ئەمن کوێرم هیچ بەدی ناکەم. لەباران و وژەوژی با زیاتر.. شاهۆ قسەکەی پێ بڕی، ئەها، تەماشاکە وایە. شەلەکەیانە. ناوی چی بوو؟ مووکە شەلی کەرا پاش کەمێك کابرا گەڕایەوە، لە پشت سنەوبەرەکان بزر بوو.. پاش کەمێك لەبەرامبەر چەکدارەکان. گڕەگڕی زیلێك و ئیڤایەك هات. لەپێش قوتابخانە ڕایگرت. دوو سەربازی مغاویر دابەزین. هەر لەدوورەوە زنجیری پانتۆڵەکانایان کردەوە. بەسەر دەوەن و دارەکاندا کەوتنە میزکردن. . بەسەر لەش و دەموچاوی شاهۆ و دووبرادەرەکەی.. ئەوانیش تەواو خۆیان لەبن دەوەن و گوڵەباخە چڕەکان مەڵاس دابوو. بچووکترین جووڵە و دەنگ دەبووە هۆی ئاشکرابوونیان. لەناوەڕاستی شار دەربازبوونیان نەدەبوو. میزی سەربازەکان تەواو نەدەبوو. چەند خوڕەی بارانەکە زیادی دەکرد، میزی ئەوانیش خشەی بەرزتر دەبووەوە. دوو سەربازەکە لەنێوان خۆیان گرەویان دەکرد، بزانن میزی کامیان بەخوڕترە و دوورتر دەڕوات. بەجلکەکانیان ڕا دیاربوو. تەواری بوون. لەگەڵ گەیشتنی زیل و ئیڤاکە سێ چەکدارەکە پەڕینەوە و هاتنەوە جێگای خۆیان. لەژێر تیشکی بە هێزی زیلەکە شەپۆل دەموچاوی مووکە شەلی دیت. نەك دیتوویەتی.. باش باشی دەناسێت. مووکە لەگەڵ دوو جاشەکە یەکە و

سواری زیلەکەبوون. نیڤایەکە ڕۆیشت شوفێری زیلەکە بانگی دوو سەربازەکەی کرد. . یاڵڵا یا شباب شنو شاربین؟ دوو سەربازەکە جیڕمیەکیان لە زنجیرەکانیان هێنا و سەرکەوتن. بەو نیوە شەوە بە دەنگەدەنگ و پێکەنین و هۆڕن لێدان نیڤایەکە تەقەی خۆشی دەکرد، لەگەڵ تەقەکان دوو تارمایی تاریکایی بەرامبەریان هاتن بە ناو جادەی هاتنە خوار. کەرێك لەگەڵ جاشکەکەی بوو. کەرەکە کورتانی لەبەر بوو، جاشکەکە ڕووت بوو. دیاربوو لەبەر باران خۆیان دابووە پاڵ دیوار لە کەلێنێك. سەرنشینانی ناو زیلەکەش بە مووکە شەلیشەوە، وەڵامیان دەدانەوە. زۆربەی دەستڕێژەکانیان بەناو ماڵاندا دەکرد، لەتاریکایی نیوە شەوە تەمومژاوییەکەدا چۆن بەخێرای هاتن ئاوهاش بەلەز بزربوون. پێشمەرگەکان بەدەم دەموچاو سڕینەوەی میزاویان.. سەرکۆنەی شاهۆیان دەکرد. . میزەکەیان هەر هەمووی بە دەموچاومان دەکەوت! بۆنی ئارەقی فەلی لێدەهات. شەپۆل لەبەر خۆیەوە جوێنی دنیای دەدا. . کاکە زۆر بە ئاسانی دەمانتوانی لە گۆڕی باوکیان ببەین. نازانم ئەتۆ کەنگێ وا ترسەنۆك بووی شاهۆ... شاهۆ هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. کاکە مەسەلە ترسان نییە، بەڵام وامزانی بۆسەیە. ئەو دووشتەی لەتاریکایی دیاربوون بە چەکداریان تێگەشتم، خوا بیانکات بە قوربانی کەرو جاشکەکەی. ئەم شەو کاتیان تەواو نەبووبوو، (دەست بەباڵی هەوریشەوە بگرن وەك سەگ دەمیان تۆپێنم) بۆ سبەی شەو.. کێ دەڵێت ئەوانە خۆیانن؟ یان پیاو خراپن؟ پاشان زۆر جاش و هەتا سیخووڕی بەناو زۆر خراپ هەن، سەربەلایەنێکی دیکەن یان سەر بە خۆمانن.. مووکە شەلمان زانی کێیە؟ هەوڵ بدەن بە زیندوویی بیان گرن، باشە شەپۆل دەموچاوی لەلام ئاشنابوو! لەکوێ دیتوومە نایەتەوە خەیاڵم؟ نەقیب. باش دیقەتی دەموچاوی مووکە شەلتان دا؟ نا، باشە لەو باوبۆران و هەڵایەی دیقەتی چیبدەین؟ لەژێر گڵۆپی زیلەکە. دەمو چاوی بەدیار کەوت، ئەو کەسە دەناسم. لەلای خۆمان دیل بووە. کەنگێ، لەکوێ نازانم؟ شەپۆل دەستی لە شانی شاهۆ دا. کاکە ئێستا شەڵاڵی ئاو بووین، بابڕۆین! پاشان بۆت باس دەکەم لەکوێ بە دیداری گەیشتووی؟ جارێ بابچین هاوڕێیان بێنین. ئەو شەو دەچینە ماڵی خۆمان. لەتاوی منداڵەکانم خەریکە شێت ببم. . شاهۆ دەستی بە ڕیشی شەپۆل داهێنا. . شەپۆل وەختی نییە! کاکە چوار ساڵە منداڵەکانم نەدیتووە. ئەتۆ منداڵت نییە وەختە بۆ شەوبا وەکێوی دەدەی. ئەدی بەمن دەڵێی چی؟دەك زمانت مووی لێ

بێت، ئەدی تەوار کچی کێیە؟ تەوار تەواری ئەنفالە.. تەواری پێشمەرگەیە هی کوردە. کچە گەورەی شۆڕشە! ئەگەر نایەن لەگەڵم حەز دەکەن بەبێ چەك دەچم. بەس ئەو دەمانچەی دەبەم ئەوەش ماڵی خۆمە و بە پارەی خۆم کڕیومە. شاهۆ نەیزانی بڵێ چی.. شەپۆل ئەتۆ شتێکت لە ناو چاودایە.. هەر سەری ژن و منداڵ و کەسوکارت بە فەتارە نەدەی! بەڵام دەزانم ئەو شەوە و ئەو دیدارە کورتە بە گیانی خۆتی دەکڕی.. باشە لەبەر یەك شت لەگەڵت دێم. هەتا بزانن ماوی شەهید نەبووی.. شەپۆل وەکوو منداڵ کەوتە ماچکردنی شاهۆ و نەقیب.. شاهۆ ڕووی لە نەقیب کرد. هاوڕێ ئەتۆ ئاگاداربە.. هەرچی ڕووبدات ئەمن بەرپرس نیم لێی. باشە کاکە ئەمن هەمووی دەگرمە ئەستۆی خۆم. شاهۆ لەوەتەی بوویە خاوەن تەوار کەمێک لە سۆز و گرفتی خێزان تێدەگەی، ئەگەر نا جاری جاران بوایە، قەت بەو سەردانە قایل نەدەبووی، هەر بژی تەوار توانیت کەسێکی ئاوا قەڵلەشەق بگۆڕیت. چوونەوە ماڵێ پێشمەرگەکانی دیکەیان هێنا و هەر دەیان لەناو شار دوورکەوتنەوەو بە قەراغی شاردا پاش چەند کوچە و کۆڵان و گەڕەکیان بڕی چوونە کەلاوەیەك. کەلاوەکە تەواو ئەکراو بوو هەمووی بلۆك و شیش و کیسە چیمەنتۆ بوو. شەپۆل ماوەیەك لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی مات کرد. . چاودێری تەواوی کۆڵانی کرد. دنیا ئارامە. هاوڕێیان لێرە چاوەڕان بن، ئەگەر هەرچی ڕوویدا، خۆتان دەرباز کەن! . شاهۆ وەرە لەگەڵم. . نەقیب بە شەپۆلی گوت، لەبەر خاتری جەنابم ئیزنیان دای سەردان بکەی کەچی خاڵی خۆت پەراوێزدەکەی، شەپۆل دەستێکی لەڕێشە درێژە چڵکنەکەی نەقیب دا. هاوڕێ منداڵەکانم ئەتۆ ببینن زەندەقیان دەچێت، دەڵێی (شەولەبانی) کەمێکیش بە ورچی کوڵکن دەچی. هەموو بە جارێك پێکەنین.. هەردووکیان ڕۆیشتن لە جادە باریکە خۆڵاوییەکە پەڕینەوە. شاهۆ لەبن دیوارە بەرزەکەی ماڵیان بە شەپۆلی گوت، باشە دیوارەکان زۆر بەرزن، لەدەرگا بدەین. شەپۆل بەبێ بیرکردنەوە، کاکە لەدەرگا دانی ناوێت. لەبەشی پشتەوە لە سووڕانەوە لەنێوان دوو دیوار کەلێنێك هەبوو، بەو کەلێنەدا چوونە ژوورەوە. لەبەرامبەریان دوو ژوور هەبوون. شەپۆل چووە بەر پەنجەرەی یەکەمیان پەردەی پێوە بوو تاریك بوو هیچ دیار نەبوو. چووە بەر پەنجەرەی دووەم بێ جام و شووشە، ڕووناکییەکی کز لە گۆشەیەك دیاربوو. شاهۆ دەستی شەپۆلی گرت، بە چرپەیەك پێگوت، هاوڕێ دڵنیای ماڵی خۆتانە؟ ئا، ئا، خانوی خۆمانە.. کرێچی نین. ماوەیەك شەپۆل لەبن

پەنجەرە تەماشای ژووری دەکرد.. پیرە مێردێکی ڕیش سپی بەتانییەکی لە خۆی لوولدابوو. جگەرمیەکی لەدەستی بوو، داڵغەیەکی قووڵی بەرامبەر سۆپەکەی تەنیشتی لێدابوو.. شەپۆل ماوەیەك بەرامبەری فرمێسك لە چاوەکانی ڕانەدەوەستان. شاهۆ هات. ها چییە؟ تەماشیەکی ژوورێی کرد. چەکەکەی لە شیشی پەنجەرەکە خشا، دەنگێکی کەمێك لە شیشەکان هەستا.. پیرەمێرد سەرێکی بەرز کردەوە. جگەرەکەی دەستی فڕێداو چاوەکانی لە پەنجەرەکەوە پڕین.. شەپۆل کەمێك هاتە بەر پەنجەرەکەی بە هێواشی بانگی کرد. . بابە، بابە. پیرە مێرد سەرێکی بەرز کردەوە، بەتانییەکەی لە خۆی لوولدا، کێیە؟ شەپۆل بانگی کرد بابە ئەمنم شەپۆل... پیرەمێرد بانگی کرد شەپۆل کێیە؟. دەتۆ بابە دەرگای بکەوە. شاسوارم. شاسوار.. پیرە مێرد لەگەڵ بیستنی ناوی شاسوار. ئەژنۆی شکان، بانگی ژنەکەی کرد.. خوونچە. خوونچە! پیرێژنێك لەبن بەتانی هەستا هەندێك دەستی لە چاوەکانی دان. چیت دەوێت؟ بەو نیوە شەوە پیرەمێرد بۆ نانووی! مامە پیر نوتقی گیرا، شەپۆل بانگی کرد، دایە، دایەگیان.. پیرێژن لەگەڵ گوێی لە دەنگی شەپۆل بوو. هەستایەوە، وەکوو گەنجێکی بەهێزی لێهات. بەپەلە دەرگای کردەوە، لەتاوان سەری خۆی لە گۆشە تیژی دەرگادا، نەپرژایە سەر ئازار و ئێش ئاڵقەڕێزی ڕاکێشا، بەپەلە باوەشی بە شاهۆدا کرد، چەند جار یەکتریان ماچ کرد. شاهۆ بە هێواشی گوتی پورێ ئەوە شەپۆلە. پیرێژن زمانی شکابوو. باوەشی بە شەپۆلدا کرد. شاسوار بەقوربانی شەپۆلت بم. ئەو برادەرەت ناوی شەپۆلە. نا، نا دایە ئەمن ناوم شەپۆلە. پیرەمێرد هەر لە تەنیشت خۆیەوە باوەشی بە شاهۆ و شەپۆلدا دەکرد، بۆنی هەردووکیانی دەکرد. پیرێژن زوو، زوو ئەدی بۆ دەیان گوت شاسوار شەهید بووە. دیاربوو لەکاتی سەر لە لێواری دەرگا دان سەری شکابوو، خوێن بەبەر گەردنیدا شۆڕبووەوە، ئاگای لە خۆی نەبوو جار جار بە خاولیەك خوێنی بەر گەردنی دەسڕی. دوو خوشکی لەخەو هەستان، کە ناوی شاسوار هات خۆیان بە شاهۆ و شەپۆلدا دا.. دەستیان کرد بە گریانێ، خوشکێکی دیاربوو لەخۆی بچوکتربوو، ڕۆیشت چوو دوو منداڵی هەراشی هێنان. ژنی شەپۆل هاتە ژوورێ، یەکەم جار شەرمی دەکرد، پاشان دەستی لەملی شەپۆل کرد تەواوێك بۆی گریا. دوو منداڵەکە یەکیان نۆساڵ و ئەوی دیکەیان حەوت ساڵ دەبوو، لەگەڵ دیتنی دوو ڕیشداری تەڕی چڵکن سڵەمینەوە. زووزوو دایکیان پێیانی دەگوت، ئەوە بابەیە. ئەدی

هەموو ڕۆژێ ناڵێن بابە لە کوێیە؟ کوڕەکە گەورەتربوو دەستی لەملی شەپۆل کرد، بابە ئەتۆ لەکوێ بووی؟ کارزان گیان ئەمن لە شارێکی دیکە بووم. پاشان کچەکە زانی براکەی لە باوەشیەتی هات، زیڕەیەکی لێدا. هەستە بابی خۆمە. شەپۆل زۆر بە گەرمی کەوتە ماچکردنی کچەکەی. کارێز چەند گەورەبووە. جا کوڕم زیاتر لە شەش ساڵە نەتدیتوون. شاهۆ هەستا، پیرەمێرد لەگەڵی هەستا ها کوڕم خێرە بۆ کوێ؟ مامە دەڕۆم برادەرانی دیکەمان لەبەرباران لەناو کەلاوە بەجێ هێشتوون. دەبڕۆ کوڕم بیانهێنە یان ئەمن بچم بە دوایاندا. شاهۆ ئاوڕێکی بە لای شەپۆل دایەوە! نازانم شەپۆل بڕۆین یان بانگیان بکەم؟ لە ئێوارەوە لەبەر باراندا. هەموو لەشیان شەلاڵی ئاویشە.. مامی پیر هەستا سۆبەی گڕدا، بڕۆ کوڕم، بانگیان بکە! شاهۆ هەر بەکەلێنەکەیدا ڕۆیشت. پاش چەند خولەکێك. بە خۆی و بە هەشت پێشمەرگەی دیکە گەڕایەوە. تەڕوبڕ ئاویان لێدەچۆڕایەوە. هاتنە ژوور. نەقیب لە پێشی هەموویان بوو، ڕیشی بستێکدەبوو. بەژن و بالاشی زۆر کورت بوو. لەگەڵ منداڵەکان نەقیبیان دیت. زیڕەیان کرد هەلاتنە پشت نەنکیان. شەپۆل ڕووی لە نەقیب کرد، شەولەبان بەخێر بێی. هەموو دایانە قاقای پێکەنین. پیرەمێرد جگەرەی دایە هەموویان. باشە واماندەزانی بەس شاسواری کوڕم پێشمەرگەیە، ئەوەتا دە پێشمەرگە بەس لەناو ماڵەکەی مندان. ئەوەتا نەقیبتان تێدایە. سوپایەکن بۆخۆتان.. نەقیب ڕووی لە پیرەمێرد کرد، وایە مام حاجی ڕاست دەفەرمووی، ڕووی لە شەپۆل کرد (کش سوارم) مامە گیان ئەو کێو بەندەنە جێگا نییە لەبەر پێشمەرگە، شەپۆل بە پێکەنینەوە ئەدی نەقیب کش سوارم چییە؟ ئەتۆ بەمن ناڵێی شەولەبان ؟با، مامم نەیگوت، شاسوار، وایە. ئەتۆ شاسواری ئەمن شا یەکەی لێدەکەمەوە مایەوە سوار، ئەمنیش دەڵێم کش سوارم. ئەها ئەتۆ دامەودامەو شەترنجت تێکەلاو کردووە. ئەتۆش شەپۆل و شاسوار و شەولەبانت تێکەلاو کردووە. پیرەمێرد هەستاو لەحەوشەی بوو بە ئێشکگر. لەهەموو لایەکەوە پەنجەی دەست و پێی شەپۆل بەبەر نەدەکەوت. دایکی پێیەکی ژنەکەی پێیەکەی دیکەی دەشێلا. خێرا خێرا لەبەر نەقیبی دەپاڕانەوە، تخوا کاك نەقیب، ئاگاتان لە شاسواری بێت، لەداری دنیایە ئەو کوڕەم هەیە. بەخوای سەبووریم بەو منداڵ و ژنەی دێت. شتێکی لێ بێت ئەمن و بابی و ئەو منداڵ و خوشکانەی دەمرین، لەپاش وی ناژین. خەمت نەبێت پورێ گیان گەورە و تەمامە دەبێ ئەو ئاگای لێمان بێت. ئا بەقوربانە هەموو ئاگاتان

لەیەکتری بێت! شاهۆ هەستی کرد مامەپیرە لە حەوشەیە. بە درێژای حەوشە کون و قوژبن دەگەڕێت. هات بەلایەوە. مامە خێرە هیچ هەیە؟ نا کوڕم. خشەخشێك لە کۆلانێ هات چووم بزانم چی بوو. ڕەشەبا بوو نایلۆنی دەفڕاند. شاهۆ مامەی ناردەوە ژوورێ. بۆخۆی چوو ماوەیەك لە کۆلان گەڕاو چاوی گێڕا هیچ نەبوو، گەڕایەوە. کاتێك هاتەوە ژوورێ دانیشت. پیرەمێرد ریزێك جگەرەی دیکەی گێڕا. نەقیب، نا قووربانی دەستت مامە. شەپۆل ڕووی لە بابی کرد، بابە ئەوە پوشیش دەکێشێت، نەقیب ئاوڕێکی بەلای شەپۆلدا دایەوە، وا دیارە بۆ خۆت کەمت پوشو پەلاش کێشاوە. مامەی پیرە تاوێك پێکەنی. هەموو بێدەنگ بوون. مامە پیرە ڕووی لە هەموو پێشمەرگەکان کرد. کوڕەکانم گوێ بگرن. شەپۆل بە تایبەتی ئەتۆ باش گوێت لە بابی خۆت بێت. لە مەنزوری من تێبگە. ڕاستە شۆڕش تووشی شکست هاتووە. ئەوە ڕۆژە، هەر ڕۆژەی بە جۆرێکە. جار هەبووە شۆڕش خاوەنی سەد و پەنجا هەزار پێشمەرگە بووە. جاریش هەبووە ژمارەیان زۆر کەم بووە. ئەتۆ ئەو دانیشتنەی ئەو شەو دڵت نەرم نەکات. لەهەردووك چاوی خۆم خۆشتر دەوێی. هەر دیتنێکی تۆ چەند ساڵ تەمەنمان درێژ دەکاتەوە، بەو هەناسەی دەژین، لەو شاخ و کێوانە لەلای ئێوەوە دێن. ڕاستە ژیانتان کوڵە مەرگییە، بەڵام( سواربوون عەیبێکە و دابەزین سەد عەیب) چۆن بەئارەزووی خۆت ڕۆیشتوی ئاواش بەئارەزوی خۆت وەرەوە. بەڵام بەسەربەرزی بە پیاوانە. لەو ڕۆژە ڕەشەی ئێمە و کوردی تێکەوتوین. پشت لە هاوڕێیەکانت نەکەی، خەمی ژن و منداڵت نەبێت، خوا نانێکی هەر دەدات پێی بژین. ئەگەر دەتان دیتن هەر وا چەند ڕۆژ لەمەوپێش، جەمەدانەکەی بە چاویەوە گرت، ماوەیەك هەر گریا و خۆی ڕادەژاند. زریکەی ژن و منداڵ دەچوونە بەری ئاسمانێ. لەگەڵ گریانی مامە پیرە، هەر هەموویان دەستیان کرد بە گریان. شاهۆ بەزۆر خۆی گرتبوو. شەپۆل ڕووی لە بابی کرد، بابە کەسوکاری هاوڕێ شاهۆش لەگەڵ ڕاگوێزراوەکانە. شاهۆ بە هەناسەیەکی درێژەوە، کەسوکاری من، یەکەم جاریان نییە ڕادەگوازرێن. هەموو دە پانزە ساڵێكماڵیان کاول دەکەن و ڕاویان دەنێن. پاشان کەسوکاری من زۆربەی لە بۆردوومانی حەفتا و چوار تێداچوون. مامە پیرە هەندێك بێدەنگ بوو، دووبارە دەستی پێ کردەوە، لەزەمانی حەرەس قەومی ژن و منداڵم بەجێ هێشت وەکوو ئێوە چوومە شاخێ، بە شداری شۆڕشی ئەیلوولم کرد، لە شەڕی هەندرێن

برینداربووم ئەوکاتی وەکوو ئێستا نەبوو، چەکی وا باشمان نەبوون، کۆنە تفەنگی ژەنگاوی. هەرچەندی هەواڵیان بۆناردم، ژن و منداڵت لە برسان دەمرن، دەمگوت ژن و منداڵی من لەو هەموو ملیۆن کوردە بێچارەیە زیاتر نین، نەگەڕامەوە هەتا بەیانی یازدەی ئازار بەسەر بەرزی هاتینەوە، ئەوکاتی شتێکمان بە شتێك کرد، بۆ ئەوسەردەمی زۆر بوو، لە هەموو دنیا دەنگی دایەوە، کورد زۆر باش بوژایەوە، بەڵام مخابن، ڕژێم لە بڕیارەکانی خۆی پەشیمان بووەوە، بە هەموو جۆرێك بوو بە خاك و خۆڵی ژێر پێی شای ئێران، هەرچەندە فارسیان بە دوژنی سەرسەختی خۆیان دەزانی. ڕێکەوتننامەی جەزائیران دروست کرد، دەبێ ئێوەش بەسەر بەرزی بێنەوە.. نەك پێشمەرگە هەتا منداڵەکانی شەپۆل هەرهەموویان تەواو گوێ قوڵا بووبوون. پیرەمێرد، دەیجا ئەمن هیچم نەماوە، یاخوا سەرکەون. شاهۆ ڕووی لە شەپۆل کرد. شەپۆل گیان ناتوانین زیاتر لێرە بین. ژوورێکی دیکەتان هەیە؟ چەند دەنگێك وەڵامیان دایەوە دوو ژووری دیکەمان هەیە. دایکی ڕووی لە شاهۆ کرد! ناکرێ چەند شەوێك لێرە بن؟ نا دایە دنیا کاول بووە، هەر ئەو شەو دەبێ بڕۆینەوە بۆ شاخ. ئەوان چوونە ئەودیوی، پێشمەرگەکان کەوتنە خۆگەرمکردنەوە و جل وشك کردنەوە. شاهۆ چەند جارێك دەچۆ دەرەوە، دڵی ئاوی نەدەخواردەوە، لە خۆڕایی پێشهاتی شتێکی ترسناکی دەکرد. لەوەتەی کراوە بە بەرپرسی سەربازی، هەموو داڵغە و غایلەی لەسەر ئەوەیە ئاگاداری هاوڕێیەکانی بێت، لەهەموو شوێنێك یەکەم کەس سینگی خۆی قەڵغانی هاوڕێیەکانی بوو. کەمتر لە چارەگێك هەموویان هاتنەوە. شەپۆل: گوتی ئامادەم بڕۆین. دەستیان دایە چەکەکانیان و چەند پرێسکە نان و جلیان دانابوو لەگەڵ خۆیان هێنایان، ماوەیەك یەکتریان لەباوەش کرد. دایك و بابی شەپۆل بەدەم گریانەوە شەپۆل و پێشمەرگەکانیان لە باوەش دەگرت. دایك و بابی شاهۆ چەند ئایەتول کورسیەکیان لەدوا خوێندن.

بۆشەوی دواتر، لە جێگای ژوان بە بێ ئۆقرەییەوە پێشمەرگەکان لەپشت دەوەنەکان، لەبەر دەم دارچنارە گەورەکە کە هێشتا بە پێوەمابوو، شاهۆ و پێشمەرگەکان زۆر بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕوانی هاتنی مووکە شەل و دوو جاشەکەی دیکەیان دەکرد. شاهۆ و شەپۆل هەر پشویان دەخواردنەوە. دەستی بە باڵی هەورەوە بێت، ئەوشەو فتی دەکەین! زۆری نەماوە. ئەوشەوە باران نەبوو. حەپین و قروسکەقروسکی سەگ و ڤڕەڤڕی لۆری و زیلی سەربازی پڕ لە

خەڵك، هەر چەندە چادریان بەسەرەوە بوون، نەپسایەوە. لە کون و کەلێنی چادرەکان دەستی خەڵك بوو دەهاتەدەورە، گریانی ژن و زیرەی منداڵ گوێی پیاویان کەڕ دەکرد. چەند شەو درەنگتر دەبوو کاروانی زیل و ماشێنە زەبەلاحەکان زیادی دەکرد. خوا دەزانێت، ئەو خەڵکە داماوە هی چی ناوچەیەکن ڕادەگوازرێن. زۆر بە خێرایی بە ناو شاردا تێدەپەڕین. لەگەڵ ئەو تیژ ڕەویە لە تاسە و چاڵ و چۆڵیان دەدا، تەواوێك لە زەوی بەرز دەبوونەوە. هاوارهاوار و زیرەزیر زیادی دەکرد. شاهۆ بەبێ نارامییەکەوە تەماشایەکی کاتژمێرەکەی دەستی کرد، نەك دوازدە بەڵکو لە دوو لای دابوو. بێ هیوابوو. برادەرەکی ناو شاریان هات، چووە لایان. نەهاتن؟ بەلەپی دەستی لەناو چەوانی خۆیدا، لەبیرم چووبوو ئەمڕۆ پێنج شەممە لەسەر هەینییە، نایەن. هەر باش بوو لەگەڵ ئەو کاروانەگەورە تووشی شەڕ نەبوون. بە پێشیان کەوت لەپشتی قوتابخانەکەوە بزربوون. شاهۆ زۆر دەترسا لە ناوچەوانی ئەو مووکەشەلە سەگبابەی تووشی بەڵایەك ببن. ئەو ڕۆژەی هەتا ئێوارە بیری کردەوە، باشە ئەگەر هاتوو ئاشکرابوون. بەرەو کوێ بچن؟ کۆسرەت بەو هەموو هێز و سوپایەوە، بست بەبستی گیراوە. چاریشیان نییە هەر دەبێ بەرەو ئەوێ بچن. ڕووی لە برادەرەکانی کرد، چی بکەین باشە، بمێنینەوە بڕۆین. هەموویان، بۆخۆت دەزانی، ناڵێین ئەو جاشکە کەرە چوار هاوڕێی بەگرتن داوە! سێ هاوڕێشی بە شەهیدکردن داوە؟ با. ئەی کەوایە بۆ ئەی تۆپێنین. وایە بەڵام زۆر زەحمەتە، یەکەم شەو لەبەر دەستمان بوون، کەرێك و جاشکێك، سێکەریان ڕزگار کرد، دووەم دەتوانین ئەو کارە بۆ برادەرانی ناوشار بەجێ بهێڵین؟ بەڵام بۆ وانیش زۆر ئاستەمە. نەقیب ڕووی لە شاهۆ کرد، باشە هاوڕێ شاهۆ لێرە چ بەڵامانە. خاوەن ماڵ داوای کردووە بڕۆین؟ مەسەلەن لەخۆی دەترسێت! برادەران ئەو ماڵە خاوەنی نییە، دەتوانین ساڵێك لێرە بمێنینەوە، بەڵام لەو هاتن و چوونە دەترسم ئاشکرا ببین. ئاشکرابووین هەتا دوا فیشەك شەڕدەکەین لەوانەی شەهیدبوون زیاتر نین. وایە، بەڵام کەسوکاری شەپۆلتان نەدیت. گیانیان لەبن پێی شەپۆل دابوو، هاوڕێ ئەگەر ئەتۆ گوێ بدەیە سۆز و هەستی منداڵ و ژن نابێ لە پێستی خۆت بجووڵێیەوە. شەپۆل بە دەنگ هات، نازانم کەسوکاری من چیان بوو، ژن و منداڵ لەلای داك و بابم لە هیچیان کەم نییە. ئەمانی منیش لەسەر مەسەلەیەکی وا چارەنووسساز نەك هیچ باکم نییە بەڵکو زۆر بە

پەرۆشەوە چاوەڕوانی دەکەم. ئەو ڕۆژە هەتا شەو پێشمەرگەکان لە گفتوگۆی گەرمدا بوون. لەنیوە شەودا دووبارە لەپشی قوتابخانەکەوە لەبن پەرژین و دەوەنەکان سێ پێشمەرگە خۆیان شاردەوە و لە کەلێنی بەرامبەریان ناو فولکەکش دوو پێشمەرگەی بەبەر کەوت. هەر دە پێشمەرگەکە پەنجە لەسەر پەلاپیتکەی چەکەکانیان چاوەڕوان بوون. لە نیوە شەودا (جیبێکی ڕەساسی) بەدیار کەوت و بەناو فولکەکە سووڕێکی خێرای خوارد. هاتە بەردەمی دەوەنەکان، ڕاوەستا. ماوەیەك لەناو جێبەکەدا بوون پاشان یەکەم جار مووکەشەل دابەزی بە قەمسەڵەی سەربازیەوە. بە شوفێرەکەی گوت، سبەی ئێوارە لەوێ وەرە دوومان! شوفێر هاواری کرد، لەکوێ بێمە دووتان؟ کوڕە لە چاڵی چا. وشەکەی تەواو نەکرد. شاهۆ وەکوو هەڵۆ بە یەك بازدان گەیشتە بەردەمی چەکی لەسەر سەری دانا. شەپۆل دەموچاوی بەسترابوو خۆی فڕیدایە ناو جێبەکە و چەکی لەسەر سەری شوفێرەکە دانا، نەجوڵێن! شوفێرەکەش دەستی بەرز کرد. چەکەکانیان لێکردنەوە و دەست و دەم و لووت و پێیەکانیان بەستنەوە. شاهۆ جێبەکەی لێخووڕی بۆ تاریکایی پشتی قوتابخانەکە. دوو پێشمەرگەی بەدیارەوە دانان ماوەیەك چاوەڕوانی هاتنی دوو ماشێنە پڕ جاش و سەربازەکەیان کرد. دەبێ تۆڵەی ئەو هەموو میزەیان لێبکەینەوە. سێ سەرباز بە پەلە خۆیان فڕێدا خوارێ لەپێشەوە شاهۆ و شەپۆل، لەولاو ئەولا دوو پێشمەرگە لە فولکەشەوە دوو پێشمەرگە، ئەوەندە نزیك بوون، لەگەڵ دەستڕێژ قاوانەکانی فیشەکەکانیان بە ئیڤایەکە دەکەوتن و هەڵ دەبەزینەوە. چەند ڕومانەیەکیان فڕێدا ناویان، لەگەڵ ڕشاندن جار هەبوو. خوێن و پارچە گۆشت بەولاو ئەولایدا دەفڕین. تاکە کەسێکیان نەك فریای تەقەکردن نەکوتن. ئیڤا و زیل خوێناویان لێدە چۆڕایەوە. پاش کەمێك جۆگەلەی خوێناو بە جادەیدا دەهاتە خوارێ. هەر کە زانیان و لەوەی دڵنیابوون کەسیان هەناسەیان تێدا نەماوە، بەپەلە سواری جێبەکەبوون. لەتاریکاییدا لەشار دەرچوون و لەبەرچاوان بزربوون.

# بۆسە

جێبە ڕەساسییەکە، بەتەواوی سەرنشینەکانیەوە، لەگەڵ تەپوتۆزێکی زۆر گەیشتە بەرزایی. لەو شوێنەی زۆر هەڵدێر و بەرز بوو، کاتێك پێشمەرگەکان سەیری خوارەوەیان دەکرد تووشی سەرسووڕمان و سەر گێژبوون دەبوون، پڕ بە دڵ حەزیان دەکرد هەرچی زووە دابەزن و بەپێ بڕۆن. ئەو چەند ساڵەی تەمەنیان زیاتر پیادەبوون. بەتایبەتی لەو دۆڵە بەرفراوانەی بە دار و گاشەبەرد و چەند کانیاوێکی گەورە بە لێشاو لە شێوەی تاڤگە... لە هەموو لایەکەوە سەربەرەو خوار بەخێرایی ڕەشەبا تیژ بەرەو خواردەبوونەوە، شەپۆلە سەر شێتە باڵا بەرزەکان، لە تاوێر و تاشە بەردە لووس و سپی سادەکانی دەدا و دەبوون بە کەف، کەفاوێکی سپی سپی. لەناو کەفاوەکە، نەورەس و کاسەڵە شینکە و مریشکاویلکە و زۆر لە جۆرە باڵدارە سەر و باڵە نەخشینەکانیان بەکەفاو تەڕدەکرد. لەخوارەوەش لەدەریاچەوە بەرەو تاڤگە بەرزەکان.. ماسیەپانکە و مارماسی، چەندان جۆری ماسی سینگ سپی بەرەو ڕووی ڕێژەنی تاڤگەکە هەڵدەستانەوە و ماوەیەك ناوقەد و سەریان بادەداو چێژیان لە کەفاوەکە وەردەگرت. کەفاوی شەپۆلی دەریاچە لەگەڵ تاڤگە لە نیوەی هەوراز بەیەك دەگەیشن، دووبارە بەسەر تیکە شاخ و گابەردەکاندا دەکەوتن. پێشمەرگەکان زۆر بە تامەزرۆییەوە تەماشای ئەو دیمەنە دڵڕفێنەیان دەکرد. حەزیان دەکرد ئەوانیش وەکوو گیانلەبەرەکانی دیکە بەو کەفاوە و بەو ناوە ڕوونە خۆیان بشۆن و بەئارەزووی خۆیان مەلە بکەن. بەڵام لەگەڵ ئەو دیمەنە سەرنجڕاکێشە! کەمێك لەولاتر، لەدەوروبەر و بەرامبەریان، دیمەنێکی دیکە بەشی ئەوان بوو. قرچەقرچی درك و چقڵەشینەکە زۆریان زەردبوون و لەگەڵ پووش و پەڵاشی سووتاو، بنار و هەتا سەری چیای گرگرتو پێوە دەڕوات.

وا پێدەچێت مۆڵگە و سەربازگەکانیش زۆر کەم بوونەتەوە. یان لەناو چڕە دووکەڵ و ئاگربزربوون. شاهۆ دەستی چوارجاشە دیلە چاوبەستراوەکەی گرت و چاوی کردنەوە. دیاربوو ماوەیەك چاویان بەسترابوو، زۆر زەحمەت دەیان بینی. هەتا چاویان بە خۆرەتاوەکە ڕاهات چەند خوولەکێکی ویست. لەلایەك دیلەکانیان

بە دەستبەستراوی بەرامبەر جێبە قوڕاوییە ڕەساسییەکە، کە زۆر نوێ دیاربوو ڕاگرت. لەبەرامبەریانەوە نەقیب زۆر بەتووڕەیی میلی کلاشینکۆفەکەی هێنایەوە. پەنجەی لەسەردانا لە ئامادەباشیدا بوو. چەند جارێك بە ویقارێکەوە سەیری جاشە دیلەکانی کرد. لوولەکەی تێیان کرد. شاهۆ زۆر بە شڵەژاویەوە هات بۆلای نەقیب، ها هاوڕێ خێرە؟ نەقیب مژێکی قووڵی لە جگەرەکەی دەستیدا، پەنجەی شایەتمانی بۆ لای دیلەکان ڕاداشت.. ڕۆژیان تەواو بووە! جارێکی دیکە نان و دۆی باوکی خۆیان ناخۆنەوە. ناپاکی و سەگبابی لەکەس ناتوانن بکەنەوە. پێشمەرگەکانیش، هەر یەك لەبەر خۆیەوە میلیان هێنایەوە. بەبێ ئەوەی بزانن مەسەلە چییە. دیلەکان هەریەکە خۆی لە پشتی ئەوەی دیکە دەشاردەوە. سەریان بەولا و ئەولادا دەسووڕاند، کە دەنگی لێوە دەهات. نەقیب هەندێك لێیان چۆپێشێ.. دوا قسەتان بڵێن هەرچەندە هی ئەوە نین، کەس بەزەیی پێتاندا بێتەوە.. بۆ پارە دایکی خۆیان دەفرۆشن. شاهۆ بەپەلە هات خۆی دایە لای دیلەکان. بانگی کرد هاوڕێیان لەسەرمخۆ، نەقیب چی بووە؟ چی چیبووە! بەتەمای چیت؟ سەگ تۆپیان دەکەم، ئەگەر حەز دەکەی ئەتۆش وەرە ڕیزەوە بۆ تەقەکردن. ببینە چەند بەختیان گەورەیە، هەتا لەمردنیشدا. لەو شوێنە ڕۆمانسیە بەنسیبیان بووە. شاهۆچەکەکەی نەقیبی هێنا خوارەوە.. هەر چواردەورمان سەربازگەیە. لەناو دەچین.. ئەتۆ دەزانی ئێرە کوێیە؟ ئەو قووتەی ئەودیو دەبینی سەرێکی بەرەو بەرزای سەروویانەوە بەرزکردەوە، بەشی هەموو کوردستان سەرباز و جاش و چەك و جبەخانەی لێیە! نەقیب تووڕەبوو، ئەدی کەنگێ وەختی دێت؟ شاهۆ وەڵامی نەدایەوە. چوو دەرگای لای شوفێری کردەوە، برێکەکەی ڕاکێشا.. لەسەرێڕا ویستی جێبەکە هەڵدێرێت. دیمەنە دڵڕفێنەکە دوودڵی کرد، بۆچی ئەو دیمەنە جوانە بە سووتانی جێبێك تێك بدات؟ هەستی بە ئازاری ویژدان کرد. چۆ ناو جێبەکە وەئیشی خست، سووڕاندیەوە. پێشمەرگەکان، هەموویان تەماشایەن دەکرد، تووشی سەرسووڕمان بوون! بۆچی سووڕایەوە، کەمێك لەولاتر، لەسەر تەلان و هەڵدێرە بەرزەکە ڕایگرت دابەزی. ئێرە باشترە بۆخۆی سووتاوە، زەرەر لە هیچ نادات! نەقیب هات بەلایەوە، زوو لەبەر چاوم بزری بکەن، ئەفرەتی لێ بێت، لە تایەکانی بەم، چەند ساڵە پێەکانم باشترین ماشێن و تەکسی من بوون، ئەو هەموو ساڵە شاخ و کێ و ئەما نەیکوتمەوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان ناپاکیان لەگەڵ نەکردم. ئەوەندە بە ماشێن ڕۆیشتم هەر هێڵنجم

دەهات و چەند جار ڕشاومەتەوە. چەنگە تفێکی گەورەی لێکرد. شاهۆ بە پێکەنینەوە، نە قیب ئەتۆ فێری وڵاخ و گوێدرێژی، ئەو شتانە بۆ تۆ و ئێمە و مانان دروست نەکراون! مادام وایە، بە خێری خۆت هاوڕێ دەستێکی بگەیەنێ و لەگەڵم با لەدەستی ڕزگارمان بێت. وای بەردەینەوە سەر و شوێنی تێدا چێت، نەقیب دەستەکانی بەرزکردنەوە و بە شاهۆی گوت، باش بوو وەبیرم هاتەوە شتێکت لەبیر چووە! ئا چوار شتت لەبیر چووە، وەکوو گۆشتی بەراز لە موسڵمانان نەك نەخوازراو و حەرامن، بەڵکو خوێنیان گڵاوە، ئەمن هەم وەك نەقیبێکی سەربازی، هەم وەکوو یاسایەکی پارتیزانی دەبێت ئەو جێبە لەگەڵ خاوەنەکانیان بسووتێنم، بیانهێنن ئەو چوار خۆفرۆش و تەرەسە. بانگی پێشمەرگەکانی کرد.. بیانهێنن بۆم! کەس وەڵامی نەدایەوە برا هەرهەموویان کەڕولاڵ بوون. بۆخۆی چوو هەرچواریانی ڕاستکردەوە، تفف بارانی کردن، هەستن کەران باو گاوینە، بەبەلاش ئالیك دەخۆن. بزانە بزانە، گێفەڕەی ملیان چەند ئەستوورە، ئەوەندەی نانی خۆفرۆشی بخۆن. دایك دێڵە سەگینە. بەبەر شەقی دان. جاشەکان لەترسی بۆکس و زللەی نەقیب خۆیان گرمۆڵە کردبوو. شاهۆ هات بەلایەوە، هاوڕێ ئەوانە دیلن نابێ لێیان بدرێت، وازیان لێبێنە. نەقیب ئەوەندەی دیکە دەهری بوو، حەی حەی جا بۆ داوای مافی پەنابەرییەتیان بۆناکەی؟ ئەتۆ نازانی ئەو ماکەرانە چیان کردووە؟ باش باشدەزانم، بەڵام وەختی نییە. شاهۆ نەقیبی لێ دوور خستنەوە. داوای لە شەپۆل کرد ئاگاداریان بێت. نەقیب دوورکەوتەوە و لەسەر بەردێك دەستی لەچەکەکەی دەستی دەدا. شاهۆ بە شەپۆلی گوت.. ئەو شێتە ئاگادار نەبین کەتنێکی گەورە دەکا! شەپۆل غەمت نەبێت. چوو بەلای نە قیبەوە، شاهۆ پاڵێکی بە جێبەکەوە نا، لەبەر ئەوەی زۆر سەرەو لێژ بوو لەگەڵ یەك پاڵی هێواش زۆر بە خێرای بەرەوخوار شۆڕبووەوە. لە چاوتروکاندنێکدا چەند جار تەقڵەی لێدا و وەرگەڕا، دەکەوتە سەر پشت و خۆی بە داروبەرد و گاشەبەرداندا دەدا. تەقەتەق و ڕەقەڕەق جێب لەناوەڕاستی هەوراز بە دارێکی زۆر گەورە گیرسایەوە.. لە ناوەڕاستی دارەکە گیر بوو و ماوەیەك لەنگەری گرت، بەدەم ڕەشەبا و هاژە هاژی تاڤگە ڕادەژا بەر بووەوە. یەکەم جار چوارتایەکانی هەریەکە و بەلایەکدا فڕین، دوای ئاگری تێبەربوو، هەرپارچەی بەلایەکدا کەوت. لە چاو بزربوو. پاش کەمێك لەکەنار بۆ ماوەیەك ئاگری گەورەی لێهەستا. پێشمەرگەکان بە نێوان دوو دۆڵی تەڕی لووس بە

بیشەڵاندا بەرەو پێش ڕۆیشتن. دیلەکان لەگەڵ ئەوەی دەستیان بەسترابوو، بەیەکەوەش بەسترابوون. شاهۆ لە ڕێگا چەند جار بە مەتارە ئاوەکەی هەریەك چەند قوومێك ئاوی بەدەمیانەوە دەکرد، ئارەقی دەموچاوویانی دەسڕییەوە. نەقیب زۆر تووڕەبوو. مژی زۆر بە توندی لە جگەرەکەی دەستی دەدا و لەبەر خۆیەوە هەر جوێنی دەدا و چەنگە تفی دەهاویشت، ئێرە بەردەرگای هیلالی سوور و نەتەوە یەکگرتوەکانە، جا بۆ ناچی پاك پاك بیان شۆی. جاشی خوێری سەگ و سەگباب. هەمووتان گوێتان لێ بوو لەژێر دارچنارەکان چیان دەگوت. کوا، هاوڕێ وەرە ئەولای، قۆنداخی لێیان بەرزکردەوە. خوێڕی خۆفرۆشینە ڕیزیان بکەن باگوللەبارانیان بکەم. شاهۆ دەستی گرت، هاوڕێ ڕاوەستە ئەوە چی دەکەی نابێت؟ چی نابێت! لێم گەڕێ پارچە پارچەیان بکەم، ئەو خوێڕیانە بۆ بژین. هاوڕێ ئەوانە دیلن.. بێدەسەڵاتن.. دەبێ ئاگامان لێیان بێت. لەسەرکردایەتی چارەنوسیان دیار دەبێت. هەقی ئێمە نییە هیچیان لێ بکەین. دادگای شۆڕش هەیە لێپرسینەوە و بەدواداچوون هەیە. نەقیب نەڕاندی، شیرەیەکی درێژی کرد، سەرکردایەتی چی؟ کاول خانەیەکە. نەقیب زۆر تووڕە بوو، دەماری دەموچاو و ناوچەوانی دەلەرزین. سەرکردایەتی دووبارە ترحێو لەبیرکە. زۆربەی پێشمەرگەکان پێکەنین.. هاوڕێ ئەتۆ منداڵ هەڵناخەڵەتێنی. بە زمانی لووسی دپلۆماسی و کۆلکە سیاسی لە خشتەم ببەی، ئەو قسە پڕوپووچانە بۆ هەرزەکارێکی تازە فێری دارەداری سیاسەت و ئەلفوبێی درۆ بکرێت، کوا پەنجە بخە ناو دەمم بزانە ددانم هاتوون، کاتی خۆی ملازم موحسینی گۆڕ بەگۆڕ، هەموو کەس ناوی ئەو جەلادەی بیستووە، پێویست ناکات پێتان بناسێنم، هەروا بەبیرت دێنمەوە، خۆ لەوانەشە نەیناسی ئەوکاتی بستەمنداڵێک بووبی، بەڵام ئەمن هەموو تاوانەکانی لەمێشکم ماون، وادەزانم ئەوڕۆیە و وەکوو ئەو چوار خوێنڕێژە لەبەر دەستم بن، سلێمانی خەڵتانی خوێنکرد. حەوت پێشمەرگە پاش چوار مانگ چوونە سلێمانی و هاتنەوە. چەند جارکەوتینە بۆسەوە. هەتا توانیمان شەوێک دوو لە پاسەوانەکانی بگرین. لەو جۆرە کەسانەبوون نەک گیانی خۆیان، هەرچی هەیان بوو فیدای ئەوییان دەکرد، لە گشت تاوانەکانی لەگەڵیدا بوون، بۆ گرتنیان خوێنی خۆمان کردە کاسەوە، ڕووحی خۆمان لەسەر بەری دەستمان دانا هەتا وەگیرمان هێنان، هەر ئەوەندەیان زەحمەت بوو، هەتا گەیشتنە سەرکردایەتی هەریەک بە بیست و پێنج

کلاشینکۆف بە هەموو تاوانەکانیان بەریاندان. دانیان بە تاوانی وا دانا، ئێمە هەر بیریشمان بۆی نەدەچوو، ئەوانە زۆر سەیرن نەخوێن بە چەک دەگۆڕدرێتەوە، نەچەکیش بە خوێن، چەند پارچە ناسنێکی ژەنگاوی قەرمبووی ئەو دایک و باوکانە ناکاتەوە چاویان سپی دەبێت هەتا کوڕێک گەورە دەکەن، بەدەستی چەند جانەوەرێکی وەکوو ئەوانە دەکوژرێت، پاشان بە چەند پارچە چەکێکی ژەنگاوی مەسرەت دەکەن.. وەکوو ئەوەی خوێنی پێشمەرگە ناو بێت. پاشان بۆ خۆت نالێی سێ پێشمەرگەیان شەهیدکردووە؟ چوار کەسیان بەگرتن داوە! پێشمەرگەی ناو شاریان سەربڕیوە. دیلەکان خۆیان لە نەقیب دەپاراست. مووکە پێی خلیسکا، ساتمەیەکی برد. پێش ئەوەی بەر بێتەوە نەقیب پێلاقەیەکی بە ناو شانی دادا. مووکە بەر بووەوە. سییانەکەی دیکە بەسەریدا کەوتن. نە قیب کەوتە سەریان بە شەق و پێلاقە. شاهۆ هات دەستی گرت. تکا دەکەم واز بێنە، لێیان مەدە. ئەمن زۆر لە تۆ زیاتر داغدارم، بەڵام هەر شتە و بەوەختی خۆی! بەئەوانە دەتوانین کاك فەرەج و کەسوکاریان و زۆر کەسی دیکەش پێیان بەردەین. جارێ وەختی نییە، هاوڕێ گیان! وەختی خۆی چی؟ یان جەنابیشت لێمان بووی بە بەرپرس و شتی گەورە؟ شاهۆ وەڵامی نەدایەوە، زانی زۆر تووڕەبووە. نەقیب لەسەر بەردێك دانیشت ئارەقی دەموچاوی سڕییەوە. جگەرەیەکی دیکەی دەرهێنا. پێشمەرگەکان کەمێك دوور کەتبوونەوە، ئەو چوار پێشمەرگەیەی لەمەوپێش لەگەڵ نە قیب بوون، گەڕانەوە و لەبەرامبەر و دەوروپشتی دانیشتن. هەریەکە و خۆی سەرگەرمی شتێك کرد.. شاهۆ هاتە لای شەپۆل. دیار بوو دەیەویست داوای شتێکی لێبکات. شەپۆل گیان بگەڕێوە قسەی لەگەڵ بکە، بزانە ساردی ناکەیەوە. شەپۆلیش تووڕەبوو، هەقی خۆیەتی، ئەوانەمان بۆ چین! جارێك کردمانە خاتری نا فەقێ خدری گۆڕبەگۆڕ. دوو ناپاکی گەورەتریان لەگەڵ کردین. باشە شاهۆ بە جۆرێکی دیکە بێنە بەرچاوت، ئەگەر هاتباو ئێمە دیلی بن دەستی ئەو خوێنمژ و خۆفرۆشانە باین چییان پێمان دەکرد؟ پێستیان دەگرووین. چاوە شینە گەورەکانی پڕ ئاو بووبوون.. شاهۆ زۆر لێی پاڕایەوە. دەزانم هەقی خۆتانە، بەڵام ئیشمان پێیانە. چەند جار شەپۆلی ماچ کرد.. ئەتۆش شەپۆل یارمەتیم بدە، بەس ئەوجارەی لەگەڵم بە. دەبڕۆ نەقیب لەگەڵ خۆت بێنە.. . شەپۆل گەڕایەوە بۆلای نەقیب. هەر لەسەر بەردەکەی هەڵترووشکابوو. داڵغەیەکی قووڵی لێدابوو. شەپۆل لێی نزیك بووەوە. نەقیب

جگەرەت پێیە؟ نەقیب بەبێ ئەوەی سەری بەرز بکاتەوە پاکەتەکەی بۆ ڕاگرت! شەپۆل لەدەستی وەرگرت. جگەرەیەکی دەرهێنا و دایەوە دەستی. هەڵسە هاوڕێ بابڕۆین! بۆ کوێ؟ نازانم بەڵام دەبێ بڕۆین. نەقیب وەکوو مندان حرووی گرتبوو، هەتا ئەو چوار سەگبابەم نەدەنە دەست ناڕۆم. پاشان شاهۆ فەندی خوی بەچی دەزانیت؟ ئەگەر دەمزانی وای لێبەسەردێت.. لەو شاخ و کێوانە دەبوو چەند ساڵێك لە دووم بگەڕێت. تازە چوو ناگەڕێتەوە. نەقیب گیان.. ئێستا تەماشاکە، دوو چالاکی گەورەمان بەیەکەوە کردووە، ئەو شەڕەی چیای کۆسرەت دەنگێکی باشی دایەوە، ئێستاش ئەوەی دوێنێ شەو سەدای باشتریشی دەبێت. بۆ دۆست و دوژمن سەلماندمان پێشمەرگە نەك ماوە بەڵکو لەجاران بەهێزترە، چەند دەسکەوتی گەورەمان هەبووە، بەبێ زەرەروزیان، کەس پەنجەیەکی بە خوێندا نەهاتووە. شاهۆ ڕاست دەکات، دەبێ هەموو شتێکیان پێ ئاشکرا بکەین. هەر لەبەر دەستی خۆمانن. هەستە بابڕۆین برادەران چاوەڕوانن. نەقیب دەمارگیرتر بوو، ئەگەر بێت و ئەو ناپاکانەش گوللە باران بکەین سەدای باشتریشی دەبێت.. بۆ خۆفرۆشەکانی دیکەش دەبنە دەرسێکی باش. لەبەر دڵی ئێوە باشە با دەست پێبکەین بە پرسیارکردن. ئەگەر دانیان بە هەموو شتێك دانا، شەلەکەیان ناوی چییە؟مووکە! مووکەی بدەنە دەست من بۆ خۆم دەزانم چی لێدەکەم. شەپۆل ڕۆیشت، شاهۆ هات ها شەپۆل چی بوو؟. زۆر تووڕەیە قسەی لەگەڵ ناکرێت! زۆری لەگەڵ بڵێی لە ناوچاوانی چەند جاشی خوێڕی شەڕی براکوژی ڕوودەدات. بڕۆ بۆخۆت قسەی لەگەڵ بکە، لەگەڵمان نایەت. ناشکرێت بەبێ ئەوان بڕۆین، چوار دیلی پیاوکوژ لەگەڵ پێنج پێشمەرگە، زیاتر لە چوار ڕۆژ ڕێگا، ئەگەر تووشی هیچ شەڕیش نەبین. شاهۆ لەبیران ڕاچوو، قسەکانی شەپۆل ڕاستن.. تووڕەیی نەقیبیش لە جێگای خۆی دایە. ئەدی چارە؟ ماوەیەکی پێچوو لەگەڵ دیل و پێشمەرگەکان هاتەوە. شاهۆ و هاوڕێیەکانی هاتن. لە چواردەوریان دەنیشتن. چوار دیلەکە لە نزیك شەپۆل بوون. شاهۆ هاتە لای نەقیب.. هاوڕێ نەقیب! ئەو دیلانە هەر ئەوەندە هەقی ئێمەیە هەتا دەیان گەیەنینە سەرکردایەتی.. دڵنیام بەو هەموو تاوانەی کردوویانە بانگی دوو کەسی وەکوو من و تۆ دەکەن بۆ گوللەباران کردنیان، بەڵام لەوانەیە زۆر تاوانی دیکەیان کردبێت کەس لێی ئاگادار نەبێت. لەکاتی لێ پرسین و لێپێچینەوە، وەك بولبول دێنە زمان. جیاوازی ئێرە و ئەوێ چییە بۆ بە سزا گەیاندنیان؟ نەقیب زۆر تووڕە

بوو، دەماری دەموچاو و ناوچەوانی دەلەرزین. سەرکردایەتی تڕحێو. زۆربەی پێشمەرگەکان پێکەنین.. هاوڕێ ئەتۆ منداڵ هەڵناخەڵەتێنی، کاتی خۆی ملازم مەحسینی گۆڕبەگۆڕ.. سلێمانی خەڵتانی خوێنکرد. حەوت پێشمەرگە پاش چوار مانگ چوونە سلێمانی و هاتنەوە. چەند جارکەوتینە بۆسەوە. هەتا توانیمان شەوێك دوو لە پاسەوانەکانی بگرین. خوێنی خۆمان کردە کاسەوە، هەر ئەوەندەیان زەحمەت بوو هەتا گەیشتنە سەرکردایەتی هەریەك بە بیست و پێنج کلاشینکۆف بە هەموو تاوانەکانیان بەریاندان. دانیان بە تاوانی وا دانا، ئێمە هەر بیریشمان بۆی نەدەچوو، کوا پەنجە بخە ناو دەمم بزانە ددانم هاتوون، ئەوانە زۆر سەیرن نەخوێن بە چەك دەگۆڕدرێتەوە، نەچەکیش بە خوێن، دایکوباوك چاویان سپی دەبێت هەتا کوڕێك گەورە دەکەن، بەدەستی چەند جانەوەرێکی وەکوو ئەوانە بە دڕندانەترین شێوە لە ناودەبرێن، پاشان بە چەند پارچە چەکێکی ژەنگاوی مەسرەت دەکەن.. بۆ مەش و بۆ ئێوەش بەهای خوێنەکەیان هەر ئەوەندە بوو، وابیرمەکەوە براله، وەکوو ئەو بازرگانانی خوێن مەبە، ڕێچکەی ئەوان بەردەن (شەرحی مار بەدار)دار حەیزەران و دارکنێر، تەڕ و زەبروەشێن، لە کاتی ڕاوەشاندی دوولابێتەوە، بۆ ئەوەی لە کاتی تەمێ کردنیان باش هەست بەئێش و ئازارەکەی بکەن. شاهۆ ویستی نۆرەی خۆی بێت.. گوێبگرە هاوڕێ. نەقیب قسەکەی پێبڕی، ئەتۆ باش گوێبگرە.. لەگەڵت هاتینە شار. کوشتارگەیەکمان کرد خەریك بوو گیانی خۆمانی لەسەر دانێین. هەرچی گوتت وەکوو فەرمانێك هەرچەندە مافی تۆ نەبوو، پۆز بەسەر مندا لێ بدەی بە قەد تەمەنی تۆ خەباتم کردوە، جەور و ستەمم زۆر بینیوە، ناپاکی و ناهەقیم زۆر دیتوە و بیستوە، بەلام نەگەیشتوومەتە ڕادەی ئەو مووکە تەرەس و ناپاك و خۆفرۆشە. ماڵی خۆمە، هەقی کەسی دیکەی بەسەرەوە نییە. زۆر کەم ڕێکەوتی کەسی بەرپرسی وەکوو تۆ ساویلکەم نەبینیوە، دەیدەنە دەستم، ئەگەرنا هەر لێرە لەیەك جیادەبینەوە. ئەوانی دیکە حەز دەکەی بەرەڵاکە، یان ئەتۆ پیاوێکی دیموقراتی چۆن چوونە شارت خستە دەنگدانەوە ئەوەشیان دەدەینە دەنگدانەوە، ئەگەر شەش پێشمەرگە گوتی بۆ سەرکردایەتی، باوابێت، بەلام پێنج پێشمەرگە و نیو بڵێت کوتایی هاتن بە ژیانیان فەوری و سەوری جێبەجێدەکرێت، ئیزڕائیلیان لەپشت بێت لێرە فتیاندەکەم.. شاهۆ لە دڵی خۆیدا ترسا، زانی ئەگەر بکەوێتە دەنگدان، بۆخۆی بە تەنیا دەمێنێتەوە، هەر ئۆیان لەگەڵ کوشتندا دەبن. بۆ وەخت

کوشتن و زیاتر بیر لێکردنەوە. چوو بەلای دیلەکاندا. زۆر ترسابوون خۆیان خزاندبووە بن یەك. ڕووی لە مووکە کرد، دەموچاوێك ڕەشی لووت گەورەی کوتراو، دوو ددانی زێڕ لەپێشەوەی دەمی، باقی ددانەکانی دیکەی ڕەشی خوار و خێچ، هەموو دەموچاوی کوترابوو. لەبن دار چنارەکە دەتگوت پێشمەرگە نەماون ئەدی ئێمە چین؟ سێ جاشەکەی دیکە تەماشایەکی مووکەیان کرد، یەکێکیان هەتا ئەو کاتە بێدەنگ بوو. کوڕە باڵی پێشمەرگە کەی تەواو دەبێت. لە گوێی گای خەوتبوو. ئەقیب لێی هەستایەوە شەقێکی تێهەڵدا، ئەدی جەنابت لەگوێی چ سەگ بابێك خەوتبووی جاشەکەری خوێڕی؟ شاهۆ پێشی پێگرت. لەسەرەخۆ هاوڕێ. باشە ئەتۆ ناوت چییە؟مووکە! ئەمن و ئەتۆ لەکوێ یەکترمان دیتوە؟ نازانم! نازانی کاتی خۆی لە شەڕی چناران ئەتۆ لەپاش شەڕێکی خوێناوی بە زیاتر لە پێنج سەد جاش و سوپا هێرشتان کردەسەرمان، ئەوەبوو ئەتۆ و هەژدە جاش بە دیل گیران، لە پاش دوو مانگ لەسەر شەرەفی فەقێ خدری نا شەریف بەردران. ئەویش وەکوو تۆ خۆفرۆش بوو. دەتناسی؟ دوور بەدوور! ئەتۆ گفتی شەرەفدا واز لە خۆفرۆشی بێنی، سێ پێشمەرگەت بە شەهیدکردن دا، چۆنت زانی لەو ماڵەن؟ مووکە، تەماشای جاشێکی تەنیشتی کرد بە خۆیەوە گرێدرابوو. ئەوە خەبەرەکەی هێنا؟ شاهۆ ڕووی لە جاشەکە کرد. ئەتۆ شوفێر و جاشی؟ بەڵی! چۆنت زانی ئەو سێ پێشمەرگە لەو ماڵەن؟ ئامۆزایەکم خەبەری هێنا! ئامۆزایەکەشت جاش بوو؟ نا. لەکوێیە؟ لەو شەڕەی پێشمەرگەکان کوژرا. ڕووی لەمووکە کرد.. بەختیارت بۆ کوشت؟ کام بەختیار؟ خزمی کاك فەرەج! فەرەج چی بەسەرهات؟ ئاگادارنیم! شەپۆل ئەڕاندی بەسەریدا چۆن ئاگادار نیت ئەگەر کەسێکم هێنا بەرامبەرت ئاگاداری ئەوە بووە، ئەتۆ خەبەرت لێداوە؟ مووکە زۆر بێمنەت، بیهێنە!. ئەقیب دووبارە لێهەستایەوە. دوو پێلاقەی بە پشتی مووکە دادا. لوولەی تفەنگەکەی لەسەر سەریدانا. وا دەزانێت لەگەڵ کەرەکەلی برادەراکانی قسە دەکات. تەماشای دەموفلقی ناموبارەکی بکە، کەران باوکاو، گڵۆپی سفری لە ناودەست هەڵکردووە، پێشمەرگەکان هەموویان لە قاقای پێکەنیاندا، ئەقیب، ئەو حیکمەتەت تازەیە، گڵۆپی سفری چی و ناودەستی چی؟ ئەقیب بە تووڕەبوونەوە، شەوێکاگی مووکەی گرت، ئەدی ئەو دوو گڵۆپە سفرە چییە، ناودەمیشی لەهەموو دەباخانێك بۆگەنترە. شاهۆ هەستایەوە و شەپۆل و ئەقیبی لەگەڵ خۆی برد. ئاوڕێکی بەلای پێشمەرگەکاندا دایەوە و پێیانی گوت،

باش ئاگاداریان بن دەموچاویان ببەستن. کەمێك دوورکەوتنەوە، گوێبگرن، ئێمە هەموومان هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکترین، نابێ لەسەرچەند جاشی هیچ، شت لەنێوانمان دروست ببێت. ئەمن شتێك دەڵێم، بزانن چۆنە! لە کەڵەمێوێ دەزگایەکی بێسیمی ڕاکاڵی زۆر باشم شاردووەتەوە. لە ناو نایلۆن و زۆر شتم پێچاوە، دەچین دەیدۆزینەوە و پەیوەندیەك بە سەرکردایەتیەوە دەکەین. بەس بزانن ڕێگامان دەدەن، بۆ لەناوبردنیان.. لەگەڵ ناوی سەرکردایەتی هات نەقیب دووبارە شێت بووەوە. ئەدی ئەگەر گوتیان نا؟ شاهۆ، نا باوەڕناکەم بڵێن نا.. جارێ با ئەو شتە بکەین، ئەگەر گوتیان نا بیر لە شتێکی دیکە دەکەینەوە. نەقیب ڕۆیشت لەولاتر دەستی کرد بە جگەرەکێشان. نەقیب چەند توورەتر بوایە کونە لووتەکانی بچووکتر دەبوونەوە. ئەو جارەیان وەها بچووك ببوونەوە هەناسەی دەرنەدەهات. شاهۆ دووبارە هاتە لای. هاوڕێ گیان ئەگەر ڕێگاشیان نەداین هەر دەیان کوژین. ئەوکاتی دەڵێین هەوڵی هەڵاتنیاندا و ویستیان چەکەکانمان بڕفێنن. نەقیب ڕووی لە شەپۆل کرد: هاوڕێ ئەتۆ ئاگاداری چی گوت؟ زۆرباش ئاگادارم! هەر سێکیان بەڕێکەوتن. شاهۆ هەستی بە سەرفرازیەك دەکرد، توانی لەو بەڵایەش خۆی ڕزگار بکات. لەدڵی خۆیدا هیوادار بوو دەزگایەکە لەوێ نەمابێت یان تەڕ و شێدار ببێت و لەکارکەوتبێت. کاتێك گەڕانەوە لای دیلەکان زەندەقیان چووبوو. پێشمەرگەکان بەڕێکەوتن، ماوەی دوو کاتژمێر بە لێواری کەناری دەریاچە بەناو ئاو و قوڕ و لم و گاشەبەرد و قەوزەدا ڕۆیشتن، جار هەبوو دەگەیشتنە شوێنی وەها ئاسێ، ڕێگا نەدەما بەرەو پێش، بەدۆڵە باریك و تەنگەبەرەکاندا سەردەکەوتن. دووبارە دەگەڕانەوە بەستێنی دەریاچە. لەسەر پردی لەگەڵ تەمومژی ئاوی سەر ڕووبارەکە تێکەڵ بەیەک دەبن ڕووبارەکە ئەک لە کوێستانان ڕادێت، بۆخۆی کوێستانە سەهۆڵاوێکە، وەکوو چاڵە بەفر، بەردەوام تەمێکی سپی قورس دیتنی ئاوەکەی ئاستەم دەکات، ئەگەر پرد و بەردەباز نەبوایە، هەموو کەس بە تەمووەژی تێدەگەیشت. بە بەرزایی باڵای دارچنار و دارکاژەکانی ئەوبەروئەوبەری چۆمەکە بەرزبوونەتەوە، مێژووی پرد و ڕووبار دیار نییە و هەر ئەوەندە دیارە لە سەر لقێکی زێیە، بەسەر سینگی ڕووباری ڕێژەن و تیژەوە هەڵچندراوە. پرد و درەخت و کەندەڵان و ئاسمانیان لە باوەش گرتووە، پانیی و درێژایی لەچەند هەنگاوێک تێپەڕناکات. زیاتر بە وشکەکەڵەک هەڵچندارەوە. لە خوارێ چەند گاشە بەردێکی گەورە و زەبەلاحی قەوزە لەسەر

نیشتو وەکو بەری دەست بە تەنیش یەکەوە ریزیان بەستووە. هەرچەند ئاو هەستێت هەتا لەکاتی سێلاویشدا ناتوانن بەردەبازەکان داپۆشن.. چ جای بگات بە پردی تۆکمە و پتەو. لەگەڵ پەرێنەوەمیان لە تەختایی لە کەنار، لەسەر بەردێك دووکەس دانیشتبوون. دیاربوو ماوەیەکی باش بوو لەچاوەڕوانی پێشمەرگەکاندا بوون. زانیان کێن لێیان نزیك بوونەوە. شاهۆ چوو دەستی لە ملی کرد، هاشاخە گیان. شاخەوانی برازای فەرەج بوو. کوڕێکی لە خۆی بەتەمەنتری لەگەڵ بوو، مامەشاهۆماڵتان ئاوابێت، چیتان لێ بەسەرهات، دەزانن لەکەنگێوە ئێمەتان لێرە وشك کردووەتەوە؟ شاهۆ دەستی لەملی کرد، شاخەگیان بەدەست خۆمان نەبوو، ڕێگا دوور بوو! ئەوەش سەفینی پووزامە بەلەمەوانێکی زۆر باشە بەکەڵەکی چەند جار بەتەنیا پەڕیوەتەوە ئەوبەری. شاهۆ پێشمەرگەکان ماچیان کردن، دوو جانتایان لەکن بوو، پڕی نان و پەنیر و یاپراخ بوو. شاهۆ لە شاخەوانی پرسی، کوا بەلەمەکە؟ شاخەوان تەماشایەکی جاشە دیلەکانی کرد، چەنگەتفێکی تێگرتن، بەلەمەکە؟ خەمتان نەبێت وەهامان شاردووتەوە بەفیرعەونیش نادۆزرێتەوە، مامەشاهۆ بە دوو مەرجان دەتان پەڕێنینەوە. ڕازی بوون باشە. ڕازی نەبوون هەرکەس لەماڵی خۆمان، بڕۆن چارێکی خۆتان لەلایەکی دیکە بکەن! شاهۆ لێی هاتە پێشێ، فەرموو شاخەوانە ئەفەندی بزانین ئەتۆ داوای چیمان لێدەکەی، هەر داوای ژنمان لێ نەکەی چونکە لەو کێو و بەندەنەی دەست ناکەوێت. شاخەوان ڕووی لە برادەرەکەی کرد، دەبێ بە پێشمەرگە وەرمانگرن. ئەوەمان زانی، باشە ئەدی دووەم بزانین چییە، بتانکەینە بەرپرس وانییە؟ نا، دەستی بۆ بەر پشتێندی برد. دەمانچەیەکی چواردە خۆری دەرهێنا. شاهۆ بەسەر سووڕمانەوە.. دەك پێنەگەی ئەوەت لەکوێ بووە؟ پێشمەرگەکان هەر هەموویان دایانە قاقای پێکەنین.. ئەو جاشە خۆفرۆشانەمان بدەنە دەستمان بیانکوژین؛ لە تۆڵەی بابم و مامم و کاکە بەختار. سێ پێشمەرگەی بەناحەق شەهید کراو! دەمانچەکەی بەرەو مووکە ڕاگرت. مووکە لەترسان خۆیدایە پشت دیلێکیان! شاهۆ دەستی گرت. هاهو هاهو لەبەیانییەوە شەڕە لەسەر ئەو دیلانە. شتی وا نابێ. جارێ کەسی نوێ بە پێشمەرگە وەرناگرین! دیل هەتا ئەو بەری دەستیان لێنادرێت. دوو کوڕە لاوەکە تووڕەبوون ڕۆیشتن، مادام وایە کەسمان لەکەس. بەلەمێکی دیکە بۆ خۆتان پەیدا بکەن. نەقیب دوو دەستی بەرزکردەوە. ئەوەمیان تەواوە هەقی خۆیانە، چاك دەکەن ئەمنیش بم پارەپارەیان دەکەم، نازانم ئەو نموونانەمان

بۆچین؟ ئێستا بەرەڵایان بکە چیان کردووە، خراپتر دەکەن. ڕووی لە پێشمەرگەکان کرد، وانییە هاوڕێیان؟ هەموو بەیەك دەنگ، هاوڕێ وایە و ئەولاتریش. دڵی گەرمی دوو لاو و هەموو کەس لە خۆت دەرەنجێنی، لە سەر ئەو قەلە باچکانە. شاهۆ دوو سێ جار بانگی کردن، ناوڕیان نەدایەوە. هەستا و بەغار گەیشت پێیان، کوڕە ئەو نان و خواردنە بۆ کوێ دەبەن وەرە بزانە چ هەرایەکتان نایەوە! لەبەیانییەوە بەبەریاندا هەڵدەڵێم و قسەیان بۆدەکەم و لێیان دەپاڕێمەوە هەتا ڕازیم کردوون. کەچی ڕیسەکەمتان کردووە خوری. پێشمەرگەکان وەکوو کوورەی هەنگ گەرم داهاتبوون، ئەوەی هەتا ئەوکاتەش بێدەنگ بوو بە شەپۆلیشەوە داوای کوشتنی دیلەکانیان دەکرد. ئەقیب هەر داد و بێدادی بوو. ئەگەر کارەساتی جوانە مەرگ شەهید بەشدار حەلاق و چوار هاوڕێیەکەی لەسەر دەستی ئەو چوار خۆفرۆشە لە ئێمە دووبارە نەبووە، دیارە سەرم لە هیچ دەرناچێت، بەبێ ئەوەی کەس پرسیاری لێبکات، پێنج پێشمەرگە دوو دیلی ئە منیان لە لابوو، وەکوو ئێمە زوو لە کۆڵیان نەکردنەوە بۆ گەشت و گوزار بردیانن، هەتا دەگەنەوە بارەگا و دادگای دەکرێن، شەو لە ڕێگا دانەیەکیان دەستەکانی خۆی دەکاتەوە، هەر هەموویان شەهید دەکات. ئەو شاهۆ دەبەنگەش ئەوەی لە چاودایە و هەمان چارەنووس چاوەڕوانیەتی. شاهۆ ماوەیەك لەگەڵیان مایەوە. کەس نەیزانی چۆنچۆنی ڕازی کردن، سێ قۆڵی گەڕانەوە. چەند سەد مەترێك لە پێشتر بەلەمیان بە کۆمەڵێك گەڵاوگیا داپۆشی بوو. دانیشتن لەگەڵ پێشمەرگەکان دەستیان کرد بە نانخواردن. شاهۆ دەستی دیلەکانی کردنەوە و نانی لەپێش دانان. ئەقیب هەر چاوی لێیان زەق دەکردەوە. ئەیان دەوێرا سەر بەلای دا بادەنەوە. هەر تەماشایان کردبا بیانوویەکی پێدەگردتن. ئەگەر سەریان شۆڕ کردبایەوە، بەبەر نووکە شەقی دەدان، چونکە هەر بەسەرشۆڕی ژیاون، هەر حەزیان لە ملکەچ کردن و لووشمەلووشمە، ئەگەر سەریان بەرزدەکردەوە، ئەوە چاو لەچی دەگێڕن، هەڵاتن مەرگتانە؟ بەدەم شەڕو سیخوورمەکانی ئەقیب دنیا تاریك داهات. بەبەلەمێکی گەورە ماوەیەکی باش بەکەناری دەریاچەدا چوونە سەرەوە. دوو کوڕە گەنجەکە باش شارەزابوون، خۆیان بە دەریاچەدا دا. زۆر بەبێ دەنگی سەوڵی زۆر بە هەست و بچوکیان لێدەدا. دەریاچە ئارام، هیچ شتێکی ئاسایی هەست پێ نەدەکرا، بەڵام پێشمەرگەکان زۆر لەسەر هەست بوون، زۆر جار ئەو ئارامییە لەناکاوێك دەبووە

سەرەتای کارەساتێکی گەورە، بەتایبەتی شەڕی ناو ناو زۆر دژوارە جێگای خۆ لەسەنگەر نان و شوێن گۆڕین نییە. پاش دوو کاتژمێر گەیشتنە ئەوبەری کەنار. دوو بەلەمەوانەکە ماوەیەك لەگەڵ پێشمەرگەکان مانەوە. پاشان پێش ماڵ ئاوایکردن ڕوویان لە شاهۆ کرد. مامە شاهۆ خۆ پەشیمان نەبوویەوە؟ نا حەیفتان نەکرد، مامی خۆتان قسەکانی هەر هەمووی سەنەدن. دوو کوڕە لاوەکە پێشمەرگانیان ماچکرد و چۆن هاتبوون ئاواش گەڕانەوە. شاهۆ بەرامبەریان وەستابوو. قسەکانم سەنەدن، بەڵام تاپۆ نین. لێوی خۆی گەست، دیسانەوە نەقیب دەهاروژێ. شەپۆل هات بەلایەوە ئەوەچۆن ڕازیت کردن؟ ئەوانە دڵسافن بە دوو قسەی خۆش لە کۆڵمان بوونەوە! پاش پشوویەکی کورت شاهۆ ڕووی لە هاوڕێیەکانی کرد، چەند ڕۆژێك لەو ناوە دەبێن بزانین جموجۆڵی ئەو ناوە لەچی دایە.. پاشان دەچینە کەڵەمێوێ. هەندێك شتم شاردووەتەوە دەیان هێنین. پاشان یەکسەر بۆ ناوزەنگ. بۆ چوونە ناوزەنگ سێ ڕێگا هەیە. یەکێکیان دەبێ بچینە ئاسۆسی لەوێوە بۆ ناوزەنگ، ئەوەیان دوورتر و سەلامەتترە. ڕێگای دووەم کۆیە بالیسان قەندیل مەترسیدارە. ڕێگای سێهەمیش هەبوو بەناو شاردا بەرەو کێوەرەش پاشان قەندیل، بەڵام ئەو ڕێگایەیان مێشوولە لێی دەرناچێت. نەقیب بەدەنگ هات لەکام ڕێگا دەڕۆین دەکرێت ئەو شەو دەبێ بچینە کەڵەمێوێ. شتەکان بێنین. بێسیمێك بکەم، دوو قسە لەگەڵ ئاغاکانی سەرکردایەتی بکەم، کۆتایی بەژیانی ئەو چوار جانەوەرە بێنم، هەر لەوێشەوە بەرەو ئاسۆس بەڕێدەکەوین. شاهۆ لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نەبوو، بەڵام چاری نەبوو ڕێکەوتنەکە وابوو. دوا قسە، ئەگەر هەر لێك دابڕانێك ڕووی دا لێرە یەکتری لە پشت ئەو بیشەڵان و کونە ئاشەی دەبینینەوە. پاش کەمێك چاودێریکردنی بنار و چیا، بەهەمان دۆڵدا یەك بەدوای یەکدا شاهۆ لەپێشی پێشەوە. شەپۆل بە دوایدا. لەپاش شەپۆل دیلەکان. دوو پێشمەرگە پاشان نەقیب. زۆر بە وریاییەوە و لەسەر هەست بەڕێکەوتن. لە زۆربەی ڕێگا لە جێگای خۆیان وچانیان دەدا هەرکەس لە شوێن خۆی. ماوەی سێ کاتژمێر بەڕێگاوەبوون. کەوتنە بەرامبەر کەڵەمێوێ. نەقیب خۆی گەیاندە لای شاهۆ. هاوڕێ ئەوەی بەرامبەرمان کەڵەمێوێیە. ڕاستە لەپشت ئەو تاشەبەردانەیە. بێسیمەکەت لەکوێ شاردووەتەوە؟ لەسەرووی کانییەکە، بەڵام تکایە بگەڕێوە جێگاکەی خۆت! باشە خۆ لە قسەی خۆت پەشیمان نەبوویەوە؟. نا، بەڵام دەستووری ڕۆیشتن تێك مەدەن. نەقیب گەڕایەوە

دواوه بەلای دیلەکاندا. قۆنداغێکی لەدەمی مووکەدا. پاش کەمێکی دیکە بزانە چۆن بۆ دۆزەخت دەنێرم بێشەرەف. شاهۆ بانگی کرد هاوڕێ لێیان گەڕێ.. قسەکەی تەواو نەکرد چەند سەرێکی لەبن بەرد و داری پێشیان و چواردەورەیان بەدی کرد. هاواری کرد بۆسەیە. پێش ئەوەی خۆی لەزەوی بدات، لەهەموو لەیەکەوە درانە بەرخرمەخرمی دەستڕێژی گوللە، وەکوو باران گوللە ویزەویزیان دەهات. لەگەڵ یەکەم دەستڕێژ ئەقیب لەگەڵ دوو پێشمەرگە کەوتنە سەرزەوی. شەپۆل ویستی تەقە بکات، کلاشینکۆفەکەی جووتەی کرد. وەستا تەقەی نەکرد. لەزەوی و ئاسمانەوە بەسەدان چەك تەقەیان لێدەکردن لەو شلەژاوییە و هاتو هووتە چوار جاشەکە ویستان هەڵێن. دانەیەکیان کوژرابوو، بەدوای خۆیاندا ڕاکێشا. ئەقیب بە برینداری دانیە بەردەستڕێژی گوللە.. دوانی دیکەشیان کوژران، دەنگیان نەما. مووکە بەشەلەشەل خۆی لە برادەرەکانی ڕزگار کرد. خەریك بوو بۆی دەرچێت. شەپۆل لێیەوە دیارنەبوو، نارنجۆکێکی بۆ فڕێدا چەند جاشێك لەگەڵ مووکە کوژران. ئەقیب و شەپۆل درانە بەر دەستڕێژی گوللە هەتا ئەوکاتە شاهۆ لەبەرزایی، ئەقیب لەخواری بەبرینداری شەڕیان لەسەر شەپۆل کرد. هەڵکەوتەی شەڕ و بۆسەکە زۆر خراپبوو. پێشمەرگەکان یەك یەك و دوودوو بەبازنەیی گەمارۆدرابوون. بەهەر چواردەوری خۆیاندا دەمیان ڕشاند. پێشمەرگەکانی دیکەش کەمێك لە خوارتر لە گەمارۆدا بوون. لەتاریکایی زۆر بەهێز دوو جاش خۆیان بە شەپۆل دادا. دەمانچەی دەرهێنا هەردووکیانی بەبەر فیشەکدا، ویستی یەدەگەکە بگۆڕێت، چواری دیکە خۆیان پێدادا. گرتیان. ئەقیب تەقەی لە جاشەکان کرد، لەهەموو لایەکەوە بەبەر دەستڕێژیان دا. ئەقیب و پێشمەرگەیەکی دیکە، وەها گەرم داهاتبوون هەستیان بە برینداری نەدەکرد. لەپاش گۆڕینی هەر مەخزەنێك بەپێوە وەکوو پڵنگی بریندار تەقەیان دەکرد. زۆر جار بەدەم هاوار و جوێندانەوە مەخزەنیان دەگۆڕی، لەگەڵ هەر دەستڕێژێك جاشەکان خۆیان لەزەوی دەدا و دەنگیان نەدەما. ئاڵقەی گەمارۆیەکە هەتا دەهات بچووکتر دەبووەوە. ئاگری چەکی دەستی پێشمەرگەیەك، بەرامبەر بە دەمیان چەکی قورس. کەمێك لەبەرزایی تەقەکان زیاتر لەسەر شاهۆ بوون. لەناو تاشەبەردەکان دەستەوکەرێکی باشی دەکرد، وەکوو چەترێك بوو بۆ هاوڕێیەکانی، لەبەرزایی هەموویانی بەدی دەکرد، لەگەڵ هەڵدەستایەوە سەرپێ بۆ تەقەکردن، جاشەکان خۆیان لەبن بەردەکان مات دەدا، زۆر جار هەتا بۆ مەغزەن گۆڕین بە

پێوه دەبوو. دەستڕێژی یەکەم بە حەفتا و پێنجی کردی تەواو چوار دەوری خۆی پاك کردبووەوه.. ئەوەی زیاتر یارمەتی دەدا، باش شارەزای ئەو ناوەبوو. بەدەم تەقەکردنەوه گەمارۆی کەڵەمێوێی شکان، بەناو گەلیە تەنگەبەرکە هەڵکشا، لەبەر سینگی هەورازی پێش کەڵەمێوێ لەخوارێ ئاگری چەکەکانی دەدیت، ئەوانەی ناوەڕاستی ڕێگا پێشمەرگەبوون، ئەوانی لا ڕێ و پێشی جاش بوون. پێشمەرگەکان زۆر بە توندی گەمارۆ درابوون. بە بۆچوونی خۆی بە بۆسەی جاشی تێ نەدەگەیشت، تەقەکان و تەقینەوه ڕووەو خاور دادەکشان، تەقینەوەی هاوەن و ئاربیجی دەستی پێکرد. شاهۆ لەبەرزاییەوه تەقەی لە جاشەکان دەکرد. لەسەرووی ئەویشەوه درابووه بەر گوللە. چەند جاشێك بۆی سەرکەوتن، لەسەرووی کانییەکەوه بۆیان دانیشت، لەناو بیشەلانێك بوو شەش جاش بەماوه بەدوای یەکەوه بوون نزیك بوونەوه، بەبەر دەسرێژیدان دوانایان کەوتن، چواریان گەڕانەوه. لەسەرەوەش بۆی دابەزین تازە سەریشی گیراوه. دەستی لە قەدی خۆی دا یەك مەخزەنی پێمابوو. ئەوەی سەر تفەنگەکەی چەند فیشەکێکی تێدامابوو. سێ نارنجۆکی پێبوون هەر سێکیانی بە جاشاندا دابوون. هەر لە ئاست خۆیەوه بە تاشەبەردە لووسەکان هەڵگەڕا.. چەندجارێك دەخلیسکا بەرەو خاوار. دواجار ڕێگایەکی دۆزییەوه لەدەستی ڕاستی سەرکەوت لەناو گەلیەکە نەما. گەلی و کەڵەمێوێ کەوتنە بەردەمی. جاشەکان لەخوار و لەسەرەوه هاتن بەیەك گەیشتن. سەرەتا تەقەیان لەیەکتری کرد. پاشان بەهەر هەموویان بەدوای شاهۆدا گەڕان. کاتێك لە گردی گەلی سووڕایەوه، ماوەیەك بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، چاودێرییەکی خوارێی کرد، دەنگی تەقە نەمابوو. وادیارە برادەران ڕزگاریان بووه، بەڵام گەمارۆیەکی زۆر سەخت بوو. بیری کردەوه، بۆ وا بە ئاسانی کەوتنە بۆسەوه؟ سەرکێشی و دەنگەدەنگ و هاواری نەقیب ئاگاداری کردنەوه! لەکاتێکی خراپ نەقیب کردیە هەرا. ئاخ نەقیب بۆ وات کرد؟ بە ناچاری لەوناوه دوورکەوتەوه. بە درێژایی ڕێگا بیری هەر لەسەر هاوڕێیەکانی بوو، بەتایبەتی شەپۆل ئاگادار بوو کە کەوتە دەستی جاشەکان زەبرێکی کوشندەبوو پێیان کەوت، بەڵام خۆ هەموو شەڕێك و پێکدادانێك و بۆسەیەك لەبەرژەوەندیان دانابێت. کارەساتی لەئەوەی گەورەتریان بەسەرهاتووه. شەڕی خوێناوی بڵقامیش و لەدەستدانی حەقدە هاوڕێ بە شەهید بەکر تەلانیشەوه شایەتحاڵی ئەو ڕاستیانەن. بۆئەوەی جارێکی دیکە نەکەوێتەوه بۆسەوه،

•بەرئەوەی زۆرکەم فیشەکی پێمابوو، زۆر خۆی دەپاراست، لەسەر هەستبوو.
•زۆر شوێن هەستی دەکرد مۆڵگا و سەربازگە زۆر لێیەوە نزیکن، هەندێك جار
گوێی لە دەنگی جاش و سەرباز دەبوو، ئەوجا بۆی دەرکەوت ئەو بنار و شاخە
چۆنچۆنی تەندراوە. سەری لێشێوا بوو هەستی دەکرد لەبازنەی چەند
گردۆلکەیەك دەخولێتەوە. بەرەبەری دنیا ڕووناکبوون بوو، بەدۆڵێکی تەنگەبەر
خۆی گەیاندە دەریاچە. لە جێگای دیاریکراو نزیکبووەوە، زۆر لە جێگای شەڕەکە
دوور کەوتبووەوە. لەو دیویەوە کۆنە ئاشەکەیە، بەڵام جێگای پاش لەیەك
دابڕابوون بەیەك گەیشتنەوە ئەو بیشەڵانەبوو، لە ناوئەو بەردانەیە. ماوەیەك
دووربەدوور چاودێری بە جوانی ئەو ناوەی کرد. هیچ دەنگ نەبوو زیاتر
نزیکبووەوە، دانیشت. دوو قومی ئاو لە ناو مەتارەکەی مابوو خواردیەوە،
چاوێکی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە. زۆری نەماوە دنیا گزنگی بدات، پاش
کەمێکی دیکە خۆر لە ئاسۆ هەڵدێت. ئەگەر هەتا نیوکاتژمێری دیکە لەو ناوەی
دوور نەکەوێتەوە، دەبێ هەتا شەوی دابێ لەو ناوەی بمێنێتەوە. نەیدەزانی چی
بکات، بەتەنها چارەنووسی هاوڕێیەکانی زۆر لەلا مەبەست بوو. هەر یەك
دووێکیان بەدیار کەوتبان. چەند خۆش دەبوو، پاش ئەو بۆسە تۆکمە و ترسناکە
هەر هەموویان بەدیارکەوتبان. ئەو بۆسەیە بە هی پێشمەرگە دەچوو، قەت جاش
و سوپا ئاوا گورج و گۆڵ و بەدەستەوکەر نین! پاشان لە هیچ نەدەگەڕانەوە،
سینگیان بەبەر گوللەوە دەنا، دەبێ بزانم ئەوانە کێ بوون؟ بەڵام ژمارەیەیان
زۆربوون. بۆخۆشیان ئەوەندە شەپڕێو و لە ناوخۆیان ناکۆك و بەدەنگەدەنگ
بوون، ئاگامان لەبەردەمی خۆمان نەمابوو. لەبەر خۆیەوە و بەدەم لێکدانەوە و
وەبیرهێنانەوەی تەواوی شەڕەکەی، لەماوەی ئەو چەند ساڵە ئاوا بێدەسەڵات
نەکەوتوونەتە بۆسەوە، تەواو ورەی بەردابوو، دەستی چەکەکەی نەدەگرت،
بەشانی دادا بوو. ئەگەر لەو کاتەیدا منداڵێك بۆی هاتبا زۆر بەئاسانی دەیتوانی
چەکی بکات. هەستایەوە بەرەو بیشەڵان ڕۆیی. لەپشت دارێکی گەورە دەنگێك
بانگی کرد، هاوڕێ شاهۆ. وەرە ئێرە، بەرەو لای دەنگەکە چوو باوەڕی بەگوێی
خۆی نەدەکرد. ئەوە دەنگ بوو یان گوێی زرینگایەوە. کەمێك هاتەوە سەرخۆی.
دەنگەکە دووبارە بانگی کرد. ئەوجارەیەیان تارماییەك بەدیارکەوت. باوەڕی بە
چاوەکانی خۆی نەدەکرد، دووجار چاوەکانی هەڵگلۆفین، ڕەنجبەر کوڕە لاوە
چست و چالاکە ڕەشتاڵەکە بە دیار کەوت. باوەشییان بەیەکدا کرد. ماوەیەك

ئەوەندە تامەزرۆی یەکتری بوون وایان دەزانی چەند ساڵە بە دیداری یەکتری شاد نەبوون. لە چاوەکانی یەکتری بە دەیان پرسیاریان دەخوێندەوە. شاهۆ لێیپرسی ماوی؟ دەم بینی! خۆ بریندار نی؟ با، بەڵام شتێکی وانییە! بەتەنیای؟ نا هاوڕێ پێشڕەوم لەگەڵە بریندارە. کێی دیکە؟ هەتا ئێستا هەر ئەو دووانەمانین! شاهۆ هات بەلای پێشڕەوەوە. لەسەر بەتانییەکی خوێناوی درێژ بوو، کەزانی شاهۆ هات هەستایەوە، دەستێکی لەکاتی خۆفرێدان شکابوو. فیشەك بەبەر شانی کەوتبوو، بەڵام باش بوو هۆشی بەسەر خۆیەوە بوو و قسەی دەکرد، بەڵام دیاربوو لەبەر توندی بۆسە و دژواری شەڕەکە تاسابوو. گەنجی سەردەمی ئەنفال، هەڵۆی سەربەرزی لووتکە سەربەتەمەکانن، هەڵگری هەرچی پەژارەی گەلێکە لە ڕێگای گەیشتن بە ئامانجەکانی، سڵ لەهەرچی شت هەیە ناکەنەوە. شاهۆ لێی پرسی، هاوڕێ چۆنی؟ ئازارم زۆرە. زۆر سەرمامە. دانە چۆقەی گرتبوو، شاهۆ پاڵتۆکەی خۆی بەسەر شانی دادا، لەدڵی خۆیدا گوتی، کەواتە لە دەستەکەی خۆمان بەس من دەرچووم، هەر ئەو دوانەتانن. هەر دووکیان وەڵامیان دایەوە، نا. ڕەنجبەر زۆر بە کزی گوتی باوەڕناکەم کەسی دیکەیان ماین، جەرگم لەت لەت بووە بۆ ئەو هاوڕێ خۆڕاگرانە. ماڵت ئاوا بێت نەقیب، وازی نەهێنا!، شاهۆ ڕووی لە برادەرەکانی کرد، حەوت پێشمەرگەمان دیار نین. بە چاوی خۆم دیتم! شەپۆل چەکەکەی واستابوو، تەقەی پێنەکرا، ماوەیەك بەدەمانچە شەڕی کرد، وابزانم بە دیلگیرا، شەڕم زۆر لەسەر کرد، بەڵام بە چاوی خۆتان دیتتان فیشەك وەکوو باران داباری، بۆسەیەکی زۆر بەپلان بوو. نەقیب شەهید بوو، ئەوانەش لەمن نزیك بوون، ئا بەڕومانە و تەقەی شەپۆل و نەقیب هەر چوار جاشەکە کوژران، ڕەنجبەر لە تەنیشت منیش، لەپاش شەڕێکی زۆر سەنگەر و دارا شەهیدبوون. پێشڕەویش بەدەنگ هات، بۆخۆم چەند جار دیتم هەر لەسەرەتای شەڕەکە شەهاب شەهید بوو، کەمێك پاشتر شێرزاد، شەڕێکی قارەمانانەی کرد. شاهۆ کەوتە ژماردنی ناوەکان، کەواتە چاوەڕوانی کەسی دیکە ناکەین، دەڵێن چی هەتا دنیا بەتەواوی ڕووناك نەبووەتەوە لەو ناوەی دوور کەوینەوە، ئەگەر لێرە بین هەتا شەو ناتوانین جووڵە بکەین، تازە ئەوەی ڕوویدا ڕویدا، ئەوەندە فیشەکمان پێنەماوە، بەش بە حاڵی خۆم لە سی فیشەك زیاترم پێنەماوە، بەشی یەك دەستڕێژدەکات. پێشڕەو گوتی، ئەمن تاقم و تفەنگم هەر پێنەماوە، لەپاش برینداربوونم نەمدەتوانی بۆخۆم بڕۆم، هەمووم

فرێدا، ئەدی ئەتۆ ڕەنجبەر؟ تەماشایەکی چەکەکەی دەستی کرد، تەنها فیشەکە تاقانەکەم پێماوە. کەواتە چاوەڕوانیمان بێهوودەیە. ڕەنجبەر چووە بن باڵی پێشڕەو. شاهۆ لە پێشیانەوە، بەرەو ناوزەنگ بەڕێکەوتن. هەرسێکیان هیلاك و شەکەت و باری دەروونیان ئەوەندە خراپ بوو مردنی خۆیان بەئاوات دەخواست. جار جار زۆر بە نائومێدییەکەوە سەرێکیان بەرەو چیاکە بەرز دەکردەوە، بۆنی خوێنی لێدەهات. وەها تەندراوبوو، بە جاش و سوپا، لەهەموو لایەکەوە سەربازگە و تەلبەند، کەس لەو باوەڕەدا نیە جارێکی دیکە ئەو هەموو مۆڵگا و سەربازگەیە ئاوا بە ئاسانی هەلکەندرێنەوە. شاهۆ هەرچەندی بیری دەکردەوە بەرەو کوێ؟ خۆ ئەگەر هەر کەسێك بەرەو ڕوویان بێت لەپاش یەکەم دەستڕێژ بەدەست دەگیرێن، بە بریندارێك و چەند فیشەکێکەوە بەرەو کوێ؟ دووبارە ڕوویان وەرسووڕاند بیشەلانی تەڕ و تووش لە باوەشی گرتنەوە، لەگەڵ گەرم داهاتنی بنار لەرزی کزەسەرمای کوێستانیان لە جەستە دەردەچوو.

# کانی ژەهراوی

لە ئاوایی گۆڕەشێر لە ئاوزەنگ! لە لاپاڵی زنجیرە چیای جاسووسان.. بەرانبەری چیای سەر بەتەمی مامەندە، کە تەنها دوڵێکی باریکی درێژیان لە نێواندا بوو... کزەبایەکی ساردی جەرگبڕ هەڵدەکات لەو وەرزە پایزە درەنگ وەختە، شتێکی ئاساییە. چەند ڕۆژێکی دیکە هەرچی سەرچاوەی ئاو هەیە بە ڕووبارەکانیشەوە دەیبەستێت. لە ئاوایی گۆڕەشێر و دەوروبەری دوو کانی هەیە، پێش هەموو شتێك شەختە و بەستەڵەك ڕوو لەو دوو کانییە دەکات. یەکێکیان لەسەرووی ئاوایەوەیە.. زۆر بەرفراوان و گەورەیە، زیاتر خەڵکی ئاوایی و میوان بەکاری دەهێنن، دەتوانین بڵێین کانی ژنانە. هەتا پیاوانی ئاوایی کەم ڕووی تێدەکەن. پێشمەرگە ئەو کانیە نەك بەکارناهێنن، بەڵکو زۆریان هەر ناشزانن کەوتووەتە کوێوە. ئەوەی دووەمیان لە خوار ئاوایی لە ناو دارستانە چڕەکەیە. پێشمەرگە و ڕێبوار بەکاری دەهێنن. ئەوەی دووەم ناوی (کانی پێشمەرگانە) چونکە پێشمەرگە بۆ خۆیان دروستیان کردووە. پێش هاتنی پێشمەرگە بۆ گۆڕەشێر ئەو کانیە نەبوو کانیەکی کەمئاوی هەروا بۆ ئاو خواردنەوە و بەشی چالێنان و خواردن دروست کردن بەکاردەهات. پێشمەرگە بۆ خۆشوشتن، دەچوونە سەر چۆمی، لەخوارێ ڕووبارێکی تەنك هەبوو پێیان دەگوت تەنکە ڕووبار. هەردوو کانی هاوین و زستان کەللە تەزێن بوون، چونکە ڕاستەوخۆ لە کوێستانەکانڕا دەڕژانە کارێز. لەسەر کانی پێشمەرگان تەوار لەگەڵ دەستە خوشکێکی هاوتەمەنی خۆی هەروا یازدەساڵ دەبوو، لەچاوەڕوانیدا بوون. لەبەرئەوەی لەسەر کانی دوو کوڕی هەرزەکاری دوازدە سێزدە ساڵی لێبوون. تەوار و دەستە خوشکەکەی لە خوار کانی چاوەڕوانیان کرد، هەتا دوو کوڕەکە بەجلکی تەڕەوە بەلایاندا بە شڵەژاوی تێپەڕین. تەماشایەکی تەوارو برادەرەکەیان کرد. بە بێ ئاوڕدانەوە لەو ناوە دوورکەتنەوە. ساوێن پرسی ئەوانە کێبوون؟ نازانم، بەڵام چەند ڕۆژە لەو ناوەی دەسووڕێنەوە، چەند جار لە ناو پێشمەرگان لەگەڵ پێشمەرگان دیتوومن. هەردووکیان چوونە سەرکانیەکە، ماوەیەك لەگەڵ دەستە خوشکەکەی دەموچاویان شووشت. تەوار سێوێکی گەورەی سووری لەدەست بوو، چەند جار لە ئاوەکەی هەڵکێشا. ماوەیەك لە ناو ئاوەکە لە وێنەی

خۆی ڕوانی. ئەوەندەی گەڵا و پوشوپەڵاشی تێدابوو، وێنەی خۆی بە پارچەپارچەی دەدیت. برادەرەکەی پارچە ئاوێنەیەکی ژەنگاوی لەبەر باخەڵی دەرهێنا. تەماشایەکی خۆی کرد، ساوێن قژڕەشی چاوڕەشی گوپن بوو، بە پێچەوانەی تەوار هەندێك ڕەشتاڵەبوو. تەوار مووزەردی چاوشین بوو، لەپاش چارەسەری ئێران تەواو ڕەنگی هاتبووەوە سەرخۆی. تەوار سێوەکەی کردە دوو پارچە، لەتێکی دایە دەستی برادەرەکەی. لەتەکەی دیکە گازێکی گەورەی لێدا و خواردی، گازی دووەم دەموچاوی تێکچوو. یاع، ساوێن کچێ نەیخۆی، دەڵێی ژەهری مارە ئەوەندە تاڵە! پارچەسێوەکەی دەستی دوور فڕێدا. ساوێن ماوەیەك لە تەوارەوە ڕاما، بەسەری زمانی تامێکی کرد. ئەوە چییە کچێ؟ ئەویش بەپەلەتر هەتا دەستی تێدابوو پارچەسێوەکەی دەستی توڕدا. تەوار بۆ ئەوەی تامی زاری بگۆڕێت، دەمی بە سولاوکەی کانیەکەوەنا چەند قومە ئاوێکی خواردەوە. ئەوە چییە ئاوەکە تاڵتریشە؟ ساوێن دوو پەنجەی تەڕکرد و تامی کرد. ڕاستدەکەی بەڵام تامی تاڵی سێوەکەیە، دەڵێی ژەقنەبووتە! تەوار دەستی بۆ باخەڵی برد دەنکە خورمایەکی لەدەمی نا تەوار ویستی بڕوات برادەرەکەی بانگی کرد. تەوار وەرە بزانە. تەوار گەڕایەوە. ساوێن هەر لە ناو کانی و دەوروبەری ورد دەبووەوە تازە سەرنجیان دەدا. چەند باڵندەی باڵەخشینی بچوك، لەناو کانی و دەوروبەری مرداربووبوونەوە. وردە ماسی و بۆق و چەند کیسەڵێك سەر ئاو کەوتبوون. لەناو پەلك و گەڵا و قەوزە هەندێکیان هێشتا خۆیان دەجوڵاند. باشە بۆ وایان لێهاتووە؟ تەوار بانگی کرد ساوێن وەرە بابڕۆین، درەنگە مامۆستا سەردار چاوەڕوانمان دەکات.. بەدەم ڕێگاوە ساوێن بەتەواری گوت، ئەدی مامۆستا سەردار چەند ڕۆژە نەهاتووە، دەڵێن نەخۆشە، بەخوای مامۆستای چاکە! قەت خۆی لەکەس توورە ناکات، ئەگەر نەشزانی هەر پێدەکەنێت، بەباشی تێمان دەگەیەنێت. دەزانی ئەو پێشمەرگانە زۆر سەیرن، هەرچەندە باوکی من و باوکی تۆش پێشمەرگەن، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو چەك و شەڕەش لەکاری خۆیان ناکەون. کانی ئاوەدان دەکەنەوە، هەروەمز لەگەڵ خەڵکی گوندەکان دەکەن. کورە خانوویان بۆ سواغ دەدەن. دروێنە دەکەن و خزمەتی باغچە دەکەون، شەو و ڕۆژ خەریکی خوێندنەوەن، ئەگەر ئەمن شتێك نەزانم باوکم دڵگران دەبێت، لێی دەپرسم بۆ خۆت نارەحەت کردووە؟ زۆر گوێم لێبوە دەڵێت، ببیستم کەسێك لە باشووری ئەفریقا نە خوێندەوارە زۆر دڵگران دەبم.

لەگەڵ ئەو هەموو ڕاکەڕاکەی چۆنچۆنی نەخۆش ناکەون. وەکوو مامۆستا سەردار (سەرێك و هەزار سەودای هەیە). تەوار گوتی، کچێ نەخۆش نییە، لەشەڕێیە دەڵێن لەسەری سادریە. یاخوا زوو بگەڕێتەوە! ساوێن، ئەرێ ئەوشەڕە بوو بەچی هەرنەبڕایەوە، بابیشم دوو هەفتەیە لەشەڕدایە. جارێك هاتەوە چڵکن و پیس بوو، یەك فەردە بەس ڕشك و ئەسپێ لەگەڵ خۆی هێناوە، دایکم بە بابمی دەگوت، ئەرێ ئەتۆ لەشەڕی جاشان بووی یان هی ئەسپێیان؟. بابم تووڕەبوو، سەری سادری ئەوەندە ساردە کێ دەتوانێت خۆی بشوات، بەڵام بابم هەر بۆخۆی ڕقی لە خۆشوشتنە. ئەرێ تەوار بابت دیار نییە؟ نازانم دەڵێن لە کۆسرەتیە وەختە بۆی شێت ببم. تەوار چەند جار تفی کردەوە، بەڵام مامە شاهۆ بابم نییە؟ ئەدی مامتە؟ نا مامیشم نییە! ئەمن داکم و بابم نەماون، لەگەڵ خوشکێکم و برایەکم بزربوون. نازانم بەچی؟ بەس خوشکێکم هەیە نازانم ئەویش لە کوێیە! ساوێن زانی تەوار ناڕەحەت بوو، باسەکەی گۆڕی.. مامۆستا ئەوزادیش لە جێگای مامۆستا سەردار هاتووە، مامۆستای چاکە. تەوار بێدەنگ بوو، جار جار هێڵنجی دەهاتێ. تەوار چیتە؟ نازانم ناو سکم دەلەرزێت هەناسەشم تەنگ بووە. بەدەم قسەکردنەوە گەیشتنە بەردەمی قوتابخانە ژوورێکی تەڕاوی شێدار داخرابوو، ماوەیەك لەبەر دەرگا چاوەڕوانیان کرد کەس نەبوو. باشە چیان لێ بەسەرهاتووە؟ خەڵکی ئاوایی بەلایاندا تێدەپەڕین، زۆر بەکزی بە غەمباری. مام وەیسە هات، تەوار و ساوێن دەیانناسی، زۆر جار ئاوی بۆ مامۆستا و قوتابیەکان دەهێنا ژوورەکەش، هەر ئەو بۆی سواخدان. پرسی ئەوە چ دەکەن لێرە؟چاوەڕوانی مامۆستا دەکەین! مامۆستا نایەت بڕۆنەوە ماڵێ. باشە مامە بۆ واشڵەژاوە؟ ئەوڕۆ دەڵێی شتێك ڕوویداوە، ئەوان ناگادارنین هەر دووکیان بەناو ئاوایدا ڕۆیشتن. ئاوایی چۆڵ بووبوو، لەخوار ئاوایی قەڵەباڵغیەکی گەورە دەبینرا. غەڵبەغەڵب و دەنگی گریان دەهات. بە تەواوی خەڵکی ئاوایی گۆڕەشێر، بە منداڵ و ژن و پیاوەوە لە سەر گۆڕستان بوون. ژاوەژاوێك دەهات، کۆمەڵێك پێشمەرگەش بەدەوری دارەتەرمێکەوە بوون. منداڵان دوور بەدوور تەماشای گۆڕەکانیان دەکرد. تەوار و ساوێن بەپەلە بەرەو گۆڕستانی ئاوایی کەوتنەڕێ. کاتێك نزیکبوونەوە پێشمەرگاکانیان ناسینەوە. ساوێن لە مردوو دەترسا، کەمێك لەدوور لەگەڵ کۆمەڵێك منداڵ لەخوار گردێك دانیشت. تەوار لە خەڵکەکە نزیك بووەوە، دوو تەرمی خوێناوی لەسەر خۆڵ درێژ کرابوون، بەجلکی

کوردی جلەکانیان لە خوێندا وشك ببوون. پێشمەرگەکان زۆر بە غەمبارییەوە لە دوو تەرمەکە ڕامابوون. پێشمەرگەیەك سەری هەردوو تەرمەکانی بەرز کردەوە و چەند جار ماچی کردن. پێشمەرگەکە دەستێکی بە ملیەوە هەڵواسرابوو، چەند لەفافێکی زەردی خوێناوی لەسەری ئالآبوو.. لەبەر خۆیەوە دەیلاواندەوە. هەموو بە غەمبارییەوە گوێیان لێی گرتبوو. وادیاربوو ئەو پێشمەرگە هاوڕێ سەربەست بوو، باسی دوا چرکەکانی هەردوو مامۆستا و پێشمەرگەی دەکرد (مامۆستا سەردار، مامۆستا گەنجۆ) هەم لە ئێمە ڕۆیشتن هەم لە قوتابیەکان.. خەڵکی ئاوایی و کوردستان بەگشتی. ئەو دوو شێرە پێشمەرگە چەند لەشەڕ و پێکداداندا ئازاو چاونەترسبوون هەتا دوا هەناسە سەنگەریان بەرنەدا! سەد ئەوەندە لەگەڵ خوێندکارەکان بە سەلیقە و دڵسۆز بوون. هەموویان بەکوڵ بۆ پێشمەرگە و مامۆستایەکان دەگریان. تەوار لێیان نزیك بووەوە، مامۆستا سەردار چاوەکانی کردبوونەوە، کەمێك لێڵ بوون، بزەیەك هەروەکوو جاران بەزیندوویی لەسەر زاری بوو، زانی مامۆستا سەرداری خۆیانە شەهید بووە. ئەوەی تەنیشتی مامۆستا گەنجۆ بوو، بەڕاستی گەنجۆ بوو. تەمەنی پێشمەرگایەتی هەر دوژمن لەبەری هەڵاتووە و خۆی شاردووەتەوە. مووی برۆ و برژانگ و سمێل و ڕیشی ئەوەندە تیژ بوون، هەرتاڵە موویەکی ئەستوور ڕەش وەکوو تیر ڕێك بوون بە خۆڕایی ناوی گەنجۆ نەبوو. دەبو گوڕ شەرم لەو جۆرە کەڵە پیاوانە بکات، کاتی خۆی مامۆستا سەرباز بوو شەهید بوو، ئەوەتا ئێستاش مامۆستا سەردار و مامۆستا گەنجۆ. لەیەکەم ڕۆژی ناسینی مامۆستایەکان هەتا چەند ڕۆژێك لەمەوپێش بۆ شەڕی سەری سادری بڕۆن، یەکەم جار مامۆستای سەرداری ناسی، یەکەم ڕۆژی دەرس خوێندن بوو بە شەڕواڵێك و کراسێکی سپییەوە هات. تەوار لێی شێوابوو ئەوە مامۆستا سەرداری برادەری مامە شاهۆ نییە. بەچەك و فیشەك دانەوە کەسێکی دیکە بوو، گورج و گۆڵ. خۆی بە قوتابییەکان ناساند. یەك یەك کەوتە پرسیارکردنی هەموویان، بەس لە تەواری نەپرسی. هەندێك هاتووچوو، بەرەو تەوار چوو، سەرێکی بۆلای گوێی برد، تەوار چۆنی؟ هەر هەموویان دایانە قاقای پێکەنین.. وانە و سروودەکانی مامۆستا هەر لە دارا دوو داری دی هەتا بەبەی زەینەب.. سروودەکانی وەکوو فلیمێك هاتەبەر چاوی! مەلا هات، خەڵکەکە ڕێیان بۆ مامۆستا چۆڵ کرد مامۆستا دەستی لەسەر دوو چاوی مامۆستا سەردار دانا.. بۆی مەگرین شەهیدی گەل و نیشتمانن! جێ و ماوەیان

بەهەشتی بەرینە. تەوار ڕەنگی زەردبوو، دنیا لەبەر چاوی سووڕا. هەستایەوە بەرەو دوو شەهیدەکە چوو، بەربووەوە بەدەم غلۆر بوونەوە بەرەو لاشەی مامۆستایەکان چوو. لرخە لرخێکی لێوەهات. پێشمەرگەیەکی[illegible]رسی پێداکرد. مامۆستا تووڕەبوو... دە ئەو مندالانە دوورخەنەوە. مندال بەدەست[illegible] لە مردوو دەترسێت! تەوار کەف و زەرداو لە دەمی هات. هەناسەی زۆر بە زەحمەت دەدا، پێشمەرگەکە فڕاندی لەولاش ساوێن پڕی بە تەواردا کرد، ئەویش هەر دەڕشایەوە. پێشمەرگەیەکی کە ساوێنی لە باوەش کرد. چیتە بابە قسەبکە؟ ساوێن بەدەم تفکردنەوە، مامە ئاوی کانیمان خواردەوە زۆر تاڵ بوو. پێشمەرگەکان تەماشای یەکتریان کرد. هەواڵێك لەناو ناوایی هات... چەند پێشمەرگەیەکی دیکەش ژەهر خواردوو کراون. کێت دی لەسەر کانییەکە؟ ساوێن هێواش هێواش ڕەنگی زەردەبوو، کەفاوەکەی ناو دەم و لالێوی زیادی دەکرد. دوو کوڕ لەسەر کانی بوون. کە ئەمە چووین بەپەلە هەلاتن. دەتناسین؟ نا بەلام تەوار دەیگوت، چەند ڕۆژە لە ناو پێشمەرگانن لەمەقەڕ. جلی چۆنیان لەبەر بوون؟ یەکێکیان جلێکی ڕانك و چۆخەی ڕەشی لەبەر بوو کلاوێکی لەسەربوو. ئەوی دیکەیان شەڕواڵێکی قاوەیی چاکەتێکی سپی لەبەر بوو. پێشمەرگەکان تەماشای یەکتریان کرد تەواوە ئەوانن. بەرەو کوێ ڕۆیشتن؟ بەرەو خوار بۆلای بێدەلان! دەستەیەك پێشمەرگە بەپەلە بەرەو بێدەلان کەوتنە ڕێ. چوارکەسی دیکەیان بەرەو شێنێوزەلێ. دوو پێشمەرگەش لەگەل ساوێن چوونەوە سەر کانییەکە. ڕەنگی کانی زەردباو بوو، هەندێك بەدەوریدا گەڕانو سووڕان... لەسەرەوە کارێز و دەوەنێکی چڕ بوو لە پشت سوولاوکە دەبەیەکی گەورەی سپی بە پوشوپەلاش داپۆشرابوو. دلۆپ دلۆپ ئاوێکی زەردی لێدە هات، دەڕژایە ناو سوولاوکەکە. بەدەم سوولاوکەکەشەوە دەڕژایە ناو کانییەکە. دەستیان دایە دەبەکە و لەگەل خۆیان بردیان. دکتۆر گەیشتە سەر تەواری بە بێهۆشی، دەبێ زۆر بڕشێتەوە. دەرزیەکی لێدا.. تەوار دەڕشایەوە و زەرداوێکی دەهێنایەوە. دکتۆر دەبەکەی دیت. هەندێکی لێ ڕشت، ژەهرێکی زۆر خەستی ترسناکە! دوو پێشمەرگەش ژەهراوی ببوون. دکتۆر ڕووی لە پێشمەرگەکان کرد، دەبێ بەپەلە بیان بەینە خەستەخانە. کەمێك لەولاتر پێشمەرگەیەك بە بێسیمی دەستی لەگەل بارەگای سەری سادری لە تەماس دابوو. باسی دوو کوڕەکەی بۆیان دەکرد، جۆری جلیان، تەمەنیان، دەبێ بیانگرن. تەوار لەگەل دوو پێشمەرگە

ژەهرخواردووەکە بە یاوەری دکتۆر ڕووەو ناوزەنگ کەوتنە ڕێ... دەستەی پێشمەرگە لەڕێگا هەر لەپرسیارکردندا بوون. گەیشتنە بێدەلان، ئەگەر بێت و بەرەو شێنیە ڕۆیشتبن ئێستا نزیکی زەڵێ بوون، خۆیان گەیاندووەتە سەربازگە یان مۆڵگای جاشان، بەڵام ئەگەر بەرەو بێدەلان چووبن ڕێگایەکەیان دوورترە. پێهەڵگرین لەوانەیە بیان گەینێ. کابرایەك دیتبوونی لێرە بوون، هەروا تاوێك لەمەوپێش قەنادیان لەمن کڕی، بەڵام زۆر سەرقاڵ و ترساو بوون، بەپەلە بەو دۆڵەی ئێرەدا بەرەو بێدەلان هەڵاتن. کەواتە ڕێگای ناوشاریان گرتووە. پێشمەرگەکان هەنگاوەکانیان گوڕج کرد.. لەبێدەلان جارێکی دیکە پرسیاریانکرد، ژنێك لەسەر تەندوور بوو دیتبوونی دوو نانیان لە پیرێژن وەرگرتبوو. دوو ئەسپیان لە ناو دێ وەرگرت، چوار پێشمەرگەکە بە چوار ناڵی کەوتنە دوایان. لەسەر کانی سێ پێشمەرگەی دیان دیت پرسیاری دوو کوڕەکەیان کرد. تازە لێرەبوون. لە خۆڕا لێیان کەوتینە گومان، بەڵام نەمان گرتن! بە ئەستۆڕانی وردمان.. بەڵام پاش ئەو گردەی دەبینن لەوێوە سەربازگەیە بگەنە ناو جاشان دەربازیان دەبێت. بە بێ گوێدانە ئەوەی لەگەڵ جاشان تووشی شەڕ دەبن یان نا. بە غارتر کەوتنە دوایان. لە پێشیانەوە کەمێك لە دوور دەنگی تەقە و دەسترێژ هات.. چەند نزیك دەبوونەوە دەنگی تەقەکان زیاتر دەبوون، لە پشت گردێکی ئەودیو دەنگەدەنگ و خرمەخرمی دەسترێژ زۆر بە هێز بوو، دەنگی ئاربیجی و هاوەن. کاتێك لەسەر یاڵەکە نزیك بوونەوە لەو دیویانەوە دەنگی چەند کەسێك دەهات. بەدەم تەقەکردنەوە سێ چەکدار گەمارۆ درابوون، یەکێکیان دوو کوڕی هەرزەکاری لە تەنیشت خۆی دانابوو، بەدوو کوڕەکاندا زانیان پێشمەرگەن. چوارپێشمەرگەکە کەوتنە بانگ کردنیان. لەبەر گەرمی تەقە دەنگەکانیان نەدەبیست. زۆر بە توندی کەوتبوونە بۆسەوە. بۆ ئاگادارکردنەوەیان چوار پێشمەرگەکە دەستیان کرد بە تەقەکردن لە جاشەکان. پێشمەرگەکان زانیان برادەرانیانن بە هاواریانەوە هاتوون. بنبەرد و بنبەرد خۆیان گەیاندە برادەرەکانیان، بەو ناوەدا بڵاو بوونەوە. جاشەکان زانیان پشتگیریان بۆهات، کەمێك دوورکەوتنەوە. شەڕ و پێکدادان دەستی پێکرد. ماوەی کاتژمێرێك تەقە بەردەوام بوو. ئەو دەستە پێشمەرگەی بۆ شێنیەوزەڵێ چووبوون. ئەوانیش بەرەو پیری شەڕەکە هاتن، لەسەری سادریشەوە پێشمەرگە دابەزین، چوار دەوری جاشانیان گرت. لەبەر زۆری پێشمەرگە جاش هەڵاتن و دوور کەوتنەوە.

پێشمەرگەکانی گۆڕەشێر لە برادەرەکانیان پرسی، ئەوانەتان لەکوێ بوون؟ یەکێك لە پێشمەرگەکان گوتی لە قوڕگی شێرمان دەرهێنانەوە. کە بێسیمان بۆ کرا لە سادری دابەزین. چەند هەنگاوێکیان مابوو بگەنە ناو جاشان فڕانمانن، بەڵام لە لایەن جاشەوە حەشرمان پێکرا.. دوو کوڕەکە ترسابوون، هەمان دوو کوڕەکەی مقەڕ بوون. زووڕەزووڕ دەگریان. ماوەیەك ئەو ناوەیان بە تۆپ و هاوەن کوتایەوە. پێشمەرگەکان بەرەو گۆڕەشێر بەڕێکەوتن.

لە ڕێگا پێشمەرگەکان کەوتنە پرسیارکردن لە دوو کوڕەکە. گوێ بگرن هەموو شتێك لەسەر ئێوە دەزانین. درۆمان لەگەڵ بکەن، بەس بۆ خۆمان دەزانین چیتان لێ دەکەین! بەڵام ئەگەر درۆنەکەن دەتانکەینە پێشمەرگە. دەزانین پێشمەرگەتان خۆشدەوێت، دیارە کەسێك فێری کردوون. لەناو کانی پێشمەرگان لەگۆڕەشێر چیتان دانا؟ ماوەیەك تەماشای یەکتریان کرد، سەریان داخست... وایانزانی هەروا پرسیارێکی سەرپێی بوو. پێشمەرگە شێوازی قسە لەگەڵ کردنیان گۆڕا، وادیارە بەتەمانین ئاشکرای بکەن. پێشمەرگەیەك ڕووی لە تەنیشت خۆی کرد هەڵۆ دەستبەکار بە. هاوڕێ هەڵۆ گۆچانێکی سەر زلی لەدەستی بوو. دوو سێجار بەتووندی کێشای بە زەویدا. ئێوە بڕۆن، لەو دۆڵە چۆڵەی چاریان دەکەم! پێشمەرگەکان ڕۆیشتن. هەڵۆ دەستی هەردووکیانی گرت.. ئەو دارحەیزەرانەی دەبینن؟ هەر دووکیان زۆر بە ترسەوە تەماشیەکی گۆچانەکەیان کرد. لەپشتی هەردووکتاندا وردی دەکەم، ئەگەر قسە نەکەن. ماوەیەك چاوەڕوانی کرد. گۆچانی بەرزکردەوە. هەردووکیان هاواریان کرد، دەبەیەکی سپی بوو!. چی لە ناو بوو؟ نازانین! بانگی هاوڕێیەکانی کرد، هەموویان گەڕانەوە. دەڵێن دەبەیەکی سپی بوو. دووبارە پرسیار دەستی پێکردەوە. باشە نەتانزانی چی لەناو بوو؟ نازانین! کێ دایە دەستان؟ کاك وسوو! وسوو لەکوێیە؟ لە فرۆشگا دوکانی هەیە. کام فرۆشاگای شێنێ یان هی قاسمەڕەش ئەوەی لە پێشمانە؟ پێشمەرگەکان دوو کوڕەکەیان لەگەڵ خۆیان بردن بۆ فرۆشگا. لەڕێگا دەیان گوت، وسوو خۆت بگرەو هاتین. دەبێ یان لەژێرداردا پشتت بشکێنین، یان ئەوەتا ناوی هەرچی ناپاکی ئەو دۆڵەیە بۆمان ئاشکرا بکەی. کاتێك پێشمەرگەکان گەیشتن، فرۆشگا جمەی دەهات. کاروانچی و بازرگان و قاچاغچی و پێشمەرگە و سیخوڕی هەر چوار پارچەی لێ بوون. هەریەك لە لایەك خەریکی سەودا و کڕین و فرۆشتن بوو. لەسەرەتایی فرۆشگا،

هەندێك لەبەرزایی ڕیزە چادرێكی لێبوون. یەكەم چادر قەڵەباڵغییەكی لەسەربوو، خاوەن چادرەكە لەگەڵ دوو منداڵەكەی دیت، خۆی بە ژووری چادرەكە داكرد. دوو كوڕەكە، ئەوەبوو، ئەوە كاك وسووە هەریەك پەنجا دیناری داینێ و قەولی هەریەكە و ئەسپێكی پێداین. پێشمەرگەكان چوونە بەردەمی چادرەكە داوایان لەدوو منداڵەكە كرد بانگی بكەن بەڵكوو بە قسەی منداڵەكان بكات، دوو هەرزەكارەكە بەیەك دەنگ بانگیان كرد، كاك وسوو ئێمەین سەردارو سەركەوت، ئەو ڕۆژەی دەبە سپیەكەت داینێ دەمان ناسییەوە، كارەكەی خۆمان كرد. كوا هەقەكەی ئەو پێشمەرگانە هاتوون چەند پرسیارێكت لێبكەن، وەرە دەرێ كاریان پێتە! خەڵكی ناو فرۆشگا هەر هەمووی لە چادر و پێشمەرگەكان كۆببوونەوە. هەركەس دەیپرسی چی بووە؟ كاك نا وسوو ژەهرمان بۆ لەكانی دەكات. چەند جار بانگیان كرد. وەرە دەرێ كارێكمان پێتە. هیچ دەنگ نەبوو. دوو پێشمەرگە چوون چادرەكە بكەنەوە لەدیوی ژوورێ داخرابوو. لایەكی پەتەكەیان پساند، لە گۆشەیەكی تاریك لەبن چەند فەردە تووتن و برنج و گەنم وسوو خۆی شاردبووەوە، دوو كالە سپیەكانی دیار بوون. دوو پێشمەرگەكە هەوڵیاندا بچنە ژوورێ. دەنگی سوار كردن و تەقاندنی چەند فیشەكێك بیسترا. پێشمەرگەكان گەڕانەوە دواوە. خەڵكەكە هەڵاتن، لەوناوە دووركەتنەوە. بانگیان كرد ناپاكیەكانت ئاشكرا بوون، چواردەورەت گیراوە، خۆت بەدەستەوە دە.. ئەگەر لە ماوەیەكی كەم نەیە دەرەوە چادرەكەت بەسەردا دەڕووخێنین! دووبارە دەنگی سێ چوار فیشەكی دیكە هات، ئەو جارەی پێشمەرگەكان وەڵامیان دایەوە. بە ئاسماندا چەند تەقەیەكیان كرد. پێشمەرگە بەدەوری چادرەكەدا هاتن و چوون، لە زۆربەی كونەكانی چادرەكەوە دووكەڵ دەهاتە دەر، بۆن سۆیەك دەهات. باشە ئەو كابرایە لەژوورەوە خەریكی چییە. یان ئەوەتا ئەوەندە شەرمەزاربووە، ڕووی نییە خۆی نیشانی كەس بدات، بانگیان كرد تەقەمەكە وەرە دەرێ نامانەوێت خوێنت بڕێژین؟. دەنگ نەبوو لایەكی چادرەكەیان هەڵدایەوە. لەبن فەردەكان لاشەی وسوو شەلاڵی خوێن بوو. چەند قەوانی فیشەك لەلای كەوتبوون. دەفتەرێك و چەند پەڕەیەك بە سووتاوی لەپێشی كەوتبوون. پێشمەرگەیەك دەستی دایە دەفتەرە سووتاوەكە، بەڵكوو بتوانێت شتێكی لێ دەستكەوێت. لوولەی چەكەكەی بۆلای لاشەی وسوو ڕاداشت. بە خۆكوشتنی خۆی، هەرچی ناوی ناپاك و خۆفرۆش هەیە لەگەڵ خۆی دەیباتە ژێر گڵ. پێشمەرگەكان لاشەكەیان بەجێ

هێشت و بەرەو گۆڕەشێر و بناری جاسووسان بەڕێکەوتن. پێشمەرگەیەك لەبەر خۆیەوە دەیگوت: بەخۆڕایی ناوی جاسووسان نییە. ئەو دۆڵە پڕیەتی لە سیخووڕی هەر چوار پارچەکە، هی دوژمن، نەك بۆ پێشمەرگە. جاسووسان بە درێژایی مێژوو بەلێشاو ناپاك ڕوویان تێکردووە و ناردوونی بۆ بزبڵدانی مێژوو.

# وێنە ڕووزەردەکان تابلۆیەکی خوێناوی دەنەخشێنن

لێرە، لەئاسمانە تەمومژیاوی و خۆڵاوییە نامۆیەکە، کات دیار نییە. شوێنیش وەکوو زەمەن دیمەنەکانی لەچاوتروکاندنێکدا زۆر بە خێرایی دەگۆڕێن. وەکوو سەرشانۆیەکی گەڕۆکی خەیاڵئامێز، ڕەنگەکان لە ناو دوو توێی دیوارەکان بتوێنەوە، بینەری زیندووی بێ هەست و مەلوول، بەدەم دەرکەوتنی ڕووناکی تیشکی ڕەنگاوڕەنگ، تاریکی هەموو دیمەنەکان وەکوو خۆیان غەمبار و نادیار و بێگیان دەکات. لەخۆیان دەپرسن، ئایە تەنها بینەرێکی بوودەڵە دەبین؟خۆ ئەو زامانە لە ڕووح و جەستەی ئێمە نین، یان ڕۆژێک لە ڕۆژان یان دوای چەند ڕۆژێکی دیکە، کێ دەزانێت بۆیی هەیە لەکاتی نمایش و نیشاندانی ئازارەکان وردوخاش بین و تەواوی پێکهاتە و جەستەی ڕەنگەکان تێکەڵ بەیەك بن، ئەوکاتی ڕۆڵی بینەریمان کۆتایی دێت و دەبینە قوربانی قوربانییەکان، خۆ ئەوانیش بۆ ئەوە نەهاتوونە بوونەوە بۆ ئەوەی خەڵکی لەئاست دیمەنی برینە دەمکراوەکانیان چاو لێکنێن و بڵێن، کەس نەیبینێت، جگە لەو تابلۆ مەرگهێنەرەی سەرزەوی، چی دیکە دەبینن؟ نەک ژیانی سەرزەوی ئەو مەملەکەتە وێرانەیە، بگرە ئەستێرەکەشمان بەرەو ئاوابوون دەچێت، ڕوو بەرەو ئاسمان هەڵبڕن، ئەوانەی بەڕوونی دیارن، چەند خاڵێکی کاڵی بچووکن، بەرەبەرە گەورەتر دەبنەوە، چاوی بریسکەدار و دەنووکی قولابی بە دیار دەکەون، وێناکان ڕوونتر دێنە بەرچاو، بە قارەقاریان خۆیان دەناسێنن ڕەوەیەك قەل و داڵی برسی و باڵ گەورەن. بە بەرچاوتانەوە لەتاقی ئاسمانەوە بە ڕەوە ئەوەندەی چاو بڕکات، بەخێرایەکی تیژ وەکوو ڕەشەبا، لەگەڵ هاتنە خواریان بە شاباڵە تیژەکانیان، بۆ هێرش بردن، بەدەم هەڵمەتی سکتێرکردن نیشانەی مەرگیان دەهێنا. بەرەو کوێ دادەبەزین؟ دیارە شۆڕبوونە بۆ سەر زەویە کێلدراوەکە! چیان مەبەست بوو؟ ئاوا بە پرتاو و داغ لە دڵ بۆخۆیان دەزانن بۆچی هەموو تیشک و چاوە سوورەکان لەسەر شاهۆن، ئەوەمان گەرەکە، بە پانایی ئاسمانی ئەو مەملەکەتە پاوانکراوە، چاومان بە دواتدا گێرا، بست بە بستی ئەو دەڤەرەمان تەیکرد، لەهیچ شوێنێک سۆراغت نەبوو، ئەتۆ چیت؟ ماری حەوت قەفیت و لەچاوترووکانێکدا، حەوت فرسەخ دووردەکەویەوە، بۆ پشوودان لەبن پنچکە گیایەک پەپکەی دەکەی، بۆ چاوبەستن

و به لاریدابردنی نەیار و شوێنهەڵگرەکانت، پێستی خۆت دادەماڵی و کاژەکۆنەکەت، کتومت لە شێوەی خۆتە، لەسەر گاشەبەردێکی گەورە بەرچاو دادەماڵی، ئەوانەی عەودالی دیتن و لەناو بردنی تۆن، نازانن ئەوەش یەکێکە لە هەزاران فرۆفێڵەکانت، لەهەر چوار کەنارەوە گەمارۆت دەدەن، چەند جار خۆیان ئامادە دەکەن بۆ هەڵمەت بردن، ناوێرن لێت نزیک ببنەوە، یان ئەوەتا نەماوە، یان لە خەوێکی قووڵی درێژخایەن دایە، هەتا وەئاگادێیت، بواری هەناسەدان و چاوگێڕانت نەماوە، تەنانەت بۆ دیتنی دوا نیگای بکوژەت، کەچی هەریەکە پارچە پێستێکی بێکەڵکی بەبەر ددان دەکەوێت، بە دەم جوینی کاژەکەوە ئارەقەی شەرمەزاری دەردەدەن، هەرچی نێچیری لە تۆ باشتر وەلامانا، کەچی مایەپووچ دەرچووین. لەبەرانبەر ئەو چاوچنۆکیە، هەل لەوە باشر دەستناکەوێت دابڕاوی لە هاورێیەکانت، تاکو تەنیا ماویەوە، کەسێکت لە دەورە نییە بۆ یارمەتی دانت، بۆ لە ناوبردنی شاهیدحاڵێك ترسمان لە چەند شاهیدی تر نییە، چەند وەختە قارەقار و قیغەقیغمان لە خۆمان بڕیوە هەتا هەست بەبوونمان نەکەی، شاهۆ بە هاوارە کە خودی خۆی دەنگی نووساوی خۆی نەدەبیست، تەفروتوناتان دەکەم قەل و دالە کەرخۆرە نەگریس و دزێوەکان، دەتان کەمەپەندی زەمانە. بە قەناس سیرەی لێدەگرتن. دووبارە کەوتیەوە خووگرتن و ڕۆحی یاخیگەری لە دەمارەکانتدا سەری هەڵدایەوە، ئاخ تەواوی ژیانت چەند یاخییەکی لێوەشاوە بووی، بەبەر تاك تاکی فیشەکمان دەدەی، چەندمان دەپێکی، ها بزانین چەند؟ سەد دوو سەد هەزار دەهەزار، کوڕە بڵێ ملێون، بە هیچ شتێك قەلاچۆ نابین و کۆتاییمان نایەت، هەرچی گوللە و جبەخانەی دنیا بەشمان ناکات، بێهوودەیە! هەرچی کیمیایی هەیە ڕشتان، میللەتێك مەفح بووەوە، ئێمە هەر دانە یەکیشمان مردار نەبووە، ژمارەمان هەتا دێت لە زیاد بووندایە، پەروباڵەکانمان گەورەتر و درێژتر و تیژتر دەبن، لاشەمان قەبەتر و گەورەتر دەبێت، چاوەکانمان سوورتر و خوێناویتر دەبێت، لە چاوەکانمان ڕامێنە ئەگەر هەترەشت نەچووە، چی بەدیدەکەی؟ سوورتر سوورتر و خوێناویتر بوونە، واهاتین بە خێرایی ڕەشەبا و بە گڕی ئاگر هاتین، چەکەکەت فڕێدە و سووجدە ببە، بپاڕێوە و داوای لێبووردن و بە خشین بکە، بۆ تۆ بە خەیاڵی خۆت وادەزانی پێکهاتەی ئێمە لە ڕەگ و خوێن و ئێسقان و پێستی تەنکە، لە پۆلا و پتەوترین کانزا و مەعدەن دروستکراوین، گەورە و سەردارەکانمان وایان بوونیاد ناوین، بە هیچ ئاگرێک

ناتوێینەوە و لەناو ناچین، ئێمە گە ورە و سەرداری تۆین، ئێمەش سەردار و سولتانمان هەیە بە فەرمانی ئەوان دەجولێینەوە، سەردار و سوولتانەکانیشمان وەکو ئێمە بەندە و کۆیلە و نۆکەری پادشاکانی ئەهریمەنن، ئەگەر پەلە نەکەی هەتا دادەبەزینە سەر زەوی، پێش ئەوە گیان تەسلیم نەکەی، بگەینە سەر لاشەیەکی سارد و سڕ، ئەوجا یەکە یەکە دەمانناسی، دالآشی لاشە خۆر هەموو یە ك جۆرن، بەڵام گروپ و تاقم و دەستە و جنس و جۆرەکانی دیکە بناسە، زۆربەیان هاوزمان و هاوشێوە و هاوڕەگەزی خۆتن، بە ئارەزووی خۆت بپرسە، کێن و چییان لێت دەوێت، هەموو شتێکت بۆ باس دەکەن، نهێنیەکانت بۆ ئاشکرا دەکەن، گرێی دڵی خۆیانت بۆ دەکەنەوە، چونکە دەزانن چەند چرکەیەك پاش بە یەکگەیشتنتان کۆتایی بە ژیانت دێت، بۆ خۆت دەزانی لەسەرچی، ئەو داڵدەدان و خۆت و هاورێیەکانت جانفیدای کەسێك منداڵێك کچۆڵەیەکن، بە پاراستنی و مانەوەی لە ژیان هەموو تاوانەکان و تاوانباران لە دیدەی تۆوە ئاشکرا دەبێت، ئەو کاتە نەک ڕیسەکەمان دەبێتەوە، بەڵکوو سووک و ڕیسوادەبین و بەیەکجاری دەبینە پەندی زەمانە، دادگاییەکی تاوانی مێژووییمان بۆ دەبەستن و سزای مەرگ و لە سێدارەدان سەد دەر سەد چاوەڕوانمانە، پێش ئەوەی گەردنمان لە پەتی قەنارە بکشێت، ئەو گەردنانەی ماون بیانشکێنین، ئەگەر هات و ئەوەمان کرد، کارەکەمان مەیسەر دەبێت و هیچ بەڵگە و ئیسپات لەدەست کەس نامێنێت، بەڵام ئەگەر ئەوە هەر ئێستا و لەو شوێنە و لەو گۆڕستانە خەیاڵییە بە پەنهانی ئەنجام نەدەین، هەواڵ گەیشتە زارێک دەکەوێتە شارێك، پاشان هەموو سنووری وڵات دەبەزێنێت و بە هەموو گۆشەیەکی ئەو گەردوونەدا وەکوو گازی کیمیایی تەشەنە دەکات و بڵاو دەبێتەوە، واهاتین بۆ ئەوەی خۆشت و کۆرپە تاقانەکەشت زیندەبەچاڵ بکەین، دەزانین وەکوو ڕۆژی ڕوون لێمان ڕوونە کچی خۆت نییە، دۆزیوتەوە، بەڵام هیچ دایک و باوکێک نیو ئەوەندەی تۆ بۆ منداڵەکانیان دڵسۆز نین، ئەو دایک و باوکانەی لەکاتی هەڵات هەڵات و لێقەومان، دەستبەرداری جەرگی خۆیان بوون کەم نین، لە تۆش چاپووکتربوون، بەڵام تەسلیمی هەقیقەتێک بوون، شەڕیان پێ لەگەڵ دەستوپێوەندی ئەهریمەن و بازرگانانی جەنگ نەکراوە، بەتەمای بە گۆڕین و ناو و جێگا و شێوە و ژیانی لە خشتەمان بەریت، چەند وەختە شاخ بە شاخ و پنچک بە پنچک و کون بەکون بە شوێنیەوەین، ئەوەی ئاستەنگ بووە لە پێش دووربینی چاوە سوورە تیژەکانمان ئەو هەوری ڕەشی

کیمیایی و خاک گرگرتنه بووه، ئەتۆ هیچ لەسەر ڕابردووی ژیانی چەند ساڵەی ئەو کچەو بنەماڵەکەی نازانی، لەکام خانەوادەیە لەکوێ ژیاوە، کچی کێیە، هەتا تەمەنی بەتەواوی نازانی، هەروا هەشت نۆ ساڵێک دەبێت، دەتوانین هەموو زانیارییەکت بدەینێ، بەڵام تازە دادت نادات و بۆ چەند چرکەیەک با بەدەم ئازارەکانتەوە بناڵی ئەوەک بیرو هۆشت بە لای بنەماڵەکەیدا بڕوات، هەر چەندە سەرگوزشتەکەی ئەو کچە ئەفسانەیە و نەمرە، لە تۆ نەک باشتر ناگادارین، بەڵکوو لەگەڵدا بووین، پاش کەمێکی دیکە ئەو تەڵقینەدەرو چەکدارو هەزاران هەزار ملیۆنان میلۆنەی بە شداری ئەو هەڵمەتی قڕکردن و قەلاچۆیەیان کردووە، مشوورتان دەخۆن و کۆتایی بە ژیانتان دێنن، تەواو نزیکدەبوونەوە. چاوەگەورە تیژەکانیان سەرەتا ڕەش ڕەش لەگەڵ قاڕەقاڕ و وژەوژەیان لەسەر زەویە سووتاوەکە نزیك دەبوونەوە. چاوەکانیان سوور سوور دەبوون وەکوو گۆمی خوێن. قارە قاڕێکی پێکەنیناوی، یان پێکەنینێکی بە قارە قار، وەکوو شریخەی هەورەبرووسکی بەهار، دەیان گرماند. شاهۆ لە ناو تەمومژێکی زۆر چڕ بەسەرسووڕمانەوە لە گۆڕستانێکی کێل بالا بەرز. زۆربەی گۆڕەکان زۆر بچووك بوون، بەژن و باڵایان بە کەسانێکی کورتەباڵا یان منداڵ دەچوون. مۆمی تەمەنیان لەچەند بەهارێك تێپەڕی نەکردبێت. هێشتا چێژی خۆشی ژیانیان نە چێشتوە، تاڵاوی مەرگ بە قوڕگیاندا کراوە. دواپەڕەی سپی ژیانیان گەچڵاوە و بووەتە خۆڵەمێش، خاکی گۆڕستان بەشی نەکردوون یان ژمارەیان لە ژماردن نەهاتوون. شاهۆ لەناو کۆمەڵە کەسێکی نەناسیاو خۆی دۆزیەوە. کەسە غەوارەکان بەجلی ڕەش هەریەکە و عەبایەکی وەکوو قەترانی ڕەشیان لەبەردابوون، لەپاش ڕۆیشتنیان بە چەند هەنگاوێک لە دوویان دەخشان و بەیداخ و ئاڵای ڕەشی نیشان دەدا، ئەوانە کێن؟ ئاجوجو باجووجن، نوێنەری خودای شەڕن، بۆ لەژیانیدا ڕێکەوتی کەسانێکی لەو جۆرەی نەکردووە. تەنها لە چیرۆک و ئەفسانە خۆڕافیەکاندا ناویانی بیستووە، کەچی ئەوەتا لەبەر چاونی و ژمارەیان وەکوو گەڵای داران زۆرن. هەر هەموویان یەك جۆربوون بەژن و باڵایان زۆر زەبەلاح و قژ لوولی هەتا سەر چۆکیان، لەگەڵ ڕیشوسمێڵیان تێکەڵاو بووبوون، کەزی و کاکۆڵ و ڕیشیان بە چەند حەڵقەیەکی تەڵایی بریقەدار بەیەکەوە گرێدرابوون، بەبێ ئەوەی هیچ تروسکایەکی تیشکی خۆر یان هەتا ڕۆشنایی فانۆسێکیش بەریان کەوێت، دەبریسکانەوە و پێش خۆیان ڕووناک دەکردەوە.

هەریەکەی پەرتووکێکی قەبەی ئەستووری خۆڵاوی زۆرپانیان لەدەست بوو. کاتێک دەیان کردەوە، لاپەڕە و دێر و ڕستەکانی بە خوێن نووسرا بوونەوە، نەک دڵۆپ دڵۆپ بە ڵکو بە لێشاو خوێن لێیان دەچۆڕایەوە، لەپاش خۆیانەوە گۆمی لینجی خوێنیان جێدەهێشت، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ڕەوە داڵ و قەلەڕەشەکان، یان وەکوو ئەوەی هەر هەست بەبوونیشیان نەکەن... تەماشای شاهۆیان دەکرد. کەسە غەوارەکان بە گۆچانە گەورەکانیان هێمایان بۆ باوەشی دەکرد. بە نەڕەو گوڕەوە دەیان گوت، بە فیکەیەک هێمایەک قەل و داڵە بێشومارەکان ونجڕونجڕت دەکەن، بەڵام نامانەوێت ئەو کارەت لەگەڵ بکەین، ئەو لاشەیەی دەستت هێشتا نوزەی تێدا ماوە و هەناسە دەدات، ڕادەستمان بکە، کەسمان لەکەس، ئەتۆ بەردەوامبە لەسەر گەشتە دوور و درێژە بێ ئامانجەکەت، بزانە دەگەیە کوێ، چەندین ساڵە بە دوای سێبەری خۆتدا ڕادەکەی، هەر غاردە و غاردە. ئێمەش بۆ چەند ئەنفالێکی دیکە، خۆمان ئامادە دەکەین، بەڵام ناوەناوە لە نێوان هەر ئەنفالێک و ئەنفالێک، ئەنفال بێپسانەوە، ئەنفال بێ کۆتایی، پێویستیمان بەوەیە پاشماوەی تاکو تەرای هەڵمەتەکان کۆکەینەوە، بۆ ئەوەی نهێنی و پلانەکەمان ئاشکرا نەبێت، هەرچەندە ئەو هەموو ژمارە ئەنفالانەی بەقەد گەڵای داران کردووە، قەد شەرمەمان لەکەس نەکردوە و لە کەسیش نەترساوین، بۆ بترسین؟ کەس هەیە بتوانێ ئەنفال دژی ئەنفال بکات، خۆ هەتا بشخوازێت ناتوانێت، میللەتێک لەگەڵ شیری بەر مەمکانی دایکی بیری ئەنفالکردن بە قوڕگیدا نەکرابێت، بەگەورەیی فێرنابێت، ئەوە لەدوای ئەوە بەو گوێرەی سەردەم ئەنفال جیبەجێ بکرێت. شاهۆ چاوەکانی بە گومانەوە بەچواردەوری خۆیدا دەگێڕا. چیان لەمن دەوێت؟ ئەو جانەوەرانە کێن؟ شوێنەکەش و کەسەکان و هەتا خاك و خۆڵەکەشی نامۆبوون بۆی. لەژیانی چەند ساڵەی پڕچەرمەسەری پێشمەرگایەتی بەردەوام سینگی بەبەر گوللە ناوە، کەم چیا و دوڵ و نزار و ڕووبار و دەریاچە و زێ و تیکە شاخ و ئەشکەوت هەیە بەرچاوی نەکەوتبێت! یان شەڕی خوێناوی لێ نەکردبێت. لاشەی بێگیانی خوێناوی دەیان بگرە، سەدان پێشمەرگە و هاوڕێ لە کۆڵ کردووە. لە نێو دەیان تەلبەندی مۆلگا و سەربازگەی سەخت، شەهیدی بە باوەش ڕزگار کردووە. چەندین جار مەرگ لەو ڕەوە قەل و داڵانە و لەو جانەوەرە عەباڕەشانە بە گوڕتر بەتەمای لوولدانی یەکجاری بە گیانی ئاشنا‌تربووە. کەسیان بەقەدەر ئەو تەرمەی باوەشی تووشی ئازاریان نەداوە. کێ

دەڵێت تەرمە؟ جەستەیەکە و بۆماوەیەک لەباوەشی گەرمی باوکی خۆی بە نارامی چاوی لێک ناوە، هەتا مامە شاهۆ هەناسەی تێدابێت و لە نزیکی بێت، ترسی نەک لەکەس نییە بەڵکوو مەرگ بە یاری منداڵان تێ دەگات، بەڵام ئەوەتا مامە شاهۆش لێی بە گومانە، حەزی دەکرد، پڕ بەگەرووی هاوار بکات، مامە شاهۆ ماوم هەناسە دەدەم، هیوام بە ژیان و دوا ڕۆژ و بڕوام بە بازوو و مەچەک و بیری تیژی تۆ هەیە، ڕام وەشێنە، تۆ خۆت بێدارکەوە، ڕاپەڕە! شاهۆ، ئەو هەموو ئاهونزوولەی نەدەبیست، هەرچەندی دەکرد باوەڕی بە خۆی نەدەکرد ئەوەی لە باوەشیەتی تەرمی تەوار بێت. دەبێ لاشەی ساردوسڕی بێگیانی هەرکەسێک بێت،

نابێت تەوار بێت. دەمەوێت خۆم هەڵخەڵەتێنم، فێڵ لە خۆم بکەم، شێوە و ڕوخسارت بە یەکێکی دیکە بچوێنم، خۆزی ئەوەی نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ لە ناو پەرەی دڵ و هەناوی هەڵی گترووم، دووبارە گیانی هاتبایەوە بەبەردا و، بەبەرچاومەوە گیانی سپاردبا و تۆ نەبای، لەمەودوا لەکاتی دڵتەنگی و نشوستی و تەڵەزگەدا کێ غەمرەوێنی وەرهەمەکانم بێت، کێ؟ دڵم بە کێ و بەچی خۆش بێت، بە ژیان، ژینێک بێ تۆ مانای چییە؟ هەر لە چاوە شینەکانی ڕادەما. چاوەکانت پێم دەڵێن جلیوە و جوڵەیان تێداماوە. ژیان زۆری تێداماوە، هێشتا بە باوەشی دایک و باوک و خۆشک و براکەت شاد نەبویەوە، هێشتا سەرگوزشتەی تاڵی تەمەن پەپوولەییت بۆ کەس نەگێڕاوەتەوە، هەر بۆخۆت دەزانی سەربردەی ژیانی خۆت بگێڕیەوە، سی و سینە بچووکەکەت، ئێسقان و دەمارەکانت، دێنە قسە لەو کاتەیدا چەند بەژان و نازاربوون. نەگەر تۆ نەمای، کەسێکی بێ ئاگا دێت و بە ناوی تۆ و هەزاران ئەنفالکراوەوە قسە دەکات، تەنها دەتان کات بە ژمارە، نازانیت ئەو ژمارانە مرۆڤ بوون، دوژمنەکانتان هەر ناناسێت، ئەو نازانێت بپرسێت، هەموو نەیارەت لە کوێوە بۆ پەیدابوون، خۆ تۆ بەهاری تەمەنت لەچەند چرۆیەک تێپەرناکات. ئەوانەی بەگوڕ هەوڵیاندەدا تەرمەکەی لەدەست برفێنن تەنها عەبا درێژە ڕەشپۆشەکان نەبوون، لەبەرامبەریانەوە کۆمەڵێك پاسداری ڕیشنی چڵکنی چاو بە قووڵاچ و تینووی خوێن و زەوتکردنی نازادی. هەر ئەوەندەیان دەگووت، نازادی نییە، ئەوانیش وەکوو عەبا ڕەشپۆشەکان بەپەلەبوون بۆ لە گۆڕنانی هەرچی زووی تەوار. چونکە دەیانزانی ئەوانیش لەو تاوانە گەورەیە بەشی خۆیان شەرمەزارییان پێدەبڕێت. بە فارسییەکی تێکەڵ بە

عەرەبی، لەگەڵ کۆمەڵێك چەکداری جل ڕەنگاوڕەنگی لەڕولاواز دەدوان وەکوو ئاغا و سەرداریان بن. ئەوانیش زۆر ملکەچ بوون بۆ فەرمانەکانیان. ئەوانە بوون بەپێش پاسدار کەوتبوون و گوند و شار و داڵدەکانیان نیشاندابوون، بۆ کاولکردنی کوردستان، دەستی غەوارمیان گرتبوو. بەدەم کرووزانەوە دمیان گوت، فەرمان فەرمانی سەرەگەورەکان بوون، ئەوان لەسەردانە بەردەوامەکانیان بەدەم نۆشینی مەی و بە بێئاگاییەوە لەسەر هەموو شتێک ڕێککەوتوون، بەتووندی فەرمانیان پێکرا، ئەولاشەمان ڕادەست بکەن. بە تەنیشت چەکدارە جل ڕەنگاوڕەنگە ڕووزەردەکانیشەوە، جاش و سوپای ئێراقی بوون. ئەوان هەوڵی ئەومیان دەدا بەزوویی زیندەبەچاڵی بکەن، چونکە ئەوان چێژ لە زریکەی زیندەبەچاڵکردنی منداڵ دەکەن، لاشەی سارد و سڕی بێگیان ئەوەندەیان فڕێداوەتە سەریەك بێزاربوون. بەهەر هەموویان بازنەیەکی ئاگرینی قەف قەف، وەکوو گورگی برسی بەدەوری تەوار و شاهۆدا کردبوو. چەند مەلایەکی زانای ئاینی (بەعسی) بە مەندیل و ڕیش و جوبەی سپیەوە. ئەوانە بوون کاتی خۆی پێش دەستپێکردنی شالاوی ئەنفالی قڕکەر فتوای بە شەرعیکردنییاندا بوو، تالان کەن، فەرهوود لە دێرزەمانە ڕێگاپێدراوە، فەرهوود کەن، هەرچی هاتە بەردەست و بەرچاوتان حەلاڵی خۆتانی کەن. سەروماڵ و منداڵ و هەموو شتێکیان حەلاڵی خۆتانە، کچ و ئافرەتەکانیان هەرچی جنسی مێینەیە، کەنیزە و کارەکەری خۆتانن، غەزایە. هەر کەسە و بەزوویی دەست بە قەتڵ و قەلاچۆ بکەن، مەلایەکان لەوکاتەوە خۆیان فرۆشت، بە دیتنی لێشاوی دینار بەهەزاران، بە تێلیس و جەواڵ، دەستبەرداری سووت و سەلەم و خێر و خێرات بوون ویژدان و میللەت و خاکیان فرۆشت، پەرستگا و مزگەوت و تەکیەمان بۆ چییە؟ دراو و تەلا و زەوی و کچی شۆخوشەنگمان گەرەکە.

زۆر بەپەلە بوون، بێنن بەعەرەبی زوو تەلقینی بدەن، بەو کارەیان یەکەم جار دژی پەیامی خۆیان وەستان. لەباتی ئەوەی فتوای ئەوەیاندابا هەرکەسێك دەستی چەك دەگرێت، لەڕووی دوژمن هەستێتەوە. ئەوانە نەك کوردستانیان کردە گۆڕستان، هەرچی مزگەوت و سەرمەزاری شێخ و مەشایەخ و جێنزرگەی هەرچی ئیماندارە بە قورئانەکانیانەوە سووتاندن و سووکایەتیان پێکردن. سەدان جار مزگەوت بە میمبەرەوە لەکاتی بە جێگەیاندی نوێژ مزگەوت و میمبەر و دار و بەردی بەسەریاندا ڕووخاوە. چەند ئەنفالچییە خوێنمژەکان زیاتر لێیان نزیك

دەبوونەوە شاهۆ توندتر هاواری دەکرد. تەوار، تاقە کچە چاو شەهێنەکەم چاو لێکنەنێی ئەتۆ دەبێ بمێنیت، هەر هەموومان بمرین و ژیانمان کۆتایی بێت، کۆتایی تۆ نابێ بێت، ژیانی خۆت بەو هەموو کوڵەمەرگییە بۆ نەوەکانی داهاتوو بگێڕەوە بابزانن دووکەڵی ژەهرت لە دەریاچە و بنار و سەرکانی و لەژێر تاڤگە و لە ئەشکەوتە قووڵ و تاریکەکان هەڵمژیوە. ئەو سییە بچووکانەت لە هەمووکەس زیاتر لە کەلێن و قوژبنەکانی ژەهری هەڵمژراوی گەلاڵە کردووە. بەو دڵەت هێشتا بەقەد هەنارێکی قاشکراوی سوورسوور وەکوو کوڵمەکانت ژان و ئازارێکی بێکۆتایی میللەتێکت هەڵگرتووە. ڕزگارکەرت تەنها پارچە لبادێک بوو، ئێستا هەزاران کەس لە تۆ لەبەرگریدان، تکادەکەم گوێم لێ بگرە، گوێ لە گەریدەیەکی بریندار و کڵۆڵ بگرە. گەدایەکم و هاتوومەتە بەر قاپیت، نەک بۆ سواڵکردنی بژێوی ژیان، بەڵکوو بۆ مانەوەت لە ژیان، ئەو کەسەی تاکە ئاواتی خۆشگوزەرانی تۆ بوو، هێشتا سۆز و پەیمانکەم بەجێنەگەیاندووە، لەسەرەتای نازانم ناوەڕاست یان کۆتایی گەڕانەکەمدام، بۆ دۆزینەوەی کەسێکت، کەچی ماڵئاواییم لێدەکەی. شاهۆ لەبەرامبەر ئەو مەرگە لە ناکاو ئەفسووناویە دەستەوەستان بوو. هەرچەندی دەکرد باوەڕی بە دڵ و چاو و مێشکی خۆی نەدەکرد.. کەسەغەوارەکان، دیار بوو کاتیان لە پێش نەمابوو، هەتا دەهات بازنەی گەمارۆیەکەیان لە تەوار و شاهۆ بچووک دەکردەوە. شاهۆ هەوڵی دەدا بەخۆ و بە تەوارەوە هەڵبێت، هەتا پێی پێوەیە لەو ناوە دوور کەوێتەوە. ڕوو لە شوێنێک بکات، دوور لە دیدەی ئەو جانەوەرانە، بەڵام پێیەکانی دەتگوت وەکوو کانیا و کارێزەکانی تەواوی وڵات لە چیمەنتۆ گیراون. هەر پێیەکی بە قەد بنەدارگوێزێك ئەستوور بووبوون، لاشە بەرگ سوورەکەیان لەدەستی فڕاند. تازە تەواو ئەو دنیای بەجێ هێشت، بەتەمای چی؟ دەنگێك لە ناو عەباڕەشەکان دەستێکی بە ڕیشە درێژە کەیدا هێنا، دەفتەرەکەی بنبالی کردەوە، یاسای ناو دەفتەرەکم دەڵێت، دەبێت ئەو کچە شوومە لە خاچ بدرێ، هەردووک دە ست و پێیەکانی بە مێخ بە تەختەی خاچەکەوە بکوترێن، ئەو شاهۆیەش بە تەنیشتیەوە بە هەمان شێوە وەکوو دزەکانی ئەولاو ئەولای عیسای مریەمە بهدەم ئازاری برینەکانیانەوە گیانیان دەرچێت، پەلەمان چییە، ڕوژێك نا دوو ڕۆژ، دوو ڕۆژ نا هەفتەیەك، هەتا شەش مانگ دەتوانین بە دیارییانەوە ئێشکبگرین، شەش مانگە بە دوایاندا وێڵین، لە چاوەڕوانیدا چاوەکانمان تەواو کزبوون. شاهۆ کاتێك

بزماره گەورەکانی دیت، پشکۆیەك لە ئاگربوون، ئەوساتە هەستی کرد قورسایی پێیەکانی لەو خاچە ناسنینە زەبەلاحەوە هاتووە، کە لەژێریدا دەناڵێنێت لەگەڵ سەنگی خاچەکە، تەواوی مورەخەی پشتی و پەراسووەکانی تێکشکاون، ئەژنۆیەکانی تەواو نووشتاونەوە و بە زۆر خۆی لەسەر پێیەکانی ڕاگرتووە، هاواری کرد، پەیامبەر عیسا لە خاچدرا، کەس خۆی لە دایکە مریەمەی نەگەیاند، ئێوەش دەستبەرداری تەوار ببن و من لە خاچبدەن. دەنگێکی بەرز بە هاوار و فەرمانەوە بە دەم خڕکردنەوەی بە ڕوو گیپاڵە زلەکەی و ڕاستکردنەوەی مەندیلە سپییەکەی پێی گوت، نەخێر! ئەو دەفتەرەی تۆ کۆن بووە و سەردەمی بەسەرچووە، بۆ مەملەکەتێکە جیاواز لێرە، پاش ئەو پەیامە چەندین پەیامی تازەتر پەیدابوون، لە خاچدان بۆ کەسێکە زیندوو بێت و لەوپەری تەندروست باشیدا بێت، کەسێك لە ئاویلکە و سەرەمەرگدا، لە کوێ هەست بە نازاری داکوتنی بزمار لەلەپی دەستی دەکات، هەتا فریای یاسین لە سەر خوێندن ناکەوێت، فاتیحەش شموولی ناکات. شاهۆ پڕ بەگەڕووی هەڵزڕاوی هاواری کرد، دەم خۆش ئەی لە جێگای گشت پەیامبەرەکان، دادپەروەری تەنها لای تۆ هەیە، کابرای تەنگەستوور، قاقا پڕ بە گورستان پێکەنی، قاقایە ناقولاکەی بە تەواوی مەملەکهتە تەنراوەکە دەنگی دایەوە، بە بێ قسە و پەرچەکردار بیشارنەوە. بە چەند دەستێك تەواریان شۆڕ کردەوە بەرەو گۆڕێکی بچووکی قووڵ. شاهۆ بە هەموو هێزی پاڵی پێوە دەنان. هەریەکەیان ئەوەندەی شێتێکی جناوی بەهێزبوون بە قامکێک پتێکیان لێدەدا چەند مەترێک بە هەوایدا دەفڕی و دوور دوور بەسەر پۆلوی گەشی ئاگردا دەکەوتەوە، جزە لە بەندەنی هەڵدەستا، بەڵام بێ گوێدان بەدوای چەکەکەیدا دەگەڕا، کوا؟ کەمێك لەمەوپێش تەقەم پێکرد؟ ئەوچەکەی لەژیانی چەکداریمدا بە بست و بۆ چرکەیەک لێم دوورنەکەوتووەتەوە، هەتا بۆ خوی شەوانیشم لە باوەشم بووە و ڕەخت و فیشەکدانەکەم سەرین و بالیفم بوون. بە بەرچاوییەوە بە هێواشی تەواریان لەناو گۆڕەکە درێژ کرد. چاوەشینەکانی بۆ ئاسمانیان دەڕوانی، تررووسکایی چاوەکانی بێباکانە وەک گوڵنەستێرە دەدرەوشانەوە، هێرشی بۆگەنی قەل و داڵە برسییەکان زیادیان کرد. شاهۆ خۆی ڕادەپسکاند لەدەستیان دەربازی بێت، بە وژەی باڵی داڵەکان بەردەبووەوە و چەند مەترێك خلۆر دەبووەوە، بەپەلە هەڵدەستایەوە.، خۆزگە پێش ناسینی تەوار فیشەکێکی گێل ساردی دەکردمەوە. هاواری دەکرد نابێ نابێ

کۆتایی نایەت. بەتەنیا جێم مەهێڵە. نابیبینێ... هەر ئەوەندەی زانی لە بەرزاییەوە لەلووتکە و لە پێدەشت و لەبنار، بەهەزاران کەس هەتا چاوبڕ بکات، بەمەشخەڵی ئاگر بەرەو بانگەواز و داخوازیەکەی هاتن. مەشخەڵە ئاگرەکان ئەوەندە زۆر بوون، واتدەزانی گڕکانێکە و تەقیوەتەوە بەقەد باڵای چیا ئاگر داوێژێت. یەکەم جار داڵاشە چاوسوورەکان لە ئاسمانەوە حەشاماتی مەشخەڵ بەدەستیان دیت، بە قیڕەقیڕ بەرەو قووڵایی ئاسمان لەناو تەومژ بزربوون. مەشخەڵ بەدەست گەیشتنە بەردەم گۆڕستان، شوورایەکیان بەدەوریدا دروست کرد، پاشان گەیشتنە سەرسەری ئەنفالچی و ئەیارانی تەوار. بە دیتنی ئەو هەموو ئاگربەدەستە، ئەنفالچیەکان ترسان و بەپەلە بەرەو خوار هەڵاتن. ملیان بەرەو دەریاچە نا، دەریاچە نەمابوو، بووبوو بەدەریالووش، شەپۆلەکانی سوور سوور ئەوەندەی بەرزترین چیا بەلرفە لرف، هەموو شتێکیان ڕادەماڵی. بەهەزاران کەس لە دەریالووش دەهاتنەدەرێ. بازنە ئاگری قەف ئەستوور بەدەست، بەرەو سەر بەرەو گۆڕستان بەڕێکەوتن. لە چاوتروکاندنێکدا لەگەڵ مەشخەڵ بەدەستەکان بەیەك گەیشتن، چەند دەستێکی سپی کریستاڵی بۆ ناو گۆڕەکە شۆڕ بوونەوە، زۆر بە هێواشی تەواریان لەگۆڕ دەرهێنا، دەستەکان درێژ بوونەوە، بەرەو ئاسمان تەواریان نیشانی مانگ و شاهۆ دەدا، بزانە جریوە و تریفەی کامییان ڕۆشەنتر و خۆش ئاوازترە. وەکوو چەند جرجێکی ترساو و زەندەق چوو، سوپاو پاسدار و چەکداری جل ڕەنگاوڕەنگ و مەلا و عەباڕەشەکانیان قۆڵبەستکردن و هەر هەموویان لە گۆڕنان. لە گۆڕێکی ئەوها بچووك ئەو هەموو حەشامەتە جێگای بووەوە. بەزمانی کوردی، فارسی، عەرەبی هاوار و نزا و پاڕانەوەیان دەگەیشتە بەری ئاسمان. ئەو دۆزەخەی تەواوی ژیانیان وێردی سەر زمانە لووسەکەیان بوو، بووە نەسیب و دوا مەنزلگایان. هاواریان دەکرد، دەنگیان وەکوو قروسکەی سەگ بوو، بمان بەخشن، بەزەیی ئەوە دوا تاوان و ئەنفال دەبێت دەرهەق هیچ بوونەوەر و زیندەوەر و میللەتێک دەیکەین، گوێ لە داد و فیغانیان نەگیرا. بکروزێنەوە، بلاڵێنەوە، بەو کارە نامرۆڤانەیەتان، گۆڕێکی تەنگ و تاریکتان بۆخۆتان هەڵکەند. بەفووی چەند مەشخەڵ بەدەستێك سەری گۆڕ داپۆشرایەوە دەنگەکان کپبوون و نەمان. تەوار و شاهۆیان لە کەژاوەیەکی سپی چواردەورە و سەر و بنی بە باقە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ نابوو. لەسەر شانی مەشخەڵ بەدەستەکان بەرەو لووتکە هەڵگەڕان.

حەشاماتی ئاشقانی تەوار، شاهۆ دەموچاوەکانی دەناسینەوە ئەوانە بوون لەوڕۆژەیەوە وەبیری دێت، قوربانی دەستی زۆرداران بوون! شەهیدو قوربانیانی ڕێگای ئازادی بوون. لەناو کەژاوەی ڕەنگین تەوار وەخەبەر هاتبووەوە هەر بەولا و ئەولای خۆیدا دەڕوانی. مەشخەڵ بەدەستەکان بەبێ وچان هەتا سەری لووتکەی چیا، کەژاوەیان بۆ تەنها جارێکیش دانەنا. لە دوندی چیا لەبەرزترین شوێن. مەشخەڵ بەدەستەکان دەستێکی سپی پەری ئاسایان بە پشتی تەواردا هێنا. کەسانی دەریا لووشە خوێناویەکە دەستێکی خوێناوی بە پشتی شاهۆدا هێنا. شاهۆ هاواری کرد، ئەو جیاوازییە چییە؟ ئەمن و تەوار یان جێگا پەنجەی سپی یان هەردووکمان سوورسوور. تکادەکەم ئەو پەڵە خوێنانەم لێ دوورخەنەوە. دووری خەنەوە دووری خەنەوە.... ڕەنجبەر شاهۆی ڕاوەشاند.. هاوڕێ هاوڕێ چیتە؟ چەند جارێك، ئەولا و ئەولای پێکرد. سەری لە ئامێزی گرت. ئارەقەی ڕووخساری دەسڕییەوە و بە ئەسپایی فووی لە دەموچاوی دەکرد، وەکوو ئەوەی فوو لە باڵی پەپوولەیەک یان پەڕەی گوڵێکی ناسک بکات. شاهۆ ڕاچەنی و وەخەبەرهات. زمانی شکابوو هەر بەچوار دەوری خۆیدا دەڕوانی.. دیتتان، بەچاوی خۆتان دیتتان، کوا چی لێهات؟ کێ چی لێهات؟ تەوار، تەوار، کەس وەڵامی نەدایەوە، بەڵام لەگەڵ گوڕاندنی، ئەوەک دەنگی ببیەن، دیارە خەونی ناخۆشت دیتوە، هاوڕێ شاهۆ؟ شاهۆ باوەڕی بەوە نەبوو خەون بووبێت. بەدووچاوی ئەبڵەق لەچواردەوری خۆی دەڕوانی. ئەوە خەون بوو یان مۆتەکە. ساڵانێکە مۆتەکە سەرشانی گرتووە، پێش ڕووداو و پاش ڕووداونی هەر شتێکی نابەجێ، تووشی دەبێت، بەڵام ئەوە زیندەخەون بوو، فیلمێکی زۆر ترسناک بوو. شاهۆ هەستا، چاوی لە ئاسمان دەبڕی، ئاسمانی ئەوێ جۆرێکیتر بوو، زەوی و خاکی ڕەنگیان ڕەشتر بوو. ڕەنجبەر و پێشڕەو لێیان پرسی، هاوڕێ بۆ وا هاوارت کرد؟ سەرێکی بادا، ئارەقەی دەموچاوی سڕی. بە شڵەژاویەکەوە، هەر لێی گەڕێ! ڕەنجبەر دەستێکی لە ناوچەوانی شاهۆ دا، هاوڕێ لەرزوتات نییە، هیچ نییە ترساوی، لێووت چەند تامیسکەیەك دەکات و چاك دەبێت. بۆخۆشم لەپاش هەر شەڕێک و خەوێکی ترسناک وام بەسەر دێت. ئەو بلۆق و تامیسکەیە سارێژ نابێت و هێشتا تەڕ و کێماوییە، قلێکی دیکە یان لەسەر ئەو یان لەتەنیشتی دەردەچێت. شاهۆ خەونەکەی سەر لەبەر بۆ گێڕانەوە. پێشڕەو بەدەم چێشتنی ئازاری کوشندەی برینەکانی، بەبێتاقەتیەکەوە پێی گوت، ئەو خەونەی تۆ

هیچ کەسێك بۆی لێك نادرێتەوە، هەرچی کتێبی خەوننامە و جادوو و فەتاحفاڵ هەیە شتی وای تێدا نیە، نەپاشا و نەگەدا، ئاوا گۆڕەشارنەدراون، وەڵامەکەی تەنها لەلای ئەوانەیە تاوانی ئەنفالیان کردووە، دەزانن مانای چییە. هەتا حەوت پشتیان تووشی ئازاری ویژدان دەبن. شاهۆ هەستا، لە خواریانەوە کانییەکی بچووك هەبوو، دەموچاوی شووشت. ماوەیەك لە ناوە زەردەکەی ڕاما، تەماشایەکی بەرزایی چیای کرد. دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ وەخت بوو، دیاربوو سەرخەوشکاندنەکەی زۆری پێچوو بوو، گەڕایەوە ناو هاوڕێیەکانی. ئەوە خەون نەبوو، ئاگادارکردنەوەیەکی پێش ڕوودانی کارەساتێکی گەورەترە، ئەوەی هەستی شەشەمم پێم دەڵێت لەو سات و کاتەیدا تەوار لە تەنگەتاویەکی زۆر دژوار دایە، ژیانی لەمەترسی دایە، ئەگەر مابێت دەستم نایگاتێ، هەرچەندە بە دەستی ئەمین و پاک و دڵسۆزم سپاردووە، بەڵام ئاراو قەرارم لێهەڵگیراوە! لەو سنوورە گڕگرتوە، چۆن وا بەئاسانی دەسبەرداری بووم، چۆن؟ هیچ ئاگا و خەبەرم نییە، نە هەواڵێک نە پەیوەندییەک، دەزگاکان گیران، بەچی پەیوەندی بکەین. خۆی خڕکردەوە. دەمەوێت بەزووترین کات لەو ناوەی دوورکەوینەوە، بۆنی کارەست و تێکشکان و بێدەسەڵاتی دەکەم. پێشڕەوی بەرز کردەوە. هەستە هاوڕێ هەستە! دەتوانی بڕۆی؟ پێشڕەو بە دەنگێکی کز بەئاستەم دەبیسترا، توانین ناتوانم، چاوێکی ماناداری لە شاهۆکرد، جلکوبەرگە خاکییە کۆنەکەی سەرتاپای بە خوێنی ووشکبووە، وەکوو مشەما ڕەق ببوو، مێش و مەگەز بە ویزەویز لە چواردەوری هاڵابوون، بەڕەنگە زەردهەڵاتووەکەی واتدەزانی چۆڕێک بگرە دڵۆپێک خوێن لە دەمارەکانی نەماوە. بەڵام چار نیە. هەر سێکیان بە هێواشی بەڕێکەوتن ڕێگایان دەبڕی. لەسەرووپانەوە مەترسی جاش و سوپایان هەبوو، چونکە ئەوەندە لێیان دوورنەبوون. ڕێگاش ڕێگا نییە، ئەوەندە دژوار و سەختە کوڕی خۆی دەوێت. هەتا چاو بڕ دەکات زنجیرە چیایە. هەڵەت و گرد و هەورازی لەبن نەهاتووە. پێیەکانیان بە دووی خۆیاندا ڕادەکێشا، ئەوەندە نەڕۆیشتبوون هەنگاوەکانیان، بەرە بەرە کەمتر و هێواشتر دەبوونەوە!، هێزی ئەژنۆکان نەك لە کزی دەدات، بەڵکوو بەلەرزینەوە ڕێگادەکەن. ئەگەر ئاوا بڕوات ناگەینە هیچ جێگایەك. لەو چۆڵەوانیە کەس بەدی ناکەین. کەس نەماوە هەتا بەدی بکەین. ئەوەندە خواردن و ئاوەی پێمان بوو دەمێکە بنی هاتووە. ئەگەر دەزانن لەبەر من ناتوانن خۆتان دەرباز کەن. ئەمن هێز لە لەشم نەماوە. یەك هەنگاوی دیکە

ناتوانم ڕێگا بکەم. ئەوە ڕوونکردنەوەی پێشڕەو بوو بۆ شاهۆ و ڕەنجبەر. دەتوانن بڕۆن خۆتان دەرباز کەن. لێرە چاوەڕوانتان دەکەم، ئەگەر بۆتان کرا گەڕانەوە بەدیداری یەکتری بە زیندوویی شاد دەبینەوە، خۆ ئەگەر نەمابووم، بۆخۆتان خۆش. ڕەنجبەرو. شاهۆ تەماشایەکی پێشڕەویان کرد.. هاوڕێ ئەوە ئەتۆ دەڵێی چی؟ ئەمن بۆ خۆم چەند جار برینداربووم. دەزانم برینداری مانای چییە؟ نەدەبوو ئەوەندەش دوور کەوتباینەوە، بەڵام بۆخۆتان دەزانن دەبوو لە بنار دوور کەوینەوە، ئەگەرنا دەگیراین. ئێستاش وا دیارە کەس نایەت بۆڕزگارکردنمان. چاوەڕێکردنمان لێرە بێ هوودەیە. لێرەوەش بۆ ناوزەنگ دوو شەو و دوو ڕۆژی دەوێت، هیچ پەیوەندیەکمان بە هاوڕێیانەوە نەماوە. لێرە هەر لەبرسان دەمرین و قەل و داڵ دەمان خۆن. جاری جاران نییە! نە گوند و نەشوان و نە ڕێبوارێك نەماون. چار نییە یەك ڕێگامان لە پێشە، دەبێت خۆمان بگەیەنینە ناو شار، بۆ چارەسەری تۆ و ڕێگاچارەدۆزینەوەش تەنها دەریاچەیە. پێوستمان بە بەلەمە. چەند ڕۆژە لەپێش شەڕەکەشەوە کەس ناوێرێت بێتە ڕاوەماسی بەتایبەتی لێرە، ئەو جێگایە دوورە و لاتەریکە. با خۆمان بگەیەنینە کەنار دەریاچە، دوور نییە ئەوەتا لەپاش ئەو یاڵەی کەنارە. لێرەوەش سەربەرەوخوارە، ئەوەندە هێزی ناوێت. شاهۆ و چووبووە بن باڵی پێشڕەو. ڕەنجبەر دوو چەکەکەی هەڵگرت و دەستێکی پێشڕەوی گرت. بە دارە دارە و هەنگاوی وردی بێ بڕوابەخۆبوون، بوونی خوێنی تازە، لە سەرشانەکانییەوە وەکوو فوارە چۆڕاوگەی خوێن بەرەو سەر سینگی دەچۆڕایە، ڕەنگی وەکوو گیازەردەکە زەرد هەڵگەڕابوو، پاش کەمێك دەگۆڕا بە ڕەنگی قوڕیەگیایە سووتاوەکەی چواردەوریان. لەسەر زەوی درێژ دەبوو، بە دەنگێکی بە ئاستەم دەبیسترا، لێم گەڕێن، ئێوە بڕۆن خۆتان ڕزگار بکەن، با لە سایەی سەری منەوە لەناو نەچن، هاوڕێیەکانی بە بێنەوەی گوێ بدەنە داواکارییەکەی، هەندێك پارچە پەڕۆی پشتێند و جەمەدانییەکانیان لە سەر شان و لاملی دەئالاند و پاش پشوویەکی کورت دەهاتنە بن باڵی. بە زۆر لە زەوییەکە ڕاستیان دەکردەوە، هەستە براله، زۆرمان نەماوە، ئەوە گەیشتین. بە هێواشی و لەسەرخۆ خۆیان گەیاندە دەریاچە. بە پانایی و درێژایی دەریاچە هیچ دیار نەبوو. جگە لە شەپۆلە کریستاڵییەکان، لەگەڵ زیاتر ئاوابوونی تیشکی خۆر لەسپییەوە دەگۆڕان بە ڕەنگێکی زێڕین، لەگەل هاژە و لرفەلرفی هەڵچوونی پێلەکان شاهۆ چەندین

دەنگی دەبیست، دەنگی دەریاچە بوو، شاهۆ ڕووحە شەکەت و هیلاك و بریندارەکەم، دوو دڵ مەبە، وەرە و لەو بارودۆخە دژوارە ژیان و گیانی خۆت و هاوڕێیەکانت بە من بسپێرە، بڕوایت بە ساکاری و سازگاری من هەبێت، گیانتان وەکوو ملیۆنان بە ڵکو ملیارەها گیانەوەری ناو هەناوم پارێزراو دەبێت، جێگاتان لە ناو پەرەگەی دڵمە، نەرمونیانترین جێگا دەبێت، برینەکانتان سارێژدەکەم، تینووتیتان دەشکێنم، ئێرە وەکوو چیا و دۆڵ و دەشت نییە، بەکەڵێن و تاوێر و نە شکەوت بێت، کەس بتوانێت بۆسەتان بۆ بنێتەوە، لە ناوتان ببەن، هەتا بە تەواوی دنیا تاریك دانەهاتوە بە بێ دوودڵی و بیرکردنەوە، خۆتان بە ئاوێ دادەن، چاوەروانی چیدەکەن، لە برسان گیان لەدەست بدەن، لە سەرمان ڕەقهەڵێن، یان دوژمن بگاتە سەرتان و وەکوو هاوڕێیەکانتان لەخوێنی خۆتاندا بگەوزن. ڕەنجبەر ماوەیەکی باش لەناو تاشەبەردەکان بزربوو، بە ڕوویەکی گەش و بزەیەکەوە گەڕایەوە. ئەو ناوەی گەڕام نە بەلەم و نە بەلەمەوانێك دیار نین، بەڵام شتێکم دۆزیوەتەوە بە بەلەم دەچێت. کاتێك شاهۆ و پێشڕەو لەگەڵی هاتن بۆ دیتنی بەلەم. بەبەردێکی لووسی سەرتیژ شتێك بەسترابووەوە. شاهۆ ماوەیەك بە چواردەوریدا هاتوچوو، ئەوە کەڵەکە. لە چوار چوویی گەورە لەچەند کۆڵەکە و دارێك بەسترابوو، خراپ نییە، بەڵام هی کێیە؟ تەماشایەکی ڕووخساری هاوڕێیەکانی کرد. ئامادەن بەو کەڵەکە بپەڕنەوە؟ پێشڕەو لەسەر بەردێك درێژ بوو. باشترە لە هیچ، بەڵام دەگاتە ئەوبەر؟. نازانم بۆی هەیە. ئەگەر شەپۆلی گەورە نەبن، دەگاتێ! ماوەیەک چاوەکانی قەپاتکرد، ڕووی بەرەو دەریاچە و پاشان چیا سووڕاند بۆ ئەوەی بزانێت کزەبا یان شەماڵێک هەیە. چونکە دەیزانی شەپۆل لە با دروست دەبێت، گڤە گڤێکی دەهاتە بەر گوێ، ڕەنجبەر خۆی فڕێدایە سەر کەڵەکەکە. کەڵەك، دەزانن لەژیانمدا سواری کەڵەك نەبووم، بەڵام خزمی سەید کەڵەکم زۆرن، خۆش دیارە. ئاوەکە زۆرە بەڵام مەندە، دەڵێن لە ئاوی مەند بترسن، چونکە ئەو ئارامییە پێش هەڵکردنی تۆفانە! ئەدی ئەو کودیە ڕەقانە چین بە هەر چوار کەنارییەوە هەڵواسراون؟ ئەوەندە سووک بوون بە بچوکترین شنەبا دەلەرینەوە و دەنگێکی خۆشیان لێهەڵدەستا، ئەوانە کولەکەی مەلەن لەکاتی ڕوودانێک بۆ مەلەکردن و خۆدەربازکردن بەکاردێن، بەتایبەتی کەسێک مەلەوان نەبێت، یەکدانە لە ناو قەدی خۆی ببەستێت قەت ژێر ئاو ناکەوێت، ئەوەندەی دەمێنێت دەستوپێیەکانی بجوڵێنێتەوە، هەتا بەرەو پێش

بڕوات. بەچەند دەگەینە ئەوبەر؟ شاهۆ دەستێکی کردە سێبەر لەسەر چاوی، ماوەیەك تەواوی دەریاچەی بەهەموو پێکهاتەکانی بە سەرکردەوە.. هەرچەندە کەنارەکانی ئەوبەر ئاستەم وەکوو تارمایی بەدیدەکران. بە مەزەندەی من، هەر وا دوو هەتا سێ کاتژمێر دەبێت! بۆ ئەوەندە زۆرە؟ ئاخر خۆ بەلەمی ماتۆدار نییە، هەتا بە خێراییەکی تیژ تێپەڕێت، پاشان بۆ خۆشمان بەلەمەوان و سەوڵ لێدەری باش نین. ئەوەندەش هێز و توانامان لەبەر نییە، سکمان قوڕەی دێت لە برسان. بەرەنگاربوونەوەی دەریاچەکی ئاواش گاڵتەی پێناکرێت. ئەگەر هەر ڕێگا چارەیەکی دیکە لەبەردەم بوایە، بە دڵنیاییەوە بە بێ بەلەمی باش و بە لەمەوانی بە هێز و لێهاتو قەرەم لە قەرەی ئەو هەموو شەپۆلانە نەدەدا. بەڵام وەکوو دەڵێن، پشتت دوژمن پێشت ئاوە، ئەولاو لات ئاگر، ڕێگای قورتاربوون بە کوێدایە، بەو بێفیشەکی و ئازووقەیە، بۆسە و سەربازگە و ئەو هەموو جاش و سوپایە بە ئێمە تێك ناشکێندرێن، ماوەو نە ماوە دەریاچەیە و کەلەك، خۆمانی لێدەدەین. دەرچووین دەرچووین، تێداچووین هەرسێکمان بە یەکەوە تێدادەچین، خۆ هیچ نەبێت ناکەوینە بەر دەستی دوژمن. کەس کەس بەجێناهێڵێت، لە یەکتری دوور ناکەوینەوە، دەستی درێژ کرد، هەردووکیان دەستیان خستە ناو دەستە تەڕ و ساردەکانی گفتی شەڕەف و پیاوەتی، مردن و ژیانمان بەیەکەوە، شاهۆ لەسەر بەردێك دانیشت، هەتا بە تەواوی دنیا تاریك نەبووە، با ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژ تۆماربکەم، بۆی هەیە ئەو دەفتەرە لە پاش نەمانمان بە بەردەستی کەسێك بکەوێت و لە دوارۆژ بگاتە دەستی تەوار، یارمەتیدە رو ڕێگانیشاندەری بێت. ڕەنجبەر هات لە تەنیشتیەوە دانیشت، بنووسە براله بنووسە، لەسەر دەریاچە گیرمان خواردوە، بێ نان و خواردن، دەریایەك ئاوی سوێری بۆن ماسیمان لە پێشە، قەت تینو نابین، بە قەد دڵۆپە ئاوەکانی هەرچی دەریا هەیە، هەزار ئەوەندەی گەڵای داران چاوەکانی تەوار ماچ دەکەم، دڵم ئاسوودەیە، تەوار لە ناوهەزاران دڵ و دەستی پاك و ئەمین دایە، وەکوو چاوی خۆیان دەیپارێزن. سیخوورمەیەکی قەیمی لە کەلەکەی شاهۆدا، بنووسە براله بۆ دایکی منداڵانیش شتێك بنووسە، خۆ هەروا بە بێدەنگی پشتی تێناکەی، بابزانێت ئەویشت خۆش گەرەکە، شاهۆ پاڵێکی پێوەنا هەتا ناو ئاوەکە خلۆر بووەوە، بە هەردووك دەستی لە ناو ئاوەکە ئاوپرژێنی چواردەوری دەکرد، شاهۆ ماوەیەك لە بێدەنگیدا دوو لە هەڵچوون و داچوونی دەریاچە ڕاما، چەند دنیا تارکتر دەبوو ڕەشەبایەکەی بە

هێزتر دەبوو، ئەوەش نیشانەی گەورەبوونی شەپۆلەکان بوو، هەر چەندی کردی بەو بارە دەروونییە شێواوە هیچی بۆ نەنووسرا، دڵی ئەوەندە پڕ بوو، وێنەی دیمەنی تەوار دەهاتە بەرچاوی لە باوەشی شەوبادا، بسکە زەردەکانی نیوەی لە ناو ئاودابوون، بە دەم شەپۆلە زێڕینەکانیەوە، تەڕدەبوون و بە درێژایی دەریاچە بە سەر ئاوەکەوە وەکو فەرشێکی دەریایی پەخش بووبوونەوە، دوو دەستە سپیە باریکەکانی بۆ ڕاداشت بوو، مامە شاهۆ خۆتی لێ بدە و زوو بگە لامان هەتا کۆرپە ساواکەی خۆمان تێر لە باوەش بگری، شەپۆلەکان دەبوونە ئەسرین و لە چاوەشینەکانی دەڕژان، دواجار خامەکەی بە دەستەوە گرت و کەوتە نووسین. لەبەرئەوەی بیر و ئەندێشەم زۆر پەرش وبڵاوە، نە بۆ خۆم بەڵکو هەردووك هاوڕێیکەم نازانین ڕۆژ و مانگ لەچەندە، کەواتە ساڵەکەش با بە ڕووداوەکان بە دیارکەون، لەگەل ڕەنجبەر و پێشڕەو کە برینداره و برینەکەشی یەجگار کاریگەر و سەختە، پاش شەڕێکی خوێناوی چەند کاتژمێری، هەر ئەو سێیەمان ماوین، چارەنووسی هەر شەش هاوڕێیەکەی دیکەمان دیار نین، بەڵام واپێدەچێت نە مابن و گەیشتبنە کاروانی نە پساوەی شەهیدان، لە نێوان تاشەبەردەکانی دەریاچە گیرمان خواردووە، دوژمن زۆر لێمانەوە نزیکە، گوێمان لە تەقەتەقی مەنجەل و قاپەکانیانە، دەنگی نەپساوەی ڕادێویەکانیان بە ئاسانی لەگەل هەڵکردن و هاتنی کزە بایەکی ساردی ئێسقان تەزێن دەگاتە گوێمان، ئەگەر هات و بەتەمای چەند دار و کونە چووپێکی لێکدراو بە کۆی پێکهاتەکەی دەڵێن کەلەك پەڕینەوە و دەرباز بووین، سەردەمی پەرجو و شتی ناوێزە بەسەرچوون، بەڵام بە ڕاستی شتێکی سەرسووڕهێنەر دەبێت، ئەو کاتی بە دیداری یەکتری شاد دەبینەوە، بەڵام هەست و ئەست و شلوقی کەلەك و بارودوخەکە پێم دەڵێن ماڵئاواییەکی یەکجاری بکە، بۆیە بەناوی خۆم و هەردووك هاوڕێیەکەم، خوداحافیز ئەی نیشتمانی ئازیز، گشت گەلی کورد، خودا حافیز تەوارەکەم هاوڕێ قارەمانەکان. شەوبا هاوسەرە ئازیزەکەم بمبوورە هاوسەر و باوکێکی باش نەبووم. ئەوەندە لەگەڵتان نەژیام، بتوانم غەم و ئازارەکانتان لەگەڵ بەش بکەم، لەبەر تاریکی نەیتوانی بەردەوام بێت لەسەر نوسینەکەی، ئەو چەند وشەیەشی نووسی دڵنیانە بوو دەگاتە دەست کەس زیاتر، بیری بە لای ئەوە دابوو لە قووڵایی دەریاچە لەگەل گۆشت و ئێسقانی دەبنە خۆراکی ماسی و گیانلەبەرەکانی نا ئاو. ئەو لاپەرەیەی لە دەفتەرە بچووکەکەی کردەوە و لە بەر

باخەلی دانا، چەند جار دەستی بەسەر داهێنا، هەتا دڵنیابێت جێگاکەی باشە، بە بێ ئەوەی باسی ناوەڕۆکی نامەکەی بکات. هەر سێکیان دنیا تەواو تاریك بوو لەوەی زیاتر چاوەڕوانیان نەکرد. شاهۆ دوودڵ بوو ئایە ئەو شرەکەڵەکە دەیانگەیەنێتە ئەوبەری کەنار. لایەکی بە تەواوی بە گونییە و پارچە مەشکە و نایلۆن گیرابوو. ڕووی لە هاوڕێیەکانی کرد. هەرچیەك ڕوودات. کەس کەس بەجێ ناهێڵێت، مردن و ژیان بەیەکەوە، بەڕەزامەندی هەرسێکمان بووە. ڕەنجبەر ماوەیەك کەڵەکەکەی هێنا و برد. باشە خاوەنەکەی کێیە؟ شاهۆ شانێکی هەڵتەکاند! ئاخر خۆ سەربەخۆ نەهاتووەتە ئێرە، باوەڕناکەم لێرە دروست کرابێت. مانەوەمان لێرە بێهودەیە، لەوبەریشەوە کەس دیار نییە. بۆی هەیە جاش و سوپا بگەنە سەرمان. مردن هەر مردنە. چی لێرە چی لەوێ. ئەتۆ دەڵێی چی هاوڕێ پێشڕەو؟ پێشڕەو ئەوەندەی ئازار هەبوو، زۆر هۆشی بەسەر خۆیەوە نەبوو. ئەگەر لەمن دەپرسن هاوڕێیان.. مردنم زۆر لەو ئازارە کووشندەیە خوشترە، مردن یەکجارە و دەبڕێتەوە، بەڵام ئەمن لە دوێنێ شەوێوە هەموو دەمێکم بە مردنێکە! شاهو باڵەکانی بەرزکردەوە مادام وایە. سەرکەون بابڕۆین. هەرسێکیان سەرکەوتن جێگای دانیشتن نەبوو. وا دروست کرابوو، هەر وا دەتوانی لەسەر چیچکان خۆت بگری. بە هەردووکیان جێگایەکیان بۆ پێشڕەو ساز کرد بتوانێت لە گۆشەیەك دانیشێت. دوو چەکەکەیان لە کۆشی دانا. دوو داری پانی ئەستووری لووسی زەردباوی داتاشراو لە شێوەی سەوڵ بوون، بەڵام بە گوێرەی ئەوەی زۆر بەتین و ئاستەنگیەکەوە جوڵەیان پێ دەکرد، کەمێك قورستر بوون. شاهۆ لەلایەك و ڕەنجبەر لەلایەك، بە هێواشی و ئاگادارییەوە خۆیان بە ئاوێدادا، کەوتنە سەوڵ لێدان. بەرەو پێش چوون و ڕۆیشتنی وەکوو بەلەم نەبوو. بەتیژی ئاوی دەبڕی زیاتر جوڵە خێراتر بوو. ئەگەر زۆر ئاگات لێ نەبا بەلایەکدا خوار دەبووەوە و لاسەنگ دەبوو. لەگەڵ لە دەستدانی پارسەنگی ئاوەکە، بەرەو لایەکی نەخوازراو ملی دەنا، شاهۆ و ڕەنجبەر هەوڵیاندەدا سەوڵ لێدان و جووڵەیان لەیەك کاتدا بێت، هەرچی شەپۆل هەیە ڕاستەوخۆ لە پشتیانی دەدا. لەو وەرزەی ساڵ ئاو زیادی کردبوو و ساردبووبوو. شاهۆ زۆر بە هێواشی سەوڵی لێدەدا و قسەی بۆ برادەکانی دەکرد. ئەگەر ئاوا بڕوات دەتوانین بپەڕینەوە. لەشار دەبین هەتا هاوڕێ بەتەوای چاك دەبێتەوە، ئەوجار دەڕۆینەوە بۆناوزەنگ. دەریاچە قووڕاویتر و بەڕێژەنتر بوو، شەپۆلەکان بەرزتر و بە هێزتر

دەبوون، زۆر بە زەحمەت دەیانتوانی بەرەو پێش برۆن. هەتا چەند مەترێك بەرەو پێش دەچوون. چەند جار خەریك بوو کەڵەکەکە قلْپ بێتەوە. بەڵام لەنگەری دەگرتەوە و بەرەو پێش ملی دەنا، ئەوەندەیان سەوڵ لێدابوو قۆڵ و باسکیان تەواو شل بووبوون. بە ماندووبونێکی زۆر، بەشەڕکردن لەگەڵ شەپۆلە باڵابەرزەکان گەیشتبوونە ناوەڕاستی دەریاچە. تەواو پەشیمان ببوونەوە لە هاتنیان. شەپۆلەکان ئەوەندە گەورەبوون. هەرجارەی بەلایەکدا دەیبردن. چەند جار ڕووەو شار، پاشان بەبێ ئارەزووی خۆیان بەرەو بنار وەردەسووڕان، سەرەگێژدەیان پێکەوتبوو. هەردووك سەوڵەکەیان لەدەست بەربووەوە و ئاوبردنی. هەر دووکیان ئەولا و ئەولای پێشڕەویانگرتبوو، ئەویش دەم و چاوی خۆی بە جەمەدانە بەستبوو، کەمتر ئاگاداری دەوروبەری خۆی بوو. بەبێ بەلەمەوان و ئاراستە گۆڕین کەڵەك ئەولا و ئەولای دەکرد. لە ژێر کەڵەکەکە هەستیان دەکرد شتێکی بە هێز خۆی لە بنی چووپەکان دەدات، ڕایدەتەکاندن. هیچ دیار نەبوو. بەڵام شەپۆل و شلپەشڵپی بەئاشکرا دەهات. لەبەر تاریکیی و قوڕاوی ئاوەکە زەحمەت بوو هیچ شتێك بەدی بکەن. شاهۆ بیری دەکردەوە دەبێ چی ڕووبدات؟ هەر چوار کولەکەی مەلەکەی داگرت، دانەیەکیان گوریسێکی پێوەبوو، لەگەڵ یەکێکی دیکە لێکی بەستن، دەستی بە ناوقەدی پێشڕەو درێژ کرد، پێشە گیان بە خۆتیانەوە گرێ بدە، ئەگەر کارێکی نە خوازراو ڕوویدا، بەو کولەکانە سەر ئاو دەکەوی، پێشڕەو بە بێئەوەی هیچ بڵێت هەردووك قۆڵەکانی بەرزکردەوە و لە ناو قەدی گیرکرد، کەڵەکە بە هەرسێ سەرنشینەکانییەوە، ئەوەندە بەدەوری خۆیدا سووڕابووەوە، ئەوەندەی دیکە شەقوشڕتر ببوو، هەرسێکیان سەریان گێژ بوو. ڕێژەنی ئاوەکە بواری هیچی نەدەدان. دەیانزانی ئەگەر بەرەو خوار برۆن توشی بەختی سەربازی دەبن. ڕاتەکاندنێکی زۆر بە هێز لەناکاوێك چووپێکیان فشەیەکی گەورەی لێهات، وەکوو ئەوەی لە ژێرەوە شتێك گازی لێگرتبێت. کەڵەك لاسەنگ بوو، لایەکی کەمێك نقووم بوو. سێ بەشی ئاوەکەیان بڕیبوو. شەوەکە تاریکتر و شەپولەکان گەورەتر و ڕاتەکاندکان لە ژێرەوە توندتر دەبوون. چوپی دووەمیش تەقی، ماوەتەوە دوو چووپ، هەرچواردەورەیان ئاو بوو. لای پێشەوەی کەڵەك تەواو کەوتبووە ژێر ئاو، بەڵام ڕاتەکاندن نەما. شاهۆ بیری دەکردەوە، ئەگەر ئەو بریندارە نەدەبوو بۆخۆی بەمەلەکردن وەکوو ماسی وابوو زۆر بە ئاسانی دەپەڕیەوە. لەگەڵ هاژەهاژی شەپۆلە سەرشێتەکان دەنگی پێشڕەو هات.

هاوڕێیان کێ مەلەوانە خۆی بەئاوەکە دادات خۆی ڕزگار کات؟. ئەمن ئەمەلەوانم نەتوانای جووڵەم هەیە. شاهۆ بە جەمەدانییەکەی دەموچاوی سڕییەوە. بەڕاستە هاوڕێ بەجێت بهێڵین! بەخوای دەبێ پێشی تۆ بخنکێم. ڕەنجەر قۆڵی بەسەرشانی دوو هاوڕێیەکەیدا دا، هاوڕێیان خۆ ئێمە لە هاوڕێ شەهیدبووەکانمان نازدارتر نین. هەرچی دەبێت بابێت. کەڵەکە ڕێژەن بەئارەزووی خۆی بەولا و ئەولایدا دەبرد. بۆ زیاتر دڵنەوایی هاوڕێیەکانی شاهۆ لایەکی کەڵەکی گرت، چۆ ناو ئاوەکە و سینگی بەرەوە شەپۆلەکان ڕاگرت. کەوتە مەلەکردن، بەرەو کەنار، لەگەل شڵپە شڵپەکەی وەکوو یەکەم سەوڵ لێدان کەڵەکەکە بە پڕتاو بەرەو پێش دەچوو، شاهۆ لەو بەرەو پێش چوونە تەواو دڵی ئارام بوو، باشە بۆچی چەندەمێك بوو وەهای نەکرد، هەر لەو کاتەی سەوڵە ئەفرەتییەکان بە ئاوێداچوون دەبو ئەوەی بە خەڵدا هاتبا، ئێستا دەمێك بوو لەوبەر کەناربوون، ڕەنجبەر پشتێندەکەی خۆی لە ناوقەدی شاهۆ گرێدابوو، چەند جار بەبن ئاو دەکەوت و بەدیار دەکەوتەوە. ساردی ئاوەکە هەناسەبڕکێی دەکرد بە کۆخەکۆخ دەکەوت. هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و بەردەوام دەبوو لەسەر مەلەکردن. تین و هێز لە لەشیدا نەدەما. هەتا چەند هەنگاوێك بەرەو پێش دەچوو، لەشی بەتەواوی شل دەبوو. کەڵەك هەم دیسان دەستی پێکردەوە، یان بەچواردەوریدا سوڕی دەخوارد، یان بەرەو کەناری چیا ملی دەنا. هەرسێکیان زۆر نائومێد بووبوون بەژیان، بەڵام کۆڵیان نەدەدا. وا فێرکرابوون ژیان هەر هەمووی ململانێیەکی سەختە و نابێت کۆڵ بدەی. سێ پێشمەرگەی هیلاکی پرزەلێبڕاوی ماندووی شەلاڵی ئاو، ڕزگارکەر و یارمەتیدەریان، کەڵەکێکی شەق و شڕی چووپ دڕاو. ها ئێستا ها کەمێکی دیکە ژێر ئاودەبێت، لەدژی شەپۆلی گەورەی سەرشێت دەجەنگن. لەگەڵ مەرگ بەرەنگاربوونەتەوە. شەپۆلە باڵابەرزە قووڕاویەکان لە لرفەلرف نەدەکەوتن. زۆر جار شاهۆ پێیەکانی لەناوئاودا لەشتێك گیردەبوون، هەستی دەکرد لەژێرەوە پڕ بە پێ و جار جارێك بە لاق و هەتا ناوقەدیدا دەکەن. تاشە بەردێکی گەورە هاتە پێشیان، کەڵەکەکە ماوەیەك بە تیکەبەردێك گیرسایەوە. شاهۆ دەستێکی لە تیکەبەردەکە گیرکرد، بەدەستەکەی دیکە توند کەڵەکی گرتبوو. دوو هاوڕێیەکەی بە چاوێکی پڕ گومانەوە سەیری دەموچاوی شلەژاوی شاهۆیان دەکرد. ئەو کاتانەی تیشکی بە هێزی چەند بلاجکتۆرێك بەناو دەریاچەدا هەموو شتێکی ڕووناك دەکردەوە، هاواری کرد وا

دیاره قەراغ دەریاچە نزیك بووەتەوە. دوو پێشمەرگەکە لەئەوبەر و چواردەوری خۆیان دەڕوانی، بە ئاستەم چەند چنارێکی بەرزیان بەدی دەکرد. ڕەنجبەر بانگی شاهۆی کرد. هاوڕێ لێرە پشوودان هیچ سوودی نیە! بۆخۆشی دەیزانی بێسوودە، بەڵام ئەدی چار چییە؟ هەوڵی دەدا وچانێك بدات، بەڵکوو هێزی وەبەربێتەوە و ئەوەندەی ماوە بتوانێت ببڕێت و بۆخۆشی و هاوڕێیەکانیشی لە مردن ڕزگار بکات. بەرپرسیاریسەتی پێشمەرگایەتی لەهەرچی ئەرك هەیە لە ژیاندا قوورسترە، زۆر پێشمەرگە هەن چەندین ساڵە پێشمەرگەن، بەس بەرپرسیارەتی خۆیان هەڵدەگرن. شاهۆ هەر لە بیرکردنەوەدا بوو بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك. بە دە ستە تەزیو و لەرزۆکەکانی پشتێندەکەی لە نووکی گرنگرنی تاشەبەردەکە گیرکرد، هەرچەندە زۆر بڕوای بەوە نەبوو چارەسەرێك بێت، بەڵام بۆ پشوودانێك یارمەتیدەر بوو، سەری بەرەوچیا بەرزەکەی بەرامبەریان بەرزکردەوە، سێبەرە گەورەکەی بە سەر تەواوی دەریاچە و کەنارە درێژەکانی ئەوەندەی دیکە شەوەکەی تاریك کردبوو، کۆسرەت دەمەوێت دوا ماڵئاواییت لێبکەم. ئەو چەند ساڵانەی ڕابووردن، ئەگەر باوەشی گەرمی تۆ نەبوایە دەمێك بوو کۆتاییمان پێهاتبوو. بەهەزاران لاوی خوێنگەرم و پێشمەرگەی دڵسۆز، لەباوەشی تۆدا و لەبەر بەرزڕاگرتنی لووتکەت، خوێنیان ڕژاوە، ماڵئاوا ئەتۆ وەکوو دەریاچە سەرشێت نیت، ڕێبوارەکانت خۆشدەوێت. ئەوە بۆسەیەک بوو بە زمانی لووسی ڕامانی کێشایە قووڵایی، هەتا لەگەڵ پەیکەرە هێسک و ئاسنەواڵ و مینە چاندراوەکانی هەڵمان لووشێت، دەریاچە هەموو دەمێك سەر شێت و کەللەڕەق بووە. بە شەپۆل و گێژەنەکانی هەموو شتێکی هەڵلووشیوە. شەپۆلێکی پانی تیژڕەوی بەقەد تەپۆلکەیەکی بەرز، دنیایەك دار و خاشاك و پوش و پەڵاشی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو، کەڵەکی ڕفاند. شاهۆ هاواری کرد خۆتان باش بگرن، زۆرمان نەماوە دەگەینە کەنار. کەڵەك بە خوارە خوار بەرەو خوار بە سووڕیی گەورەگەورە کەوتە ناوەڕاستی دەریاچە. شاهۆ وەکوو خولخولە بە دەوری کەڵەکی ڕەتێندراودا دەسووڕایەوە. لەو نزیکانە ورشە ورشی شتێك دەهات، بەڵام لەبەر شلەژاوی و تاریکی هەستیان پێ نەدەکرد. لەو وەختە ناسکە لە پێشیانەوە وژەی شتێك هاتە بەر گوێیان.. سەریان بەرزکردەوە. لە پێشیانەوە دوو بەلەم بەدیارکەوتن. شاهۆ بانگی کردن. هۆ برا، کاکە فریامان کەون! کەڵەك بە چواردەوی خۆیدا دەسووڕایەوە. بەرەو خوار ملی دەنا. بەلەمێکیان نزیك بووەوە

لایەکی کەڵەکەکەی گرت. کەسێك لەناوبەلەمە هاواری کرد. کاکە ئێوە کێن؟ شاهۆ، بانگی کرد پێشمەرگەین!. کابرا هات بەلایانەوە. کەسێکی دیکەشی لەگەڵدا بوو. کاکە وەرن یەك یەك دەستی گرتن. دەستی بۆ پێشڕەو ڕاداشت، وەرە کاکە وەرە. شاهۆ بە کابرای گوت، کاکە بریندارە ناتوانێت. با جارێ ئەتۆ لەو بەفراوەی ڕزگار بکەین. دەستی بۆ شاهۆ ڕاداشت لەناو ئاو هێنایەدەرێ! وەکوو کوندەی ئاو لێشاوی ئاوی لێدەچۆڕایەوە، پێڵاو و گۆرەوی لە پێدا نەمابوو. ویستی چەند هەنگاوێك بڕواتە پێشەوە، بەربووەوە خەریك بوو بکەوێتەوە ناو ئاو. کابرا گرتیەوە، کاکە دانیشە پێیەکانت سڕبوون خوێنیان تێدا نەماوە. بەتانیەکی دایە دەستی، زوو لاقەکانت بپێچە بەپەلە جوڵەیان پێبکە. هەستی دەکرد لە کەمەریەوە مردووە یان پێوە نەماوە. لەشی ئەوەندە قورس ببوو، بەولا و ئەولایدا دەکەوت. دەستەکانی لە تەختاکان ساردتر و بێخوێنتر بوون. بە بەلەمەوان و و ڕەنجبەر دەستیان گرت و هێنایانە ناو بەلەم. پێشڕەویشیان زۆر بە هێواشی گواستەوە. لەسەرمان سڕبووبوون، دانەچۆقەیان گرتبوو. هەتا ماوەیەك زمانیان گۆی نەدەکرد. کەڵەکەیان لەبەلەم گرێدا. کابرا کەوتە ماچ کردنیان، کاکە کەس ئەوەی کردووە؟ بەو تۆفان و بەو وەختەی بەکەڵەکی بپەڕنەوە. ئەو کەڵەکە دەزانن چەند دەمێکە لەوبەری ڕاگیراوە، ئەوە زۆر لەسەرەوە بوو ئاو ڕای داون. ماوەیەکی دیکە ڕۆیشتبان دەکەوتنە ناو بەلەم و زەورەقی جاش و سەربازان. لەدوور لەکەناری ئەوبەر چەند ڕووناکاییەك دیاربوون، سەگ و گورگەکان لەو سەربازگەی ئەوبەرن. کابرا بەتانییەکی بە پێشڕەو دادا ئاوی دەموچاوی سڕییەوە. لەتەنیشت خۆیەوە پڕێسکەیەکی دەرهێنا نان و ماسی برژاوی دانێ. هەرسێ پێشمەرگەکە باوەڕیان نەدەکرد، ئەوجارەش ڕزگاریان بوو. دوو بەلەمەوانەکە هەر سەریان بادەدا. چەند ئاوڕیان بەلای کەناری ئەوبەر دەدایەوە مووچڕك بەلە شیدا دەهات. دوو بەلەمەوانەکە چاویان لەسەر پێشمەرگەکان هەڵنەدەگرت. یەکێکیان لێی پرسین، ئەو کاکەیە بەچی بریندار بووە؟ شاهۆ گوتی. پێش ئەوەی وەڵامت بدەمەوە ئێوە چکارەن، بەو نیوەشەوە لە چی دەگەڕێن؟ ئەوە کاکمە بەلەمەوانە، کوڕێکی لە دوێنێوە بەبەلەمێکەوە لەگەڵ برادەرەکەی هاتوونە سەر دەریاچە و بێسەروشوێنن، هاتووین بە دواياندا دەگەڕێین. هەردەمیان دوزینەوە، بەخت و ناوچەوانی ئێوە بوو، ئەگەرنا چەند ڕۆژە کەس ڕووی لێرە نەکردووە. بەڵام ئەتانگوت بە سەرهاتی ئێوە چییە؟ شاهو بە دەم خواردنەوە،

چەند ڕۆژێك لەمەوبەر تووشی شەڕهاتین. لەسەرووی شووشکە، لەوێ برینداربوو. شەڕی کەڵەمێویٚ؟ ئا. لەکوێت بیستووە! دنیا باسی دەکات. دوو پێشمەرگەی دیل لەوشەڕەی دوێنێ بەبەر چاوی خەڵکییەوە لە فیرقەی ڕانیە گوللەباران کران! ناویان چی بوو؟ ئەمن لەوێ نەبووم ئەوڕۆ لە قەیاغەوانێکم بیست. بەڵام بەڕاستی پێشمەرگە شەڕی قارەمانانەی کرد بوو. کەواتە ئەو شەڕەی ناوشاریش هەر ئێوە بوون؟ شاهۆ کەوتە بیری ئەو دوو پێشمەرگەی گوللەباران کراون. کامەیانن بەدیل گیروان؟ کابرا چاوەڕوانی وەڵامی نەکرد.. دەك دەستتان خۆش. زیاتر لە چل جاش و مغاویر کوژرا بوون، بە شۆڕشێك هەبوو، دووبارە سەلماندتان شۆڕش و پێشمەرگە هەرماون. ئەوەندەی بیر لەو حاڵەی ئێوە دەکەمەوە ترس دەمگرێت، باشە دەگەیشتنە ئەوبەر؟ شاهۆ بە دەنگێکی پڕ بڕوابوون بەخۆی. بۆنا، ئەگەر بە تەنیا دەبووم، دەمتوانی هەر بەمەلە بپەڕمەوە. بەڵام بریندار و نەخۆش کەنگێ هی ئەو چەرمەسەرییەیە. کاکە چارمان نەبوو، یان لە برسان و سەرمان دەمردین، بۆی هەبوو بکەوینە بن دەستی جاشان، ئەوکەڵەکە ژیانی ڕزگارکردین. ئەوەندەی پێشمەرگە بە ناو مین و ئەشکەوت بەسەردا ڕمان و لەشاخی هەڵێران و کارەساتە سروشتییەکان لە ناودەچن، قەت ئەوەندە لەشەڕ ناکوژرێن. هەمووتان بەسەرهاتی شەهید (عەلی کلاشینکۆف) تان بیستووە. ئەو قارەمانە لەسەرەتای شەستەکانەوە شەڕنەما بەشداری تێدانەکات، یەکەمین پێشمەرگە بوو کە لاشینکوفی گرت، بۆیە لەقەبی کلاشینکۆفی وەرگرت، کەچی لەگەڵ چوار پێشمەرگەی دیکە ئەشکەوتیان بەسەردا ڕووخا. کابرای بەلەمەوان، وەڵلا زۆری نەمابوو ببن بە خۆراکی نەهەنگ و ماسی. ئەوەش لەناوچەوانی چەند جاشێکی خوێڕی. کاکی بەلەمەوان دیاربوو زۆر داخداربوو. جاش لەدەستم بێت توخم و تۆویان ناهێڵم، قرانیان تێدەخەم. ئەوەندە زۆربوون لەهیچ جێگایەك جێگایان نابێتەوە. هەرچی دەبینی چەکێکی بە شانیدا کردووە. بەشانازییەوە دەڵێ، ئەمن جاشم. لەو ماوەی کچێکی خزممان مێردی کرد، لێم پرسی مێردەکەت چ کارەیە؟ بەشەرمەزارییەکەوە گوتی دوور لەڕووت جاشە. هەتا لەناو ماڵ و منداڵی خۆشیان سووك و ڕسوابوون، بە پیاویان نازانن. پاش سەعاتێك گەیشتنە ئەوبەری کەنار. پێشڕەو بە هێواشی دابەزی. شاهۆ هەرچەندی دەکرد پێیەکانی لە دوو نەدەهاتن. ماوەیەك شیلانی ئینجا جووڵەیان تێکەوتەوە. یەکێك لە بەلەمەوانەکان پێڵاو و گۆرەوی خۆی دا بە

شاهۆ. کەمێك بۆی گەورەبوو. بەڵام لەگەڵ گۆڕەوی ئەستوور بۆی بوو. ڕەنجبەر بەدوایدا. دوو بەلەمەوانەکە داوایان لێیان کردن هەر کارێك بەمە دەکرێت، پێمانی ڕاسپێرن سەری خۆمان لەبن پێتاندا دادەنێین. پێشمەرگە هەرلایەنێك بن تاجی سەرسەری هەرهەموومانن، حسابی ئەوە مەکەن چەند کەسێکی ئەفەس نزمی خوێڕی بوونەتە جاش، ئێمە وەکوو میللەت بەو هەناسەی دەژین کە پێشمەرگە دەیدات. شاهۆ زۆر ماچی کردن، لەلای کەس باسی مەکەن. ئیزنی دان. بۆخۆشی نەیدەزانی لە کوێن. هەر ئەوەندەی دەزانی کۆسرەت بەرامبەریانە، هیچ نە بێت ئێرە ئاوەدانی لێیە، چارەیەکی خۆیان هەردەکەن. شاهۆ لەبەر هەواڵی گوللەباران کرانی هاوڕێیەکانی بەر پێی خۆی نەدەدی، بەڵام لەبەردڵی بریندارەکە وەسەر خۆی نەدەهێنا لەبرادەرەکانی جودا بووەوە، ماوەیەك بەناو ئاو و قوڕ و لیتەی دارستاندا ڕۆیشت، سەری دەسووڕا! لەبازنەیەکی قوڕاوی دەخوولایەوە، هەواڵێکی جەرگبڕ بوو، بە بیستنی وێنەی شەپۆل و منداڵە چاوگەشەکانی، لەهەست و سۆزی چەند ساڵەی باوکایەتی بێبەش بوون، ئاە و نزوولەی پیرە دایك، هیوا و ئاواتی لە گۆڕنراوی پیرە باوك، چەند دڵی بە ڕەخت و فیشەکدانی کوڕەکەی خۆشبوو، ئازادی کوردستانی لە لوولەی ئەو چەند تفەنگەی هاوڕێیەکانی دەدۆزیەوە. ورە و باوەڕی بەقەد کێوی سەفین بەرز و بەهێزبوو. خێزانی شەپۆل، لەمەودوا بە بێوەژنی، بەنانکەری ماڵان هەتیوو بەخێو بکات. پێکەنین و توڕەبوونەکەی لەسەر هەقی نەقیب، هاوڕێ جوانەمەرگەکانی دیکە، بیر لە کامیان بکاتەوە، بۆ کامەیان شیوەن بکات. ماوەیەك بەو ناوەدا گەڕا و سووڕا، دانیشت سەری خستە ناو ئەژنۆکانی، لێڕەوار بە هەموو تاشەبەردەکانیەوە لەبەرچاوی دەسووڕا. هەوا و خوناوی ساردی دارستان و تەڕ و بڕی جلەکانی تەواو هەناسەیان تەنگ کردبوو، سیخەسیخی لە سینگی دەهات. هەستا سەرڕێ.. بە چواردەوری خۆیدا گەڕا، تەپۆڵکەیەکی بەرزی لە پێش بوو، چووە سەر تەپۆڵکەکە. ماوەیەك چاوی گێڕا ماسوولکەکانی چاوی ئەوەندە هیلاك بوون دنیا لەبەر چاوی نەك ڕێشکەو پێشکەی دەکرد، بەڵکو یەك پارچە تارمایی بوو. ماوەیەك چاوەکانی گووشین. ئەوجار زانی بە کەڵەکەوە چەند بەرەو خوار هاتوون. لە پێشیانەوە لەجەنگەڵەکەوە باخوباخاتی ماڵی شاخەوانی ناسییەوە. تانکییەکی سوور لەسەربانیان بوو، دنیا چۆڵ و خامۆشە. هەتا دەنگی سەگوەڕیش نایەت. ویستی بگەڕێتەوە لای هاوڕێیەکانی، هەستی بە تەنیاییەکی

کوشندە دەکرد. نەی دەزانی ڕوو لە کوێ بکات لەکام لایەوە هاتووە. چەند جار فیتوویەکی درێژی لێدا وەڵام نەبوو. گەڕایەوە سەر تەپۆڵکەکە هاواری کرد. هاوڕێیان، لەکوێن؟ لەو لێڕەوار و بیشەڵانە هاوار دەنگی دەدایەوە. ڕەنجبەر لە خوارێ لەناو بەردەکانی کەنار دەستێکی بۆ بەرز کردەوە. ئاهێکی بەبەردا هاتەوە، چووە لای هاوڕێیەکانی. هەستی بە ئارامییەك کرد. زۆر دوور نین لە سەر ڕەزی ماڵی شاخەوان، ئەوجارەش ڕزگارمان بوو. بابڕۆین. پێشڕەو لەسەرمان و لەتاوی ئازار دانەچۆقەی پێکەوتبوو، چوونە بن باڵی، پاش چارەگێك گەیشتنە ناو ڕەزی ماڵی شاخەوان. لە پەرژینەکان پەڕینەوە، لەترسی سەگەکان زۆر بە هەستەوە دەچوونە ژوورەوە. لە هیلاکی و ماندووبونیان لاکەیان دەهات. گەیشتنە بەردەرگای ژوورەکان بانگیان کرد، شاخە.. شاخە ماوەیەك گوێ قوڵاغبوون.. هیچ دەنگێك نەبوو. وادیارە خەوتوون؟ ڕەنجبەر ئالقەڕێزی دەرگای ڕاکێشا، کلیل نەدرابوو. ماڵێکی ساردی تاریکی چۆڵ و هۆڵ. بۆفیە و یاتاغەکان لەگەڵ هەندێك کەلوپەلی شۆڕاو لەوێ مابوون. بە گوێرەی حاجەتەکان دیاربوو چەند ڕۆژێك لەمەوپێش لەوێبوون. شاهۆ گەڕایەوە حەوشە، چەند کۆلکەدارێکی هێنا، سۆبەی گڕدا. لە ژوورە تاریکەکە دەرمانچیا و سەبەتێك نان لەسەر سەکۆیەك دانرابوون.، هەر بە وشکی کەوتنە کرماندنی. ڕەنجبەر سەبەتە نانی هەڵگرت، ڕاوەستن ڕاستە زۆرمان برسییە، بەڵام ئەو نانە وشکە هەموو قووڕگتان دادەتاشێ. بابچم تەڕی بکەم. لەسەر بیری ئاوەکە نانی تەڕکرد و گەڕایەوە. لە گۆشەیەك شاهۆ قتوویەك ژاژی دۆزیەوە، بەنانە نەرمەوە خواردیان. پێشڕەو ئازاری هەبوو، ناڵەناڵی دەهات لەبەر لەرزوتایەکی توند وەکوو مێژوکی دەلەرزی. دانەچۆقەی ددانەکانی بە تەواوی ژوورەکە دادەگەڕا، چەند لێف و پەتوویەکیان پێدادا، ڕەنجبەر پێیەکانی دەشێلا. هەندێك نانیان بەزۆر دەرخوارد دا، ڕەنگی تەواو بزڕکابوو.. شاهۆ جلەکانی لەبەر پێشڕەو داکەند، قۆڵی تەواو شین ببوو بۆی بەرز نەدەکرایەوە. سێ فیشەك سەرشانی هەڵتەکاندبوو، بەڵام خوێنی وەستابوو. جلەکانی گۆڕی، هاوڕێ بەس ئەمڕۆت زەحمەتە ئەوشەو دەچمە ناوشار دکتۆر لەبن ئەرز بێت بۆت پەیدا دەکەم. لەسەر ئەو حاڵەش دەیگوت، ناباشم. کەمێك ئازارم هەیە چ نییە! بۆ خۆی دەڕوات. جارجار دەنگی کۆپتەر دەبیسترا، ئاسمانی ئەو ناوەی بەرنەدەدا. لەدوور دەنگی گرمەگرم و تەقینەوە دەهاتە بەرگوێ. دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ وەخت. گرمەگرێك لەناکاو لەو

نزیکانە پەیدابوو، هەتا دەهات نزیکتر دەبووەوە. دەنگی تراکتۆرێك هات، لەپێش شینایی بەردەرگا ڕای گرت، شاهۆ کەوتە چاودێریکردنی، لەکونی پەنجەرەوە لوولەی کلاشینکۆفەکەی تێیان کرد. دووکەس دابەزین، هاتنە ژوورەوە، لەحەوشە شاهۆ زانی، شاخەوانە و کەسێکی لەگەڵە. شاخە هات ماوەیەك لە بن دەوەن و دارمیوەکان هات و چوو، وەکوو ئەوەی شتێکی بزر کرد بێت. برادەرەکەشی چوو بەلایەوە. پاشان شتێکیان دەست دایە و لەسەر لێواری بیری ئاوەکە دایان نا، بەرەو دەرگاهاتن. دەستێکی بۆ ئاڵقەڕێزەکە برد، بە برادەرەکەی گووت کەسێك هاتووە بۆ ئێرە کەسمان لەو ناوەی نەماون، دەبێ کێ بووبووبێت؟ بۆنی مامە شاهۆ و هاوڕێیەکانی دەکەم. شاهۆ هەستا بانگی کرد.. شاخە، وەرە کاکە وەرە! شاخەوان لەگەڵ گوێی لەدەنگی شاهۆ بوو یەکسەر ناسییەوە. بەپەلە خۆی بەژووردا کرد، هاوڕێ شاهۆ دیمانەت بەخێر.. شاهۆ باوەشی پێداکرد، ماوەیەك لەباوەشی گرت، لەدیتنی تێر نەدەبوو. هەستی دەکرد شاخۆ زۆر لێی تووڕیە. بە بۆن خەڵك دەناسییەوە، بۆنی من وەکوو ماسی بۆگەنی وایە. ماوەیەکی باش پێشمەرگەکانی ماچ کرد.. هەردووك چاوی پڕبوون لەئاو. لەگۆشەیەك دانیشت.. یەك بەیەك لە پێشمەرگەکان ورد دەبووەوە. تاسابوو، چاوەڕوانی ئەو دیدارەی نەدەکرد. بەچاو دەیویست لە شاهۆ بپرسێ، بۆچی ڕاست نەبووی لەگەڵم؟ هەموو هیوا و ئاواتەکانی گەنجێکی خوێن گەرمت لە گۆڕنا. چ دەبوو ئەگەر بەڕاشکاوانە پێمت گوتبا! ئەتۆ بەکەڵکی پێشمەرگایەتی نایەی. شاهۆش هەرکە لە برژانگە ئەستوور و چاوە ڕەشەقەترانییەکانی ڕادەما. حەیف نییە ئەو دوو چاوە هەر بەزیندووی نەمێننەوە. بە چەند فیشەکێکی گێل خامۆش بکرێن.. ئەگەر بەداوی کەفوکوڵ و دڵگەری گەنجانە و هەرزەکارانەی تۆ کەوتبام، ئێستا ئەتۆش دەبوویە کول و کۆڤانێکی زۆر گەورە، وەکوو ئەوانی دیکەی شەهیدبوون، یان بەدیلگیران و زۆر بێ بەزمییانە بەدەم قاقای جەلادە بەعسیەکانەوە، دەچوویە دەفتەری یادەوەریەوە! هەموویان بە بێدەنگی تەماشای یەکتریان دەکرد. بۆ شکانی ئەو بێدەنگییە، شاخەوان ڕووی لە هاوڕێ شاهۆ کرد. دەستی لەسەر شانی برادەرەکەی دانا، ئەوەش وریای خزممانە. هەروا لەتەمەنی شاخۆ دەبوو. شاهۆ ماوەیەك تێیڕاما، وادیارە شاخە تێی ڕادەبینێت بۆیە هەروا بەئاسانی دەڵێت خزممانە. شاخەوان لە شاهۆی پرسی، باشە وا ژمارەتان کەم ماونەتەوە؟ شاهۆ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، شاخەگیان ئەوایان بەسەرهاتێکی زۆر جەرگبڕ و

ناخۆشه هەڵی گره بۆ وەختێکی تر. بۆئەوەی سەرگەرمی قسەی بکا، شاخۆ پرسیاری ئەوەی لێ نەکات بۆچی وەری نەگرت، وەك پێشمەرگە! ڕووی له برادەرەکەی کرد. ئەتۆ وابزانم، کەسێکی ئاواتی؟ کوڕه کەمێك تەماشای شاخۆی کرد، ڕەنگی سوورهەڵگەڕا، کاکم ئاوات برا گەورەمه! شاهۆ هەستایەوه ئەملاو و ئەولای ماچ کرد. ئەدی بۆ لەکەنگێوه قسەناکەی؟. کوڕه بەشەرمێکەوە، جا هاوڕێ ئەتۆ هیچ پرسیارت لەمن نەکرد. ئەمنیش له خۆمەوه چ بڵێم. ئاوات له کوێیه؟ کاکم ژنی هێناوه، ژنەکەی دکتۆرەیه، بۆخۆشی بەتەواوی نازانم. لەماڵێ ئەگەر چووبا بۆ بازاڕی دەیگوت، دەچمه هەولێرێ. ئەوکاتی هاتم لەماڵێ بوو. پێشڕەو بەدەم ئازار و ئەقەئەقکردن، خوا ناردی بۆ چارەسەری من باشه. شاهۆ لەگۆشەیەك پارچه پەڕاویکێ له دەفتەرێك کردەوه، کەوته نووسینی نامەیەکی کورت. پێچایەوه. دایه دەستی شاخەوان.. شاخۆگیان! ئەو نامەیه بەزووترین کات بگەیەنه دەستی ئاوات زۆر به نهێنی، به خێراییش وەڵامەکەیم بۆ دەهێننەوه. ئەوکاتی هاتن ڕێگا چۆن بوو؟ ئارام بوو، هیچ جموجۆڵی جاشان نەبوو؟ شاخەوان بەدەم هەستانەوه، به شاهۆی گوت، نا، شتێکی وا له گۆڕێ نەبوو. هاتبووین ئەو شتانه بخەینه ناو تراکتۆری و بیان بەینەوه شاری، بەڵام مادام ئێیه لێرەن نایان بەین. شاهۆ به شاخۆی گوت، شاخەگیان ئێمه لێره نامێنینەوه. ئاواتم بۆ پەیدا بکەن زۆر ئیشم پێیەتی. شاخه زۆر به دڵگرانی لەشاهۆی پرسی.. هاوڕێ له کۆسرەتی چتان لێ بەسەرهات؟ کەوتینه بۆسەیەکی زۆر مەحکەم، هەر ئەو سێ پێشمەرگه دەرچووین، ئەرێ شاخه. دەنگو باسی شار، ناڵێن کێن؟ مەسەلەی هاوڕێ شەپۆل سەد دەر سەدە! ماڵێشیان کاولکرا، ژن و منداڵی خۆیان شاردووەتەوه. داکوباب و خوشکەکانی گیران. ڕێبازیش هەمان چارەنووسی هەیه. شاهۆ له پرسیارەکەی پەشیمانبووەوه. تەماشایەکی هاوڕێیەکانی کرد، بەغەمباری له گۆشەیەك پاڵیان دابووەوه. دوو لاوەکه ماڵئاواییان کرد. لەپشت پەرژینەکانەوه دەرچوون، تراکتۆرەکەیان ئیش پێ کرد، گرەگرێکی کرد، کوژایەوه. شاخەوان دابەزی بوخچەیەکی لەدەستی بوو، هاتەوه ژوورەوه دایه دەستی شاهۆ. ئەو نان و پەنری و ژاژییه بۆخۆتان بێت. ئەگەر بۆمانکرا ئێواره دەگەڕێینەوه. شاهۆ شانی گرت. بۆمان کرا نییه. ئەتۆ ئەو نامەیه بگەیەنه دەستی ئاوات هەقت نەبێت، بەڵام باشی بشارەوه و نەیدەیه دەستی کەس، له ئاواتی زیاتر باشه. دووباره شاخەوان دەرچوو، لەسەر بیری

ئاوەکە دەستی دایە شتێك و ڕۆیشت. پێشمەرگەکان دەستیان کرد بە نان خواردن، بەدەم خواردنەوە، شاهۆ بە پێشڕەوی گوت، لەمەودوا غەمت نەبێت، شتەکان بەرەو باشی دەڕۆن، ئەوەتا خێزانی ئاوات دکتۆرەیە. ڕەنجبەر پرسی، ئاوات کێیە؟ هاوڕێیەکی ناوشارە. جێگای متمانەیە، بەرپرسی هەموو ڕێکخراوی ناو شارە. دەمەو ئێوارە، بەرەبەری خۆر ئاوابوون. لاندرۆڤەرێك لە پێش دەرگا ڕای گرت. سەرەتا گەنجێکی باڵابەرزی چوارشانە دەبازی. هاتە ژوورەوە. دوو چەکداری لەگەڵ بوون. ڕەنجبەرو، پێشڕەو لەحەوشە دیتیان شڵەژان. ڕەنجبەر دەستی دایە تفەنگەکەی هەر چەند دەیزانی تەقە ناکا لەبەر ئەوەی تەڕی دوێنێ شەوی هێشتا تێدامابوو. شاهۆ پێی گوت، هاوڕێ لەلایەك داینێ، پێویستمان پێی نییە، ئەوە ئاواتە. ئاوات لەدەرگای دا. سەرێکی بەژوورێدا کرد، ماڵێ میوانان ڕادەگردن. شاهۆ بانگی کرد، وەرە وەرە، ماڵی خۆتە. ئاوات هاتە ژوورێ، دوو چەکدارەکە لە حەوشە مانەوە. باوەشی بە شاهۆدا کرد. چاوەکانی پڕ ئاو بوون. خێراخێرا دەیگوت، باوەڕ بە چاوەکانی خۆم ناکەم. هەردووك هاوڕێیەکەی ماچ کرد. لەبن سەری پێشڕەو دانیشت. هاوڕێ برینداری. پێشڕەو هێزی دایە بەر خۆی دانیشت. جێگای فیشەکەکان ئەوەندەی ئەو شانەم بە ئازار نین، دیارە شکاوە. غەمت نەبێت هەر ئەوشەو چارەسەری تەواوت بۆ دەکرێت، دکتۆر و داو و دەرمان زۆر و زەبەندە، خۆ ئەگەر پێویستی بە خەستەخانەش بوو، بە شێوەیەک جێ بەجێی دەکەین، با دنیا بەتەواوی تاریك دابێت، دەتوانم برینەکانت ببینم؟ بە شێوەیەکی نیمچە پاڕانەوە، ئەو پرسیارەی لە پێشڕەو کرد، کەمێک خۆی قیت کردەوە و جەمادانییەکەی لەشانی کردەوە، شانی خوار کردەوە، فەرموو ئەوەی دیکەیان بۆخۆت، پەڕۆ و پاتاڵەکە لادە. ئاوات قۆپچە خوێناوییەکانی چۆغە و کراسە سەوزە لەو خوێندا ڕەقبووەکەی کردەنەوە، زۆر بە ئەسپایی کەوتە لادانی پارچە پشتێند و پەڕۆ ڕەقبووەکان، لە چوار لاوە برینەکان تەواو دەمییان کردبووەوە، خوێنی تازە و سوورسووری خەست بەسەر پشت و سینگیدا دەهاتە خوارێ، پاکی کردەوە، مەترسێ هاوڕێ لەخۆمەوە دەستکاری ناکەم، خوولێکی دەرزی لێدان و پزیشکیم بینیوە. چارۆگەیەکی لەتەنیشت بوو، شووشەیەکی ڕەنگ قاوەیی تۆخی دەرهێنا، بەرسەر برینەکانیدا کرد، کەمێک دەکزێتەوە، پاکی دەکاتەوە، ددان بە خۆتدا بگرە، مادام پێشمەرگەی سەردەمی ئەنفالی ئەوەندە برینەت بەخەیاڵدا نایەت. پێشڕەو بێدەنگ چاوەکانی

گرتبوو ددانەکانی لە جیڕەوە دەبرد، بەدەم سەر سووڕاندن لێوەکانی دەلەرزین..
خۆشبەختانە فیشەکێکیان سەرچیخ کەمێک پێست و گۆشتی بڕیوە، نەگەیشتووەتە ئێسقان و دەمارەکان، بەڵام ئەوەی دیکەیان بەر دەفەی شانت کەوتووە و کووناودەر بووە. لەپشتەوە پێکراوی لەبەرئەوەی جێگا کونی پشتت باریک و بچووکە، بەڵام بەلای سینگتدا تەواو دەمی کراوەتەوە، برینەکانی بە چەند شاش و لەفاف و دیتۆڵ و دەرمانە سوورە پێچایەوە، دەرزییەکی تۆز و ئاوی تێکەڵاو کرد، تکایە هاوڕێ درێژبە هەر بەڕاکشانەوە دەرزییەکەی لێدا. پاڵکەوە و پشوو بدە. ڕووی لە شاهۆ کرد، هەتا ئەو کاتە بەبێدەنگی لەو دیمەنەی دەڕوانی. وابزانم جارێکی دیکە هاتبوونە ناو شار لێرە نەبووم، مانگێك لە هەولێر بووم، قەت لەبیرم ناچێت. زۆر زانیاریی و شتم هەبوون بەکەڵکتان دەهات، چالاکییەکی زۆر قارەمانانەتان کردبوو، بەڵام ئەوەی بۆسەی کۆسرەت و شەهیدبوونی حەوت پێشمەرگەی قارەمان برینێکی گەورەیە. بەتایبەتی لەو سەردەم و ساتەدا، ژمارەی پێشمەرگە ڕۆژ بەڕۆژ لە کەمیدایە، کەس لەخۆیڕا نابینیت ببێتە پێشمەرگە، جاری جاران نییە لە جێگای حەوت پێشمەرگەی شەهید حەفتا جێگایان بگرێتەوە، کێ ماوە، ئەوەی ئەنفالکرا، ئەنفالکرا. ئەوەی ڕۆژێک لەڕۆژان جموجوڵێکی هەبوو بێت لە زیندانە، بە سەدان هەزار کەس لە ئۆردووگا زۆرەملێیەکان چواردەوریان تەلبەندی دڕکاوی کراون، گوندەکانیان خاپورکرد و ڕایانگواستن، پاشان شارۆچکەکان، ئەوەتا دەنگۆی شارە گەورەکانیش لە گۆڕێیە. شاهۆ و ڕەنجبەر ڕوویان لە ئاوات کرد، هاوڕێ ئەوە شۆڕشە هەموو میللەتان بەو قۆناغ و دەورانەدا تێپەڕیون، هەر کەسێك دەست بداتە چەك دەکوژرێ و دەکوژێت، کەس نازانێت پاش کەمێکی دیکە چی ڕوودەدات! ئێمە نابێت ئاوا ڕەشبین بین، ڕاستە قوربانییەکی زۆر دراوە، بەڵام دوا شت سەرکەوتنە. ئاوات ماوەیەك مات بوو، غەمێکی زۆر بە سوێ لە ڕووخساری بەدی دەکرا. سەرێکی ڕاوەشاند نەیزانی چی بڵێت! بە ڕووخسەتتان دەچم ئەو دوو جاشە دێنمە ژوورەوە. ئاوات لەبەر دەرگاوە بانگی کردن، هاوڕێیان وەرن. دوو جاشەکە بەچەکەوە خۆیان بە ژووردا کرد. شاهۆ یەکێکیانی ناسی، کاتی خۆی لەگەڵیان پێشمەرگەبوو. تووشی نەخۆشییەکی قوڕس بوو، ناردیانەوە ناوشار. شاهۆ بانگی کرد، ها جاشی مل ئەستوور. کابرا بەپێکەنینەوە، ئێمەت کرد بە جاش و بۆ خۆت بووی بە باش. شاهۆگیان لەوەی زیاتر لە توانامدا نەماوە، یەك

بست لێت جیا نابمەوە! کوڕە باڵێ، دەڵێن ڕێوی بۆ خۆی بە کونەوە نەدەچوو، تۆرەی گەڵێشکیشە، ئەوەندە پێشمەرگەی ماوین، نازانین چۆنچۆنی بژین؟ واز لەوەی بێنە. ئەو برادەرە کێیە؟ ئاوات بە پێکەنینەوە ئەویش، کاك لوقمانی خۆمانە. ئاوات سەیرێکی دەرەوەی کرد، دنیا تاریك بووبوو.. پرسی، سەعات چەندە، ئاوات تەماشایەکی کاتژمێری دەستی کرد، لە هەشت لای داوە. کەواتە خۆتان کۆکەنەوە، دوایی باسی هەموو شتێك دەکەین. هاوڕێ تەندروستی باش نییە، هەندێك نا نو کەبابیان بۆ هێنابوو لەپێشیان دانان. شاهۆ، ئەوەندە نابێت نانمان خواردووە. شاخۆ نان و پەنیری هێنابوو. بخۆن کاك هەتا هەیە، پێشمەرگە هەموو دەمێك برسییە. هەندێك نان و کەبابیان خوارد و چوونە بن باڵی پێشڕەو، جەستەی تەواو شل ببوو، هەردووک باسکەکانی بەملیەوە هەڵواسرابو، ملی تەواو شۆڕ بووبووەوە. چاوەکانی قەپات و لرخەلرخێکی لێوە دەهات.. شاهۆ دەستی بە ڕوومەتە ساردەکانیدا هێنا، پەشۆکا، تەماشایەکی ئاواتی کرد، ئەویش بە هێواشییەکەوە گووتی، بێخەم بن! دەرزییەکە کاری خۆی کردووە، لەئازار ڕزگاری بووە، ئاوا باشترە هۆشی بەسەر دنیاوە نەبێت، بەس ئەمن دەزانم چ ئازارێک دەچێژێت، سەرشانی تەواو هەڵتەکاوە، پێم سەیرە هەتا ئێستا ماوە و ددانی بە خۆیدا گرتووە. ئاوات بەکۆڵی خۆی دادا، بەناو حەوشە قوڕاوییەکە چوونە دەرەوە. لەبەر دەرگا بە لاندڕۆڤەرەکە ڕۆیشتن. لەڕێگا شاهۆ پرسیاری ئەو دوو پێشمەرگەی کرد کە لەسەربازگەی شار گوللە باران کراون؟ هەتا ئێستا بەس شەپۆل و ڕێباز ناسراون. بەدەم قسەکردن و پرسیار کردن. لەسەر پردی شار پەڕینەوە. دنیاییەکی تاریك و کشومات، دەنگی هیچ نەدەهات. بە لاکۆڵاناندا ڕۆیشتن، ئەوەی بەرچاویان دەکەوت لە سەربانەکان چەکدار بوون، دەهاتن و دەچوون. ئاوات ڕووی لەبرادەرەکانی کرد.. دەتان بەمە شوێنێك جێگای شك و گومانی کەس نەبێت. ئەو جارەی دەبێت ماوەیەکی درێژ لەشاری بمێننەوە. هەتا چارەسەری ئەو هاوڕێیە دەکرێت، پاشان ڕێگایەکتان بۆ دەدۆزینەوە بگەنەوە ناوزەنگ. بەڵام تکایە، بەبێ ئاگاداری برادەرانی ناوشار بۆ هیچ لایەک نەچن، ناو شار هوەها تەندراوە مێشووله دەرناچێت. لە کەندەڵانێك شۆڕبوونەوە، چەند خانوویەکی گەورەی بلۆك دیاربوون. شاهۆ پرسی، باشە ئاوات شار بۆ وا تاریك و چۆڵە؟. لەپاش ڕاگواستنی قەڵادزێ، خەڵکی ترسان، بۆخۆیان باریان کرد. هەر چەندە زیاتر لە ساڵێکە، قەڵادزێ ڕاوگوێزراوە و چی

دەنگ نییە؟ بەلام مەسەلەی بێ کارەبایی، لەپاش چالاکیەکەتان، نە ک شەوانەکارەبا دەبڕێت، بەلکوو ژیان و گووزەرانیان لە خەلکی تاڵ کردووە. گەیشتنە بەردەرگای ماڵیک هەندێك چاوەڕوانیان کرد. دەرگا دووتاکی گەورەکە کرایەوە، خۆیان بە حەوشەدا کرد. شاهۆ و پێشمەرگەکانیان دابەزاندن. ئاوات پێش ئەوەی بڕوات، لەگەڵ چەکدارەکان بردنیاننە ژوورێکی گەورەی خاوێن و لۆکسی بۆ هەلکردن. هەموو شتێکمان ئامادە کردووە. پاش کەمێکی دیکە دەگەڕێینەوە، چاوەڕوانمان بن. دەرگا لەکەس نەکەنەوە و هەستان بەهەر جوولەیەکی نا ئاسایی کرد، خۆتان دەرباز بکەن. کلاشینکۆفێکی لەگەڵ تاقمی فیشەك لە برادەرەکەی وەرگرت. دەمانچیەکی بەچەند هێدەکەوە بۆیان بەجێ هێشت. خواردن و خواردنەوە هەبوو، ژوورەکە گەرم و خۆش بوو، هەستیان بەئارامی کرد. ئاوات لەگەڵ هاوڕێیەکانی ڕۆیشت.

شاهۆ هەستی دەکرد تەواو سەرمای بووە. دەنگی نووسابوو، ئەوەندەی هاوار کردبوو، قوڕگی شەقارشەقار خوێنی لێدەهات. هاژەهاژی شەپۆلەکان بەر بینگی بەرنەدەدا، ڕەنجبەر ڕووی لە شاهۆ کرد، بزانە چیمان بەسەرهات، ئێستاکەش باوەرناکەم ڕزگارمان بووە، وادەزانم خەونە. شاهۆ دوو دەستی بەرەو سەر بەرز کردەوە، جارجار شتی واش ڕوودەدات. ڕەنجبەر و شاهۆ جلکیان داکەند و خۆیان گۆڕی. لەناو لێف و بەتانی گەرم، خۆیان گرمۆلە کرد. ڕەنجبەر بەدەم نانخواردنەوە، بەڕاستی لە ژیانمدا زۆر جار لەنێوان ژیان و مردندا بووم، بەلام قەت بەقەد ئەوشەو نائومێد و بێهیوا نەبووبووم. ئاواتم دەخواست لەشەڕەکەی ئەوشەوەیدا کوژرا بام. بزانە ئەو پێشڕەوە، بەهەموو برینانەوە قەت ئاخونۆفێکی نەکرد. شاهۆ ڕووی لە هاوڕێیەکەی کرد، بۆخۆشم دەستم لە خۆم شوشت بوو، بەلام بەسەر خۆم نەدەهێنا. دەبێ باوەڕمان زۆر بە هێز بێت. چەند ملیۆن کەس چاویان لەدەست و بازووی ئەو چەند پێشمەرگەیەیە. لەو قسانەدابوون دەرگای حەوشە کرایەوە. شاهۆ هەستا و دەستی دایە چەکەکەی و لەپشت دەرگا چاوەڕوانی کرد. ئاوات بانگی کرد، هاوڕێیان خۆمانین. ئاوات لەگەڵ سێ کەسی دیکە خۆی بە ژوورێدا کرد. دوو پیاو و ژنێك بوون. ئاوات هەموویانی بەیەکتر ناساند. پاش کەمێك دیاربوو ژن و پیاوێك دکتۆر بوون. پێشڕەویان هێنا قۆڵیان بەرزکردەوە. برینەکانی سەرشانی زۆر قووڵ دیاربوون. دوو دکتۆرەکە داوایان لە ئاوات و شاهۆ کرد، لێرە چارەسەر ناکرێت، دەبێ لەگەڵ خۆمان بێبەین. شاهۆ

تەماشایەکی ئاواتی کرد. ئاوات سەری ڕازی بوونی لەقاند. بانگی کردە دەرێ. هاوڕێ ئایا باش دەیانناسی؟. ئافرەتەکە خێزانمە ئەوی دیکەشیان برایەتی! شاهۆ دڵی ئاوی خواردەوە. شتێکی دیکە، دەمەوێت بچمە سەردانی ماڵی شەپۆل. ئاوات ناوچەوانی تێکچوو. هاوڕێ شەپۆل شەهید بوو، ماڵیان تەخت بوو، بۆ کوێ دەچی؟ شاهۆ سوور بوو لەسەر چوونەکەی. بەئارەزووی خۆت، ئەمن ناتوانم ڕات بگرم، ئەتۆ نیشوکاری خۆت بۆخۆت باشتر دەزانی، بەڵام لەگەڵ چوونەدەرتدا نیم، سەبەی شەو پێکەوە دەڕۆین. دوو دکتۆرەکە و پێشڕەو و ئاوات ڕۆیشتن. شاهۆ لەگەڵ ئاوات و ڕەنجبەر بۆ شەوی دواتر چوونە جێگای ماڵی خانەوادەی شەپۆل. کەلاوە هەر وەکوو خۆی مابوو، لەبەرامبەریەوە خانووی ماڵی بابی شەپۆل هەتا سەر بناغەکەی هەڵکەندرابوو شوێنەواری شوورا و دەرگا و ژوورە بەرزەکان نەمابوون. شاهۆ و ڕەنجبەر ماوەیەك بەناو قوڕ و بلۆك و داروبەردی ئەوناوەدا هاتن و چوون. کۆمەڵێك یادەوەری و بیرەوەری خۆش و ناخۆش بە مێشکیاندا هات. ئاخ شەپۆل، بۆ مێژوو داستانەکانت دەمێننەوە، ئەوەی لەشەڕی دەریاچە بەسەر تۆ هات، کەم کەس هەیە و ئاستەمە بتوانێت جارێکی دیکە دەستی چەك بگرێت. کەچی شەپۆل لەجاران بە گوڕتر بوو لە پێشمەرگایەتی. بەدڵێکی زۆر غەمبارەوە ئەو ناوەیان بەجێهێشت. پاش ئەوەی زیاتر لە مانگێك لە شار مانەوە بۆ چارەسەری پێشڕەو، ڕۆژبەڕۆژ تەندروستی پێشڕەو لە باشی دەدا. باری دەروونی شاهۆ بەرەو خراپی دەچوو. هەستیان دەکرد بۆی هەیە کارەساتی مامۆستا سەرباز و هاوڕێیەکانی دووبارە بێتەوە. لە ڕێگای دۆڵە بەفرێ دووبارە ڕێگا سەخت و دژوارەکانی زنجیرەی چیای قەندیل باوەشی بۆیان کردەوە. ئەوەندەی بەڕێگا ڕۆیشتن لە گوندی کەلاوە و ڕووخاو، ڕەز و باخی شێلدراو و کوێستانەکان چۆل چۆل دەتگوت خۆڵی مردوویان بەسەر داکراوە، مۆڵگە و سەربازگە و هاتن و چوونی فڕۆکەی جەنگی و کۆپتەر، زۆر لەزیادی دابوو. بەچەند شەو و چەند ڕۆژ خۆیان گەیاندە ناوزەنگ. ناوزەنگ هەر وەکوو جاران بوو. تەنها چۆڵتر بوو و ژمارەی پێشمەرگە زۆر لەکەمی دابوو. جاسووسانیش و گوڕە شێر، بارەگا و پێشمەرگەی لە ئامێز گرتبوو.

# راپەڕین و سەروەری

لەناو خانوویەکی پەڕپووتی داڕووخاو، دیوارەکانی تەواو سنگیان دادابوو. نەك درز، بەڵکوو قڵیشی گەورەگەورەی لە بن میچەوە هەتا سەرزەوی تێدابوون! کۆنەخانوو چاوەڕوانی داڕمانی بەپەلەی لێدەکرا، بەتایبەتی لەو وەرزە سەهۆڵبەندانە. ئەوە دوا زستانی دەبێت. بە شی خۆی پێشوازی لە زستانی سەخت کردو بە پشتە کوڕە تەنکەکەی بەفری گلدایەوە، لەگەڵ هەر ماڵئاواییەکی زستان، هەناسەیەکی ئارامی هەڵدەکێشا، ئەوجارەش بە سەرچوار دیوارەوە بنمیچێکم هەیە، بۆ چلەی دابێش، گلەبان و سواغێکی باش دەکرێم. سەربان وەکوو هەموو خانووە قوڕەکانی ئاوایی ئەوەندەی بەفر لێکەوتبوو، خانوو و درەخت و تەوێڵە گەورەکان بە ئاژەڵ و پەلەوەرەکانی ناویانەوە، لە ژێر باری قورسی بە فرێکی ئەستوور دەیان نالاند. لە کۆڵانەوە بەسەر بەفردا بە بێ هیچ پەیژە سەردەکەوتن. زۆربەی ڕێگایەکانی سنوور گیرابوون، جا یان لەبەر بەفروزریانی سەخت، یان ویست و ئارەزوی دوو وڵاتی داگیرکەر وای دەویست. بەئارەزووی خۆیانە، سنوور وەکوو قووتی میللەت وایە، بەردەوام لە بڕین و کردنەوەیە. لەو سنوورە دەستکردەوە بە تەواوی لە گوندی گۆڕەشێر، ئەو گۆڕەشێرەی بەدەیان نەک شێرەبەفرینە بەڵکوو شێری بە مەچەک و بازووی بەهێز، بە نەڕەنەڕ و گوڕە گوڕ لە گۆڕناوە. ئێستاکەش چاوەڕوانی سێ شێری پاڵەوانی داستانەکانن، پاش ململانەیەکی زۆر لەگەڵ ڕێگا دژوارەکان. شاهۆ لەتەنیشت مەلۆتکەیەکی بەرگ سپی، زۆر بە بێتاقەتی پێیەکانی درێژ کردبوون. شەویا بەگەڕانەوەی شاهۆ زۆر خۆشحاڵ بوو، باوەڕی بە چاوەکانی خۆی نەدەکرد گەڕاوەتەوە، چایەکی بۆ هێنا، ماوەیەك بە بێدەنگی لەتەنیشتی دانیشت، حەزی دەکرد پرسیاری زۆر شتی لێبکات، ئەو ماوە دوور و درێژە لە کوێ بووە؟ چۆنچۆنی ژیاوە؟ هەتا چەند بیری تەوار و خۆیی و کۆرپە ساوایەکەی کردووە؟ هەواڵی بناری کۆسرەت و شارۆچکە و گوزەرانی خەڵکەکە! بەڵام هەرچەند لە ڕووخساری وورددەبووەوە، شەکەتی ڕێگاوبان، لەدەستدانی زۆربەی هاوڕێ خۆشەویستەکانی، زاتی ئەوەی نەدەکرد پرسیاری لێبکات. ئەو ماوەی لەگەڵی

ژیابوو شارەزای خوڕەوشتی بووبوو، ئەوکاتانەی لە بیرانڕا دەچێت، تاکە شت کە هێوری دەکاتەوە تەنیاییە، لێگەڕێ با لەگەڵ خۆیدا بژیت، هەتا بۆ خۆی وەدەنگ دێت. ئەو کاتی دەکەوێتە دنیای خەیاڵات و ئەندێشەوە، بەتەواوی لە دەوروبەری، هەتا لە خودی خۆشی دادەبڕێت. نازانێت ماوەی چەندە لەگەڵ بێدەنگی لە خەڵوەتدایە.. لەلایەکی دیکەش شاهۆی دەناسی خاوەنی چ ورەیەکی بەرز و پۆڵاینە و هەروا ئاسان شلوێ نابێت. بۆ دواجار زەردەیەکی بۆ شاهۆ کرد، گیانەکەم، بۆ وا خۆت بێتاقەت کردووە؟ ئەو کچە گوناحە زیاتر لە مانگێکە لە دایکبووە، هێشتا ناوی لێنەنراوە، چەند بەتامەزرۆییەوە چاوەڕوانی هاتنەوەی تۆم دەکرد، بۆخۆت ناوی لێ بنێی. شاهۆ زۆر بە بێزاریەوە، ناوی چی و منداڵی چی! ئەگەر سبەی تەوار نەگەڕێتەوە بەدوای دەکەوم. لەبەر تەواری جێ بەخۆم ناگرێت. تەواو لە تەواری نا ئومێد بووبووم، وا هەستدەکەم، جارێکی دیکە چاوم بە چاوەشینەکانی ناکەوێتەوە. ئەو سۆزەی دابووم کە تەوار بدەمە دەستێکی ئەمینی نزیکی، نەك بە جێم نەهێنا و سەرکەوتوو نەبووم، بەڵکوو شەرمەزاربووم، چیم بە چی کرد؟ هیچ، بەس ڕووزەردی! لە ژێر تیشکی کزی چراکە، کە هەر پلتەپلتی بوو، دیار بو نەوتی تێدانە مابوو، ڕەنگی ئارەقاوی سوور هەڵگەڕابوو، دوو لێوە پەمەییەکانی خوێنیان لێ بڕا بووو و ڕەشداگەڕا بوون.. لە ژێر لێوەوە پرسی:

باشە ئەو کاتی تەوار لەسەرکانی ژەهری خواردەوە. یان ژەهەرییان دەرخواردا، پێم ناڵێی ئەتۆ لە کوێ بووی؟ هەندێك ددانی لە جیڕەوە بردن. بۆ ئاگاداری نەبووی؟ چەند جار پێتم گوتی، ئەو کچە شەنس و ناوچەوانەکەی نایکات، ئاگاداری بە، بەردێك لەو ئاسمانەی بەربێتەوە بەدوایدا دەگەڕێت. ئێستا کێ دەڵێ، ماوە یان مردووە؟ هەرنەوەندە دکتۆری لەگەڵە. باشە دکتۆر بۆ لێرە چارەسەری نەدەکرد؟. بەدەمیان پرسیاری دەکرد، چاوەڕوانی وەڵامی نەدەکرد. هێشتا وەڵامێکی دەست نەکەوتبوو، پرسیارێکی دیکەی دەکرد. شەوبا نەیدەزانی چی وەڵام بداتەوە. بەقەد شاهۆ تەواری خۆش دەویست، دەستی کرد بە گریان، ئەمنیش لەئازار و دەردی خۆم هۆشم بەسەر دنیاوە نەبوو، نەمتوانی لەگەڵی بچم. بۆ خوێندن دەچوو، لەگەڵ ساوێنی چوزانێت ژەهر خواردی دەکەن، بەسەر مەرگی دوو مامۆستای کە لەچاوی خۆی خۆشتر دەویستن دادەچێت. پێش بوونی ئەوکچە، تەوار وای بەسەرهات. کاتێك خەبەریان بۆم هێناو پێمزانی، بۆ

ناوزەنگێ بەڕێکرا بوو. نازانم بۆخۆشم نازانم چی ڕوویدا! وەرە بزانە لەو چیا و چۆڵە و لەو کونەگورگەش وازمان لێ ناهێنن. ئەو بەیانیەی ژەهریان بۆ لە کانییە کردین، تەوار هەستا بوو. ئەوەندە جوان بووبوو، وەکوو مانگی دەدرەوشایەوە، خەونێکی بۆ گێڕامەوە. شاهۆ پرسی، لەسەر کێ؟ لەسەر تۆ! چی دەگوت؟ هەرئەوەندەی دەگوت، لەخەونمدا مامە شاهۆ... تەواوی نەدەکرد، زۆرم لێکرد.. نەمابوو.. شاهۆ قەت وەکوو ئەو ماوەی نەبووە لەوەتی دەیناسم، بەقەد ئەو چەند ڕۆژەی پرسیاری کەسوکاری نەکردووە، لەکوێن؟ چیان بەسەرهات؟ مامە شاهۆ دەزانێت، ماون یان نەماون، هەر بۆخۆشی وەڵامی خۆی دەدایەوە، دەزانم نەماون! ئەمن ئەو ماوەی لەدەستی تۆ و تەوار شێت دەبم، وەشاخ و کێوان دەدەم. دەستی کرد بەگریانێکی وەکوو دایکی کۆرپە مردووی کۆست کەوتوو. شاهۆ هەستی بەشەرمەزاری کرد. بۆ یەکەم جارییەتی بەو توندی و توورەبوونەوە نەك شەوبا، بەڵکوو لە بەرامبەر هیچ ئافرەتێك بەشێوەیە قسە بکات، ئاخر شەوباگیان، بە قوربان، لەتۆ نەپرسم، ئەدی لەکێ بپرسم؟ دەستی لە ملی کرد.. ماوەیەك بە سینگی خۆیەوە نووساند. شەوبا لەسەر گریانەکەی خۆی بەردەوام بوو. شاهۆ لەوەی زیاتر چاوی بەرای نەدا شەوبا بەو شێوەیە ببینێت. پاڵتۆکۆنەکەی لەبەر کرد و بەبێ هیچ قسەیەك چووە دەرێ. ماوەیەك لە پشتی پەنجەرە بێ شووشەکە، وەکوو تارماییەك بێجووڵە مایەوە. پاشان لەپشت دەرگا دەستی دایە بەفرماڵکێك و هەر لە کۆڵانەوە چووە سەربان. کزەبایەکی جەرگ بڕی دەهات، هەرچەندە دەمەو نیوەڕۆ بوو، بەڵام لەبەر بەفری سپی هیچ کەس لە ئاوایی دیارنەبوو. سەربانەکە بەقەد کۆڵان بەفری نوێی لێ خڕبووبووەوە. جەمەدانەکەی لە دەموچاوی ئاڵاند، دەستی کرد بەفرماڵین. ماوەی نیوکاتژمێرێك بەفری فڕێدا خوارێ. هەستی دەکرد دەست و پەنجە و گوێچکە و لووتی بەستوویەتی، وەکوو تەختەی ساردیان لێهاتووە. ڕیش و سمێڵی تەواو بەستبووی. جگەرەیەکی بۆ هەڵکرد، بەڵکوو بتوانێت تەواوی بکات. لەپاش تەواوکردنی بەفر فڕێدان. کەوتە پەستانەوەی چاڵەکانی. ئەوەندە زۆر و قووڵبون کالەکانی تەواو ڕۆدەچوون. هەستی دەکرد ئەو سەربان و ژوورە بەمزوانە دادەتەپێت. دابەزی، بەپەلە خۆی بە ژووردا کرد. شەوبا خێرا پاڵتۆکەی لێدانا و بەتانیەکی بەسەر پشتی دادا. شاهۆ ماوەیەك لەدەموچاوی شەوبا ڕاما. چووە لای سۆبەکە بۆ زیاتر جۆشدانی. بەڕاستی زستانێکی سەختی کەم وێنەیە؟

ماوەیەك خۆی خەریکی سۆبەکە کرد. لەپشتی دەرگا دەنگێك بانگی کرد، ئەرێ ماڵێ لەماڵن؟ شاهۆ بانگی کرد، فەرموو هاوڕێ ڕەنجبەر وەرە ژوورێ. دەرگا تەنەکەکەی بە جیڕەجیڕ کردەوە. پەردەی لادا. لەبەر خۆیەوە. پششششش.. ئەوە چۆن نە پیشاون؟ هەندێك با هەوا بگۆڕێت. لەبەر خۆتان نا، لەبەر ئەو شازادەیەی دەخنکێت. هاتە ژوورێ، مەلۆتکەکەی لەباوەش کرد. لەبەر ڕووناکایی پەنجەرەکە ڕووخساری سپی سپی کچەکە دەردەکەوت، دوو چاوی گەورەی قاوەیی و لووتێکی قنجی باریك. ڕەنجبەر ڕووی لە شاهۆکرد، چاوە و لووتی بە تۆ دەچێت! سپیایەتی و لێوەکانی بە شەوبا! ئەرێ، ئەو کچە جوانە ناوی چییە؟ لەو کاتەیدا چەکەکەی بەدیوار هەڵپەسێردرا، جولاّ و بەسەر کۆمەڵێك پەرداخ و ئیستکان و فەخفوری شۆردراودا کەوت. خرمەیان هات، زۆریان شکان. هیچ خۆی تێك نەدا. ببوورن بەپیسی بۆ لێرەتان فڕێداون. شەوبا بە پێکەنینەوە، گوێ مەدەیە هاوڕێ، قەزا و بەلاّکێڕە. ڕووی لە شاهۆ کرد. هاوڕێ چیتە دەڵێی پاپۆڕت بە سەدان سەرنشینەوە ژێرئاو کەوتووە. هەر پیش دەخۆیەوە. پرسیم، ئەو کچە نازدارە ناوی چییە؟ شاهۆ بەبێئەوەی ڕوو لە ڕەنجبەر بکات، ڕەنجە دڵم لەقەفەزەی سینگم جێی نابێتەوە. وا هەست دەکەم تەوار نەماوە. ناوی ئەو کچە نانێم هەتا چارەنووسی تەوار نەزانم. ئەوەندە خەون و هەواڵ و بەسەرهاتی ناخۆشم بیستن، وەختە لە پێستی خۆم بچمە دەرێ. نازانم، بۆ زانینی هەواڵی تەوار ڕووله کوێ بکەم؟ ڕەنجە بە توندی لە ناوچەوانی خۆیدا. وەرە ئەمنیش سەر و مێشکم نەماوە. بۆچی هاتووم و دانیشتووم باسی چی دەکەم؟ ئەمنیان ناردووە، بێم لەگەڵ خۆم بتبەمە ناوزەنگ؟ شاهۆ بە پەشۆکاوییەکەوە، بۆ؟ بۆ ناوزەنگ؟ کوڕە تەوار گەیشتووەتە بارەگای نۆکان. لە بنکەی ئازادییە، لەچارەسەر گەڕاوەتەوە. دەڵێن لەگەڵ دکتۆر و هاوڕێیانە زۆر باش بووە. شاهۆ باوڕی بە گوێیەکانی خۆی نەکرد، تەماشەیەکی شەوبای کرد. ئەتۆ بەڕاستیتە! لەکەنگێوە؟ ئێستا هاوڕێیان لاسرکیان کردووە. دوو ئەوەندەی تۆ تامەزرۆی دیتنی تەوارم. شاهۆ ماوەیەك لە ڕووخساری ڕەنجبەر ڕاما. یان لەبەر دڵی من ئەو قسەیە دەکەی! هاوڕێ لەبەر دڵی تۆی چی! بەڕاستمە.. شاهۆیەك پێ هەستایەوە ئەدی ناجسن لە کەنگێوە بۆ قسەناکەی چەند جار ڕەنجبەر و شەوبا و بە بۆکەی ماچکرد. دەستی دا تفەنگەکەی هەستە بابڕۆین. ڕەنجبەر بۆ کوێ؟بۆ ناوزەنگ‌لێێ باشە دوو مەتر بەفر کەوتوە. ئەدی چاکەت. ئەدی زەنگاڵ ڕەقو

ووشك دەبیەوە. هەر ئێستا دەچم دوو پێشمەرگەی دیکە لەگەڵ خۆم دەبەم و بۆ ئێوارە بەخۆ و تەوارگیانەوە دەگەڕێمەوە، شەوبا و کۆرپەی ساوا پێویستیان بە تۆیە، شاهۆ دووبارە دوو سێجار ڕەنجبەری ماچ کرد. شەوبا پاڵتۆیەکی درێژی دایە دەستی شاهۆ. تخوا ناگاتان لە تەواری بێت سەرمای نەبێت. لەوێش لە نۆکانێ خاوەخاو مەکەن و خۆتان ماتڵ مەکەن یەکسەر وەرنەوە. یان شاهۆ بۆ ئەو کچەی لەلای هاوڕێیان دانەنێم هەتا دێمەوە. حەزم لێیە لەگەڵتان بم. شاهۆ بەدەم دەرچوون ئەتۆ لە ماڵێ بە هەتا دەگەڕێمەوە. شەوبا بانگی ڕەنجبەری کرد. ڕەنجە یەکسەر هەرئەو شەو بگەڕێنەوە. ڕەنجبەر چەند جار، سەرچاو، سەدی سەد بۆ ئێوارە دەگەڕێینەوە. شلەساوارێکمان بۆ ئامادە کە. شاهۆ لەگەڵ ڕەنجبەر بەرێکەوتن، شاهۆ لەپێشەوە هەر غاری دەدا. ڕەنجبەر بەپێیەکانی ڕانەدەگەیشت. هەنگاوەکانی لەسەر بەفرنەرمەلوکەییەکە. خرم خرم. گەورەجتر کردنەوە. بانگی کرد هاوڕێ بەرەو کوێ؟ بۆ نۆکان. بەڵام ئەتۆ ڕێگای دۆڵەکۆگەت گرتووە. بۆچی بۆلای ڕاستمان دۆڵەکۆگەیە لای چەپ نۆکانە. بەلای خۆی پێشمەرگەی کۆن و بەرپرسی، شاهۆ ماوەیەك لە دەوری خۆی ڕوانی. بە هەر چواردەوریدا هەر سپیاییە بەفر دنیای داگیر کردووە. ئاوایی و دوڵ و چیا و درەختەکان لەژێر قورسایی بە فر پشتیان چەمابووەوە. شاهۆ ڕووی وەرسووڕاند، ڕێگای نۆکانیان گرت سەربەرەو خوار چوونە دۆڵێکەوە. ڕێگایەکی باریکی خلیسکی دووروودرێژ، ماوەیەك هەنگاوی گورج و بە پارێزیان داویشتن. چۆمەکە تەواو بەستبووی، تووشی سێ پێشمەرگە بوون ئەسپێکی قوڕای هیلاك و ماندوو هانکەهانکی بوو، کەسێکی لەسەر بەسترابووەوە. دوو دەستی بەرەو خوار شۆڕ ببونەوە. شاهۆ سلاوێکی کرد، لە پێشمەرگەکانی پرسی، خێرە چییەتی؟ پێشمەرگەکان هیلاك و پرزەلێبڕاو، سەرو دەموچاویان لە بەفردا بزر بووبوو. یەکێکیان بەدەنگێکی خەمبارەوە، لە سەرووی بەرد قسلێ، کێڵگەی مین هەیە، مینی لە ژێر پێیدا تەقییەوە. جا باشە ڕێگای بەرد قسڵ کوا بێرە دایە؟ هەر مەپرسە بووین بە پەند، ڕێگامان بزر کرد. شاهۆ هەرچەندی تەماشای دەکرد هیچ شوێنێکی بریندار نەبوو، کوا هیچ برینێکی نییە؟ پێشمەرگان ئەسپەکەیان سووڕاند. پێشمەرگەکە هەردووك قاچی لەسەرەوی ئەژنۆیەوە بڕابووەوە. چەند پشتێند و جەمەدانەیان لێ ئالاندبوو، دڵۆپ دڵۆپ خوێنی سووری خەست دەڕژایە سەر بەفرەکە، وادیار بوو خوێنی زۆر لەبەر ڕۆیشتبوو،

ئەگەر بهاتبا و ئەو بەفر و سەرمایە نەبوایە دەیکوشت، بەلام خوێنی بەستبوو، جارجار نوزەیەکی لێداهات، لێوەکانی وشك وشك، شەقارشەقاربوون، داوای ئاوی دەکرد. هاوڕێیەکانی بەبەفرەکە لێویان تەڕ دەکرد، کاکە بۆ ئاوزەنگ زۆری ماوە؟ لەو گردەی سەرکەوین دکتۆری لێیە. لە گۆڕەشێری. هاوڕێ ڕەنجبەر برۆ لەگەڵیان بەتەنیا دەڕۆم. ڕەنجبەر تەماشایەکی شاهۆی کرد. بیرۆکەکەی بەدڵ نەبوو، بەلام وەسەرخۆی نەهێنا. ئاوساری ئەسپەکەی گردت، لەگەڵ پێشمەرگەکان هەر بەو ڕێگاییەی هاتبوو گەڕایەوە. بۆ ڕۆیشتنی پێشمەرگە ڕێگای نێوان گۆڕە شێر و نۆکان ئەوەندە نەبوو، هەر چەندە هەڵەت و هەوراز و نشێو و دۆڵی تەنگەر و دژواری زۆربوون، بە تایبەتی لەو وەرزە تووشەی. شاهۆ واهەستی دەکرد، ڕێگاکە بەقەد ڕێگای بەرواری بالا بۆی درێژبووەتەوە. دەستێك هەیە لەپشتی ئەو درێژکردنەوە، ئەو ڕێگایە وەکوو بەری دەستی خۆی شارەزایە، بە چاوبەستراوی دەگاتە بارەگای نۆکان. لە ڕێگا هەر بیری دەکردەوە، داخوا ئێستا تەوار ڕەنگ و ڕووی چۆن بێت، بەژن و بالای چەندی لێ هات بێت؟ ئایە ژەهرەکە کاریگەربووە، ئاخ تەوار لەو ڕۆژەی چاوت بەو دنیا پڕ جەنجاڵی و چەرمەسەرییە هەڵێناوە، ڕۆژێك لەژیاندا نەحەسایەوە. هەرچی جەور و ستەم هەیە بەرامبەر بەتۆ کرا. وەرە بزانە دوو کوڕی هەرزەکار بە هەندێك پارە هەڵخەڵەتێنداران، چی ڕوویدا؟ دوو پێشمەرگە و تەوار و چەند ڕێبوار هاتنە حاڵی مردنێ، ڕەنگ و ڕووی دوو کوڕە هەرزەکارەکەی هاتەوە بەرچاو، ئەوکارەی بۆخۆیان کردبوویان نەیانزانی بوو ئەنجامەکەی ئەوەندە ترسناك دەبێت، پاش لێکۆڵینەوە و هێنان و بردن، زانیان لە نەزانییەوە ئەو کارەیان کردووە. لەسەر قسە و داواکاری شاهۆ بەڕەلایانکردن. بەدەم بیر و خەیالاتەوە چەندجار پێی لەسەر بەفر دەخلیسکا و ساتمەی دەبرد. بەزۆر خۆی دەگرتەوە. چەند جار لە ڕێگا دەوەستا و تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد. هەتا چاوبڕ بکات هەر سپییە. چەم و ئاوەکانیش بەتەواوی بەستبوویان. چیای مامەندەی بە نیشانکردووە، کە چی ئەویشی بزر کردووە. جارجارە قوڕگی وشك دەبوو، هەندێك بەفری دەخستە ناودەمی. دوا هەوراز بوو، هەرکە سەرکەوت لەتەلانێك لەبەرزاییەوە، دارستانە چڕەکەی نۆکان بەدیار کەوت. لەپشتی دارستانە سپی پۆشەکە، دووکەڵکێشی بارەگا بەدیار کەوت. لەبەرامبەر بارەگا چاخانەیەکی بچووك هەبوو. کۆمەڵێك پێشمەرگە لەبەر دەرگاو ناو چاخانەکە دەنگیان دەهات.

لەگەڵ دیتنی شاهۆ دوو پێشمەرگە پەڕینەوە باوەشیان بەیەکدا کرد. ئەوەندە بە تاسە و تامەزرۆی یەکتری بوون وەکوو ڕەشمار تێك ئاڵابوون، دوو پێشمەرگەکە کۆنەهاوڕێی شاهۆبوون. لەگەڵی هاتن بەرەو بارەگا. ئێستا تەنها پردێکی داری نیوەداڕوخاو، لەژێر باری گرانی بەفر دەیناڵان، مەترسی داڕمانی لێدەکرا. پێشمەرگەیەکیان بە شاهۆی گوت ئەوە چۆنە بە تەنیا هاتووی؟ هاوڕێ ڕەنجبەرم لەگەڵ بوو، بەڵام لە ڕێگا تووشی چەند پێشمەرگە بووین برینداریان پێبوو لەگەڵ ئەوان ناردمەوە بۆ لای دکتۆر. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دۆڵە پڕیەتی لە سیخووڕ و پیاوی خراپ، بە تایبەتی ئەو ماوەی دوایی لەپاش ئەو گرژییەی ئێراق دژی کوێت دروستی کردووە، هەق نییە بەتەنیا بڕۆی! هیچ لە گوڕێ نییە، پاشان ڕێگاکە ئەوەندە نییە. هاوڕێ شاهۆ بەڕای تۆ، مەسەلەکە بەکوێ دەگات؟ مەسەلەی چی؟ هەڕەشە و گوڕەشەکانی ئەو دوایانە بەرامبەر قوتدانی وڵاتێك بە ناوی کوێت. ئا ئەوانە هاوزمان و هاودین و خوێنی یەکترن، ئەگەر گۆشتی یەکتریش بخۆن ئێسقانی یەکتر ناشکێنن، کهواتە هەر هاتوو هووتە، بەیانی دەگەنە یەکتری وەکوو ئەوەی نەبایان دیبێ نەبۆران. بەڵام مادام هێزی ڕۆژئاوا گردبوونەوە، کارەساتێک ڕوودەدات، وا پێدەچێت، قسەوباس و لێکدانەوە سیاسییەکان بۆ تەنها جارێک ڕاست دەرچێت و بنەمایەکی هەبێت، یان شتێکی نهێنی گەورەیان بە گوێچەکەیاندا چرپاندبێتن، بۆیە بەردەوام لە پێشمەرگە دەکەم شەش مانگی دیکەش ددان بە خۆیدا بگرێت و هێزەکە بڵاوەی لێ نەکات، ئەو جارەیان لایەك بە لایەك دەبێت. ئەمن بۆچی هاتووم پرسیاری چیم لێدەکەن، کوا، تەوار لە کوێیە؟ یەکێکیان دەستی بۆ سەربانی بارەگای بەرامبەریان ڕاداشت، ئەو چادرەی دەبینی لە سەر تەپۆلکەی بەرامبەرمان. بەڵێ ئەوە سەربانی نانەواخانەیە. ڕاستە بگەیە هەتا بەسەرسەری تەواردا نەتەپیوە. هاوڕێ ئاگاداربە لە پەڕینەوە، ئەو پردە شەو هەیە دوو جار دەڕوخێت. کاتێك لە پردەکە پەڕینەوە، ئێشکگر لەسەر سەربان هەبوو. کابرایەکی باریکی باڵا مام ناوەندی، وەکوو خوی بەردەوامی بەزردەخەنەیەکی زۆر گەرم، جگەرەکەی لا لێوی لادا، باوەشی بە شاهۆدا کرد. باشە ئەگەر بۆ هاتنی سەردانی کچەکەشت هاتبی هەرباشە؟ بزانە لەوەتەی گەڕاویەوە هەواڵپرسینێك، سەردانێك، هیچ. شاهۆ هەستی بە شەرمەزاریەك کرد، بڕوابکە هاوڕێ باوکی دڵشاد، هەموو دەمێك لەیادم بووی، پاشان ئەمن دوێنێ شەوێ هاتوومەتەوە، ئەوەتا ئەمڕۆ لە خزمەتتدام، هاوڕێ

باوکی دڵشاد یەکێکە تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵی دەبوو، بەڵام هەموو ژیانی لەپێشمەرگایەتی و سیاسەت ژیابوو، کادیریکی قاڵبووی شۆڕش بوو. ئەوە دەزانی وەکوو چی لێهات هاوڕێ، کەسێك بە کەسێکی خۆشەویستی گوت، برام شەش مانگە دیارنیت.. وەڵامی کابرا چی بێت باشە! بەسەری تۆ دوێنێ کارم هەبوو.. ماوەیەك پێکەنین، پاشان باوکی دڵشاد، پەنجەی شایەتمانی بۆ چادری سەر ئانەوەخانەکە درێژکرد، ئەوەتا شازادە ئەفسانییەکەمان، زۆری سەرمابوو، لەوسەر تەندوورە باشترین جێگامان داونێ، لەگەڵ هاوڕێ ڤیان و کچەکەی، چی بکەین برام هەر دەڵێین لێمان قایل بن و بگەڕێنەوە لامان. ئەو هەموو یادەوەرییە تاڵ و شیرینە کەنگێ دانیشین و باسیان بکەین، زۆریان هەر لەبیری هەموو لایەکمان چوونەتەوە.. شاهۆ دەستی لەسەر شانی باوکی دڵشاد دانا، جا هاوڕێ لە کوێوە دەست پێ بکەین، ئەوەندە زۆر هەر تەواو نابن، بەهەورازە نزمەکە هەڵگەڕان، لەپێش زالکی، چادرەکەی دووکەڵکێش هەڵدەستا، بزانە زانیم زۆریان سەرما بووە، لە باشترین و گەرمترین شوێن دام ناون. پێش ئەوەی هاوڕێ باوکی دڵشاد بانگی، تەوار بکات، شاهۆ پرسی. هاوڕێ دکتۆر لەکوێیە؟ ئەوڕۆ بەیانی لەگەڵ تەوار و هاوڕێ ڤیان و کچەکەی لە ئێران گەڕایەوە. ئێستا ئۆرە داربڕینی بوو، دارمان نەماوە، لەو نزارەی سەرەوەیە دکتۆر هەر بۆ دەرزی لێدان ئازا نییە، بەڵکوو لەهەموو پێشمەرگەکان ماندووترە، سەرما وابکات، ئەو ساڵ نەك زستانەکەی بەڵکوو بەهارەکەشی سەخت دەبێت. شاهۆ دەستێکی لەسەرشانی دانا، کوێستانە هەر وا دەبێت. لەپشت چادرەکە شاهۆ بانگی کرد، تەوار.. تەوار.. هاوڕێ ڤیان. زۆری پێنەچوو لایەکی چادرەکە هەڵدرایەوە، هاڵاوێك هاتە دەرێ. هاوڕێ ڤیان بانگی کردنە ژوورێ، باوکی دڵشاد و دوو پێشمەرگەکەی دیکە ڕۆیشتن. شاهۆ بە هێواشییەکەوە خۆی بە ژووریدا کرد، هاوڕێ ڤیان زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کرد. تەوار خەوتبوو، شاهۆ بەتانی لەسەردەم و چاوی لادا، تەنکە نارەقەیەکی کردبوو، سەری ماچ کرد. شاهۆ زۆر تێیەوە ڕاما، ڕوومەتەکانی سوور سوور، کچەکەی ڤیانیش پرخەی دەهات، شاهۆ پرسی هاوڕێ لە ئێران بووی؟ بەڵی لەبەر تەواری، ژەهرەکەی زۆر کاریگەر بوو، کەس بەتەمای نەبوو، زمانی شکابوو. دوو هەفتەش هۆشی بەسەر دنیایەوە نەبوو، ئازارێکی زۆری چەشت، بەڵام بۆ خۆی ناوی خۆی بەخۆیەوە، کچێکی سالار و مەندوو و مەستوور، چەند ئازاری زیادەکات، زیاتر ددان بەخۆیدا دەگرێت.

کچەکەی خۆم زۆر نەخۆشبوو، ئاگام لەوی نەما لەبەر تەواری. باش بوو دکتۆرمان لەگەڵدا بوو، هەر لێرە زۆر شتی بۆ کرد. لە سەردەشتێ هەفتەیەك لە خەستەخانەبوو، پاشان بەپەلە ڕەوانەی تاران کرا، هەتا بەرگەی تارانیمان جێبەجێکرد بەرد شەقی برد. لەو کاتەشدا، شەوبا، لەسەر مانگ و ڕۆژی خۆی بوو، ویستی لەگەڵمان بێت، بەڵام سەفەری وا چۆن بە ئافرەتی زۆیستان دەکرێت! بەڕاستی زۆر غەمی ئەویشمان بوو، لەبەر تۆ و لەبەر تەواری زۆر بەپەرۆش بوو، بەڵام باش بوو تەوار چارەسەری بۆ کرا. برینەکانی کیمیایی بەتەواوی بن برکران. لەتارانێ چەند دکتۆر و پرۆفیسۆر گوتیان ئەگەر هاتبا و ژەهرەکە نەڕژابایە ناو کانی، لەگەڵ ئاو تێکەڵ نەبوایە. یەکسەر دەیکوشت، بەڵام لەگەڵ ئاوەکەی کاریگەری کەم بووەتەوە. ئەو کچە ئەوەی خراپە، خۆ بەدەست خۆشی نییە، هەرچی دەردوئازارە دەیداتەوە هەناوی خۆی، ماوەی سێ هەفتە، دەنگ لەبەرد بێت لەو بەستەزمانە نەهات، زۆر پرسیاری دکتۆرەکان بۆ خۆمان، بەگوێرەی زانینی خۆمان وەڵاممان دەدایەوە. هەتا باسی ژەهراوی بوونی کانی و سەرچاوەکەی نەدەکرد. ئەتۆ وەرە بزانە ڕژێمێکی چەندە زاڵم و خوێنڕێژە. بە هەموو ئەنفال و کیمیابارانەی دڵی ئاوی نەخواردووەتەوە، ژەهر لەکانی بکەی! هیتلەر و مۆسۆلۆنی بە چارەگی ئەو سەدامە گوڵەی خوێنڕێژ نەبوون. لەو قسانەدا بوون تەوار بە خەبەرهات. هاوڕێ ڤیان دەستێکی بەسەر و لاڕوومەتی داهێنا. تەماشەکە بزانە کێ هاتووە؟ تەوار کەمێك چاوەکانی هەڵگڵۆفین. هەندێك بەولا و ئەولای خۆیدا ڕوانی، ماوەیەك وەکوو هیچی نوێ ڕوووینەدابێت بێدەنگ مایەوە. پاشان بەهاوارێکەوە، مامە شاهۆ.. خۆی بە باوەشیدا کرد. شاهۆ لەباوەشی گرت. لەماچ کردن و بۆن کردنی تێر نەدەبوو. هاتی مامە شاهۆ؟ دەمزانی دێیت. لە کوێ بووی؟ شاهۆ نەیدەزانی بڵێ چی.. قەت قەت جارێکی دیکە بەجێت ناهێڵم. ئەوە دواجارە، ئەو جارەش بە زیندوویی گەڕایەوە، کچە بەدبەختەکەم! ئای چەند تامەزرۆی دیتنت بووم. ئەمنیش مامە! ئەوە چیت بوو؟ نازانم، بۆخۆشم نازانم؟ کانییەکەیان ژەهراوی کردبوو. ماسییەکی زۆر مردبوون!

تەوار ڕووی لە شاهۆکرد، مامە ئەو بەبە جوانە ناوی چییە؟ تەوارگیان لەبەر تۆ هەتا ئێستا بێناوە! زۆر ناویان بۆ دۆزیوەتەوە، کوێستان، کوردستان، کارێز. زۆر ناوی دیکە، هەرپێشمەرگە و ناوێکی بۆداناوە، بەڵام با ناونانی کاری تۆ بێت. بەبێ ئەوەی بیر بکاتەوە و وەکوو ئەوەی دەمێك بێت ناوێکی بۆ دانابێت، حەز

دەکەم ئەگەر بەقسەی من بێت ناوی (تەلان) بێت. تەماشیەکی بەبەی کرد و پرسی، بەدڵتە، شاهۆ شەوبا تەماشایەکی یەکتریان کرد، هەر دووك نەك ڕازی بوون، بەڵکو زۆر ناوەکەیان بەدڵ بوو. ئەوشەوە ژوورە گچکە لەرزۆکەکەیان دڵۆپەی دەکرد. لە نیوەشەودا بەفر ئەستوورتر بوو، دڵۆپەکان زیادیان کرد، بە بنمیچ و دیوارەکاندا قوڕاو دەهاتەخوارێ. جیڕەجیڕ بە کۆنەکاریتە و کۆڵەگەکان کەوتبوو. لەزۆر شوێن تەپەقوڕ و پارچە بەردوو چیلکەی بنمیچەکە دەهاتنە خوارێ. وای لێهات ئاو بە لێشاو دەچۆڕایەوە، بنمیچەکە تەواو سکی دادا بوو، شاهۆ هەستایەوە، ئەوڕۆ لەکاتی بەفرماڵین زانیم ئەوشەو ئەو ژوورە دەڕووخێت. هەستن با خۆمان ڕزگار بکەین. دەستی دایە چەکەکەی. کۆرپەکەی لەباوەش کرد. شەوبا دەستی تەواری گرت، لە ماڵ دەرکەوتن. بارەگا زۆر لەوێ دوور نەبوو. چوونە ناو هاوڕێیان. فریامان کەون لێمان قەوماوە.. چادرێکی گەورەی ڕووناك هەبوو دایاننێ. پێشمەرگە ئەوەندی بۆیان کرا لانك و شرە و بڕەیان هێنانەدەر. ئەو شەوە خەوتن. بەیانی چوونەوە سەر ژوورەکە، بەسەریەکدا تەپی بوو. هەر چۆنێك بێت ئەو زستانەیان بەڕێ کرد. زۆربەی کات شاهۆ سەرگەرمی دەرسدانی تەواربوو، ئەویش وا هۆگری ساوێن بوو زۆربەی وەختەکان بەیەکەوە بوون. شاهۆ دوو هەفتە جارێك لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگە دەچووە سەری سادری بۆ نێشکگرتن لە گوومرگ. لە هاویندا ژمارەی پێشمەرگە ئەوەندی دیکە لە کەمی دابوو، ئەوەی بەرەو ئێران بۆ ئۆردووگایەکان، بەشێکی بە ناچاری بەرەو هەندەران و تاراوگە کۆچیان کرد، نەگەیشتنە ئەو ڕۆژەی چەندین ساڵ بوو چاوەڕوانیان دەکرد. بەچاوی خۆیان ببینن، کێشەی نێوان ئێراق و کوێت زۆر بەگەرمی هەبوو. ڕۆژانە لە ڕادیۆ و لە ڕێگای کاروانچی و قاچاغچییەکانەوە هەرچی دەنگوباسی ناوشار هەبوو دەهات. پێشمەرگە بەردەوام ڕادیۆیان بەبن گوێوە بوو. بەرپرسە سیاسیەکان دەیانزانی شتێك ڕوودەدات. هەڕەشە و گوڕەشە و بروبانوی شمشێری عەرەب و عروبە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیادی دەکرد. بەردەوام نامەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی بۆ برا عەرەبەکانی دەنارد. ئەگەر بێت و بە نارەزووی ئەو نەجولێنەوە، وەکوو کورد ئەنفاڵتان دەکەم. لە جینۆسایدی کورد چەند سەدام تاوانبارە، ئەوەندەش شێخەکانی کەنداو، شەڕی هەشت ساڵەی کاولکاری بە فیت و بە بۆڕییە نهوتەکانی کوێت و عەرەبستانی سعودی دەکران. ئەوەتا ئەمڕۆ بۆخۆیان دەکەونە

بەر شالآوی ئەنفال، لەسەرەتای مانگی هەشت، هەڕەشە و گوڕەشەکان بوون بە ڕاستی. سوپای ئێراق بەچەند کاتژمێرێك کوێتی قوتدا، هەرچی شێخ و مشایخی کوێتی هەیە بە عەبایەسپیەکانیانەوە هەڵاتن. چەند تەن زێڕ و زەمبەرەی چەندە ساڵەی موڵکی میللەتی دزیبوویان دووبارە دزرایەوە. لەماوەی چەند ڕۆژێك وڵاتێك نەما بەناوی کوێت، چۆن لەدیرۆك ئێراقی بوو، بووەوە بەئێراقی. سەرکردایەتی چەند جار لەگەڵ پێشمەرگە کۆبوونەوە و کەوتنە خۆئامادەکردن و پلان دانان، دەیانزانی لەپاش ئەو هەڕەشە و ئینزار و موڵەتدانە بە سوپای ئێراق بەکشانەوە، ئەگەر نەکشێتەوە هێرشێکی سەربازی گەورەی دەکرێتە سەر. بۆ دەرپەڕاندنی لە کوێت، چەند هێنانی کەشتی جەنگی و هێزی سەربازی ئەمەریکا و هاوپەیمانانی زیادی دەکرد، ڕۆژ بەڕۆژ ئینزارەکانی وڵاتانی کەنداو و ڕۆژئاوا، دەمارگیرانەتر دەبوون. وا کەنداو پڕ بوو لە سەربازگە و سەربازی بێشوماری ڕۆژئاوا. ڕژێم شەڕی ڕۆژئاوا، بەشەڕی میللەتێکی هەژاری وەکوو کورد تێگەیشتبوو. لێرەو لەوێ سەربازی کۆدەکردنەوە. بەخەیاڵی خۆی چۆن لەگەڵ ئێران هەشت ساڵ جەنگا، ئاواش لەبەرامبەری هێزی ڕۆژئاوا خۆی ڕادەگرێت. هەرچەند هاوپەیمانان خۆیان بۆ گەردەلوولی بیابان ئامادە دەکرد. دایکی هەموو شەڕەکانیش خەڵکی بە زۆرەملێ چەکدار دەکرد. ژیاندنەوە و بە هێزکردنی فەوجە سووکەکان، بەشێکبوون لە خۆ تەیار کردنەکە. دووبارە جاشایەتی ڕەواجی پەیدا کردەوە، هەڕەشە و گوڕەشەی زیاتر بەرامبەر ئیسرائیل و دەوروبەری دەکرد. خەڵکی چاوەڕوانی جەنگێکی خوێنای گەورەیان دەکرد. لە لایەکی دیکەوە تاکە هیوابوو بۆ لەناوبردنی ئەو ڕژێمە خوێنڕێژە. پاش چەند جار ئاگادارکردنەوە و هەڕەشەی ڕاستی، لەزستاندا فڕۆکەی جەنگی هاوپەیمانان کەوتە هەڵتەکاندن و هەڵوەشاندنی سوپا و سەربازگەکانی سوپای ئێراقی. لەبیابانی مەرگهێنەر بەهەزاران سەرباز و دەرەجەدار کەوتنە ژێر تەپۆڵکەی لم و خۆڵ و باهۆزی خنکێنەر. ڕۆژانە سەرەتا بەدەیان.. پاش چەند ڕۆژێك بەسەدان.. لەگەڵ تێپەڕبوونی دوو سێ مانگ، هەڵاتن لەسەربازی و ڕوویان لە چیا و گوندە سووتاوەکان دەکرد. هەرچی جاش و سەرۆك جاش هەیە کەوتنە پەیوەندی کردن بە پێشمەرگەوە و وازیان لە ئاڵقە لەگوێی و پیاوخراپی هێنا. پێشمەرگە بەپەلە کۆبونەوەیەکی سەرتاسەری کرد، بەتایبەتی ئەوانەی سەربازی بوون. ڕۆژیان هاتەوە، کەوتنە پلاندانان بۆ ڕزگارکردنی خاکی کوردستان. سەرەتا وایان دانا

بەکۆمەڵ ڕوو لەسەربازگە و سوپا لە قەڵادزێ و پشدەر بکەن، بەڵام پلانیان گۆڕی.. ئەگەر لە دەربەندی ڕانییەوە بەرەو کێوەڕەش هێرشبەرن ئاسانتر دەگیرێت و ئەو هێزەی لە سەنگەسەر و توەسووران، ژاراوە و پشدەرە، بەگرتنی ڕانیە پشتاو دەبێت و بەبێ هیچ تەقەیەك خۆبەدەستەوە دەدات. دەستە دەستە ڕێکخرانەوە، بە چەك و جبەخانەی باش، وا بڕیاردرا، هەر دەستە و بۆ ناوچەی خۆی. لەپاش ڕزگارکردنی هەموو شار و شارۆچکەکان و بەرەنگاربوونەوەی دایکی هەموو جەنگەکان، بەرامبەر بە گەردەلوولی بیابان، کورد بەتەواوی لەگەڵ گەردەلوولی بیاباندا بوو، بەڵام ماوەیەك بەرەناگاربوونەوە کپ کرا، هەتا ئامانجەکانی میللەتێك تێکەڵ بەبەرژەوەندی ئەمەریکا نەبێت شەڕیان نەکرد. دەشیان زانی (دژایەتی کردنی ئەمەریکا خۆکوژییە، کەوتنە ناو داوی ئەوینیشی زۆر مەترسیدارە) هەرئەوەندە بەرژەوەندیان نەما، پشتت تێدەکەن و گورگان خواردووت دەکەن. لەگەڵ سوپای شەق و شڕی ئێراق لە کوێت دەپەڕێندرا، پێش ئەوەی دەستی پێشمەرگە بگاتە زۆر ناوچەکان تووڕەی جەماوەر بەسەر هەموو دامودەزگا ئەمنی و سیخوڕییەکاندا ڕژابوو.

لەبەر پارێزگای تازە و نۆزدەهەمین، دایکی هەموو جەنگەکان، بەرامبەر بە گەردەلوولی بیابان بە چۆکدا هات. شاهۆ لەگەڵ دەستەیەك پێشمەرگەی هەشت نەفەری، بەبەری قەندیلدا ڕوەو کێوەڕەش. هەر لەیەکم سەربازگەوە چۆڵکرابوو زانیان ڕژێم زۆر لە حاڵێکی خراپدایە، لەگەڵ ئاوەدیو بوونیان بۆ ناو ڕانیە. دووسەد جاش و سەرباز بەچەکەوە خۆیان بەدەستەوە دەدا، لەژێر فەرمانی یەك پێشمەرگە دەبوون. ڕژێم بۆگرتنەوەی تەپۆلکەیەك ئەو هەموو کیمیایی و چەکە قورسەی بەکار دێنا، ئەگەر لە توانای دابا هەر وابەئاسانی چۆڵی نەدەکردن. توڕەی و ڕقی چەندها ساڵەی جەماوەری ماف پێشێلکراو زۆر دەمێك بوو بەسەریاندا ڕژابوو. لەماوەیەکی کورت زۆر شار و شارۆچکە بەتەواوی ئازاد کرابوون، دەروازەی ڕاپەڕین، ئاوەلابو، هەر لە وێشەوە ئاوێنەی ڕووی وڵات گۆڕا. لەسەر شەقام و بن دیوارە ڕووخاوەکانی مزگەوت و خوێندنگا و باڵەخانەکان هەزاران سەرباز کۆڵەپشتەکانیان کردبووە سەنیر و بێچەك بە ترس و شەرمەزارییەك لەو خەڵکە ڕقگرتووە ڕادەمان، کە هیچ بەلایاندا نەدەهاتن، مەگەر جارجار ئاو خواردن، جلکوبەرگ یان پێخەفییان بۆ دەهێنان، بە بێئەوەی کەس پرسارییان لێبکات، بە زمانێکی دیکە کەس تێیان نەدەگەیشت، ئەو زمانەی هەتا

چەند ڕۆژ لەمەوپێش بە بیستنی خەڵکی موچرکیان بە تەواوی جەستەیان دادەهات، لەگەڵ زانیان زمانەکەیان دەورانی بەسەرچوو، هەرچ . وشەی کوردی دەیانزانی بە ڕەوانی بۆ پاڕانەوە دەیانگوت، کاکە ئە من هەنم لێرە بە ڕاژدی، خەلکی وەکوو ئەوەی هەست بە بوونیان نەکەن، بە دەشت و ناو سەر بەهەزاران سەرباز بەبێ چەك لەبرسان لاکەیان دەهات. ئارەزوویان دەکرد لە سەر سەرانگوێلك و کەلاوەکاندا بژین و ڕوو لە سەربازگەکان نەکەنەوە، تەواوی ژیانیان بە پرسکردن بووە، چەند مانگ جارێك بوو سەر دانی خانەوادەکانیان بوو دوو ڕوژ سەد دەستیان ماچ دەکرد، ئەو خووەیان هێشتا بڕ دەکات، بۆ سەرئاو و تەماشایەکی ئەفسەرەکانیان دەکرد، کە پلە و دەرمجە و ئە ستێرەکانیان دامالی بوون، لە نێوان سەربازەکان سەرییان لە نێوان ئەژنۆکانیان نابوو، بە چاو سەربازەکانیان تێدەگەیاند، هەرکەس بەرپرسی خۆیەتی کەس لەکەس بالآدەستتر نییە. لەپاش ئەو هەموو جەور و ستەمەی لەو خەڵکەی کرا، ئەوجاریش خەڵکی نان و ئاو و جێگای حەوانەوەیان بۆ سەربازەکان دابین دەکرد. لاشەی پارچە پارچە و سووتاوی جەلاد و خوێنمژان و قوربانی تێکەڵ بوون و بە هەموو لایەکدا بڵاو بووبوونەوە. باوەشی گەرمی میللەت بۆ پێشمەرگە بەتەواوی کرایەوە. پێ بە پێ، لەهەموو شارەکان ڕاپەڕین بە تەواوی بەرپابوو، کاتێك شاهۆ لەگەڵ چەند سەد پێشمەرگەیەك لەدوای نیوەڕۆ گەیشتنە کەرکووك دڵی گەرمی میللەت وەکوو بابە گوڕگوڕ دایسا. بڕیاردرا هێزی سەرەکی بۆ کەرکووك بڕوا، چونکە پێشمەرگە دەیزانی ڕزگارکردنی کوردستان بەبێ کەرکووك، وەکوو لاشەیەکی بێ دڵ وایە. هەرچەندە دەیانزانی ڕزگارکردنی ئەو شارە داگیرکراوە هەر وا کارێکی ئاسان نییە. دوژمن ئەك بای بەشی کورد، بەڵکو ولاتێکی دراوسێ هێزی بێشوماری دانابوو. دەستەدەستە بەرەو سەربازگە و مۆڵگای دوژمن دەکەوتنە ڕێ. چەند جۆری ماشێن زیل و ئیفا و زۆر کەس بەچەکی خۆی بە ماتۆڕ بەدەشتاییدا ماوەیەکی باش بەناو خۆڵ و درك و کەندولەندا بۆ هەیئەی خاسەی کەرکووك زۆربەیان ئەك کەرکووکی نەبوون، بەڵکو هەر ئەیان دەزانی سەربازگەی خالید و هەیئە لە کوێیە. پێشمەرگەیەکی لاو هێشتا مووی لێنەهاتبوو، لەناو هینۆیەك لەتەنیشت شاهۆ دانیشتبوو. دەستی بۆ تۆقە ڕاداشت، ناوم شێرڤانە! دەزانی هەیئەی کەرکووك لە کوێیە؟ شاهۆ زۆر بەگەرمی دەستی خستە ناو دەستی کوڕە لاوەکە. ناوم.. شاهۆیە، ڕاستی

ئەمنیش بەداخەوە کەرکووکی نیم. ئەوانەی ئەتۆ دەیانبینی لەشاری دیکەوە هاتوون، بۆ یارمەتیدانی خەڵکی کەرکووك بۆ ڕزگارکردنی. ئەتۆ خەڵکی کام شاری؟ لاوەکە مژێکی قووڵی لە جگەرەکەی دەستی دا، ئەز بۆ خۆ خەڵکی گوندی باڵاڤێم، بەڵام بابم پێش چەند ساڵێك لە هەیئەی کەرکووك لەژێر ئەشکەنجە شەهیدبوو، حەوت منداڵی بەجێهێشت. وەڵا بەس بگەمە هەیئەی لەکووشتن و تۆپاندنی کەس دەست ناپارێزم، چاوەکانی پڕبوون لە ناو دیاربوو چەند یادگارییەکی باوکی خۆش و ناخۆشی هاتبووەوە بەرچاو. شاهۆ دەستێکی لەسەر شانیدانا برام، هەرهەمووومان وەکوو تۆین.میللەتی کورد ئەگەر فریای خۆی نەکەوێت بە تەواوی لەناو دەچێت. هەیئە وەکوو ئەمن بیستوومە لە ناو شارە لەناو جەرگەی ناوچە کوردنشینەکان، با ئەو سەربازگانەی دەوروبەر پاکبکەینەوە ئەگەر ماین بەشداری گرتنی هەیئەش دەکەین. ئەوانیش وەکوو هەموو سەرنشینەکانیکە بە بێدەنگی چاوەڕوانی گەیشتن بوون، شاهۆ ژیانی ڕابردووی وەکوو فیلمێکی کورتکراوەی پڕ کارەسات و نەهامەتی هاتە بەرچاو هەر لە سەردەمی منداڵیەوە، لەو کاتەی بەردەوام لە سەر کوونە تەیارەکانی حەوشە لەدایکی دەپرسی، دایە گوێم دەزرینگێتەوە، شتێک ڕوودەدات، ئەوەبوو کارەساتی بۆردومانی قەڵادزە ڕوویدا. پاشان لە هەڕەتی لاویەتەوە، خوێندی تەواو نەکرد، دەبوایە لە زانکۆ خوێندبای بوو بە پێشمەرگە، یەکەیەکی سەرکەوتن و تێکشکانەکانی هاتنە بەرچاو، دۆزینەوەی تەوارو پاراستنی هەتا ڕادەستی خوشکەکەی کرد، لەڕەنگ و ڕووی ناسوودەیی بەدیدەکرا، ئەوەی ڕوویدا دەبێت فەرامۆشی بکەم، ئەوەتا ڕۆژی حیساب هاتووە و لە سەرکەوتن نزیک بووینەتەوە، لەدوورەوە دەنگی تەقەو خرمەخرمی دەستڕێژی ئەپساوە دەهات. گرمەگرمی تەقینەوەی گەورە دنیای دەهەژاند. لە سەربازگە نزیك بوونەوە. پاش ئەوەی دیتیان سەربازگە تەنیا سەربازگەیەك نییە، بە دەیان سەربازگە و مۆڵگا. هەتا چاو بڕکات شووورای بەرزو تەلی دڕکاوی بە چواردەوری سەربازگەدا ڕاکێشرابوون. لەهەمووولایەکەوە ئاگری چەکی دەستی پێشمەرگە و خەڵکو هێزی بەرگری ئاراستەی دەکرا. دیاربوو دەمێك بوو هێرشی کرابووە سەر. لەناوەوە بەرگریەکی بەهێز هەبوو. لەناو کێڵگەی دار خورما، گوللە وەکوو تەرزە دەبارین. چوار دەوری خۆیان دەڕشاند. بەڵام تەقەکانیان بۆ دەربازکردنی گیانی خۆیان بوو نەك بەرگری. هەر سەربازگەیەك لەناو خۆی بەندیخانەی تایبەتی هەبوو

قەسابخانەی زۆر نهێنی تەنها بۆ لەناوبردنی کورد کرابوو. باش دەیانزانی کۆتایی بە خوێنڕێژیان هاتووە. پەلەقاژەی مەرگ بوو، بە هیوای گەیشتنی هێزی ڕزگارکەر. چەند شەڕ درێژەی دەکێشا، چرەدووکەڵ و بۆن سۆ لەناو سەربازگە و بەندیخانە و دەروبەری هەڵدەستا. لەکونی بچووکی ژوورەکان هاوارهاوار و بانگکردن بە ئاشکرا دەبیسترا، بەڵام دۆشکە و ئاربیجی چەکی دەستی پێشمەرگە، دەنگەکانی بزر دەکرد. هەردووک لایان تەواو شەکەت بووبوون، چی دەستەی هێرشبەر چی دەستەی بەرگریکەر. لە پاش هەڵمەتێکی گەورەی هەموو پێشمەرگەکان بەیەکجاری لەو نزیك و دەورووبەرە دەنگی تەقە نەما لەبەشی پشتەوە چەند کۆمەڵە خانوویەکی بەرز هەبوون لەناو کێڵگەی دارخوورمای چڕتر دیاربوو هی ئەفسەر و دەرەجە دارەکان بوون. تەقە هەر بەردەوام بوو. دەستەیەك چوونە ژوورەوە.. لاشەی سووتاو پارچەپارچەی سەرباز و ئەمن سیخوڕ بەوناوەدا بڵاو بووبوونەوە. هاوارهاوارەکە لەژوورەکان زیاتر بەرزبووەووە. دەرگای بەندیخانەیان شکاند، ژووره تەنهاییەکان، دیوارەکانی بە خوێن نووسراوبوون. پەڵە خوێنی وشك بووەوە و تازە تەواوی دیوارەکانی داگرتبوو چەندێن جۆری قامچی و حەیزەران و شتی ئەشکەنجەدان. زۆر لە بەندیەکان بۆ خۆشیان نەیاندەزانی چەند لەو دیو شیشە ساردەکانەوە بەند کراون. هەموویان لەڕ و لاواز ڕیشنی جلوبەرگ دڕاو. لەژێرزەمینەکان بە دەیان داری فەلاقەو هەڵواسین بۆ ئەشکەنجەدان.. دۆلابو دەزگای کارەباو دەیان شتی کە لە سەرمێز و سەر تەختەکان کەوتبوون هەر نەشیاندەزانی ئەو شتانە چین. لە زۆربەی قوژبنکانی ژێرزەمین جێگای ڕاخراو، پڕ بوون لە هەموو جۆر فیلمی ڤیدیۆی سێکسی، بەزۆر کچ و پیر و گەنجیان لاقەکردبوو، کرداری هەتکردنەکەشیان بە ڤیدیۆ گیرابوو. ژمارەی بەندیان ئەوەندە زۆربوون لە ژماردن نەدەهاتن، زۆر لەبەندییەکان سەر و ڕیشیان هەتا سەر ئەژنۆیان هاتبوو هەرکە لە ژووره بۆگەنیوە شێدارەکان بەڕاڵادەکران، زۆریان بە گریان و فرمێسکی ئازادی دەستیان دەدایە چەك و بەرەو سەربازگە و خانووی ناو کێڵگەی دارخوورما کان بۆ تۆڵەکردنەوە.. لەکاتی گواستنەوەی بەندییەکان شاهۆ لە ناوەکانیانی دەپرسی! بزانێت کەسی ناسیاو و کەسوکار و خزمی تێدانییە. هەندێکیان دیاربوو ئەوەندە لەسەر ناوەکەیان ئازاردرابوون، یان سووکایەتیان پێکرابوو، ناوی خۆیان نەدەگوت. پێشمەرگەکان بەکون و قوژبنی زینداندا لە

پشکنینداببوون له هەموو شتێك وردەبوونەوە، گوێیان بۆ هەموو چرپەیەك ڕادەگرت. شاهۆ هەستی ڕاگرتبوو، دەمێك بوو هەستی دەکرد لەناو دیوار لە جێگای فێنککەرەوە خشەخشێك دێت. دەیزانی هەر هەموویان نەکوژراون، بەڵام چیان لێهات ئاسمان هەڵی لووشین، زەوی قوتیدان بەئاستەم دەنگێکی پستە پست بەعەرەبی دەبیسترا لە جێگای پوش و پەڵاش. لە لوولەکەی ناو دیوار نزیك بووەوە، گوێی ڕاگرت یەکێك بەوەی کەیانی دەگوت، هێشتا نە ڕۆیشتوون. شاهۆ بانگی کرد. ڕەنجبەری لە نزیك بوو..وەرنە دەرێ دەزانین خۆتان لە کوێ شاردووەتەوە! هیچ دەنگ نەبوو، چەند جار بۆڕیەکەی ڕاوەشاند.. موبەڕیدە و بۆڕی فڕێدا لایەك سێ جاری دیکە بانگی کرد. وەرنە دەرێ دەنگ نەبوولڕومانەیەکی دەرهێنا فڕێیدایە ناو کونکە. شەش لاشەی ونجڕونجڕ بەداوی یەکتریدا بەربوونەوە خوارێ. لەپاش ئەوانە بەماوەیەکی کەم، ئەفسەرێکی ڕەشی کورتە باڵای زۆر لاواز، بە خشەخش هاتە خوارێ. هەر بەڕێوە دەمانچەیەکی ڕووتی لەدەست بوو دەموچاوی خەڵتانی خوێن بوو. ڕەنجبەر دیتی هاواری کرد.. هاوڕێ ئاگاداربە! هەتا شاهۆ ئاوڕیدایەوە. ئەفسەر بەجوڵانەوەیەکی زۆر خێراچەند فیشەکێکی لە شاهۆدا. ڕەنجبەر بە دەستڕێژێك سەری ئەفسەری دابێژا غاری دایە سەرشاهۆ. لەسەر و دەموچاو و سەرسینگی خوێن فیچقەی دەکرد، چاوەگەورەکانی شاهۆ هێواش هێواش بەرەو کزبوون دەچوون، لەنێوان تاڵی ڕیشی درێژی پڕی خوێن ڕێچکەی بەستبوو. دوو دەستی خوێناوی بەسەر سنگیەوە گرتبوو. هەندێك هێزی دایە بەرخۆی.. بە دوو دەستی بەرۆکی ڕەنجبەری گرت.. . بەدەم لێشاوی خوێنەوە بە ڕەنجبەری گوت هاوڕێ ئاگاداری تەوار و تەلان و شەوبا بە.. گیانی منیش هێواش هێواش دنیا لەبەر چاوی تاریك دەبوو قسەکەی بۆتەواو نەکرا.

تەوار لەگەڵ زۆر لە خێزانی پێشمەرگەکان، لەگەڵ دەستپێکردنی ڕاپەڕین هاتبوونە دەڤەری پشدەر و لە شارۆچکەی قەڵادزێ... بەناو کوچە و کۆڵانی شارۆچکەدا لە نێوان کەلاوە و دار و پەردو دەگەڕا.. هەرچەند کردی بیر و مێشکی خۆی گوشی، هیچ یادگاریەکی ئەوسای وەبیرنەهاتەوە، بەڵام هەستی دەکرد ڕۆژێك لەڕۆژان ئاشنایەتی لەگەڵ خاک و داروبەرد و هەتا باڵندە و پەلەوەرەکانی ئەو شارۆچکەیە ئاشنا بووە، بە دوای چیدا وێڵم، چیم گوم کردووە، منداڵیم کەسم دایکم باوکم خوشك و برایەکانم. لێرە دەیاندۆزمەوە.. لە

ڕێگای بانگەوازێکەوە ڕۆژانە و بەردەوام، وەکوو دەنگی بڵندگۆی شار خەڵکی ئاگاداری ئێزگە و ڕۆژنامە و گۆڤارە ڕەش و سپییە خوێناوییەکان، دەکرانەوە لە دۆزینەوەی منداڵی بێسەرپەرشتار و بێکەس. تەوار، بەدیداری خوشکە گەورەکەی شادبوو، هەرچەندی دەکرد باوەڕی بە دڵ و چاوەکانی خۆی نەدەکرد. بەڵام ئامێز و باوەشەکەی بۆنی دایکی لێدەهات، ئەویش سەری بە سینگی خۆیەوە دەنووساند، تەوارە ئەنفالکراوەکەم، بۆنی دایك و باوك و خوشك و برا جوانە مەرگەکەمت لێدێت، برین و زامی تاقە کیژە بێسەر و شوێنەکەمت کولاندەوە، ئەوڕۆژەی ڕۆیی بۆ قوتابخانە و هەلاو ئاشوب ڕوویاندا نەگەڕایەوە، نازانم بۆ خۆشم نازانم برۆم پاشماوەی ئێسك و پروسکەکان کۆبکەمەوە و لە ئامێزیان بگرم و لە گۆڕخانەی ڕۆحمدا بە بێدەنگی بیاننێژم بەخاکییان بسپێرم، یان ئەوان کوێیان بە نسیب بووە و لە باوەشی یەکتردان لێکیان جوودا نەکەمەوە. تەواریش بە دەم ڕوانینی ئەستێرانەوە هەرچی لە سەر خێزانەکەی دەیزانی بۆ تارای خوشکە گەورەکەی گێڕایەوە. ئەوەندی لەبیری مابوو هەموویان چاوەڕوانی شاهۆیان دەکرد. تاراش وەکوو تەوار چاوشینێکی باڵا مام ناوەندی مووزەردە بوو... بەسەرهاتی ماڵی باوکی واتە، مامۆستا نزاری هەڵەبجەی دەیزانی، پاش ئەوەی ماڵی باوکی بەڕواڵەت بۆ مامۆستایی بۆ قەڵادزە دەنێردرێن بەڵام دوورخراوەیەک بوون، لەژێر چاودێریدابوو هەر لەهەمان ساڵی ئەهاتی و ساڵی جەنگ و ماڵوێرانی و لێکترازان، هەشتا و سێ (ئەمنێکی عەرەبی) زۆر خراپ بەناوی ساجید عەرەب لەو شارۆچکە گرگرتووە پەیدابوو، ژیانی لێرە هەر ئاشووب و نەهامەتی بوو، لەناوچوونیشی دیسان بەختی بوو، تەواوی بەسەرهاتەکەش لە بیر و هزری زۆرینەی خەڵکی ماوە، بەدەستی کوڕێکی هەرزەکار دەکوژرێت، ئەو کەسە لە پیاوکوژانی محەمەد عەرەب بوو. لەلایەن خوێنمژانی گەورە بەعسی ڕێگا پێدراو بوون. کێ بکوژن ببڕن هەرچی بیکەن ئازادن کەس لێ پێچینەوەیان لەگەڵ ناکات. کوڕە لاوەکە، پاش کوشتنی ساجید بەسەر دیواردا خۆی بەماڵی مامۆستا نزاردا دەکات لەگەڕەکی (مام قاسمەی) پاش گەمارۆدان و شەڕێکی خوێناوی بە شەهیدبوونی لاوەکە کۆتایی دێت. مامۆستا نزار لەگەڵ خێزانەکەی و تەوار ئەو ڕۆژە لە دەرەوەی شار دەبن، هەواڵی ئەو بەسەرهاتەی بۆ دەگێڕنەوە. ناگەڕێتەوە ماڵەوە و بەخۆ و بەتەوار و خێزانەکەی دەداتە شاخ و کێو. وەکوو مامۆستایەك لەو کوێستان و هەتا گوند

مابوون مامۆستایەتی دەکرد. دوا زانیاریی لە چیای کارۆخ ئەو کارەساتەیان بەسەر دێت. لەگەڵ چەندین خێزانی دیکە، بەو شێوە نامرۆڤانەیە لەناو دەبردێن. بێ لە تەوار دوانەیەکیان هەبووە. بەسێ ساڵ لە تەوار بچووکتر، بەناوی تەلار و تێبین. پاش ئەوەی لە زۆربەی شار و ئۆردووگا زۆرەملێیەکان، خەڵکی قەڵادزێ بەشداری ڕزگارکردنی دوا بستەخاکی کوردستان لە جەبەل حەمرین کردبوو. هێواش هێواش خەڵکی گەڕابونەوە شارە خاپور کراوەکەیان. شەوبا و تەوار و تارا و تەلانی ساوای بەرمەمکان، بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی شاهۆ بوون. پێی بڵێن ئەو پەیامەی هەڵتگرت و ئەو سۆزەی دابووت تەوار بە کەسێکی شادبیتەوە، ئێستا بە چاوی خۆت ببینە چاوەڕوانتین. تەلار لە هەر هەموویان زیاتر لە چاوەڕوانی شاهۆ دابوو، فریادڕەسی تاکە خوشکەکەی بە چاوی خۆی ببینێت. ئەوەی بیستوتی لە دەمێکەوە، داکوباب و سەرجەم خێزانەکەی لەگەڵ سەدان کەسی کە بە دیلگیراون و ڕەوانەی خواری وڵات کراون، ئەوەی دەڵێت سەرجەمیان لەناوچوون ڕاست نییە، بەڵام شوێنی گیرانی خێزانەکەی نازانێت، کاتێک کاک شاهۆ گەڕایەوە، هەموو شتێک ئاشکرا دەبێت، تەوارگیان دایە و بابە و تێبین و تۆمار ماون، دڵم دەڵێت ماون، هەواڵێك بەناوشاردا بڵابووەوە. شاری خاپوورکراو چاوەڕوانی لە ئامێزگرتنی چەند ڕۆڵەیەکیەتی. لەسەر کەرکوکی خاکی کوردستان خوێنی خۆیان بە خت کردووە. لاشەی خوێناوی شاهۆ گەیشتەوە شاری خامۆشان گۆڕستانی شەهیدانی قەڵادزێ. خەڵکی شار تەواریان لەسەر شان دانابوو، لەگەڵ شەوباو کۆرپەی ساوای شاهۆ تەلان گەیاندبووە گۆڕستان. لە گۆڕستانیش خەڵکی زۆر بە غەمباریەوە وەستابوون کەوتنە پشکنینی جلە خاکیەکەی لەخوێن شەڵاڵبوو. لەناو باخەڵی سەرسینگی نامەیەکی کورتی بە پەڵەخوێن کە فیشەکێکی بەرکەوتبوو بە خامەیەکی سوورنووسراوبوو.. ئەو نامەیە بۆ گشت گەلی کوردی ئازیز، بۆ کوردستانی بریندار، بۆ تەواری لەهەموویان بریندارتر! کورد هەتا ڕۆڵەی فیداکار و گیان لەسەردەست و پێشمەرگەی هەبێت، پەناگەی و جێی داڵدەدانی شاخی لووتکەی سەربەتەم بن، قەد سەر دانانوێنێت، بەرەو سەرفرازی هەنگاو دەنێت.. خوێنەر و هاوڕێی دێرینی شاهۆ، ڕەنجبەر دووچاوەکانی بچووك کردنەوە نامەی خوێناوی تەواو لە چاوەکانی نزیك کردنەوە.. هەرچەندی کرد نەیزانی چی لەسەر ئەنفالچیان نووسراوە، لەبەر ئەوەی فیشەکی بەر کەوتبوو، بەردەوام بوو..

ئەونامەیە تایبەتە بە تەوارگیان.. تەوارەکەم. تەواری میللەتی بە جینۆسایدکراوی گەلێکی هەژار.. هەتا بەچکە هەڵۆ و تەوار لەشاخە سەربەرزەکانی کوردستان مابن هەر زیاد دەکەن.. لەسەدانەوە دەبن بە هەزاران، لەهەزارانەوە دەبن بە ملیۆنان. بێدەنگ مەبە تەوارەکەم، کارەساتی ئەنفال و خاپوورکردنی کوردستان یەکەیەکە بۆ نەوەکانی داهاتوو بگێڕەوە ئەوەندەی دەتوانی، بۆ کۆرپە و خێزانە سەربەرزەکەم.. لەژیانمدا و لە گۆڕیشدا گیانم نارامە چونکە کەسی وەکوو ئێوە دڵسۆزم هەیە.. ئێستا لە کەرکوکی کوردانم، لەنزیك شوورا سەرشۆڕەکانی سەربازگەی خالید.. لەکاتی بەرەنگاربوونەوە. شەهیدبوونم شانازیە. دەبێ باوەشی گەرمی هەموو کورد بۆ تەوارەکان ناوەڵا بێت. دڵسۆتان، شاهۆ. بەدەم گریانی تارا و شەوبا و تەواوی گشت خەڵکی شار جگەلە تەوار، چونکە تەوار لەکاتی کارەساتەکاندا نەدەگریا، بەڵکوو دوو چاوە گەورە شینەکانی بریسکەیەکی دەکرد. هەمان بریسکەی زۆر بە هێز.. بەسەر جەستەی خوێناوی شاهۆ و گشت شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری تیژ تێدەپەڕی، وەکوو ئەوەی بە بریسکە برووسك ئاسایە.. ڕووداوەکان تۆمار بکات بە خوێن بیاننووسێتەوە. جەستەی بچووکی تەلانیشی دەگرتەوە، بەوپەڕی بێئاگاییەوە نەیدەزانی چ ڕوویدەدا. ئەوە دوا نیگایە بۆ ڕووخساری باوکی.. دوو دەستە بچووکەکانی بۆلای باوکی شەهیدی ڕێگای کوردایەتی و ڕێبازە سوورەکەی ڕادەداشت و داوای باوەشی گەرمی بە سۆزی دەکرد، بەڵام وەکوو هەزاران منداڵی کورد. بۆ هەتا هەتایە لە سۆزی باوك بێبەش بوو. پێش ئەوەی بەیەکجاری تیشکی خۆر لە سیلەی ئاسۆس ئاوابێت. لەبەرامبەری قەڵای سەربەرز لەباوەشی گردی حوسنی، لەتەنیشت هەشت کۆترەکەی ئەحمەدی سابیری قوربانی بۆردوومانی حەفتاو چوار. ئەگەرچی بە جەستە هیچی وا لە هەشت ڕۆڵەکەی ئەحمەدی سابیری نەدۆزرایەوە، بەڵام ڕۆژانە بەباڵە ئەخشینە بچووکەکانیان، بەسەر تەواوی شاردا دەسووڕانەوە. ڕەنجبەر پڕ بەگەرووی بە سەر هەردوو زێی ئەولا و ئەولای قەڵا بە درێژایی کانییە شێخەی دەینەڕاند، لەکاتی بەخاکسپاردنی شاهۆ بەهەزاران دەنگ لەگەڵی دەیان گوتەوە:

شەهید:ئەمرە وەکووو شاخ
وەکوو بەفر، وەکوو درەخت
وەك گوڵەباخ

شەهید ئاوە،
تینوێتی زەوی دەشکێنێ
پەنجە و دەستە
ئازاری خاك ڕادەژەنێ
سۆمای چاوە،
کام دوا ڕۆژ دوورە دەبینێ
شەهید باڵای
بەقەد باڵای کوردستانە،
دڵی ئازادی و بەیداخی،
لووتکەی هەڵوێستی
ئینسانە

کۆتایی بەرگی یەکەم

بەرلین ڕێبەندانی١٩٩٢

که تاریک دادەهات، بزنە ڕێیەکان وەک
زەردەمار دەهاتنە بەر چاو... لەم کاتانەدا
ترس لە خلیسکانی تەوارو لێکترازانی
هاوڕێیان دەستی پێدەکرد. دەستەی
پێشمەرگەکان بێئاگا لە یەکتری
نزیکدەبوونەوە، تا ئەو نزیکییەی
هەناسەکانی یەکتریمان دەبیست.
تا لەوێدا هەستمان بە ماندووبوونی تەوار
دەکردو جیاوازییە زەقەکان ئازاریان
دەداین، ئاخر ئەویش دەبوو ئێستا لە
باوەشی دایکی و لەناو نوێنێکی گەرم
وموورِدا بنوێ، کە برسی با خواردنی گەرم و
کولێرەی نوێی خواردبا. ئەو دەبوو لە
قوتابخانە لەگەڵ هاوتەمەنەکانی فێری ژیان
بووبا و بەرەو ئایندەیەکی ڕووناک
چووبا، بەڵام ئێستا بەو نیوەشەوە لە نێو
چیاو پێچە نەدیوەکان لەگەڵ دەستەیەک
پێشمەرگە بەرەو ئایندەیەکی نەدیو گوێت
تەنها لەهەناسە گەرم گەرمە، بەڵام
ساردەکانیەتی



دەزگای ڕۆسیا
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب

بەرگ: ئاکار جەمال